# پەندی پێشینان

کۆکردنەوەیان و راستکردنەوە و لێدانەوە و چیرۆك بۆ نوسین یان

بە قەڵەمی


## شێخ محەمەدی خاڵ

ئەندامی کۆڕی زانیاریی عیراقی و جێداری

سەرۆکی کۆڕی زانیاریی کورد

# پێشکەشکردن

پێشکەش بێ بە گیانی پاکی ئەو پێشینانەی کە ئەم پەندانەیان داداوین، وە ئەم سەرمەشقانەیان بۆ کێشاوین، کە تا جیهان جیهان بێ و گەلی کورد لە ڕووی کاربێ، بە پێی ئەم پەندانە هەڵ ئەستن، وە لە بەر ڕووناکییان دائەنیشن.

پێشکەش بێ بە گیانی ڕەوانی ئەو باووباپیرانەی کە ئەم کەلەپوورەیان بۆ بەجێ هێشتووین، کە ئەمە هەزاران ساڵە خۆراك و پێ بژێوی گیانمانن، وە بە هۆی ئەوانەوە توانیومانە لەم جیهانە بۆگەنەدا بژین، وە لە سەر شانۆی ژیان هەڵسوڕێین، وە خۆمان نیشان بدەین، وە لەبەر باری لاسەنگ و خواری ڕۆژگارا بوێستین، وە لەبەر وەیشومەی جیهانا وەك کێوی پیرەمەگرون سنگ داکوتین، بە ڕەنگێکی وا نە بە زللەی ڕۆژگار بلەرزین، وە نە لە هەڕەشەی دەوران بترسین.

محەمەدی خاڵ

# پێشەکی:

شێخ محەممەدی خاڵ نووسەر و خاوەن بیرێکی ناسراوە، جێ پەنجەی لە بواری کوردایەتیدا بەدی ئەکرێ لە سەرانسەری کوردستانی گەورەدا. ئەو کوردایەتییەی کە بە ئەنجام دانی کاری گەورە خزمەتی مەسەلەی نەتوایەتیمان پێکردووە، وە هەموو کوردێك بە جیاوازی بیروڕا کەڵکی لە بەرهەمەکانی وەرگرتووە و وەرئەگرێ. شێخی خاڵ بە بیر و قەڵەم و کۆششی بێوچان لەماوەی ( ٥٥ ) ساڵدا زۆر بەرهەمی هەمەجۆری بە کەڵکی پێشکەش نەتەوەی کورد کردووە، وە کەلێنێکی گەورەی پڕ کردۆتەوە لە کتێبخانەی کوردیدا، وە ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە بووژاندنەوەی کەلەپوور و سامانی نەتەوایەتیمان و ناسینی کورد بە جیهان وە بە قەڵەمەکەی خزمەتی گەلەکەی بە گرنگترین پێویستی سەرشانی خۆی ئەزانی. وە وەك نووسەرێکی خاوەن بەهرەی بەدەسەڵات توانیویەتی زۆر بەرهەمی نۆبەری بە کەڵك ئەنجام بدات لە زۆر بواری جیاوازی ڕۆشنبیریدا، کە لە پێش ئەودا کەس نەبوو لەو بوارانەدا شتێك بنووسێ، وەك (فەرهەنگی خاڵ) کە ئەنجامی کۆششی ( ٤١ ) سال بوو لە بواری زمانەوانییدا. لەبواری ئەدەبیشدا ژیاننامەی شاعیر و نووسەرە کۆنەکانمان کە پێش ئەو باس نەکراون وەك پێویست وەك (مفتی زەهاوی و شێخ مەعروفی نۆدێ و بیتوشی و مەلامحەممەدی خاکی و سەید ئەحمەد فائزی بەرزنجی) لە بواری کەلەپوور و میراتی نەتەوایەتیشمان ( پەندی پێشینان) کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٥٧ دا کەوتە بەردەم خوێنەرانی کوردەوە کە بریتی بوو لە ١٣١١ پەند. چاپی دووەمی لە ساڵی ١٩٧١ دا بوو کە ژمارەی پەندەکانی گەیشتە ٣٨٩٣. ئێستاش وا بە هیممەت و دڵسۆزی لێپرسراوانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی سێیەمی ئەنجام درا کە بریتییە لە ٤٥١٣ پەند، واتە بە زیادبوونی ٦٢٠ پەندی تریش کە خوالێخۆشبووی باوکم لە دوای چاپی دووەمەوە بە کۆشش و ماندوبوونێکی زۆر کۆی کردونەتەوە کە بەشێك لەو پەندانە هی ناوچەی هەولێرە.

سوپاس و پێزانینم بۆ کاربەدەستان و کارمەندانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم کە دیارییەکی بە نرخ پێشکەش خوێنەرانی کورد ئەکەن لە هەر کوێیەك بن. بە تایبەتی کتێبی ناوبراو لە مێژە لە کتێبخانەیەکی کوردستاندا نەماوە، وە ژمارەیەکی زۆر لە خوێندەواران و ڕۆشنبیران بە شوێنیا ئەگەڕێن و تینوون بۆی.

خالید محەممەد خاڵ

# سەرەتای چاپی یەکەم

پەندی پێشینان: وتارێکی کورتی، رێك و پێکی، جوانی، بەتامی، بە تەوژمی، کاریگەرە، کە لە دڵ و دەروونێکی، بێداری، ئاوەدانی، ئاگاداری، پێشینانەوە هاتبێتە دەرەوە، لە دوای بەراورد و تاقی کردنەوەیەکی دووردرێژ.

پەندی پێشینان: فەلسەفەی ژیان و ، دەنگی تاقی کردنەوەی جیهان و بەری رەوان بێژیی (بلاغە) رەوان بێژان (بلیغان)ە، کە باووباپیران لە هەزاران ساڵەوە، بەکەلەپورێکی وێژەیی، بۆیان بەجێهێشتووین، تا بیانکەین بە ئاوێنەی بالآنما بۆ خۆمان.

پەندی پێشینان: بیرێکی جوان و ، پوڕتەوێکی دەروونە، هێندێ جار هەڵ ئەقوڵێ، لە دڵێکی ئاوەدانەوە، بۆ سەردەم و زبانێکی رەوان لە کاتی دوان، یا دوای روداوێك، کە روو بدات، لەپاشا زۆر بە خێرایی دەماودەم ئەکەوێ و بڵاو ئەبێتەوە، وە پشتاوپشت ئەگێڕێتەوە، لەبەر جوانی و رێك‌وپێکی خۆی، تا نمونەی ئەو شتەی کە پەندەکەی تیا وتراوە، روو ئەداتەوە، ئەو حەڵە خاوەن مەبەس پەندەکە ئەخوێنێتەوە، بۆ بەهێزکردنەوەی قسەکەی، یا رۆوناك کردنەوەی باسەکەی.

پەندی پێشینان: زادەی سروشتی ئادەمییە، لەبەر ئەوە لە ناو هەموو گەلێکا هەیە، وە بەهەموو زبانێك وتراوە، وە زۆریان لە یەك ئەچن.

پەندی پێشینان: لەهەموو شت کاریگەرترە لەدڵی کۆمەڵەدا، چونکە هەر لە دەروونی خۆیانەوە هەڵقوڵاوە، وە لە سەر روپەڕەی دڵیان هەڵکەندراوە، لەبەر ئەوە خوێندەوار و نەخوێندەوار و لادێیی و شاریی و دانا و بۆرە پیاو، وەك یەك بەلایانەوە جوانە، وە هەموو لە کاتی قسە کردنا، بۆ بەهێز کردنەوەی قسەکەیان، ئەڵێن: وەك پێشینان وتویانە.

پەندی پێشینان: زادەی بیر و باوەڕی گەلە، وە دەست کردی کۆمەڵەیە، بێ‌ئەوەی کە بزانرێ خاوەنەکەی کێیە، تەماشا ئەکەیت لە کاتی قسە و گفتوگۆدا، ئەگەر شیعرێك، یا ئامۆژگارییەك بخوێنیتەوە، ئەڵێت: وەك فلآن زانا وتویەتی، یا فیسار پێشەوا فەرموویەتی، بەڵام کە پەندێکی پێشینان بخوێنیتەوە، ئەڵێت: وەك پێشینان وتویانە، بێ ئەوەی کە خاوەنەکەی ناو ببەیت، یا بزانی کێیە.

پەندی پێشینان: وەك سەربازی نادیار (جندی مجهول) وایە، هەر وەك کۆمەڵە و گەل بیەوێ، کە هەر بە ماڵی تێکڕایی خۆی بمێنێتەوە وایە.

زۆر جار بەو پەندە، ڕەخنە ئەگیرێ، لە ناتەواوییەکی سیاسی یا کۆمەلآیەتی، یا ڕەوشت و خویی، بێئەوەی کە کەس بترسێ لە زۆردارێکی ستەمکار، یا لە سەرۆکێکی دەولەتی، چونکە خاوەنی پەندەکە، ون و نادیارە، وە کەس نازانێ کێیە، وابزانم هەر لەبەر ئەوەیە، کەوا پەندی پێشینان، کراوە بە سەربازی نادیار، تا هەموو کەسێك بتوانێ لەلاوە، چ ڕەخنەیەك ئەگرێ، بیگرێ.

پەندی پێشینان: بەرزی بیر و باوەڕی گەل نیشان ئەدات لە ناو گەلانی تردا، وە ئەندازەی تێگەیشتن و پێگەیشتن بەرچاو ئەخات، وە بە تەواویی ئاشکرا و تمایانی ئەکات، کە ئەو گەلە ئەندامێکی بەهۆش و بیرە، لە جەستەی ئادەمیی دا، وە شایستەی ژیانە، یاخۆ ئەندامێکی بێ هۆش و گۆش و ، شایستەی نەمانە.

پەندی پێشینان: وەك شتێکی زیندوو هەمیشە لە زاووزێ دایە، وە هەر یەکەی لە ناوچەیەکا لە دایك بووە، وە لە بەسەرهات و چۆنیەتیەکدا هاتۆتە جیهانەوە، لە هەژاریی، یا دەولەمەندیی، زەبوونی، یا دەسەلآت و گەورەیی، یا داد و پرسینەوە، ئنجا کۆمەلە لەو کاتانەدا بێ پەروا پەندێکیان لە دڵ و دەروونەوە هەلقولآوە، بۆ سەر دەم و زمانیان، سایا بەدەم ئاه و هەناسەی سارد و قولپی گریانەوە، وە یا بەدەم پێکەنین و بزە و زەردەخەنەوە.

پەندی پێشینان: هەندێکیان وەك شیعر ڕێكوپێك و ڕەوان و بەرانبەرن وەك:

( ئاوێ بڕوا بۆ ڕۆخانە خوێش بیخوا نەك بێگانە)

هێندێکیشیان لە شێوەی پرسیار و وەرامان، وەك:

(کوێرە چیت ئەوێ؟ دوو چاوی ساغ)

(ئەلێ ژالە بۆ وا تالێت؟ لەبەر برا مردن، گولێ بۆ وا جوانە، لەبەر دۆست و دوژمن)

ئەوانیکەی تری هێندێکیان، لە پەردەی ئامۆژگاریی دان، وەك:

(کردن هەتا مردن)

(نازانم، ڕەحەتی گیانم)

هێندێکیان هەر باسی ئەوە ئەکا کە هەیە (بیانی واقع) وەك:

(ئەگەر لووت نەبێ چاو چاو ئەخوات)

(بە تەماشا کردن بوایە، سەگ زوو فێری قەسابی ئەبوو)

یا لە پەردەی جنێو و پلاران، وەك:

(ئەگەر دلسۆزت بوایە، ئێستا لە میری سوور ئەبوویت)

یا لە پەردەی تەشبیهایە، وەك:

(ئەلێی دڕکی مەم و زینە)

(ئەلێی لە گوێی گادا نووستوە)

یا لە پەردەی مەتەلۆکە دایە، وەك:

(قسەی راست بەردە، راست گۆبە، درۆ بەردە)

پەندی پێشینان چونکە دەست کردی هەموو گەلە بە تێکڕایی، وە زادەی بیروباوەڕی گشت لایەکیانە، بێگومان هێندێکیان لە ناوچەی خوێندەواری و ژیری و بیری بەرزو، هێندێکیشیان لە ناوچەی نەخوێندەواری دا دارێژراون، هەر وەك هەموو شیعر و داستان و گۆرانی و سەرگوزەشتێکی کۆمەلایەتی، لەبەر ئەوە هێندێکیان ئەبینین لە کالا و مەبەستێکی زۆر قەشەنگ و جوان ودڵ چەسپا، وە هێندێکیشیان ئەبینین لە بەرگ وکالایەکی تردا، بەلام هەموو بە تێکڕایی جوانن، وە هەر یەکە وەك ئەستێرەی ئاسمان جۆرە و رشە و پرشە و بریسکە و تریسکەیەکی هەیە، وە هەر یەکەی نیشانەی شتێکە، وە رێنموونی چەند کەسێك ئەکات بۆ مەبەستێکی بەرز.

پەندی پێشینانی هەموو گەلێك سەرگوزەشت و مێژوویەکی تایبەتی هەیە، ئەگەر بزانرێ کێ وتوویەتی، وە چۆن، وەبۆچی، وە کەی وە لە کوێ وتراوە، ئەو حەلە زۆر شتی ئەو ماوەیە دەرئەکەوێ لە بابەت کۆمەلایەتی و زانین و ئاین و سیاسەت و ئابووری و پیشەسازی و رەوشت و خووەوە، وە ئەو پەندە وەك ئاوێنەیەکی بالانما، چۆنیەتی ئەو سەردەمەمان بۆ روون ئەکاتەوە، بەلام داخەکەم هێشتا کوردی قوڕبەسەر، ئەوەندە ماوەی نەبووە کە بحەسێتەوە، وە بیر لە شتی وا بکاتەوە.

جاران پەندی پێشینان بە سەر دەمی هەموو کەسێکەوە بوو، لە خوێندەوار و نەخوێندەوار و پیاو و ژن و گەورە و بچوك، بەلام داخەکەم ئەمە چەند ساڵێکە پشت گوێ خراوە و لە بیر براوەتەوە، وە بەرەبەرە خەریکە لە ئاسۆی کوردەواریی ئاوا ئەبێ، وە ئەچنەوە پەردەی نەبوون.

زۆرتر ئێستا لە ناو ژنانی نەخوێندەوارا بەکار دێنرێ، ئەتوانم بڵێم زۆر ئافرەتی وامان هەیە هەرچی قسە و گفتوگۆی هەیە هەمووی هەر بە پەندی پێشینانە، بەلام داخی بە جەرگم لەبەر ئەوەی کەسمان نییە کە ئەمانە کۆ بکەنەوە، هەروا ئەم ئافرەتانە بەرودوا ئەمرن، وە لەگەڵ خۆیانا ئەو هەموو پەندانە ئەبەنە ژێر گڵ.

ئنجا ئەگەر هەروا بڕوا، لە پاش چەند ساڵێکی تر، ئەم کەلەپوورە وێژەیی یە بە نرخەمان ئەچێتەوە باوەشی پێشینان، وە بە دەستی خۆمان زیندە بە چاڵیان ئەکەین، وە ئەگەر کۆشیان بکەینەوە، ئەوا نامەخانەیەکی گەورە پێکەوە ئەنێین، وە دائیرەی زانیاری (معارف) یەکی سەدەها ساڵ ئەخەینە سەر یەك.

جا لەبەر ئەوە هاتم دەستم کرد بە کۆ کردنەوەیان، وە زۆریانم لە گۆڕ هێنایە دەرەوە و زیندوم کردنەوە، وە هەموویانم بە پێی پیتی یەکەم و دووەم، تا بیستەم و سێیەم ریز کردن، وە مەبەستم لێدانەوە، وە شوێنی بە کارهێنانیانم نووسی، لەگەڵ چیرۆکی هێندێکیانا کە ئەم زانی، سا بەلکو رۆژێکیش بێ، مێژووی هەموو پەندێکیان بە تایبەتی بنووسین، بە یارمەتی برادەران و مامۆستایانەوە.

ئێستاش ئەی خوێندەوارانی کورد، ئەوەندەی ئێمە پەندی پێشینانمان کۆ کردۆتەوە، دە ئەوەندەی تری ماوە لە دێهات و لادێ و شارە کوردەکان و ناوچە کوردەوارییەکانا، بێ گومانم باپیران و داپیرانمان چاوەڕوانی ئەوەمان لێ ئەکەن کە ئەم کەلەپوورە بە نرخە کۆ بکەینەوە وە لە چەپاڵەی رۆژگار بیان پارێزیین. لە پاشا هەر یەکێك لەم پەندانە مێژوویەکی تایبەتی و سەرگوزشتەیەکی خۆی هەیە کە ئەبێ بدۆزرێنەوە و بنووسرێن، سا خوا یارمەتیمان بدات بۆ خزمەتی گەل و نیشتمان.

سلێمانی٩/٩/١٩٥٧

محەمەدی خاڵ

# سەرەتای چاپی دووهەم

لە ساڵی ١٩٥٧دا (١٣٠٨) پەندم کۆ کردەوە، وە بە ڕیزکراوی و ڕاڤە (شـرح) کـراوی لـە چاپم دان، وە لەماوەیەکی کەما بڵاو بووەوە.

ئنجا لـە هـەموو لایەکـەوە دەسـت کـرا بـە داوا کردنـی، ناچـار کەوتمـە بـیری لـە چاپدانەوەی، بەڵام بە ڕاستی ڕووم نـەهات هـەر وەك خـۆی لـە چاپی بدەمـەوە، چونکە جیهـان بـە شـەو و ڕۆژ و سـاڵ و مانگییـەوە، وە بـە ئەسـتێرە و زەوییـەوە، وە بـە دار و درەخت و ئادەمی و گیان لەبەرانییەوە هەموو لـە جوڵانـو گۆڕانـان، لەبـەر ئـەوە منـیش دەستم کرد بە کۆکردنەوەی پەندی تر، وە لە ماوەیەکی زۆر کەما دوو ئەوەندەی پەنـدە کۆنەکان، پەندی ترم کۆ کردەوە.

لـە پاشـا بیسـتم کـە مـەلا محەمـەدی حـاجی مـەلا کـەریمی بیـارە، زۆر پەنـدی کـۆ کردۆتـەوە کە لـە لای مـن نییـە، منـیش داوام لێکـرد کـە ئـەو پەندانـەم نیشان بـدا، تـا تەماشایەکیان بکەم، وە چیم لـە لا نـەبێ وەریـان بگـرم، خـوا حەقـە ئـەویش پیاوانـە و مەردانە، دەفتەرەکانی خۆی بۆ هێنام، بەڵێ زۆری تیا بوو، بـەڵام دووسـەد پەنـدێکم لـێ هەڵبـژارد وە لەگـەڵ پەنـدەکانی لای خۆمـا، بـە کـۆن و تـازەوە تێکـەڵم کـردن، وە بـە ڕیزکراوەیی و ڕاڤە کراوەیی، لەجاران جوانتر و ڕەوانتر لـە چاپم دانـەوە، وە پێشکەشـی خوێندەوارانی بەڕێزم کردن.

زۆر سوپاس بۆ مەلا محەمەد کە ئەم پەندانەی بە نووسراوەیی و پوختە کراوەیی بۆ هێنام، ئەگەر هەموو خوێندەوارێك نەخوازەڵا مامۆستای دێهاتەکان — ئەمەندە هەوڵیان بدایـە، وە لەگـەڵ پەنـدێکیان بیسـت، خێـرا بیـان نووسـیایەتەوە، ئێسـتا خـاوەنی کەلەپوورێکی ویژەیی زۆر گەورەی وا ئەبوون کە شانازیمان پێوە بکردایە، ئێستاش ئـەی مامۆستاینە، نەچووە بچێ، لەمەولا واتان پیا ڕانەپەرمووین کـە هـەر پەنـدێکتان بیست خێـرا بینووسنەوە بـە خـۆی و چیرۆکەکەیەوە، وە بۆمـانی بنێـرن بـۆ چـاپی سـێهەم. ماوەتەوە قسەیەکی زۆر گرنگ، کە پێویست بە درکاندنە ئەویش ئەمەیە کە لەم هەموو پەندانەدا، دە، پانزە، بیست پەندێکی تیایە کە بێپەردە و کاڵا بێ، هێندێ جار ئەهاتمـە سەر ئەوەی کە نـەیان نووسـم، وە بیانکەم بـە ژێـر لێوەوە، بـەڵام کە تەماشـام ئـەکرد، ئەمانە کەلەپورێکی ویژەیی پێشینانن، کـە بـۆ ئێمـەیان بەجێهێشتووە بـە یادگـار، ئنجا ئەگەر نەیان نووسین، لەوانەن کە جارێکی تـر بـە بیردا نەیـەن، یا چاپ نـەکرێن، ئـەو حەلـە لـەناو بچـن، کـە ئەمـەش بـە دریـغ و کۆتاییـەکی ویـژەیی ئـەزانم، لەبـەر ئـەوە نووسیمن، وە داوای لێبووردن ئەکەم، ئیتر لەسەر خوا.

سلێمانی ١٩٦٩/٦/٢ محەمەد خاڵ

## (پیتی ئەلف)

١)- ئاخ زۆرە ! پەی زاتیٚ[1]

٢)- ئاخری پیری، جۆ بەتیری[2]

٣)- ئاخری عومر و هەوەڵی ترۆیی[3]

٤)- ئاخورِ خوار، گا هار[4]

٥)- ئاخورِی بەرزە[5]

٦)- ئاخورِی خۆی لیٚ گۆڕاوە[6]

٧)- ئاخورِی چەورە[7]

٨)- ئادار نارِوا بە بیٚ دۆ، نیسان نارِوا بە بیٚ جۆ[8]

---

[1] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی هەورامی بەهێز، بە ڕێگایەکا ئەڕوا، جەردەیەك دووی ئەکەویٚ، بۆ ئەوەی کە لە هەڵێکا رووتی کا، تا کابرای هەورامی ئەگاتە قورِ و ئاوێك، وڵاخەکەی بە بارەوە لەقورِەکە ئەچەقیٚ، ئەمیش ئەچێتە ژێر سکی کەرەکە، وە بە خۆی و باریەوە هەڵی ئەگریٚ و ئەیباتە وشکانی، جەردەکە کە ئەمە ئەبینیٚ پەشیمان ئەبێتەوە لە رووت کردنەوەی، بەڵام کابراکە وڵاخەکەی دائەنیٚ، ئەڵیٚ: (ئاخ زۆرە پەی زاتیٚ)، واتە خۆزگە ئەم هێزە، زاتێکی لەگەڵا ئەبوو، کە جەردەکە گوێی لەمە ئەبیٚ، تیٚ ئەگا کە کابرا ترسنۆکە، ئیتر ئەچێتە سەری رووتی ئەکاتەوە.

[2] تیری: نانێکی تەنکە کە بە تیرۆك بکرێتەوە، لەبەر ئەوەی کە ئاردی جۆ بیٚ پێزە، نانی تیری لیٚ ناکرێتەوە، مەگەر بە ڕەنج و کۆششێکی زۆر، کە ئەوە هەر لەتوانای جوانایە، نەك پیری بیٚتاقەت. بە پیرێك ئەوتریٚ کە بە کارێکی قورسەوە خەریك بیٚ.

[3] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە دوای پیری دەست بکا بە بەدکرداری.

[4] بە کارێکی چەواشە ئەوتریٚ کە هیچی بە سەر هیچەوە نەبیٚ.

[5] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە تریِ زل و لووتی بەرز بیٚ.

[6] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە لەخۆی گۆڕابیٚ.

[7] بە یەکێك ئەوتریٚ کە ساماندار و سایە چەور بیٚ.

[8] واتە لە کوردستان، لەیەکەم مانگی بەهارا لەوەڕ پیٚ ئەگا و ئاژەڵ پاك ئەبێتەوە، هەر وەك لە نیسانا جۆ دروێنە ئەکریٚ و نوخشە دەرئەچیٚ.

٩)- ئاداره، مەشكە لەداره[٩]

١٠)- ئارد بێژان و گیان كێشان[١٠]

١١)- ئارد چووه هەمانیێ، مێرده ئەڵێ هانیێ، ژنه ئەڵێ كوانیێ[١١]

١٢)- ئاردی بن درك، گرد نابێتەوه[١٢]

١٣)- ئاردی بێژراوه، سۆسشی ڕێژراوه[١٣]

١٤)- ئاردی بێژراوه، كەپەكی ماوه[١٤]

١٥)- ئاردی جەواڵم خواردووه و هەمانەم ماوه[١٥]

١٦)- ئاردی ڕۆیوه و سۆسی ماوه[١٦]

---

[٩] واته له كوردستان، لەیەكەم مانگی بەهارا لەوەڕ پێ ئەگا و ئاژەڵ پـاك ئەبێتـەوه، هـەر وەك له نیسانا جۆ دروێنه ئەكرێ و نوخشه دەرئەچێ.

[١٠] ئەگێڕنەوه كه ژنێكی مێردار، دۆستێكی ئەبێ، هەموو ڕۆژێـك كـه مێردەكـەی ئەچـێته سەر ئیش، ئەو لەگـەڵ دۆسـتەكەیا دەسـت ئـەكا بـه كـەیف كـردن، تـا نزیـك هاتنـەوەی مێردەكەی، ئەو حەله ئنجا پەلەپەل دەست ئەكا به نان كردن، مێردەكەی كه به برسێتی و ماندوویەتی دێتەوه، ئەبێت زۆر چاوەڕوان بكا، تا دوو نانی بۆ ئەبرژێنێ، هەر چـەند بـه ژنەكەی ئەڵێ: (تۆ بۆچی ئەم نانه زوو پێ ناگەیەنی؟) ئەڵێ پیاوەكه (ئارد بێـژان و گیـان كێشان) ڕۆژێك كابرا وەڕەس ئەبێ ئەڵێ: وا نییه، ئارد زوو ئەبێژرێتەوه، ئـەو ئـاردەم بـۆ بێنه، من زوو بۆت ببێژمەوه) ژنەش ئەچێ ئاردەكەی بۆ ئـەهێنێ، وه فێڵێكـی لـێ ئـەكا، بەم ڕەنگه هێڵەكەكـەی بـۆ لـه ئـاو هەڵئەكێشـێ، لـه پـاش چۆڕانەوەی ئەیداتـه دەسـت مێردەكەی، كه ئاردەكەی تێ ئەكا، لەبەر تەڕی هێڵەكەكه ئاردەكه ئەخوسێتەوه و كونی هێڵەكەكه ئەگرێ. وه هەر چەند ئەكا ئاردەكه داناڕا، ئنجا ژنەكه پێی ئـەڵێ: پـێم نـەوتی (ئاردبێژان و گیان كێشان) ئێستا ئەم پەنده له ڕووی تەوسەوه بـه یـەكێكی ئـەڵێیت كـه ئیشێكت بۆ بكات وه به فێڵ دوای خا و درەنگ بیداته دەستت.

[١١] به یەكێك ئەوترێ، هەر چییەكی بۆ بكەیت دیار نەبێ.

[١٢] به ماڵێك ئەوترێ، كه پڕا بێ به جۆرێك كۆ نەكرێتەوه.

[١٣] به كارێك ئەوترێ، كه پوخته و ئامادە كرابێ.

[١٤] واته باشی ڕۆیوه و خراپی ماوه.

[١٥] یەكێك ئەیڵێ كه بەشی زۆری تەمەنی به سەر بردبێ و بەشی كەمی مابێ.

[١٦] بەشتێك ئەوترێ، كه كەڵكی نەمابێ.

**١٧)- ئاردی ورد، لە ماڵی خاوەنی دێتە دەرێ[١٧]**

**١٨)- ئاروو بە بڕکەوە جوانە[١٨]**

**١٩)- ئازا جارێك ئەمرێ، ترسنۆك رۆژی سەد جار ئەمرێ[١٩]**

**٢٠)- ئاسکی ماندوو ئەگرێ[٢٠]**

**٢١)- ئاسکی نەگیراو ئەبەخشێ[٢١]**

**٢٢)- ئاسکی نەگیراو زۆرە[٢٢]**

**٢٣)- ئاسمان دوور و زەویی سەخت[٢٣]**

**٢٤)- ئاسمان سەرە خەرێتی و زەویی ژێرەخەر[٢٤]**

**٢٥)- ئاسمان ستوونی ئەوێ[٢٥]**

**٢٦)- ئاسمان لە بەر چاوم تاریك بوو[٢٦]**

**٢٧)- ئاسمان لێفە بێت، دایناپۆشێت[٢٧]**

**٢٨)- ئاسمان و ڕێسمانە[٢٨]**

**٢٩)- ئاسنی سارد ئەکوتێ[٢٩]**

---

[١٧] هەژارێك ئەیڵێ، کە داوای شتێکی لێ بکەن کە لەماڵیا نەبێ، واتە شتی وا لە ماڵی مـن چی ئەکات؟ ئەوە هەر لە ماڵی خاوەنی خۆی دێتە دەرێ.

[١٨] ئاروو خەیارە، واتە مەردوم بە کەس و کار و خزم و خوێشیەوە جوان و بە نرخە.

[١٩] واتە هەموو ترسێك مردنێکە.

[٢٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە بچێ بە گژ یەکێکی زەبوونا.

[٢١] بە یەکێك ئەوترێ، شتێك ببەخشێ کە هی خۆی نەبێ.

[٢٢] واتە شتێك نرخی هەیە کە لە ژێر دەستا بێ.

[٢٣] یەکێك ئەڵێ: کە لە تەنگانەیەکا بێ، وە دەستی بە کەسا ناگا.

[٢٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر هەژار و رەجاڵ بێ.

[٢٥] بە قسەیەکی درۆی زۆر زل ئەوترێ.

[٢٦] یەکێك ئەڵێ: کە لەشتێك زۆر تووڕە، یا بە شتێك زۆر خەمبار ببێ.

[٢٧] بە یەکێك ئەوترێ کە دەنگی زڕابێت و نەنگ و بەدناوی دەرکەوتبێ.

[٢٨] بە دوو شتی وا ئەوترێ، کە زۆر لە یەکەوە دوور بن.

[٢٩] بە یەکێك ئەوترێ کە بە ئیشێکەوە خەریك بێ کە دەرەقەتی نەیەت.

٣٠)- ئاسنی سارد بە فوو گەرم نابێ[30]

٣١)- ئاسنی سارد مەکوتە[31]

٣٢)- ئاسوودە خۆم، گەرم نییە، لە کا و جۆ خەبەرم نییە[32]

٣٣)- ئاسیاو گرمەی دێ و ئاردی دیار نییە[33]

٣٤)- ئاسیاو کە گرا، یادانی دە، یا ئاوی ببڕە[34]

٣٥)- ئاسیاوی فەرەهاڕ، وردیش ئەهاڕێی و درشتیش[35]

٣٦)- ئاش ئاو بردوو، ئاشەوان لە چەقچەقە ئەگەڕێ[36]

٣٧)- ئاش ئەگەڕێ و چەقەنە سەری خۆی ئەشکێنێ[37]

٣٨)- ئاش بە چەقەنە و مەسۆیی بە چەنە[38]

٣٩)- ئاش بمیزێ، لە حیزی ئاشەوانە[39]

---

[30] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ئیشێکی گەورەوە خەریك بێ، بێ ئەوەی یارمەتی دەرێکی ببێ.

[31] تەماشای دوو پەند پێش ئەم پەندە بکە.

[32] یەکێك ئەڵێ: کە کەسێکی وای نەبێ داوای شتی لێ بکا.

[33] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەمیشە خەریکی ئیشکردن بێ، کەچی هیچیشی دیار نەبێ.

[34] بە یەکێك ئەوترێ کەلام سەرلایی، کارێك بگرێتە دەست واتە کارەکەت یا پیاوانە بکە یا دەستی لێ هەڵگرە.

[35] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر ئیش و کار زۆری، ئیشەکەی ناپوخت بێ.

[36] بە یەکێك ئەوترێ، زەرەرێکی قورسی کردبێ، دوای ئەوە بە شوێن شتێکی بێ نرخا بگەڕێ بۆ پڕ کردنەوەی ئەو زیانە.

[37] بەیەکێك ئەوترێ، کە زۆر قسە بکا لە ئیش و کاری یەکێك، وە ئەو یەکەش هەر خەریکی ئیشی خۆی بێ.

[38] مەسۆ: ناوی دێیەکە لە ناوچەی قەرەداخ، دانیشتۆکانی زۆر چەنەبازن، واتە کاری ئاش بەچەقەنە و کاری مەسۆیی بە چەنەدان جێ بەجێ ئەبێ، بە یەکێك ئەوترێ کە بە هێزی چەنە کاری خۆی بباتە سەر.

[39] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەست و پێوەندی بە قسەی نەکەن، لەبەر بوودەڵەیی و بێ دەسەڵاتی.

٤٠)- ئاش گرمەی دێ و ئاردی دیار نییە[٤٠]

٤١)- ئاش لە خەیاڵێ، ئاشەوان لە خەیاڵێ[٤١]

٤٢)- ئاش و تەنوور بە نۆرە[٤٢]

٤٣)- ئاشێ لە میزتن بێ، هەر ئەمیزێ[٤٣]

٤٤)- ئاشە تەنوورە، بە نۆرە[٤٤]

٤٥)- ئاشەوان لە خەیاڵێك، باراش هاڕ لە خەیاڵێك[٤٥]

٤٦)- ئاشەوان، چ دۆست، چ دوژمن[٤٦]

٤٧)- ئاشتی بە ئاشتی و ، چێشتی بە چێشتی[٤٧]

٤٨)- ئاشتی دوای دەعوا خۆشتر لە حەلْوا[٤٨]

٤٩)- ئاشتی كتك و مشك، پرسەی بەقاڵە[٤٩]

---

[٤٠] بە یەكێك ئەوترێ، كە هەمیشە لە رەنجا بێ و هیچی دیار نەبێ.

[٤١] بە یەكێكی ئەڵێیت: كە تۆ لە خەیاڵێك و ئەو لە خەیاڵێكی تردا بێ، وە ئەو وابزانێ كە تۆ لە خەیاڵەكەی ئەوایت.

[٤٢] واتە هەموو شت ئەبێ بە نۆرە بێ.

[٤٣] بە كارێك ئەوترێ، كە چەند جارێك پەكی كەوتبێ و دەستی پێكرابێتەوە.

[٤٤] واتە هەموو شت ئەبێ بە نۆرە بێ.

[٤٥] ئەم پەندە بە مەعنا چوار پەند لەمەپێشە.

[٤٦] واتە من كە باراش داریم، باراشی خۆم ئەهارِم، دەخڵم نییە بە سەر ئەوەوە ئاشەوانەكە دۆستە یا دوژمنە، بە یەكێك ئەوترێ، كە بە پارە ئیش بكات واتە ئیشی خۆت بكە، دەخڵت بە سەر شتی ترەوە نەبێ.

[٤٧] یەكێك بە ئاشنایەكی خۆی ئەڵێ، واتە ئەگەر تۆ بە وشكی بێیت بۆ لای من، منیش بە وشكی دێم بۆ لات، وە ئەگەر بە چەوری بێیت، واتە ناو بە ناو زیافەت بكەیت زیافەتت بۆ ئەكەم.

[٤٨] چونكە هەر دووكیان پەشیمانن.

[٤٩] چونكە كە ئەم دوانە یەك كەوتن، هیچ لە دوكانی بەقاڵەكەدا نامێڵن ئەم پەندە یەكێك بە كاری ئەهێنێ كە دوو دوژمنی یەكیان گرتبێ.

٥٠)- ئاشتی کتك و مشكه[٥٠]

٥١)- ئاشی ئاو، به ئاو ئەگەڕێ[٥١]

٥٢)- ئاشی فرەهار، وردیش ئەهاڕێ و زبریش ئەهاڕێ[٥٢]

٥٣)- ئاشی کەم گەڕ هەیە، بەڵام هیچ نەگەڕ نییە[٥٣]

٥٤)- ئاشی کەم گەڕم دیوە، بەڵام هیچ نەگەڕم نەدیوە[٥٤]

٥٥)- ئاشی نەزان خوا ئەیگێڕێ[٥٥]

٥٦)- ئاگای لە خشەی مارو مێرووە[٥٦]

٥٧)- ئاگای لە مام شەهاب نییە[٥٧]

٥٨)- ئاگای لە مەحمودی بێ زەواد نییە[٥٨]

٥٩)- ئاگر ئەکاتەوە[٥٩]

٦٠)- ئاگر کەوتەوە، ئاگر بڕ ئەکرێ[٦٠]

٦١)- ئاگر لە سەر پشتی بکەرەوە[٦١]

٦٢)- ئاگر لە چاوی ئەبارێ[٦٢]

---

[٥٠] بە دوو کەس ئەوترێ، کە یەکێکیان زۆردار و ئەویتریان زەبوون بێ، وە زۆردارەکە بیەوێ بە ناوی دۆستایەتییەوە ماڵی زەبوونەکە بخوا.

[٥١] واتە هەر شتە شتێکی ئەوێ.

[٥٢] واتە ئیش کە زۆر بوو، باشیش ئەبێ و خراپیش ئەبێ.

[٥٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچی لە دەست نەیەت.

[٥٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچی لە دەست نەیەت.

[٥٥] بە یەکێکی گێلۆکە ئەوترێ کە لە کاری خۆیا هەمیشە سەرکەوتوو بێ.

[٥٦] بە خوا ئەوترێ.

[٥٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە شتێك بێ ئاگا بێ.

[٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە شتێك بێ ئاگا بێ.

[٥٩] واتە زۆر تووڕەیە.

[٦٠] ئەگینا تەڕ و وشك پێکەوە ئەسوتێ.

[٦١] بە یەکێکی حیزی بێ نرخ ئەوترێ، کە هیچی لە دەست نەیەت.

[٦٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئەوەندە تووڕە بووبێ، چاوی سوور هەڵگەڕابێ.

٦٣)- ئاگر له چاوی ئەبێتەوە[٦٣]

٦٤)- ئاگر له کای کۆن بەر نەبێ[٦٤]

٦٥)- ئاگر نەچێتە کای کۆن[٦٥]

٦٦)- ئاگرە سووریٚ، لەخۆم دووریٚ[٦٦]

٦٧)- ئاگری بەری، دای لەسەری[٦٧]

٦٨)- ئاگری پێوەنێیت، بۆسۆی لیٚ هەڵناستیٚ[٦٨]

٦٩)- ئاغا دەست مەشۆ، نە بۆ منە و نە بۆ تۆ[٦٩]

٧٠)- ئاغا ژنی سەرچەپەریٚ، پشیلەکە هات دووگەکە بەریٚ، بێزی نەهات ختەکەریٚ[٧٠]

٧١)- ئاغا ڕۆ، خوا شوکر[٧١]

٧٢)- ئاغا چوو بۆ سەروپیٚ نەبوو، خزمەتکاری نارد بۆ دەس و پاڵوو[٧٢]

---

[٦٣] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە ئەوەندە تووڕە بووبیٚ، چاوی سوور هەڵگەڕابیٚ.

[٦٤] بە کۆنە عاشقێك یا خەفەتبارێك ئەوتریٚ، کە عەشقەکەی یا خەفەتەکەی تازە بووبێتەوە.

[٦٥] بە کۆنە عاشقێك یا خەفەتبارێك ئەوتریٚ، کە عەشقەکەی یا خەفەتەکەی تازە بووبێتەوە.

[٦٦] یەکێك ئەیڵیٚ، کە ئاژاوەیەك قەومابیٚ و خۆی تیا نەبیٚ.

[٦٧] بە یەکێکی حەشەریی ئەوتریٚ، کە ئارەزووی جوتگرتن سەری لیٚ تێك دابیٚ، وە کاری ناشیرینی پیٚ کردبیٚ.

[٦٨] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە زۆر ڕووت و قووت بیٚ.

[٦٩] بە یەکێك ئەوتریٚ کە بە تەمای شتێك بیٚ کە بۆ ئەو نەبیٚ.

[٧٠] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە لەبەر دەعیە و دەمار زەرەر لە خۆی دوور نەخاتەوە.

[٧١] بە یەکێك ئەوتریٚ کە مردوویەکی وای مردبیٚ پێی خۆشبیٚ، بە دیمەنیش شیوەنی بۆ بکا.

[٧٢] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە خۆی چووبیٚ بۆ کارێکی سوك پێی نەکرابیٚ، کەچی دوای ئەوە خزمەتکارەکەی بنێریٚ بۆ کارێکی گەورەتر.

٧٣)- ئاغا و خزمەتكار لێك راست بوونەوە قوربانی و قوربان لە بیر چوونەوە[٧٣]

٧٤)- ئاغاژنی بەرچەپەرێ، باوەشێن كلكی كەرێ[٧٤]

٧٥)- ئافتاوە و لوولێنە، كاری یەك ئەكەن، بارمتە نانیان حسابە[٧٥]

٧٦)- ئافرەتی تافتەخوار، پیاوی گوێ بە گوار، ساڵی دوو بەهار، پەسەند نییە[٧٦]

٧٧)- ئاڵتوون لە قوڕا دیارە[٧٧]

٧٨)- ئاڵتوون ناوی زەڕەكەریش بۆی ئەزەڕێ[٧٨]

٧٩)- ئاڵیاوا لە قنگییەوە دیارە[٧٩]

٨٠)- ئانە گورز و ئانە مەیدان[٨٠]

٨١)- ئاو ئەكاتە بێژنگ[٨١]

---

[٧٣] بە بچووكێك ئەوترێ كە سیوایی لە گەورەكەی بووبێتەوە.

[٧٤] بە یەكێكی بووەی لێكەوتوو ئەوترێ كە تڕ و زڕی جارانی مابێ.

[٧٥] ئافتاوە: مەسینەیەكی دەسكداری لوولەدارە لە مس. لوولێنە: گۆزەڵەیەكی بچكۆلانەی لوولەداری دەسكدارە وەك مەسینە، ئەوی بە مەسینە بكرێ، بە لوولێنەش ئەكرێ، بەلام ئافتاوە نرخێكی هەیە، بە ڕەنگێك كە لە بارمتەی شتێكا دابنرێ، بەلام لوولێنە ئەو نرخەی نییە، بە دوو كەس ئەوترێ كە هەر دوكیان لە شتێكا وەك یەك وابن بەلام یەكێكیان لەویتریان بە نرختر بێ لە ناو كۆمەڵدا بە ڕەنگێك كە قسە و گفتوگۆی زۆرتر بایەخی پێ ببێ.

[٧٦] بە شتێك ئەوترێ، كە لە باوی ناو كۆمەڵە بەدەر بێ.

[٧٧] بە ژنی جوانی هەژار ئەوترێ، واتە هەزار جار ڕەش و رووت بێ، جوانییەكەی هەر دیارە.

[٧٨] واتە كەر بۆیە ئەزەڕێ، چونكە زەڕەكەی لە وتەی (زەڕ) ئەچێ كە ناوی ئاڵتوونە.

[٧٩] بە یەكێك ئەوترێ، كە زۆر ڕەش و رووت و شەڕو وڕ بێ.

[٨٠] بە یەكێك ئەوترێ، كە خۆی هەڵكێشێ، وە بڵێ من بوومایە وام ئەكرد و وام ئەكرد، واتە ئەگەر راست ئەكەیت فەرموو ئەوە گورز و ئەوە مەیدان.

[٨١] بە یەكێك ئەوترێ، كە ڕەنجێكی بێهوودە بدا.

٨٢)- ئاو ئەکاتە سەبەتە[٨٢]

٨٣)- ئاو ببرێ لە رۆخانە، خۆ نابێ بە بێگانە[٨٣]

٨٤)- ئاو بە ئاوەدانی دا ئەچێ[٨٤]

٨٥)- ئاو بە دەستی خۆت نەخۆیەوە تامی نییە[٨٥]

٨٦)- ئاو بە دووی بێلەوە ئەڕوا[٨٦]

٨٧)- ئاو بە شوێنی لێژەوە ناوەستێ[٨٧]

٨٨)- ئاو بتبات، لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە[٨٨]

٨٩)- ئاو بێنە دەست بشۆ[٨٩]

٩٠)- ئاو دەزانێ پەنیری مەلا کێ خواردوویەتی[٩٠]

٩١)- ئاو کرا بە ئاگرا[٩١]

٩٢)- ئاو لە بێژنگا ئەهێنێ[٩٢]

---

[٨٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە رەنجێکی بێهوودە بدا.

[٨٣] رۆخانە: چەمی گەورەیە، واتە وشك بوونی ئەو جۆرە چەمانە کە هەرگیز نەبووە و نابێ ئەگونجێ بەڵام بوونی خۆ بە بێگانە هەرگیز ناگونجێ.

[٨٤] واتە تێر ئارەزووی ئاو خواردنەوە ئەکات نەك برسی.

[٨٥] واتە ئیشی خۆت، خۆت نەیکەیت، بێگانە وات بۆ ناکات بە کار بێ.

[٨٦] بە یەکێك ئەوترێ ، کە دەستی بڕوا، وە هەموو ئیشێکی بۆ بچێتە سەر.

[٨٧] واتە مەردومی دەست بڵاو پارەی بە دەستەوە نامێنێ.

[٨٨] چونکە کە ئاو بردتی، یەك جار ئەمریت، بەڵام کە لە پردی نامەرد پەڕیتەوە، تا ئەو ڕۆژەی ئەمریت هەموو ساتێکت مردنێکە.

[٨٩] بە شتێك ئەوترێ، کە هیچی نەمابێ.

[٩٠] ئەگێڕنەوە کە مەلای دێیەك لە دێهاتی کۆیە چەند سەلکێك پەنیری ئەبێ، یەکێك لێی ئەدزێ و ئەیخوا، ئێواری ئەهلی دێیەکە لە مزگەوت کۆ ئەبنەوە، یەکێکیان زۆر ئاو ئەخواتەوە ، لە پاشا لە مەلا ئەپرسن: ئایا نەتزانی کێ پەنیرەکەی خواردیت؟ ئەویش ئەڵێ: ئاو دەزانێ پەنیری مەلا کێ خواردویەتی.

[٩١] واتە ئاژاوەکە کوژایەوە.

[٩٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە رەنجی بێهودە بدا.

٩٣)- ئاو له بێژنگا ناوەستێ[٩٣]

٩٤)- ئاو له دەستی ناتکێ[٩٤]

٩٥)- ئاو له دنگا ئەکوتێ[٩٥]

٩٦)- ئاو له سەرچاوەوە لێڵە[٩٦]

٩٧)- ئاو لەسەر زوڵفی ئەتکێ[٩٧]

٩٨)- ئاو لەسەر من، که تێپەڕیی، چه یەك گەز چ سەد گەز[٩٨]

٩٩)- ئاو و ئاگر ئەمانیان نییه[٩٩]

١٠٠)- ئاو و ئاوەدانییان وتووه[١٠٠]

١٠١)- ئاوێ به جۆگەیەکا ڕۆی، ئەبێ هەر بڕوا[١٠١]

١٠٢)- ئاوێ به شوێنێکا ڕۆی ئەبێ هەر بڕوا[١٠٢]

١٠٣)- ئاوێ بڕوا بۆ ڕۆخانه، خوێش بیخوا نەك بێگانه[١٠٣]

١٠٤)- ئاوایی پڕه و مەتی کڕه[١٠٤]

---

[٩٣] به یەکێکی دەم شڕ ئەوترێ، که قسه له دەمیا نەوێستێ.

[٩٤] واته زۆر پیسکەیە.

[٩٥] به یەکێك ئەوترێ، که به تەمای شتێك بێ و هەوڵی بۆ بدا و دەستی نەکەوێ.

[٩٦] به شتێك ئەوترێ، که هەر له سەرەتاوه باش نەبێ.

[٩٧] واته زۆر گەنج و جوانه.

[٩٨] واته من که خنکام چ له ئاوێکی تەنکا بێ، چ له دەریایەکی قووڵابێ.

[٩٩] واته لێیان بترسه.

[١٠٠] واته له هەر کوێیەك ئاو بوو ئاوەدانی ئەبێ.

[١٠١] واته باوی کۆن زۆر درەنگ ئەگۆڕێ.

[١٠٢] واته باوی ئەبێ هەر وەك خۆی بمێنێتەوه.

[١٠٣] واته هەر چی خۆشی و قازانج هەیە هەمووی بۆ خزم و خوێش و گەل و هاوزبان بێ، تا ئەگاته ئاوی چەم و ڕووباریش.

[١٠٤] به یەکێك ئەوترێ، که دەنگێکی ناشرینی لێ دەرچووبێ هەموو ئاوایی بیستبێتی کەچی به مەردوم بڵێ: ئەم قسەیە با هەر لای خۆت بێ، وه کەس نەزانێ.

١٠٥)- ئاوت شیرین، نانت گەنمین، ژنت هەر بووك بێ[١٠٥]

١٠٦)- ئاوەدان بێ "حەریر"ە هەر گوندێك و نۆ میرە[١٠٦]

١٠٧)- ئاوەدان بێ مەراغە، خوڵامی لێ بوونە ئاغا[١٠٧]

١٠٨)- ئاوەڵی قەل دەندووکی بە گووە[١٠٨]

١٠٩)- ئاوی ئاموون و توونی باباچێ[١٠٩]

١١٠)- ئاوی بێلغاو ئەخواتەوە[١١٠]

١١١)- ئاوی رژاو گرد نابێتەوە[١١١]

١١٢)- ئاوی زۆردار سەربەرەو ژوور ئەڕوا[١١٢]

١١٣)- ئاوی سەر بەڕوو، نانی بێ کەڕوو، کووزەڵەی بێ زەروو، خۆشە[١١٣]

---

[١٠٥] چونکە ژیانی جیهان لای پیاوی دنیا هەر خواردن و خواردنەوەی پاك و تەمیز و ژنی جوانی رێك و پێکی شەنگ و شۆخە.

[١٠٦] حەریر: ناوی ناوچەیەکە لە کۆیە کە چەند دێیەك بە سەرەوە بووە، وە هەر دێیەك چەند ئاغا و میرێکی تیابووە، کە حەق وایە هەر دێیەك تاقە یەك میری تیا بێ، ئنجا ئەم پەندە بە تەوشەوە ئەوترێ بە شوێنێك کە لە جیاتی یەك گەورە، سێ چوارێکی تیا بێ، وە هەر یەکە لە لایەکەوە فەرمان بدا.

[١٠٧] مەراغە شارێکە لە تورکستانی ئێران، بە یەکێکی بچووکی نەدارا ئەوترێ کە کەوتبێتە حەسانەوەیەکی کاتییەوە، وە دەستی لە ئیش و کاری خۆی هەڵگرتبێ و پشتی سارد بووبێتەوە، واتە بە تەمەڵی دامەنیشەوە بچۆرەوە سەر ئیش و کاری جارانت.

[١٠٨] بە یەکێك ئەوترێ کە هاوڕێی مەردومی دەم پیس بێ، و ئەمیش وەك ئاوەڵی قەل دەمی خۆی پیس بکات.

[١٠٩] ئاو نییە لە جیهانا بە ناوی ئاوی ئاموون، ئەبێ ئەمە ئاوی ئامور بێ کە ناوی چەمێکە لە ناوەند روسیا و چینا، توونی بابا: ناوی دۆڵ و دەرەیەکی زۆر دووورودرێژ و بە پێچ و پلووچە لە رێی دەربەندیخان، هەر چی تێی کەوێ ون ئەبێ، ئەم پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە حەزت لە چارەی نەبێ، وە نەتەوەێ بیبینیت.

[١١٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشی سەربەخۆ بکات، وە لە کەس نەترسێ.

[١١١] بە شتێك ئەوترێ، کە لە دەست چووبێ.

[١١٢] چونکە زۆری لەگەڵایە.

[١١٣] واتە شتی باش لە شتی خراپ پەیدا نابێ.

۱۱٤)- ئاوی سوێر، تینوێتی ناشکێنێ[114]

۱۱٥)- ئاوی شیرین له گڵی سوێر دەرناچێ[115]

۱۱٦)- ئاوی چاوی سەنراوە[116]

۱۱۷)- ئاوی کردە ژێر[117]

۱۱۸)- ئاوی له کوڵ ئەڵێ: هەر چیم کرد خۆم بە خۆمم کرد[118]

۱۱۹)- ئاوی لێژان، گۆشتی گێژان (..)ی درێژان بە تامن[119]

۱۲۰)- ئاوی وا بە بێڵەوە[120]

۱۲۱)- ئاوی وا بە جۆگەوە[121]

۱۲۲)- ئاوێکی خراپ ڕێژراوە[122]

۱۲۳)- ئاوێنە ئەگرن بە دەمیەوە[123]

---

[114] بەڵکو توینوێتی ئەدا، بە هەموو شتێك ئەوترێ کە پێچەوانەی مەبەست کار بکا.

[115] واتە شتی باش لە شتی خراپ پەیدا نابێ.

[116] ئاوی چاوسەندن: کردەوەیەکی تایبەتییە بۆ کوێر کردنی یەکێك بێ ئەوەی چاوەکەی ناشرین ببێ. جاران لۆتی کە یارییان بە مەیمون و ورچ ئەکرد، ئاوی چاوی ورچەکانیان دەرئەهێنا، تا ڕانەکەن، وە پەلاماری کەس نەدەن. ناصرالدین شا، ئاوی چاوی "ڤل السلگان"ی کوڕی خۆی دەرهێنا، تا دوای مردنی خۆی نەچێ بە گژ (مظفرالدین شا)ی جێگەدار (وەلی عهد)یا، ئێستا بە یەکێك ئەوترێ کە لە کار خرابێ.

[117] واتە جێی پێ لەق کرد.

[118] واتە ئەگەر من وەختی خۆی ئاوی درەختم نەدایە، وە گەورەم نەکردایە، ئەمڕۆ بەو ئاگریان لە من بەر نەئەدا، وە منیان نەئەهێنایە کوڵ، بە یەکێك ئەوترێ کە تۆ زۆر خزمەتت کردبێ و پێت گەیاندبێ وە ئەمڕۆ بێ بە گژتا، وە دڵت بێنێتە کوڵ.

[119] واتە ئەگەر من وەختی خۆی ئاوی درەختم نەدایە، وە گەورەم نەکردایە، ئەمڕۆ بەو ئاگریان لە من بەر نەئەدا، وە منیان نەئەهێنایە کوڵ، بە یەکێك ئەوترێ کە تۆ زۆر خزمەتت کردبێ و پێت گەیاندبێ وە ئەمڕۆ بێ بە گژتا، وە دڵت بێنێتە کوڵ.

[120] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو ئیش و کارێکی بۆرایی ببێ.

[121] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو ئیش و کارێکی بۆرایی ببێ.

[122] کاتێك ئەوترێ، کە دەستوورێکی خراپ دانرابێ، وە شتێکی خراپ کرابێ بە باو.

[123] تا بزانن هەناسەی تیاماوە، بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر کەشەنگ بێ.

١٢٤)- ئاوێنه ئەگرنه رووی[١٢٤]

١٢٥)- ئۆخەی ئۆخەی له منێ، مێرده وتی چلمنێ، گا دەرکه له هەرزنێ[١٢٥]

١٢٦)- ئۆخەی ماڵی خۆم، حەزکەم ئەتخۆم حەزکەم ناتخۆم[١٢٦]

١٢٧)- ئەتەرو مەتەر، یەك له یەك بەتەر[١٢٧]

١٢٨)- ئەدا به لای مارا کلکی ئەقرتێنێ[١٢٨]

١٢٩)- ئەدا له ئاو، قولی تەڕ نابێ[١٢٩]

١٣٠)- ئەرتۆ مەنی، من دوو مەنم، بێجگه له گورزو کەمەندم[١٣٠]

١٣١)- ئەرز وەك چەرمی گا وایه[١٣١]

١٣٢)- ئەزانێ چەند موو، وا به قنگییەوه[١٣٢]

١٣٣)- ئەزانێ کەری خۆی، چەند مەن بار ئەبا[١٣٣]

١٣٤)- ئەزم، هەڵ ئەبەزم؟ [١٣٤]

١٣٥)- ئەسب به ڕاکردن، ئالیکی خۆی زیاد ئەکا[١٣٥]

١٣٦)- ئەستێره هەر چەند پرشنگ دار بێ به مانگ نابێ[١٣٦]

---

[١٢٤] تا بزانن هەناسەی تیاماوه، به یەکێك ئەوترێ که زۆر کەشەنگ بێ.

[١٢٥] به ژنێك ئەوترێ به تەوسەوه که مێردەکەی قسەیەکی خۆشی لەگەڵا بکات.

[١٢٦] یەکێك ئەیڵێ: که چاوی له ماڵی کەسەوه نەبێ، وه منەتی کەس هەڵنەگرێ.

[١٢٧] به دوو کەسی هیچ و پووچ ئەوترێ، که یەك له یەك بڵحترن.

[١٢٨] به یەکێ: ئەوترێ که زۆر بەتەماع بێ.

[١٢٩] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر فێڵباز و زۆرزان بێ.

[١٣٠] یەکێك به یەکێکی سووکی ئەڵێ، که سووکەکه گاڵتەی پێ بکا.

[١٣١] واته جێی له جێی چاکتره.

[١٣٢] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر شارەزای یەکێکی تر بێ، وه بزانێ چی له باریه.

[١٣٣] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر شارەزای یەکێکی تر بێ، وه بزانێ چی له باریه.

[١٣٤] به یەکێك ئەوترێ، که لەخۆی بایی بووبێ، واته به زبانی حاڵ وا ئەڵێ به خۆی.

[١٣٥] تەماشای پەندی نۆهەمی دوای ئەم پەنده بکه.

[١٣٦] به یەکێکی بەهرەمەند ئەوترێ، که بەهرەمەندێکی گەورەتر له ژوور ئەوەوه بێ.

١٣٧)- ئەسپ پێیەکی ڕەنجە، پێیەکی گەنجە[١٣٧]

١٣٨)- ئەسپ لە ژێر کورتان، کەر لە ژێر زین[١٣٨]

١٣٩)- ئەسپ و ئێستر، لەقە لەیەك نادەن[١٣٩]

١٤٠)- ئەسپ و زین، کەر و قەررازە[١٤٠]

١٤١)- ئەسپ و ماین ناڵ ئەکران، قرژاڵ و کیسەڵ قاچیان هەڵ ئەبڕی، ئەیان وت ئێمەش[١٤١]

١٤٢)- ئەسپێ ئەکوژن لە دەوری، لە باتی کولێرە چەوری[١٤٢]

١٤٣)- ئەسپێ لە باخەڵیا سەوزەڵە گیانم ئەڵێ[١٤٣]

١٤٤)- ئەسپی خەڵاتی، کەس تەماشای دەم و دانی ناکا[١٤٤]

١٤٥)- ئەسپی شێ، یا ئەفڕێ، یا ئەتڕێ[١٤٥]

١٤٦)- ئەسپی چاك ئاوزەنگی ناوێ[١٤٦]

١٤٧)- ئەسپی چاك خۆی ئالیك بۆ خۆی زیاد ئەکا[١٤٧]

---

[١٣٧] واتە ئەوەندەی تیا خەرج ئەکەیت، ئەوەندەش بەهرەی لێ ئەبینی.

[١٣٨] بە یەکێکی بەرز و یەکێکی پەست ئەوترێ، کە یەکەم پیشەیەکی پەست و دووهەم پیشەیەکی بەرزی درابێتێ، واتە ئەمە چۆن ئەبێ؟

[١٣٩] چونکە خزمی یەکن، بە دوو کەس ئەڵێن کە خزمایەتی نەفامن.

[١٤٠] بە دووکەس ئەوترێن کە هەر یەکێکیان، شایستەی شتێك بن.

[١٤١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لاسایی لە خۆی گەورەتر بکاتەوە.

[١٤٢] بە یەکێك ئەوترێ: کە زۆر لات بێ.

[١٤٣] سەوزەڵە گیانم: گۆرانییەکی تایبەتییە. بە یەکێك ئەوترێ کە دەمێك بێ، پارە لە باخەڵیا نەبێ.

[١٤٤] یەکێك ئەیڵێ کە شتێکی خۆڕایی دەست کەوتبێ.

[١٤٥] بە ئیشێك ئەوترێ، کە زۆر درەنگ بێتە بەر.

[١٤٦] چونکە بۆ خۆی ئەڕوا.

[١٤٧] بە مووچە خۆرێك ئەوترێ، کە پیشەیەکی پێ سپێررابێ، وە داوای زیاد کردنی بکا، واتە ئەگەر ئەتەوێ مووچەکەت زیاد بکرێ ئیشی باش بەکە. ئەو حەلە بە ناچاری بۆت زیاد ئەکرێ.

١٤٨)- ئەسپی چاك شوولێکی بەسە[١٤٨]

١٤٩)- ئەسپیان ناڵ ئەکرد، کەریش پێی هەڵبڕی وتی: منیش[١٤٩]

١٥٠)- ئەسپێك بە چل ساڵ تەعلیم بدرێ، بۆ مەیدانی قیامەت بە کار دێ[١٥٠]

١٥١)- ئەسپێکی لەڕ، لە تەویلەیەکی پڕ لە کەر، چاکترە[١٥١]

١٥٢)- ئەشومڕێ و ئەشتڕێ[١٥٢]

١٥٣)- ئەشی خورێ و ئەشی یەشێ[١٥٣]

١٥٤)- ئەچێ بە پێتا، دڕکە، ئێژێ: وەی، خاسە، پەرژینی باخی پێ ئەکەی[١٥٤]

١٥٥)- ئەچمە باوان تەکۆ دەرم، خەمی دنیا ئەکەوێتە بەرم[١٥٥]

١٥٦)- ئەچمە جێیەك گۆشت بگرم، نەك دەردێ بگرم پێی بمرم[١٥٦]

١٥٧)- ئەچمە شارێ کەس نەمناسێ، خۆم هەڵ ئەکێشم پڕ بە کراسێ[١٥٧]

١٥٨)- ئەچێتە شایی هۆمەرە کوێر، هەڵ ئەپەڕێ بە بێ بلوێر[١٥٨]

---

[١٤٨] تەماشای پەندی دووهەم لە پێش ئەم پەندەوە.

[١٤٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لاسایی لە خۆی گەورەتر بکاتەوە.

[١٥٠] بە ئیشێك ئەوترێ، کە زۆر درەنگ بێتە بەر.

[١٥١] واتە شتێکی باش، لە سەد شتی خراپ باشترە.

[١٥٢] بە یەکێك ئەوترێ کە خراپیش بێ و دەمەوەڕیش بێ.

[١٥٣] بە یەکێك ئەوترێ: کە خۆی حەز لە گاڵتە کردن بکا لەگەڵ مەردوما بەڵام نایەوێ کەس گاڵتە لەگەڵ ئەوا بکات.

[١٥٤] واتە شت بە ئیعتبار ئەگۆڕێ، وەك لێرەدا، دڕکەکە لەم رووەوە کە ئەچێ بە پێدا، لێی ئەترسن و ئەڵێن: وەی، وە لەم رووەوە کە پەرژینی باخی پێ ئەکرێ قازانجی هەیە، ئەڵێن: خاسە. ئنجا ئەمە بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی بەلاوە باش بێ لە کاتێکا و خراپ بێ لە کاتێکی ترا.

[١٥٥] تەکۆدەرم: یەکێك لە وتە کۆنەکانی کورد، کە سەدەها ساڵە باپیران و داپیران بۆیان هەڵگرتووین، واتە ئەچمە باوان تا تۆزێ ڕابوێرم، کەچی خەمی دنیا ئەکەوێتە بەرم. هێندێ لە پیرێژنەکان لە جیاتی (تەکۆدەرم) ئەڵێن (تەکەوە بەرم).

[١٥٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە بچێتە شوێنێکی وا کە تیا نەحەسێتەوە.

[١٥٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ناو چەند کەسێکی نەناسیاوا خۆی هەڵکێشێ.

[١٥٨] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر حەزی لە کەیف و رابواردن بێ بە خۆڕایی.

١٥٩)- ئەگەر ئەبوو عەقڵ و فامی، یەکێ بە خاسی ئەیبرد نامی[159]

١٦٠)- ئەگەر ئەتەوێ عەقڵت ساوا کەیت، لەگەڵ گەوران شەڕ و دەعوا کەیت[160]

١٦١)- ئەگەر ئەزانی لایلایە بکەیت، بۆ ئەگری[161]

١٦٢)- ئەگەر ئەمدەیتێ مدح و سنایە، ئەگەر نامدەیتێ چەکوش و فنایە[162]

١٦٣)- ئەگەر بایە و ئەگەر بۆرانە، بۆ بەفر زیانە[163]

١٦٤)- ئەگەر بە دوعا ئەبوو، پشقل بەخورما ئەبوو[164]

١٦٥)- ئەگەر بەماڵی، بە مام و خاڵی، ئەگەر بێ ماڵی بە بیت المالی[165]

١٦٦)- ئەگەر بەد نیت، مەبە بە یاری بەد[166]

١٦٧)- ئەگەر برا شوانە، خوشك هەر چاوەڕوانە[167]

١٦٨)- ئەگەر بزن هاتە مردن، چەقۆکێش زۆر ئەبن[168]

١٦٩)- ئەگەر تۆ نەبیت بە یارم، خوا ئەسازێنێ کارم[169]

---

[159] بە یەکێك ئەوترێ، کە دڵی مەردوم زویر بکا.

[160] واتە هەرگیز مەچۆ بە گژ کەسێکا کە لەخۆت بەدەسەلاَت تر بێ.

[161] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئامۆژگاری یەکێك بکا لەسەر شتێکی ناشرین، کە خۆی ئەو شتەی تیابێ. واتە کە تۆ ئەزانی ئامۆژگاری مەردوم بکەیت لەسەر ئەو کارە ناشرینە، ئەیخۆت بۆچی ئەیکەیت.

[162] بە یەکێك ئەوترێ: کە بە زۆر شت لە مەردوم بسێنێ.

[163] یەکێك بەکاری دێنێ، کە لە هەموو سەرێکەوە زەرەمەند بێ.

[164] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر بە دەم لە خوا بپاڕێتەوە، بەلاَم بە کردەوە هیچ هەوڵێك نەدات، واتە دوعا ئەبێ لەگەڵ کردار بێ، نەك هەر بە گوفتار.

[165] واتە کە پارەت بوو هەموو کەسێك خزمتە، کە پارەشت نەبوو، خۆت خاوەنی سەری خۆت نیت.

[166] واتە هاوڕێی پیاوی خراپ مەکە.

[167] واتە خوشك هەمیشە چاوی لە دەستی برایە، با شوانیش بێ.

[168] بۆ سەربڕینی و کەوڵ کردنی و گۆشت خواردنی.

[169] چونکە خوا کەسی بێ کەسانە.

١٧٠)- ئەگەر پشیلە لەماڵ نەبێ، مشکان تلیلی لیانە[١٧٠]

١٧١)- ئەگەر پیاوەتی بە شۆخ و شەنگی بوایە، بووك سواری زاوا ئەبوو[١٧١]

١٧٢)- ئەگەر پێنجین، ئەگەر شەشین، هەموو غولامی دیزە رەشین[١٧٢]

١٧٣)- ئەگەر حوشتر باڵی ببوایە، ئەم عالەمە چی بکردایە[١٧٣]

١٧٤)- ئەگەر خۆت بە پیاو ئەزانی، مەوێستە لە سەر رێگا و لەسەر بانی[١٧٤]

١٧٥)- ئەگەر خۆت لە هەموو کەس بە زیاتر بزانی، دیارە ناکەس بەچە و نادانی[١٧٥]

١٧٦)- ئەگەر خۆت لە هەموو کەس بە کەمتر بزانی، دیارە یەکە پیاوی جیهانی[١٧٦]

١٧٧)- ئەگەر خانەدانیت، لە خانەدانان خەبەر داریت[١٧٧]

١٧٨)- ئەگەر خەنە زۆر بوو، گونانیشی پێ رەنگ ئەکرێ[١٧٨]

١٧٩)- ئەگەر خەو چاك ئەبوو، کەروێشك بە گا ئەبوو[١٧٩]

---

[١٧٠] بە چەند کەسێك ئەوترێ، کە ئەو گەورەیەی شەرمی لێ ئەکەن لە لایان نەبێ.

[١٧١] چونکە هەرچی بەرگی جوان هەیە لەبەر ئەوایە، هەرچی شتی جوان هەیە بەوەوەیە.

[١٧٢] جاران لە جیاتی مەنجەڵ چێشتی شلە هەر لە دیزەدا لێ ئەنرا، واتە هەموو خێزانێك بەیانیان و ئێواران چاوەڕوانی شۆربای ناو دیزە رەشن.

[١٧٣] بە هێندێ مرۆڤی، نارەسەنی، پیسی، حەسوودی، قین لە سکی، نالەبار ئەوترێ، کە هیچی بە دەست نییە، واتە ئەگەر ئەمانە شتێکیان بە دەست بوایە، مەردوم چی بکردایە.

[١٧٤] چونکە رێگا بۆ هاتوچۆی ژن و پیاو و گەورە و بچوك کراوە، کە تۆ وێستایت رێگا لە مەردوم ئەگیرێ، وێستان لە سەر بانیش نابێ، چونکە حەوش و ناوماڵی مەردوم دەرئەکەوێ.

[١٧٥]

[١٧٦]

[١٧٧] خانەدانێکی لێ قەوماو، بە خانەدانێکی تری ئەڵێ.

[١٧٨] لە کاتێکدا بەکار دێنرێ کە شتێك لەبەر زۆری دەستی پێوە نەگیرابێ، وە زۆری لێ بە کار هێنرابێ.

[١٧٩] چونکە کەروێشك هەمیشە ئەنوێ.

**١٨٠)- ئەگەر خلەماڵی ئەکرد، لە موڵکی خۆی گاڵی ئەکرد**[180]

**١٨١)- ئەگەر خوا باڵی بە حوشتر بدایە، ئەبوایە سەربانمان گشت بڕوخایە**[181]

**١٨٢)- ئەگەر دۆستێکی وەك تۆم ببێ، ئیتر دوژمنم بۆچییە**[182]

**١٨٣)- ئەگەر دەروازە گەڕبێ، بێ کەشکۆڵ نابێ**[183]

**١٨٤)- ئەگەر دەستی بڕوا لە پشتی ملەوە پیاو سەر ئەبڕێ**[184]

**١٨٥)- ئەگەر دەستی بڕوا، بە زیندوێتی پیاو ئەگورێ**[185]

**١٨٦)- ئەگەر دەنگێ نەکەم، دەنگم دەرنەچێ، ئەگەر دەنگێ ناکەم ڕەنگم ئەچێ**[186]

**١٨٧)- ئەگەر دەوڵەت هاتە سەری، بزەڕەوەکی کەری**[187]

**١٨٨)- ئەگەر دڵسۆزت ببوایە، ئێستا لە میری سوور ئەبوویت**[188]

**١٨٩)- ئەگەر ڕەشبم وەك موو، دەوڵەتی باوکم ئەمدا بە شوو**[189]

**١٩٠)- ئەگەر ڕووتنایەت بێژەنگێك بگرە بە ڕووتەوە**[190]

---

[180] یەکێك ئەیڵێ، کە هەژار بێ و هیچی نەبێ، واتە هەردەمێ من لە موڵکی خۆما گاڵم کرد، ئەو حەلە ئەتوانم ماڵیش بکەم.

[181] تەماشای سێ پەند لەمەپێش بکە.

[182] بە دۆستێك ئەوترێ کە قسەیەك بکات بە زەرەری تۆ تەواو ببێ.

[183] دەروازەگەڕ: دەروێشێکە کە ماڵە وماڵ بگەڕێ بۆ سواڵ. کەشکۆڵ: لەتە گوێزێکی گەورەی هێندییە، لووس کراوە و زنجیری تێ خراوە، زۆرتر دەروێشی ڕەوتەنی "مسافر" هەڵی ئەگرن بۆ ئاو پێ خواردنەوە و هێندێ شتی تر. بە یەکێك ئەوترێ کە دەستی دابێتە کارێك و خۆی بۆ ئامادە نەکردبێ.

[184] بە یەکێکی دڵ ڕەقی، قین ئەستوور، ئەوترێ.

[185] بە یەکێکی دڵ ڕەقی، قین ئەستوور، ئەوترێ.

[186]

[187] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە پارە و دارایی زۆر، یاخی بووبێ.

[188] میری سوور، ئەو دێیەیە، کە خوابگاە (مەرقەد)ی میری سووری کوڕی شێخ عیسای بەرزنجی لێیە، وا دەنگ بڵاوە، کە هەر کەسێك شێت ببێ و ببرێ بۆ زیارەتی میری سوور، چاك ئەبێتەوە، واتە تۆ شێتیت و کەس نییە بتبا بۆ سەر میری سوور.

[189] چونکە ئەمڕۆ زۆر کەس ژنیش کە دێنێ هەر بۆ ڕاوی دنیایە.

[190] بە گاڵتەوە ئەوترێ بە یەکێك کە لە شتێکی هیچ و پووچ شەرم بکات.

١٩١)- ئەگەر ڕێوی بنوێ، خەو بە مریشك خواردنەوە ئەبینێ[١٩١]

١٩٢)- ئەگەر زۆر بڵێیت، زۆریش هەڵە ئەکەیت[١٩٢]

١٩٣)- ئەگەر زاڵ نەبیت، بەسزمان ئەبیت[١٩٣]

١٩٤)- ئەگەر زانی ئەزم، ئەگەر نەیزانی دزم[١٩٤]

١٩٥)- ئەگەر زەمانە هێناتیە پێکەنین ساتێك، وریا بە نەتگرێنێ ساڵێك[١٩٥]

١٩٦)- ئەگەر زمان بیەڵێ، سەر رەحەتە[١٩٦]

١٩٧)- ئەگەر زیخێ نییە لە کەوشیا بۆچی ئەلەنگێ[١٩٧]

١٩٨)- ئەگەر سەبر بکەیت، لەبەر سیلە حەڵوا ئەکەیت[١٩٨]

١٩٩)- ئەگەر سەر هەبێ پێ چ نییە[١٩٩]

٢٠٠)- ئەگەر سەگ نەبێ، گورگ ئەتخوا [٢٠٠]

---

[١٩١] چونکە هەمیشە لە بیری ئەوەدایە.

[١٩٢]

[١٩٣] واتە ئەگەر تۆ زۆر و ستەم لە مردوم نەکەیت تا لێت بترسن، ئەوان زۆر و ستەم لە تۆ ئەکەن.

[١٩٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ناوی دیدەنییەوە بێتە ماڵەکەت، ئنجا ئەگەر ماڵ چۆڵ بوو، وا دزە و شتێك ئەدزێ و ئەڕوا، وە ئەگەر مەردومیش دیار بوو، ئەوا میوانە و دائەنیشێ.

[١٩٥] واتە ئەگەر تووشی خۆشییەك بوویت، یاخی مەبە و لە خۆت بایی مەبە، با تووشی ناخۆشییەك نەبیت کە خۆشیەکەت لە بیر بباتەوە.

[١٩٦] واتە هەموو دەردی سەرییەك کە تووشی مردوم ئەبێ، بەهۆی قسە و زبانەوەیە، کەوابوو تا ئەتوانیت ئاگات لە زمانت بێ.

[١٩٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئەنگێکی ببێ، وە خۆشی بزانێ و پێوەی دیار بێ، واتە ئەگەر خۆی بە ئەنگدار نازانێ، بۆچی خۆی ئەشارێتەوە؟

[١٩٨] واتە هەموو شتێك بە پێی خۆی سەبرێکی ئەوێ، وە سەبر کلیکی دەرگای فەرەحە نابینیت بەرسیلە بە دە پانزە بیست ڕۆژ لە ترشیەوە شیرین ئەبێ و دۆشاوەکەی ئەکرێ بە حەڵوا.

[١٩٩] چونکە هەموو شت بە سەر ئەوەستێ.

[٢٠٠] بە ستەم کارێك ئەوترێ، کە ستەم کارێکی تر بەیدەست بکات.

٢٠١)- ئەگەر سیروانیش بخۆیتەوە، نالێم بە گیانت خۆش[٢٠١]

٢٠٢)- ئەگەر شەعبانە، ئەگەر رەمەزانە، مووچەی کوڕە کەچەڵ، هەر دوو نانە[٢٠٢]

٢٠٣)- ئەگەر شتێکت نەزانی، مەیلێ، ئەگەر زانیت نیوەی بلێ[٢٠٣]

٢٠٤)- ئەگەر شێر مەرحەبای کردی، هەوڵی راوکردنی مەدە[٢٠٤]

٢٠٥)- ئەگەر گۆشت گرانە نەخواردنی هەرزانە[٢٠٥]

٢٠٦)- ئەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مەبە[٢٠٦]

٢٠٧)- ئەگەر گوڵن بەرانبەرن، ئەگەر عەترن سەر بەسەرن[٢٠٧]

٢٠٨)- ئەگەر فیل هەیە، کەرگەدەنگیش هەیە[٢٠٨]

٢٠٩)- ئەگەر قاز نیت، هێلکەی قاز مەکە[٢٠٩]

٢١٠)- ئەگەر قەرداری، هەرۆ بەیاری[٢١٠]

٢١١)- ئەگەر قەلەڕەش رێ نیشاندەر بێ، ئەبێ گەورە هەر دەربەدەر بێ[٢١١]

---

[٢٠١] یەکێك ئەیلێ بەیەکێك، کە حەزی لە چارەی نەبێ.

[٢٠٢] یەکێك ئەیلێ، کە مووچەکەی هەرگیز زیاد نەکات.

[٢٠٣] واتە هەمیشە قسە نەکردن لە قسە کردن باشترە.

[٢٠٤] واتە ئەگەر پیاوێکی گەورە ئیشێکی پێت بوو، مرخی لێ خۆش مەکە کە بەو بۆنەیەوە شتێکی لێ بپچریت.

[٢٠٥] واتە هەموو شتێکی گران، با بە نەخواردنی هەرزان بکرێ.

[٢٠٦] واتە کە قازانجت نییە، با زیانیشت نەبێ.

[٢٠٧] بە یەکێکی بەڕێز ئەوترێ، کە خوازبێنی کچەکەی بکرێ بۆ یەکێکی وەك خۆی، وە ئەویش نەیدا.

[٢٠٨] واتە دەست بە بانی دەست زۆرە.

[٢٠٩] واتە هەرگیز لاسایی پیاوی گەورە مەکەرەوە.

[٢١٠] بەیار: زەوییەکە کە چەند ساڵ بێ نەکێڵرابێ و دانەچێنرابێ، کە زۆر بەهێزە، وە هەرچێکی تیا بکرێ زۆر بە بڕشت ئەبێ. واتە ئەگەر قەرزار بوویت بە کارێکی واوە خەریك بە کە قازانجی باش بدات تا قەرزەکەت بدەیتەوە.

[٢١١] کەواتە دەخیل سەد دەخیل دوای قەلەرەش مەکەون؛ بەڵکو هەمیشە لە دوای شابازان بکەون.

٢١٢)- ئەگەر کۆز هەیە نان نییە، ئەگەر نان هەیە کۆز نییە[٢١٢]

٢١٣)- ئەگەر کا، هی خۆت نییە، کایەن هی خۆتە[٢١٣]

٢١٤)- ئەگەر کاوێژی بکردایە، گۆشتی ئەخورا[٢١٤]

٢١٥)- ئەگەر کەر بۆ قوربانی نەشێ، بەهای بۆ قوربانی ئەشێ[٢١٥]

٢١٦)- ئەگەر کەرن، بەرامبەرن، ئەگەر ئێسترن سەربەسەرن[٢١٦]

٢١٧)- ئەگەر کەس نەیخواستم، شووت پێ ئەکەم[٢١٧]

٢١٨)- ئەگەر کەسێك کەسە، حەرفێکی بەسە[٢١٨]

٢١٩)- ئەگەر کەوڵ و پۆست چاك ئەبوو، بە شانی خاوەنی خۆیەوە ئەبوو[٢١٩]

٢٢٠)- ئەگەر کوندەبەبوو کەڵکی ببوایە، راوکەر بەجێی نەئەهێشت[٢٢٠]

٢٢١)- ئەگەر لە جانان یەکێك بمێنێ، حەقی بەرو دوا لە گشت ئەسێنێ[٢٢١]

٢٢٢)- ئەگەر لەکین، گشت چون یەکین[٢٢٢]

٢٢٣)- ئەگەر لووت نەبێ لە بەینا، چاو چاو ئەخوا[٢٢٣]

---

[٢١٢] کۆز: پێخۆرە، واتە دەمێ نان هەیە و پێخۆرە نییە، دەمێ پێخۆرە هەیە ونان نییە.

[٢١٣] بە یەکێك ئەوترێ: کە لەسەرخوانی یەکێکی تر ئەوەندە بخوات تا نەخۆش ئەکەوێ، واتە ئەگەر خواردنەکەش هی خۆت نەبێ، سیبیق (معدە)ەکە هی خۆتە، کە بە زۆر خواردن نارەحەت ئەبێ.

[٢١٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆرگێل و بەسزمان و کەرەواڵە بێ.

[٢١٥]

[٢١٦] بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی زلتر بگرێ لە ئاوەڵەکەی.

[٢١٧] بە یەکێکی ئەڵێی، کە بتەوێ شتێکی لێ بکڕی و قنگەقنگی تیا بکا.

[٢١٨] واتە دانا بە درکاندن، کەریش بە نەقیزە.

[٢١٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی ببێ و زۆر پەسەندی بکات لە ناو مەردوما، کەچی خۆی بۆ خۆی بە کاری نەهێنێ.

[٢٢٠] واتە گۆشتی ناخورێ، چونکە خۆی گۆشت خۆرە و دەنووکی قولاپییە وەك باز.

[٢٢١] واتە تیرەیەکی ئازان.

[٢٢٢] یەکێك بە یەکێکی وەك خۆی ئەڵێ، کە ئەو خۆی لەم بە گەورەتر بزانێ.

[٢٢٣] بە هێزێك ئەڵێن، کە دوو هێزی تر شەرمی لێ بکەن.

٢٢٤)- ئەگەر ماڵت هەیە کەفیل بە، ئەگەر ئیشت نییە شاهید بە[٢٢٤]

٢٢٥)- ئەگەر مەڕم نەدیبێ لە هەرێزا، پشقلم دیوە لە پەرێزا[٢٢٥]

٢٢٦)- ئەگەر مەلا بتڕی، جەماعەت لە خۆ ئەڕی[٢٢٦]

٢٢٧)- ئەگەر موو بە بەخت ئەبوو، بزن لەسەر تەخت ئەبوو[٢٢٧]

٢٢٨)- ئەگەر موو بە بەخت ئەبوو، کەچەڵ بەدبەخت ئەبوو[٢٢٨]

٢٢٩)- ئەگەر ناتوانیت بگەزیت، هەرگیز دانت دەرمەخە[٢٢٩]

٢٣٠)- ئەگەر ناو نەبڕێ و ئاش نەکڕێ، هەر کەسە کولێرەیەکی پێ ئەبڕێ[٢٣٠]

٢٣١)- ئەگەر نەشبی بە ئاغا، بە نۆکەر مەبە[٢٣١]

٢٣٢)- ئەگەر نەمدیایە باوکی، ئەمردم لە عەزرەت دایکی[٢٣٢]

٢٣٣)- ئەگەر نەیدا مەعبوود، چی بکا مەحموود[٢٣٣]

---

[٢٢٤] واتە کاتێك ببە بە کەفیل کە دەوڵەمەند بیت، چونکە قەرزدار قەرز ناداتەوە، وە بە ناچاری ئەبێ تۆ بۆی بدەیتەوە. هەروەها کاتێکیش ببە بە شاهید کە بێ ئیش بیت، چونکە زۆرت ئەبەن و ئەهێنن، ئنجا ئەگەر کارت بێ ناتوانیت ئەو هاتوچۆیە بکەیت.

[٢٢٥] پەرێز، شوێنی دەغڵێە کە دروابێتەوە. هەرێز، فرووزووە، بەیەکێك ئەڵێیت کە بە ژێرت نەزانێ.

[٢٢٦] واتە مەلا و مامۆستا ئەبێ سەرمەشقی چاکی و پاکی بن، ئەگەر خوانەخواستە ئەوان هەڵەیەك بکەن دەستوپێوەندیان سەد هەڵە ئەکەن.

[٢٢٧] چونکە لە هەموو گیانلەبەرێك مووی زیاترە.

[٢٢٨] کەچی وانییە، بەڵکو زۆر کەچەڵ بەبەخت و ناوچەوانە.

[٢٢٩] واتە کە دەسەڵاتت نەبوو، هەڕەشە مەکە.

[٢٣٠] ئاش کە لە گەڕابوو، وەدانی نەما، ئەڵێن ئاشەکە ئەکڕێ واتە بەرداشەکانی کرە کری لێوە دێ، واتە ئەگەر هەموو شت بە پێی مەرام بێ، ئەوا باشە، ئەگینا هیچ.

[٢٣١] واتە هەمیشە چاوت لە پایەی بەرزەوە بێ.

[٢٣٢] بە یەکێکی ناوەجاخ ئەوترێ، کە خۆی لێ گۆڕابێ.

[٢٣٣] ئەگێڕنەوە کە سوڵتان مەحمودی غەزنەوی لای وابووە کە بەدبەختی نییە لە جیهانا، وە هەر کەسێك ئیش کەر و هەوڵدەر بێ پێ بژێوی خۆی و ماڵ و منالی پەیدا ئەکات، ئەیازی وەزیریشی لای وابووە کە بەدبەختی هەیە، وە بەدبەخت هەر چەندە هەوڵ و تەقەلا بدات بەدبەختییەکەی بەری نادات، وە ئەمە ساڵەهای ساڵ بیروباوەڕیان ئەبێ.

٢٣٤)- ئەگەر هەموو مەلێ میوە خۆر بوایە، میوە بە دارەوە نەئەما[٢٣٤]

٢٣٥)- ئەگەر هەوەسە، ئیتر بەسە[٢٣٥]

٢٣٦)- ئەگەر وا نەبووایە، وانەئەبوو[٢٣٦]

٢٣٧)- ئەگەر وتی ماست سپییە، پێی باوەڕ مەکە[٢٣٧]

٢٣٨)- ئەگەریان دابە مەگەر، کوڕێکیان بوو ناویان نا: کاشکی[٢٣٨]

٢٣٩)- ئەگەریان چەند، سەوز نەبوو[٢٣٩]

---

ڕۆژێ ئەیاز بە سوڵتان مەحمود ئەڵێ: ئێمە ئەتوانین ئەمە تاقی بکەینەوە، سوڵتان مەحمودیش ئەڵێ زۆر باشە. ئەیاز ئەڵێ کابرایەك هەیە لەم شارەدا مەشهوورە بە بەدبەخت، وە هەموو ڕۆژێ بەیانیان، دوای هەتاوکەوتن لە فلان کۆڵانەوە ئەچێ بۆ بازاڕ. ئەم بەیانیە هەزار قڕانی بۆ بخەنە پەڕۆیەکەوە لەسەر چەقی ڕێگاکە بۆی فڕی بدەن، بزانین ئەبێ بە نسیبی؟ بەیانی سوڵتان مەحمود هەزار قڕان ئەدا بە پیاوێکی کە بیبا لە سەر ڕێگای کابرای بەدبەخت دایبنێ، وە لە دوورەوە بوێستێ بزانێ کابرا چی ئەکات، بەیانی پیاوەکەی سوڵتان پارەکە ئەبات کە لە دوورەوە کابرا دەرئەکەوێ پارەکەی لە سەر چەپی ڕێگاکە بۆ دائەنێ، وە لە دوورەوە ئەوێستێ، کابرای بەدبەخت لە ناو هەموو ڕۆژێکا ئەو ڕۆژەی لە دڵی خۆیا ئەڵێ: مـن چاوم هاتوتە کزی، بۆچی من ئەمڕۆ پەراوەیەکی کوێرێتی نەکەم، بزانم ئەتوانم وەك کوێر بە بێ چاو بڕۆم بە ڕێگادا. کابرا چاو ئەقووچێنێ و دەست ئەکا بە ڕۆیین، تا لە پارەکە تێپەڕ ئەبێ، ئنجا چاو ئەکاتەوە، سوڵتان و ئەیازیش لە دوورەوە سەیر ئەکەن، سوڵتان مەحمود کە ئەمە ئەبینێ ئەڵێ: "ئەگەر نەیدا مەعبود، چی بکا مەحمود".

[٢٣٤] تەماشای پەندی (هەموو مەلێ هەنجیر خۆر بوایە، هەنجیر بە دارەوە نەئەما) بکە.

[٢٣٥] بە یەکێك ئەڵێیت کە سەری کردبێتە سەرت و قسەی لاقرتێت لەگەڵا بکات.

[٢٣٦] تەماشای ڕاڤەی پەندی (بە زبانی خۆم، چیم کرد بە خۆم) بکە.

[٢٣٧] چونکە زۆر درۆزنە.

[٢٣٨] واتە هەر کارێك (ئەگەر) و (مەگەر)ی تێکەوت بە تەمای مەبە وە ئەمانە هیچیان لێ پەیدا نابێ (خۆزگە) و (کاشکی) نەبێ، کە ئەم وتانە یەك لەیەك بێ ئەنجامترن.

[٢٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە پێت بڵێ: ئەگەر ئەو کارە وابێ، یارمەتیەکی باشت ئەدەم، واتە کە ئەگەرت هێنایە پێشەوە یارمەتییەکەت نایەتە ڕوو ئەگەر یارمەتیم ئەدەیت ئەگەری تێ مەخە.

٢٤٠)- ئەڵێ ژاڵە بۆ وا تاڵیت؟ ئەڵێ لەبەر برا مردن، گوڵت بۆ وا جوانە؟ لەبەر دۆست و دوژمن[٢٤٠]

٢٤١)- ئەڵێ مامە گونت بە چەندە؟ ئەڵێ بە سەنگ و بە ترازوو[٢٤١]

٢٤٢)- ئەڵێ: نێرە. ئەڵێ: بیدۆشە[٢٤٢]

٢٤٣)- ئەلف لەیلە، ئەخوێنێ[٢٤٣]

٢٤٤)- ئەڵێن خزمت کێیە؟ ئەڵێ: ژنم نەهێناوە[٢٤٤]

٢٤٥)- ئەڵێی ئاشی ئاو کەوتووە[٢٤٥]

٢٤٦)- ئەڵێی ئاگری بن کایە[٢٤٦]

٢٤٧)- ئەڵێی ئاڵەت کراوەتە قنگی[٢٤٧]

٢٤٨)- ئەڵێی ئاو لایداوە[٢٤٨]

٢٤٩)- ئەڵێی ئەسپی بۆ زین کراوە[٢٤٩]

٢٥٠)- ئەڵێی ئەسپێی کراسی کۆنە[٢٥٠]

٢٥١)- ئەڵێی بۆ ئاگر هاتوویت[٢٥١]

---

[٢٤٠] بە یەکێك ئەوترێ کە دوو ئیشی پێچەوانەی لێ روو بدات، وە هەر یەکەی بە جۆرێك پینە بکات.

[٢٤١] واتە هەموو شتێك، ئەبێ بە کێشانە و حساب بێ.

[٢٤٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە داوای شتێکت لێ بکا کە لە تواناتا نەبێ، وە هەر چەند عوزری بۆ بێنیتەوە، ئەو هەر لە سەر داواکردنەکەی خۆی بێ.

[٢٤٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر قسەی بێسوود بکات بە رەوانیی.

[٢٤٤] واتە لای زۆر کەس خزم هەر خزمی ژنە.

[٢٤٥] بە ماڵێك ئەوترێ، کە لە بەر هەژاری یا چۆڵی بێدەنگ بێ.

[٢٤٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ژێرەوە کنە لە یەکێکا بکات، وە بە سەر زاریش دۆستی بێ.

[٢٤٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هیچ کوێیەك قنگی توێتکە نەخوا.

[٢٤٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر نەزانی، یا خەفەتباری خۆی، بێدەنگ بێ.

[٢٤٩] بە یەکێك ئەوترێ کە بە پەلە بێ، لەسەر رۆین بۆ شوێنێك.

[٢٥٠] بە یەکێك ئەوترێ کە پێتەوە نووسا بۆ شتێك، لێت نەبێتەوە.

[٢٥١] بە یەکێك ئەوترێ، کە چوو بۆ شوێنێك، زۆر زوو هەستێ.

٢٥٢)- ئەڵێی بازاڕی شێخ هەمزەیە[٢٥٢]

٢٥٣)- ئەڵێی بە دەم دایناوە[٢٥٣]

٢٥٤)- ئەڵێی بە سەربانی جەهەنەمەوە لەوەڕیوە[٢٥٤]

٢٥٥)- ئەڵێی بەدوو نق و نیو دیویێتی[٢٥٥]

٢٥٦)- ئەڵێی بەردی ئاوەسووە[٢٥٦]

٢٥٧)- ئەڵێی بەردی بن گۆمە[٢٥٧]

٢٥٨)- ئەڵێی بەرزەکی بانانە[٢٥٨]

٢٥٩)- ئەڵێی بەڕوی لە دەما تەقیوە[٢٥٩]

٢٦٠)- ئەڵێی بووکە بە بارانێیە[٢٦٠]

٢٦١)- ئەڵێی تەرازووی بەن پچڕاوە[٢٦١]

٢٦٢)- ئەڵێی تەرسەقولێکن و کراون بە دوو کەرتەوە[٢٦٢]

---

[٢٥٢] واتە زۆر پڕو پەشێوە.

[٢٥٣] بە دایك، یا باوکێك ئەوترێ، کە منداڵەکەی زۆر لە خۆی بچێ.

[٢٥٤] بە یەکێکی رەقی تەقی لاواز ئەوترێ.

[٢٥٥] بە ژنێك ئەوترێ، کە منداڵێك لەخۆی نەبێ، کەچی زۆری خۆش بوێ و بێ لاوێنێ.

[٢٥٦] بە یەکێك ئەڵێن، کە رووی قایم بێ.

[٢٥٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە بێدەنگ دانیشتبێ.

[٢٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە گۆبەنگێکا دەستی ببێ، کەچی ڕزگاریشی ببێ، بێئەوەی پێی بزانن.

[٢٥٩] بەیەکێك ئەوترێ، کە بە پەلە، وە یەك لە سەر یەك قسە بکات.

[٢٦٠] بووکە بەبارانێ، شتێکە وەك داهۆڵ: منداڵان دروستی ئەکەن لە دار و پەڕۆ، لە کاتی بێ بارانی دا، ماڵە و ماڵ، ئەیگێڕن، بۆ ئەوەی ئاوی پیا بکەن، بۆ نوقڵانەی باران بارین، بە یەکێك ئەوترێ کە هەموو لەشی تەڕ بووبێ.

[٢٦١] بە یەکێکی دەستە پاچەی لێنەهاتوو ئەڵێن.

[٢٦٢] زۆرتر بە دوو کەسی خراپی هیچ و پووچ ئەوترێ کە لە یەك بچن.

٢٦٣)- ئەڵێی تەلاّی دەستە و شار و گەنجی باوەی دۆزیوەتەوە[٢٦٣]

٢٦٤)- ئەڵێی تێلاّی قووت داوە[٢٦٤]

٢٦٥)- ئەڵێی پەشتە ماڵی حەمامە، هەردەمەی بە بەر یەکێکەوەیە[٢٦٥]

٢٦٦)- ئەڵێی پشیلەی چاو نەپشکووتووە، ماڵە و ماڵی پێ ئەکەن[٢٦٦]

٢٦٧)- ئەڵێی پشیلەی کەللە خانەیە[٢٦٧]

٢٦٨)- ئەڵێی پیرێژنی دۆ ڕژاوە[٢٦٨]

٢٦٩)- ئەڵێی جاشی ماکەرێکن[٢٦٩]

٢٧٠)- ئەڵێی جاو ئەنێتەوە[٢٧٠]

٢٧١)- ئەڵێی جن پیا تسیوە[٢٧١]

٢٧٢)- ئەڵێی جن گۆڕیویێتی[٢٧٢]

٢٧٣)- ئەڵێی جیوەی تێکراوە[٢٧٣]

---

[٢٦٣] تەلاّی دەستەو شار: گونکێکی گەورەیە لە زێڕی نەرم کە لە چینەوە بە دیاری نێرا بۆ شای ئێران (خوسرەو پەروین) و ئەو زێڕە هەر چەند لە ناو دەستتا بگوشرایە لە بەینی پەنجەکانەوە هێندێکی لێ ئەهاتە دەرەوە، لە پاشا کە دەستی لێ بەر ئەدا زێڕەکە وەک خۆی لێ ئەهاتەوە. گەنجی باوە: گەنجێکی بە ناوبانگە کە ون بووە، و هەزاران ساڵە بە شوێنیا ئەگەڕێن.

[٢٦٤] بە یەکێك ئەوترێ کە قسەی بە ڕەوانی پێ نەکرێ.

[٢٦٥] بە یەکێك ئەوترێ کە کوڕی ڕۆژ بێ، وە هەردەمەی لەگەڵ یەکێکی دەستڕۆیوا بێ.

[٢٦٦]

[٢٦٧] بە یەکێکی کەللە زلی قەڵەو ئەڵێن.

[٢٦٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە خەمێکی لێ نیشتبێ.

[٢٦٩] زۆرتر بە دوو کەسی خراپی هیچ و پووچ ئەوترێ کە لە یەك بچن.

[٢٧٠] بە یەکێك ئەڵێن، کە زۆر بێت و بچێ.

[٢٧١] بە شتی بێ پیت ئەوترێ.

[٢٧٢] بە مناڵی زۆر ناشرین ئەوترێ.

[٢٧٣] بە یەکێکی زۆر بزێو ئەوترێ.

٢٧٤)- ئەڵێی حەمامی ژنانە[٢٧٤]

٢٧٥)- ئەڵێی حوشتری ناو پەمووە[٢٧٥]

٢٧٦)- ئەڵێی خۆڵی مردووی بە سەرا بێژراوە[٢٧٦]

٢٧٧)- ئەڵێی خەرەنگەزی بن کلکی گایە[٢٧٧]

٢٧٨)- ئەڵێی خوری خواردووە و پەتك ئەڕیی[٢٧٨]

٢٧٩)- ئەڵێی دۆمی خەڵاتکراوە[٢٧٩]

٢٨٠)- ئەڵێی داری واوەیلایە[٢٨٠]

٢٨١)- ئەڵێی درگی مەم و زینە[٢٨١]

٢٨٢)- ئەڵێی دیزەی رەشە[٢٨٢]

---

[٢٧٤] بە کوڕێك ئەوترێ، کە هەر یەکە لە عاستی خۆی قسە بکا بە دەنگی بەرز بێئەوەی یەکێك گوێ لە یەکێك بگرێ.

[٢٧٥] بە یەکێکی درێژ و قووچ ئەڵێن کە لەگەڵ چەند منداڵێکا بڕوا بەڕێدا.

[٢٧٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە مات و خەفەتبار دانیشتبێ.

[٢٧٧] بە یەکێك ئەوترێ: کە زۆر قسە بڕنگێنێتەوە، وە لەسەر شت بڕوا.

[٢٧٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر لە سەر پێشاو بمێنێتەوە.

[٢٧٩] بە یەکێك ئەوترێ کە یەك پارچە کاڵای تازەی لەبەرابێ، وە بەرگەکانی تری هەمووی کۆن بێ.

[٢٨٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر لەڕ و لاواز و رەق و تەق بێ.

[٢٨١] ئەگێڕنەوە کە (کاکە مەم) و (خاتو زین) دوو دڵداری گیانی بە گیانی بوون، وە دڵیان بە یەکەوە بوو، بەڵام (بەکر مەرگەوەڕ)، بەبۆختان و دوو زبانی کەوتە ناویانەوە، وە نەیهێشت ببن بە چارەنووسی یەك، تا کاکە مەم گیراو لە زینداناا بە داخەوە مرد، دوای ئەو خاتو زینیش خۆی کوشت لە داخا، وە لە تەنیشت کاکە مەمەوە نێژرا، دوای مردنیشیان بەکر مەرگەوەڕ وازی لێ نەهێنان، وە هەمیشە لە سەر گۆڕەکەیان، وە لە ناوەندی هەر دووکیانا دائەنیشت، تا ڕۆژێ براکەی خاتو زین هەر لەوێدا ئەی کوژێ، وە لە جێ خوێنەکەی کۆمەڵە دڕکێك شین ئەبێ لەناوەندی هەر دوو گۆڕەکەدا، وە هەر چەند هەڵی ئەکەنن هەر شین ئەبێتەوە، ئەنجا ئەمە بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر نالەبار بێ، وە هەر چەند بتەوێ لە کۆڵت نەبێتەوە.

[٢٨٢] بە پیاوێکی بێوەی ئەوترێ، کە لە ناو بردنی بە خراپە، مەردوم توشی زیان ببێ.

٢٨٣)- ئەڵێی ڕۆنی سەگ ئەدەن لە لەشی[٢٨٣]

٢٨٤)- ئەڵێی ڕۆنی ورچ ئەدەن لە لەشی[٢٨٤]

٢٨٥)- ئەڵێی ڕێوی گەزیزان خواردووە[٢٨٥]

٢٨٦)- ئەڵێی سای مەل لێی داوە[٢٨٦]

٢٨٧)- ئەڵێی سەگی پێ سووتاوە[٢٨٧]

٢٨٨)- ئەڵێی سەگی عەرەبییە، چِخە نازانێ[٢٨٨]

٢٨٩)- ئەڵێی سەگی هەڵە پاسە[٢٨٩]

٢٩٠)- ئەڵێی سەیفندەی بە ڕۆژەیە و گووی بە دوو پەلی دارەوە کردووە[٢٩٠]

٢٩١)- ئەڵێی سێوێکن، کراون بە دوو کەرتەوە[٢٩١]

٢٩٢)- ئەڵێی شەخسە پەڕۆیە[٢٩٢]

٢٩٣)- ئەڵێی شەرواڵ بە کۆڵی خواردووە[٢٩٣]

---

[٢٨٣] بە یەکێك ئەڵێن، کە بە زەرەری مەردوم کەیف خۆش بێ.

[٢٨٤] بە یەکێك ئەڵێن، کە بە زەرەری مەردوم کەیف خۆش بێ.

[٢٨٥] گەزیزە: گوڵێکی حەوت ڕەنگی جوانە، هەر دەمێ ڕێوی بیخوا، توولەك ئەکا.

[٢٨٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هیچە لە خۆی گۆڕابێ.

[٢٨٧] بە یەکێکی خوێڕی گەڕۆك ئەوترێ.

[٢٨٨] بە سەگێك ئەوترێ، کە لە وتەی (چِخە) نەگەڕێتەوە، واتە ئەڵێی عەرەبییە و لە چِخە کە وتەیەکی تورکییە تێ ناگا.

[٢٨٩] بە یەکێکی دڕی بێ حەیا ئەوترێ.

[٢٩٠] سەیفندە: ناوی کابرایەکە لە دێی (بەڕۆژە) لە تەنیشت (بانە) لە کوردستانی ئێران، ئەم کابرایە لەبەر دەعیە هەر گووی لەسەر داری دوو پەل کردووە، بۆیە ئەم پەندە هەر بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بە دەعیە و دەمار بێ.

[٢٩١] بە دوو کەسی جوان ئەڵێن، کە لە شێوەدا زۆر لە یەك بچن.

[٢٩٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر چێکی لەبەرابێ وەك پەڕۆی سەرشەخس شڕ و وڕ بێ.

[٢٩٣] شەرواڵ بە کۆڵ: گیایەکی ڕەوانە، هەر کەسێك بیخوا ئەبێ شەرواڵەکەی بدا بە کۆڵیا. بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر ڕەوان بێ.

٢٩٤)- ئەڵێی شەکی شوانان گاوە[٢٩٤]

٢٩٥)- ئەڵێی شەلاقەی باڵ شکاوە[٢٩٥]

٢٩٦)- ئەڵێی شەیتان تفی کردۆتە دەمیٚ[٢٩٦]

٢٩٧)- ئەڵێی شەیتان دەرسی داداوە[٢٩٧]

٢٩٨)- ئەڵێی شێتە و بۆ بەرد ئەگەڕیٚ[٢٩٨]

٢٩٩)- ئەڵێی چالەکەیە، تا لێیدەیت قەڵەو ئەبیٚ[٢٩٩]

٣٠٠)- ئەڵێی گۆشتی قازی خواردووە[٣٠٠]

٣٠١)- ئەڵێی گەماڵی سەر دێڵە بەبایە[٣٠١]

٣٠٢)- ئەڵێی گەنەی گونی گایە[٣٠٢]

٣٠٣)- ئەڵێی گورچیلەی گان بە یەکەوە نانووسێن[٣٠٣]

٣٠٤)- ئەڵێی گولی بەخیلە[٣٠٤]

٣٠٥)- ئەڵێی گوو گێژی کردووە[٣٠٥]

٣٠٦)- ئەڵێی گووی خۆی گێرە ئەکا[٣٠٦]

---

[٢٩٤] بە یەکێکی پیس و پۆخڵی دڕوداوێن قوڕاوی ئەوتریٚ.

[٢٩٥] بەمەردومی شلەپەتە ئەوتریٚ.

[٢٩٦] بەیەکێك ئەوتریٚ، کە زۆر زیرەك و وریاو بێدار و ئاگادار و بزێو بیٚ.

[٢٩٧] بەیەکێك ئەوتریٚ، کە زۆر زیرەك و وریاو بێدار و ئاگادار و بزێو بیٚ.

[٢٩٨] بە یەکێك ئەوتریٚ بە شوێن شتێکا هەڕاکا و نەیگریٚ.

[٢٩٩] چالەکە: دەعبایەکی قەڵەوی پانکەلەی چوار پێیە گۆشتی ئەخوریٚ.

[٣٠٠] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە دەنگی وەك دەنگی قاز زل بیٚ.

[٣٠١] بە یەکێکی دڕی شیڕەت ئەوتریٚ.

[٣٠٢] بە یەکێك ئەوتریٚ، بە هەر شتێکەوە نووسا لێی نەبێتەوە.

[٣٠٣] بە چەند کەسێك ئەوترێن، کە پێکەوە هەڵکردیان نەبیٚ، وە هیچیان بە هیچیانەوە نەنووسێن.

[٣٠٤] بە یەکێکی دڵ پیسی بەخیل ئەڵێن.

[٣٠٥] بە یەکێك ئەوتریٚ لە ڕووی سووکییەوە کە زۆر گێژ و وێژ بیٚ.

[٣٠٦] بە یەکێك ئەوتریٚ کە هەر بێت و بچیٚ بە بیٚ هوودە.

۳۰۷)- ئەڵێی گوێز ئەکاتە هەمانە[۳۰۷]

۳۰۸)- ئەڵێی گوێزە، باری نییە[۳۰۸]

۳۰۹)- ئەڵێی گوێزی بۆ ئەژمێرن[۳۰۹]

۳۱۰)- ئەڵێی گوێزی ناو بێژنگە[۳۱۰]

۳۱۱)- ئەڵێی گوێزی ناو دەخیلەیە[۳۱۱]

۳۱۲)- ئەڵێی گیپەی جۆیە[۳۱۲]

۳۱۳)- ئەڵێی گێرەی هۆمەرە کوێرە[۳۱۳]

۳۱٤)- ئەڵێی گیسکە دێی یە[۳۱٤]

۳۱۵)- ئەڵێی گیسکی سەلەمە[۳۱۵]

۳۱٦)- ئەڵێی گیسکی قەرزار نەگرتووە[۳۱٦]

۳۱۷)- ئەڵێی گیسکی ناو دێیە[۳۱۷]

---

[۳۰۷] بە یەکێکی تووڕە ئەوترێ، کە بە ڕەقی قسە بکات لەگەڵ یەکێکی نەرم و شلا.

[۳۰۸] بە یەکێکی چەوتی نالەبار ئەڵێن.

[۳۰۹] بەیەکێك ئەوترێ، کە هەر چەند ئامۆژگاری بکەیت وەری نەگرێ.

[۳۱۰] بە یەکێك ئەوترێ، کە سەری لێ شێوا بێ، وە هەردەمە لە شوێنێك بێ.

[۳۱۱] بە یەکێکی زۆر بچکۆلانە ئەوترێ.

[۳۱۲] بە شتی قەبەی ناقۆلا ئەڵێن.

[۳۱۳] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك بووە ناوی هۆمەرە کوێر بووە، خەرمانێکی بووە ویستویەتی گێرەی بکات، بەڵام خۆی جووتی نەبووە و کەسیش یارمەتی نەداوە، ناچار خۆی کەرێك و مانگایەك و سەگێك و بزنێکی ئەبێ، دێت تێکیان ئەخات، وە ئەیەوێ گێرەیان پێ بکات، کە دەست ئەکەن بە خولخواردن گێرە ئەشێوێ، وە خەرمانەکە پەرش و بڵاو ئەبێتەوە، ئنجا ئێستا ئەمە بە شتێك ئەوترێ کە تێکەڵ و پێکەڵ ببێ.

[۳۱٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە سەر بە هەموو شوێنێکا بکات.

[۳۱۵] بەیەکێکی گەمژەی نابووتی بچکۆلانە ئەڵێن.

[۳۱٦] بە یەکێکی گەمژەی نابووتی بچکۆلانە ئەڵێن.

[۳۱۷] بەیەکێك ئەوترێ، لە هەر کوێیەك خواردن و مڵ و مووشی ببێ، ئەو لەوێ بێ.

٣١٨)- ئەڵێی عیسا گرتوویەتی و مووسا تێی ئاخنیوە[٣١٨]

٣١٩)- ئەڵێی فاتەی سوورەبانە[٣١٩]

٣٢٠)- ئەڵێی قەل و بەچکە قەلەکان، تفاندویانەتەوە دەمی یەك[٣٢٠]

٣٢١)- ئەڵێی قەندەی دەم بەرەوژووورە[٣٢١]

٣٢٢)- ئەڵێی کاسەی چەورە[٣٢٢]

٣٢٣)- ئەڵێی کەری دەروێشە سەر بە هەموو ماڵێکا ئەکا[٣٢٣]

٣٢٤)- ئەڵێی کەری گوو شل خواردووە[٣٢٤]

٣٢٥)- ئەڵێی کەشکی ئاوەسورە[٣٢٥]

٣٢٦)- ئەڵێی کتکە نەوتینەیە[٣٢٦]

٣٢٧)- ئەڵێی کەڵەشێری بلّقاسمە[٣٢٧]

٣٢٨)- ئەڵێی کەڵەشێری سەر بارەدارە[٣٢٨]

---

[٣١٨] بەیەکێك ئەوترێ، کە لە قەڵەوییدا ڕەویی بێتەوە.

[٣١٩] ئەگێڕنەوە کە ژنێك بووە ناوی فاتـە سـوورەبان بـووە، ئـەم ژنـە شـەڕی ناوەتـەوە و خۆشی سەیری کردووە، کە لێشیان پرسیوە: ئـەوە چییە؟ وتوویـەتی : ئـەلێن شـەڕ و هەرایە، قەباحەتی فاتەشی تیایە. ئێستا بە یەکێك ئەوترێ کە شەڕ بنێتەوە و خۆی سەیر بکا.

[٣٢٠] بە دوو کەس ئەڵێن کە لە قسەیەکا هـەر دووکیـان وەك یـەك قسـە بکـەن بـێ ئـەوەی ئاگایان لە یەك بێ.

[٣٢١] بە یەکێك ئەوترێ، کە بۆ هەر لایەك بچێ خواردنی بە تووشەوە بێ.

[٣٢٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچ نەگرێتە خۆی.

[٣٢٣] بە یەکێکی ناشرینی دەم و قەپۆز چلّکن ئەوترێ.

[٣٢٤] بە یەکێکی ناشرینی دەم و قەپۆز چلّکن ئەوترێ.

[٣٢٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسە کاری تێ نەکا.

[٣٢٦] بە مەردومی ڕەش و ڕووتی چلّکن و پیس ئەوترێ.

[٣٢٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە میانەی قسەی ئەم و ئەوا تێهەڵکات.

[٣٢٨] بە یەکێکی بچوکی بێ نموود ئەوترێ، کە هەمیشە خۆی دەرخات.

٣٢٩)- ئەڵێی کەڵەشێری کلك هەڵکێشراوە[٣٢٩]

٣٣٠)- ئەڵێی کەڵەشێری ناوەختە[٣٣٠]

٣٣١)- ئەڵێی کەندووی بەتاڵە[٣٣١]

٣٣٢)- ئەڵێی کەندووی نەزان کردووە[٣٣٢]

٣٣٣)- ئەڵێی کەوی بنێشتە تاڵ خواردووە[٣٣٣]

٣٣٤)- ئەڵێی کچە جافیان بۆ دابەزاندووە[٣٣٤]

٣٣٥)- ئەڵێی کلاوی سەخری جنی لەسەردایە[٣٣٥]

٣٣٦)- ئەڵێی کوڕە زۆکەیە[٣٣٦]

٣٣٧)- ئەڵێی کوردی بە دۆ مردەیە[٣٣٧]

٣٣٨)- ئەڵێی کوردی دۆ نەدیوە[٣٣٨]

٣٣٩)- ئەڵێی کوزە کەمتیاری پێیە[٣٣٩]

٣٤٠)- ئەڵێی کووپەی سەروبنە[٣٤٠]

---

[٣٢٩] بە یەکێکی بچوکی بێ نموود ئەوترێ، کە هەمیشە خۆی دەرخات.

[٣٣٠] بە یەکێك ئەڵێن، کە وەخت نەناسێ.

[٣٣١] بە یەکێکی بۆشی بێ زانین و زانیاری، یا بێژیری و بیر ئەوترێ.

[٣٣٢] بە یەکێکی زلی قەبەی ناشرین ئەوترێ.

[٣٣٣] بە یەکێکی دەنگ زوڵاڵ ئەوترێ، چونکە وا بڵاوە کە بنێشتە تاڵ دەنگی کەو خۆش ئەکا.

[٣٣٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ چەند دۆست و برادەرێکیا بێ، وە سەر لە ئێواری بە جێیان بێڵێ، بچێتەوە بۆماڵەوە.

[٣٣٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر بزێو بێ، وە لەهیچ شوێنێك زۆر نەمێنێتەوە لەبەرئەوە دۆزینەوەی بۆ یەکێك گران بێ.

[٣٣٦] بە یەکێکی پیر ئەڵێن، کە کردەوەی منالانە بنوێنێ.

[٣٣٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە خواردنێکی ئەوەندە خواردبێ نەخۆش کەوتبێ.

[٣٣٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە بۆ شتێك تامەزرۆ بێ.

[٣٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لای هەموو کەسێك خۆشەویست بێ.

[٣٤٠] بە مەردومی کورتی خڕی تێکسمڕاو ئەڵێن.

٣٤١)- ئەڵێی کوێری ئەسپێ لە مشت کەوتووە[٣٤١]

٣٤٢)- ئەڵێی لۆتییە و مەیموونی تۆپیوە[٣٤٢]

٣٤٣)- ئەڵێی لە بن دارێکایە گەڵای پێوە نییە[٣٤٣]

٣٤٤)- ئەڵێی لە ترش و خوێدا سوور کراوەتەوە[٣٤٤]

٣٤٥)- ئەڵێی لە دەم ڕەش بەربووە[٣٤٥]

٣٤٦)- ئەڵێی لە دەم گورگ بەربووە[٣٤٦]

٣٤٧)- ئەڵێی لە سەر ئاگر دانیشتووە[٣٤٧]

٣٤٨)- ئەڵێی لە سەر دڕك بەندە[٣٤٨]

٣٤٩)- ئەڵێی لە گەرووی مار دەرهاتووە[٣٤٩]

٣٥٠)- ئەڵێی لە گوێی گادا نوستووە[٣٥٠]

٣٥١)- ئەڵێی لە کێری تیتی و قوزی بیبی بوون[٣٥١]

٣٥٢)- ئەڵێی لەسەر دڕکە[٣٥٢]

٣٥٣)- ئەڵێی لەکلا گەڕاوە[٣٥٣]

---

[٣٤١] بە یەکێك ئەوترێ، کە چنگی بە سەر شتێکا گرتبێ، وە بەئامان و زەمان لە ژێر چنگی نەیەتە دەرەوە.

[٣٤٢] بە یەکێکی خەفەتبار ئەوترێ.

[٣٤٣] بە یەکێکی خەفەتبار ئەوترێ.

[٣٤٤] بە یەکێکی ساغی قەڵەوی سوور پڕ تۆڵ ئەوترێ.

[٣٤٥] بە یەکێکی چلێسی نەوسنی بە هەڵپە ئەڵێین لە خواردنا.

[٣٤٦] بە یەکێکی چلێسی نەوسنی بە هەڵپە ئەڵێین لە خواردنا.

[٣٤٧] بەیەکێك ئەوترێ، کە بە ناچاری لە شوێنێك دانیشتبێ.

[٣٤٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ناچاری لە شوێنێك دانیشتبێ.

[٣٤٩] واتە زۆر ڕاستە.

[٣٥٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە بێ ئاگا بێ لە دەنگ و باسێك.

[٣٥١] بە یەکێکی لاری خوار و خێچی ناشرین ئەوترێ.

[٣٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ناچاری لە شوێنێك دانیشتبێ.

[٣٥٣] بە یەکێکی لاری خوار و خێچی ناشرین ئەوترێ.

٣٥٤)- ئەڵێی لەکێری قاقان و لە قوزی بیبی جان بوون[٣٥٤]

٣٥٥)- ئەڵێی ماستمان خواردووە و دۆمان داوە بەو[٣٥٥]

٣٥٦)- ئەڵێی ماکەری ئابڵاخە[٣٥٦]

٣٥٧)- ئەڵێی مانگای مالوانە[٣٥٧]

٣٥٨)- ئەڵێی مەشکە تاڵ ئەدا[٣٥٨]

٣٥٩)- ئەڵێی مژ لە قنگی کەر ئەدا[٣٥٩]

٣٦٠)- ئەڵێی مریشکە و لە گووی خۆیا چینە ئەکا[٣٦٠]

٣٦١)- ئەڵێی مریشکی ئاشەوانە[٣٦١]

٣٦٢)- ئەڵێی مریشکی ئاشەوانە، تا کشەی لێ بکەیت زیاتر بۆ سەردۆڵیان رائەکات[٣٦٢]

٣٦٣)- ئەڵێی مریشکی ئاوەڕوتکراوە[٣٦٣]

---

[٣٥٤] بەیەکێك ئەوترێ، کە زۆر بە دەعیە و دەمار بێ.

[٣٥٥] بە یەکێك ئەوترێ کە لە هیچەوە زوێر بووبێ.

[٣٥٦] ئابڵاخ: دێیەکی نزیکە لە رۆژئاوای شاری سلێمانییەوە، ئەمە ساڵێکە کەوتۆتە سەر شار بەهۆی گەورە بوونی سلێمانییەوە، بە یەکێك ئەوترێ کە هیچی لە دەست نەیەت.

[٣٥٧] مالوان، دێیەکە لە شارەزوور. بە یەکێکی زلی قەبەی ورگن ئەوترێ کە زۆر بخوا.

[٣٥٨] مەشکە کە ماوەیەك دۆی تێکرا، چەرمەکەی خاو ئەبێتەوە وە بە دەستەوە ئەنوسێ، ئنجا دێن تاڵی ئەدەن، بەم ڕەنگە جەوت و قەزوانی وشك و توێکڵە پرتقاڵی وشکی بۆ ئەکوتن لەگەڵ خۆیدا، وە بە دیوی دەرەوە و ناوەوەی ئەکەن زۆر بە خەستی، وە بەو ڕەنگ ئەمێنێتەوە تا دوو سێ رۆژ، ئنجا بە چەقۆ دای ئەتاشن و ئەیشۆنەوە وە بەو ڕەنگە پنر ئەبێتەوە، وە تام و بۆنی خۆش ئەبێ ئەم پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە جنێوێکی زۆر بدا بە یەکێك، وە بە جنێو بی ئاخنی و تاڵی دا.

[٣٥٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە مژی قایم بدا لە سەبیل و قەندە.

[٣٦٠] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی لێ ون بووبێ، وە بە ڕاست و چەپی خۆیا دەست بگێڕێ.

[٣٦١] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە سەر ئەم و ئەوەوە بلەوەڕێ.

[٣٦٢] بە یەکێك ئەوترێ کە لە خوارەوە جێگای نەبێتەوە بۆ بەرەوژوورتر هەوڵ بدات.

[٣٦٣] بە یەکێکی رووتی کەم بەرگ و کاڵا ئەوترێ.

٣٦٤)- ئەڵێی مشتەی ناو هەمانەیە[٣٦٤]

٣٦٥)- ئەڵێی مشکی جەواڵ دڕە[٣٦٥]

٣٦٦)- ئەڵێی مشکی سەر تەختەیە[٣٦٦]

٣٦٧)- ئەڵێی مشکی ناو جەواڵە[٣٦٧]

٣٦٨)- ئەڵێی من کرە ئەکەم و ئەو ئەیخوا[٣٦٨]

٣٦٩)- ئەڵێی موورووی لە گووی خۆیا دۆزیوەتەوە[٣٦٩]

٣٧٠)- ئەڵێی موویان بۆ هەڵ کڕووزاندووە[٣٧٠]

٣٧١)- ئەڵێی میزی پشیلەیان داوە لەبەری پێی[٣٧١]

٣٧٢)- ئەڵێی میزی گایە، هەر لار ئەڕوا[٣٧٢]

٣٧٣)- ئەڵێی مێشێ میوانی نییە[٣٧٣]

٣٧٤)- ئەڵێی مێشە، ئەنیشێ بە پیسیەوە[٣٧٤]

٣٧٥)- ئەڵێی میچی قومارخانەیە[٣٧٥]

٣٧٦)- ئەڵێی نازداری قازی بەنێیە[٣٧٦]

---

[٣٦٤] بەیەکێك ئەوترێ، کە زبان و دەمی بە نهێنی لە کارا بێ.

[٣٦٥] بەیەکێکی بزێوی دڕ ئەوترێ.

[٣٦٦] بە یەکێکی بچکۆلانەی جرپنی جەربەزە ئەوترێ.

[٣٦٧] بە یەکێکی بچووك ئەوترێ، کە بەرگی یەکێکی لە خۆی گەورەتر لەبەر کردبێ.

[٣٦٨] بە یەکێك ئەڵێیت: کە حەز لە چارەی نەکەیت.

[٣٦٩] بە کەسێك ئەوترێ لە ڕووی سوکیەوە، کە زۆر پێبکەنێ.

[٣٧٠] بە یەکێك ئەڵێیت لە کاتێکا کە نەتەوێ بێت، کەچی ئەو لەو کاتەدا کوتوپڕ پەیدا بێ.

[٣٧١] بەیەکێك ئەوترێ، کە زۆر هاتوچۆ و جرت و فرت بکا.

[٣٧٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هەموو شتێکا لار بێ.

[٣٧٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی بەسەرهاتبێ و باکی نەبێ.

[٣٧٤]

[٣٧٥] بە یەکێکی فێڵباز ئەوترێ.

[٣٧٦] قازی بەنێ: زیارەتگایەکە لە شیوی قازی لە ناوچەی قەرەداخ، گوایا هەر ژنێك منالّی نەبێ بچێتە سەر گۆڕەکەی، بۆ ئەوەی منالّی ببێ ئنجا هیوا هەیە کە گەڕایەوە منالّی

٣٧٧)- ئەڵێی نانی بە سەر ساجا سووتاوە[٣٧٧]

٣٧٨)- ئەڵێی نانی هاری گرتووە بەدەمەوە[٣٧٨]

٣٧٩)- ئەڵێی نە بای دیوە و نە باران[٣٧٩]

٣٨٠)- ئەڵێی نە نان ئەخوا و نە ئاو[٣٨٠]

٣٨١)- ئەڵێی نیسکە بەروپشتی بۆ نییە[٣٨١]

٣٨٢)- ئەڵێی ورچی دەست شکاوە، هەر بۆڵە بۆڵێتی[٣٨٢]

٣٨٣)- ئەم ترە کەڵەکێیە، سەر ناگرێ[٣٨٣]

٣٨٤)- ئەم دەست موحتاجی ئەو دەست نەبێ[٣٨٤]

٣٨٥)- ئەم دەسی لەو دەسی چڵك وەرناگرێ[٣٨٥]

٣٨٦)- ئەم سایە، هی ئەو سایە[٣٨٦]

---

ئەبێ، وە هی واش هەیە نای بێ، ئەوی کە بووی مناڵەکەی زۆر خۆشەویست ئەبێ لای باوك و دایکی وە پێی ئەڵێن نازداری قازی بەنێ، وە هەر کەسێکی تریش کە مناڵەکەی وا خۆشەویست بێ پێی ئەڵێن: ئەڵێی نازداری قازی بەنێیە.

[٣٧٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کارێکا پەلە پەل بکا.

[٣٧٨] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر هاروهاج بێ.

[٣٧٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەر کارێ: سزایەکی سەخت درابێ، کەچی لە دوای سزاکە دەست بکاتەوە بە کارەکە.

[٣٨٠] بەیەکێکی زۆر لەڕ و لاواز ئەوترێ.

[٣٨١] بەیەکێکی دوو ڕوو ئەوترێ.

[٣٨٢] بە یەکێك ئەوترێ کە لەبەر خۆیەوە هەر بۆڵەی بێ.

[٣٨٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیوای زۆری ببێ، وە هیوا لە سەر هیوا دابنێ و کەڵەکەیان بکات.

[٣٨٤]

[٣٨٥] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر ڕژد و چرووك بێ.

[٣٨٦] بەیەکێك ئەوترێ، کە حورمەتێکی کۆنی بنەماڵەیی مابێ.

٣٨٧)- ئەم سەر ئەكا و ئەو سەر ئەكا، پارە ئەدا و پینە ئەكا[٣٨٧]

٣٨٨)- ئەم سەر كرێ، ئەو سەر كرێ، پارە كرێ پینە كرێ[٣٨٨]

٣٨٩)- ئەم قسەیە، با لە ناو دووتوێی نانابێ[٣٨٩]

٣٩٠)- ئەم كاسەیە بێ ژێر كاسە نییە[٣٩٠]

٣٩١)- ئەم لا ئەكەم ئاو ئەمبا، ئەولا ئەكەم گورگ ئەمخوا[٣٩١]

٣٩٢)- ئەم لا تات و ئەولا تات، ئای بابە جیقم دەرهات[٣٩٢]

٣٩٣)- ئەم لای ناوە بەولاوە، گووی كردە هەر دو لاوە[٣٩٣]

٣٩٤)- ئەم مردووە، بەم شیوەنە، زیندوو نابێتەوە[٣٩٤]

٣٩٥)- ئەم نانە بەو ڕۆنە[٣٩٥]

٣٩٦)- ئەم هەویرە ئاو زۆر ئەكێشێ[٣٩٦]

٣٩٧)- ئەمانەتیان دا بە عەردی، نەچووە ژێری[٣٩٧]

---

[٣٨٧] بە یەكێك ئەوترێ، كە هەمیشە خەریكی پینە كردنی ئەو گوفتار و كردارانە بێ كە ئەیانكا.

[٣٨٨] پارە: مەبەست پارچە كردنە، واتە هەر چیت بۆ بەرن، یا بۆت بێنن یا بۆت پارچە پارچە بكەن، یا بۆت لە یەك بدەن، هەمووی هەر بە كرێ، وە بە پارەیە.

[٣٨٩] بە یەكێك ئەوترێ، قسەیەك بكا كە هێشتا وەختی نەهاتبێ، واتە قسەیە با فەرامۆش نەكرێ، وە هەڵگیرێ بۆ ڕۆژی خۆی.

[٣٩٠] بە كردەوەیەك ئەوترێ، كە مەبەستێكی تایبەتی تیابێ.

[٣٩١] یەكێك ئەیڵێ، كە لە ناوەندی دوو بەڵای گەورەدا بێ.

[٣٩٢] تات تەلە بەردی پانی گەورەیە، یەكێك ئەیڵێ كە لە دوو لاوە زۆری بۆ هاتبێ.

[٣٩٣] بە یەكێك ئەوترێ، كە دوو كاری بە دەستەوە بێ، وە هەر دووكی تێك دابێ.

[٣٩٤] واتە زۆر شیوەن مەكەن لە سەر مردوو.

[٣٩٥] بەیەكێك ئەوترێ كە ئارەزووی شتێكی ببێ و دەستی نەیگاتێ.

[٣٩٦] بە قسەیەك ئەوترێ، كە زۆر مەعنای ببێ.

[٣٩٧] بە یەكێك ئەوترێ كە هەموو جۆرە سپاردەیەك وەربگرێ، وە باكی نەبێ ئەگەر لە لای بفەوتێ، ئەم پەندە ئاماژەیە بۆ ئایەتی "انا عرجنا الامانه علی السماوات و الارج و الجبال فابین ان یجعلنا و اشفقن منها و حملها الانسان" واتە ئێمە سپاردەمان ڕانواند بە سەر ئاسمانەكان و زەوی كێوەكانا، هەموو لە هەڵگرتنی یەخەیان هەڵتەكان و لێی ترسان.

٣٩٨)- ئەمە ئەرز و ئەوە گەز[398]

٣٩٩)- ئەمە باوكی گشتیانە[399]

٤٠٠)- ئەمە خوێی چێشتە، لە چاو ئەودا[400]

٤٠١)- ئەمە سنعەتە و سەبەتە، مزگەری نییە و قنگ هەڵسوڕان[401]

---

[398] بە یەكێك ئەوترێ، كە بە هاشە و هووشە قسەیەكی زل بكات كە لە دەستی نەیەت، واتە ئەگەر راست ئەكەیت فەرموو بیكە.

[399] ئەگێڕنەوە كە كابرایەكی شارەزووری، ئاشنای ماڵێكی گەورە ئەبێ،ساڵی هەشت نۆ جار ئەچێ بۆ ماڵیان، هەموو جارێك یا مەشكۆلەیەك دۆ، یا چەند سەلكێك دۆینە، یا تۆزێ كەشكیان بۆ ئەبا بە دیاری، وە هەموو جارێ، دوو سێ ڕۆژ ئەمێنێتەوە تێر و پڕ پڵاو و گۆشت ئەخوا ، بێجگە لە خەڵات و بەرات، ساڵێك بە بەهاردا ئەچێ، وەك جاران چەند ڕۆژێك ئەمێنێتەوە، وە بە خانەخوێكەی ئەڵێ: ئێستا لای ئێمە زۆر خۆشە و هەمووی سەوزیی و ئاو نێرگس و گوڵاڵە سوورەیە، ئەم منداڵانە بۆ نانێری چەند ڕۆژێك لەوێ بەخۆشی رابوێرن، كابراش ئەڵێ باشە، وە لەگەڵ پیاوەكەیا ئەیان نێرێ، ڕۆژی یەكەم چێشتی دۆینەیان بۆ لێ ئەنێن. ڕۆژی دووهەم دۆكەشیكیان بۆ ئەكەن، منداڵەكان لەمانە لە هیچیان ناخۆن چونكە فێری ئەم جۆرە خواردنانە نەبوون، كابرا نە بەرخێكیان بۆ سەر ئەبڕێ، نە كیسكێك و نە مریشكێك، لەلەی منداڵەكان خێرا ئەیانباتەوە، وە داستانەكە بۆ باوكیان ئەگێڕێتەوە، باوكەكەیان زۆر دڵگیر ئەبێ، وە لە دڵی خۆیدا بڕیار ئەدا كە ئەمجارە كابراكە هاتەوە دەریكا، ڕۆژێ تەقەتەق لە قاپی ئەدەن، خاوەن ماڵ تەقەی دەرگاكە ئەناسێتەوە، وە ئەزانێ كە ئەمە كابرای شارەزوورییە، ئەڵێ كەس نەچێ بە دەنگییەوە خۆم دەرگای لێ ئەكەمەوە، لەپاش ماوەیەكی زۆر ئنجا ئەچێ ئەڵێ ئەوە كێیە؟ كابرا ئەڵێ خۆمانین، ئەڵێ خۆتان كێن؟ ئەڵێ قوربان نامناسی؟ ئەڵێ نەخێر، ئەڵێ فلانم، ئەڵێ بۆچی هاتوویت؟ ئەڵێ بۆ دیدەنی منداڵەكان ئنجا ئەمیش دەرگاكەی لێ ئەكاتەوە(.....) بۆ دەرئەهێنێ، وە ئەڵێ (ئەمە باوكی گشتیانە) وە ئەوانە هەموو لەمە كەوتوونەتەوە، كابرا سەر دائەخا و ئەڕوا، وە ئیتر جارێكی تر ناچێتەوە، ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە شتێك ئەڵێن لە ناو چەند شتێكا كە لە هەموویان باشتر و بەكەڵك تر بێ.

[400] واتە زۆر كەمە.

[401] یەكێكی پسپۆڕ لە كارێكا ئەیڵێ بە یەكێكی وا كە لە ئیشەكەی ئەما، نەشارەزا بێ و كەچی قسەشی تیا بكات.

٤٠٢)- ئەمڕۆ ئێرە دیوەخانە، سبەینێ هێلانەی مشکانە[٤٠٢]

٤٠٣)- ئەمڕۆ بە حازر، سبەینێ بە قەرز[٤٠٣]

٤٠٤)- ئەمڕۆ دنیایە و سبەینێ قیامەت[٤٠٤]

٤٠٥)- ئەمڕۆ دنیایە، سبەینێ زۆڕنایە[٤٠٥]

٤٠٦)- ئەو بۆناو هۆز، ئەو بۆناو کۆز[٤٠٦]

٤٠٧)- ئەو بەرد لە مشت و ئەم دیزە بە کۆڵە[٤٠٧]

٤٠٨)- ئەو ترەی لە قنگتایە بیکەنە[٤٠٨]

٤٠٩)- ئەو جێیە خۆشە، کە دڵی لێ خۆشە[٤٠٩]

٤١٠)- ئەو خورمایەی تۆ خواردووتە، دەنکەکەی وا لە گیرفانی منا[٤١٠]

٤١١)- ئەو خوێنەی شەوی بە سەرا تێپەڕێ، تۆڵەی فەوتاوە[٤١١]

---

[٤٠٢] واتە دنیا تا سەر بۆ کەس نامێنێ، ئەمڕۆ شوێنێك ئاوەدان و سبەینێ چۆڵ و وێرانە، مەگەر زۆڕنای تێا لێ بدرێ.

[٤٠٣] خاوەن دوان ئەم پەندە ئەنووسێ و هەڵی ئەواسێ، بۆ ئەوەی هیچ کاتێك هیچ بە قەرزنەدا، چونکە لەهەر دەمێکا بچێت بۆ لای ئەو ئەڵێ: ئەمڕۆ نا سبەینێ.

[٤٠٤] بەیەکێك ئەوترێ، کە دەست درێژی بکا بۆ مەردوم.

[٤٠٥] واتە دنیا تا سەر بۆ کەس نامێنێ، ئەمڕۆ شوێنێك ئاوەدان و سبەینێ چۆڵ و وێرانە، مەگەر زۆڕنای تێا لێ بدرێ.

[٤٠٦] یەکێك ئەیلێ کە دەستێ بەرگی لەبەرابێ، وە دستێکی کۆنی دڕاویشی هەڵواسی بێ، وە لێی بپرسن ئەم دەستە دڕاوە بە کاری چی دێ.

[٤٠٧] بەرد لە مشت: بە یەکێکی بێڕەوشت و خوو ئەڵێن کە داوای کچی بێوەژنێك بکا، ئەگەر نەیداتێ، نەنگێك بخاتە پاڵ کچەکەی، دیزە بە کۆڵ بە بێوەژنێك ئەڵێن کە کچێکی پاك و تەمیزی بێ، وە هەمیشە لە دەمی مەردوم بترسێ کە نەنگێك بخەنە پاڵ کچەکەی.

[٤٠٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی ناشرینی لە دڵا بێ، بیەوێ پێتی بڵێ.

[٤٠٩] بە یەکێك ئەڵێیت، کە پێت بڵێ: تۆ لەم شوێنە ناخۆشە بۆ نیشتەجێ بوویت؟ واتە لێرە دڵم زۆر خۆشە.

[٤١٠] واتە ئەم فڕوفێڵەی کە تۆ ئەیکەیت، من لەوسەری دێمەوە.

[٤١١]

٤١٢)- ئەو دانیشتووە لە وێرانەی وێری، خەڵقی تەموورە لێ ئەدەن بە گون و کێری[٤١٢]

٤١٣)- ئەو ژنەی دانی جوان نەبێ، بە چاو پێ ئەکەنێ[٤١٣]

٤١٤)- ئەو ساڵە ساڵی سی بوو، کۆستە برسی بوو[٤١٤]

٤١٥)- ئەو سەرە سوونە، بۆ ئەو بنە سوونە[٤١٥]

٤١٦)- ئەو سەرینە بخەرە ژێر سەرت[٤١٦]

٤١٧)- ئەو سوار و من پیادە[٤١٧]

٤١٨)- ئەو شوێنەی پاك بێ، خۆمی تیا دائەنیشم[٤١٨]

٤١٩)- ئەو چاوە کوێر بێ، دوژمنی خۆی پێ نەناسێ[٤١٩]

٤٢٠)- ئەو کاتە زانیم کار گوو بە گووە، سەرۆکی بازاڕ یا قوو بەجووە[٤٢٠]

٤٢١)- ئەو کاروانچی، من خانچی[٤٢١]

٤٢٢)- ئەو کانیەی ئاوی لێ ئەخۆیتەوە، بەدری تێ مەخە[٤٢٢]

---

[٤١٢] بە یەکێك ئەوترێ کە بێ خەم دانیشتبێ لە ماڵی خۆی، بێئەوەی گوێ بداتە ئەم و ئەو کە ناوی ئەبەن بە خراپە.

[٤١٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە کردەوەیەکی جوانی بووبێ نەیکردبێ، ئێستا بە قسەیەکی خۆش بیەوێ دای پۆشێ، یا قسەیەکی باش بووبێ نەی وتبێ ئێستا بەکردەوەیەکی جوان بیەوێ دای پۆشێ.

[٤١٤] تەماشای پەندی (ساڵ سییە، سیوەیل برسییە) بکە.

[٤١٥] سوون: کەرتەی (هەسوونە) بە دوو شتی هیچ و پووچ ئەڵێن کە بۆ یەك دەست بدەن، یا دوو کەسی خراپ کە لەگەڵ یەکا یەك کەوتبن.

[٤١٦] واتە دڵنیابە.

[٤١٧] واتە هەر چەند ئەکەم نایگرم، وەنای بینم.

[٤١٨] واتە مەردوم نابێ دریغی لە خۆی بکات، وەچی بە باش ئەزانێ، ئەوە بۆ خۆی بەکار بێنێ.

[٤١٩] واتە مەردوم چۆن ئەبێ دوژمنی خۆی نەناسێ.

[٤٢٠] بە رۆژگارێك ئەوترێ کە ناوەجاخی ناڕەسەن ببێ بە سەرۆك و کار بەدەست.

[٤٢١] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە هەر ڕۆژە نا ڕۆژێ، بێتە سەرت، ببێ بە میوان و تۆ ناچاربی خزمەتی بکەیت.

[٤٢٢] واتە لە هەر کەسێك بەهرەیەکت وەرگرت، ناوی بەخراپە مەبە.

٤٢٣)- ئەو کەسەی بڵێت و بیکا فیلەتەنە، نەڵێت و بیکا کەرکەدەنە، بڵێت و نەیکا مانگای تەڕەزەنە[423]

٤٢٤)- ئەو کەسەی دوو بەردان لە یەك بدات، ئەردێکی پەیدا ئەکات[424]

٤٢٥)- ئەو کەسەی گیان ئەدا، گیانیش ئەسێنێ[425]

٤٢٦)- ئەو کەسەی ماڵی لە شووشە بێ، نابێ بەرد بگرێتە ماڵی کەس[426]

٤٢٧)- ئەو کوتەکەی بە خۆما نەدرێ، وەك لە رەشکەی کا بدرێ وایە[427]

٤٢٨)- ئەو مانگە، مانگی ڤیروسیایە، ئەم مانگە مانگی مل شکایە[428]

٤٢٩)- ئەو نانە نانە، ئەمڕۆ لە خوانە[429]

٤٣٠)- ئەو وارە، نە ئەو بەهارە[430]

٤٣١)- ئەو وەختە دانی دوێتەم کەند، کە کردم لەگەڵ گاگەل[431]

---

[423] کەرگەدەن: گیاندارێکی زۆر گەورە و قاچ و مل ئەستوورە، تاقە شاخێك وا بە سەر لووتییەوە، تەڕەزەن: گیانداری تازە زاوە کە شیری زۆر و روون بێ.

[424] بە یەکێك ئەوترێ کە لە داوێنی شاخێکەوە تەلانێك دروست بکات و ناوەکەی پڕ بکاتەوە بە گڵ، ئەوسا ئەبێ بە خاوەنی ئەرزێك، ئنجا لەو ئەرزەدا ئەتوانێت بیکەیت بە باخ، یا بە زەرعات یا بە خانوو.

[425] واتە چاوەڕوانی هەموو شتێك هەر لە خواوە بکە.

[426] واتە یەکێك خۆی نەنگدار بێ، نابێ نەنگ لە مەردوم بگرێ.

[427] بە یەکێك ئەوترێ کە خود پەرست بێ، وە هەر چاوی لە خۆیەوە بێ.

[428] بە یەکێك ئەوترێ، کە کاری یەکێك دوا بخات، ئەم مانگ بۆ ئەو مانگ.

[429] یەکێکی لێ قەوماو ئەیڵێ بە ناکەس بەچەیەك، کە ئەمڕۆ نان دار بێ، وە خاوەنی سفرە و خوان بێ.

[430] وار: هەوارە. ئەگێڕنەوە کە یەکێك لە بەهارێکا ئەچێ بۆ لای یەکێك لە شوێنێك، وە زۆر خزمەت ئەکرێ، هەر ئەو کابرایە لە بەهارێکی تردا ئەچێتەوە بۆ ئەو شوێنە، بەڵام ئەو خزمەتە ناکرێ. ئنجا بەو بۆنەیەوە ئەڵێ: (ئەو وارە، نە ئەو بەهارە) واتە هەوار هەر هەوارەکەی جارانە بەڵام بەهارەکە ئەو بەهارە نییە، ئێستا بە شتێك ئەوترێ کە وەك جاران نەمابێ.

[431] دوێت: کچە، واتە ئەو ڕۆژە کچەکەم ماڵ وێران کرد، کە کردم بە شوانی گاگەل، یەکێك ئەیڵێ کە پاشە ڕۆژی منالی خۆی نەخوێنێتەوە و بەدەست سپی بیهێڵێتەوە.

٤٣٢)- ئەوا گا گووی کرد[٤٣٢]

٤٣٣)- ئەوە ئاوی سارد و ئەوە بەرەوژوورەی سەخت[٤٣٣]

٤٣٤)- ئەوە ئەرز و ئەوە گەز[٤٣٤]

٤٣٥)- ئەوە ئەزم، هەڵ ئەبەزم[٤٣٥]

٤٣٦)- ئەوە باوە، وا لە ناوە[٤٣٦]

٤٣٧)- ئەوە بەختی من نییە گەسك بدەم و کێری کەر بدۆزمەوە[٤٣٧]

٤٣٨)- ئەوە خەتەنە سووران بوو، زەماوەند وا لە دواوە[٤٣٨]

٤٣٩)- ئەوە خەوێ بوو دیت، ئیتر نای بینیتەوە[٤٣٩]

٤٤٠)- ئەوە گۆڕت بێ[٤٤٠]

٤٤١)- ئەوە کاوڕ بازی بوو ئەمە بەران بازییە[٤٤١]

---

[٤٣٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە تۆ چاوەڕوانی گوفتار یا کردارێکی جوانی لێ بکەیت، کەچی ئەو پێچەوانەی ئارەزووەکەی تۆ، قسەکە یا کردەوەکە بکات.

[٤٣٣] بەرەوژووری سەخت: بە خواردنەوەی ئاوی سارد ئەبڕێ، دوژمنیش بەرەوژووری لێ گرتیت زاڵ ئەبێ بە سەرتا، بە یەکێك ئەوترێ کە لێت تووڕە بووبێ، وە هەڕەشەت لێ بکا، واتە ئەوە ئاوی سارد بی خۆرەوە وە ئەوەیش بەرەوژووری سەخت بڕۆ لێم بگرە بزانم چیت لە دەست دێ.

[٤٣٤] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە گاڵتە بە کارێکت بکا، واتە فەرموو تۆ بچۆ بیکە بزانم لەوە باشتری ئەکەیت.

[٤٣٥] یەکێك ئەیڵێ کە ماوەیەك بێ سەربەستی کپ کرابێ، وە ئێستا رزگاری بووبێ.

[٤٣٦] واتە چی داهات، ئەبێ بە باو.

[٤٣٧] یەکێك ئەیڵێ، کە گلەی لە بەختی خۆی بێ.

[٤٣٨] واتە خۆشی گەورە لە دوایە.

[٤٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆشیەکی دیبێت و لەدەستی چووبێ.

[٤٤٠] بە یەکێك ئەوترێ: کە بە لاسایی خۆی، کارێکی ناپەسەند بکا، لە پاشا تووشی تۆڵەی خۆی ببێ.

[٤٤١] بە دوو کار ئەوترێ، کە دووهەمیان لە یەکەمیان گرنگتر بێ.

٤٤٢)- ئەوە ملی من و ئەوە چەقۆی تۆ[٤٤٢]

٤٤٣)- ئەوەش کەوا لە ژێر بەڕەدا، ئەکەوێتە سەر بەڕە[٤٤٣]

٤٤٤)- ئەوەندە بێ و بچۆ، قەدرت نەچۆ[٤٤٤]

٤٤٥)- ئەوەندە بە شوێن دزا بچۆ، لێت هەڵ نەگەڕێتەوە[٤٤٥]

٤٤٦)- ئەوەندە بچۆرە باوان، بەڕەیەك بەژێرت بیاران[٤٤٦]

٤٤٧)- ئەوەندە تاریکە، بە دە کوێر چاو ساغێك ناگەیەننە ماڵ[٤٤٧]

٤٤٨)- ئەوەندە دزە، کل لە چاو ئەفڕێنێ[٤٤٨]

٤٤٩)- ئەوەندە ساغە، ئەڵێی دارەکەی قەرەداغە[٤٤٩]

٤٥٠)- ئەوەندە شیرینە بە قوزەڵقورتەوە ئەخورێ[٤٥٠]

٤٥١)- ئەوەندە گەڕا بێمایە، چووەوە سەر کۆنە قایە[٤٥١]

٤٥٢)- ئەوەندە گەڕاوە، دڕاوە[٤٥٢]

---

[٤٤٢] بە یەکێك ئەڵێت، کە لێت زویر بووبێ لەسەر هەڵەیەك، واتە چیم لێ ئەکەیت سەرم لە ڕێتایە.

[٤٤٣] واتە ئەوەی ئەمڕۆ داپۆشراوە، سبەینێ دەرئەکەوێ.

[٤٤٤] واتە ئەوەندە مەچۆرە جێگایەك کە لێت وەڕەس بن.

[٤٤٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر نووزە درێژ بێ، وە لەسەر قسە زۆر بڕوا.

[٤٤٦] بیاران: واتە بیهێنن. واتە ئەوەندە مەچۆرە جێگایەك کە لێت بێزار بن.

[٤٤٧]

[٤٤٨] بە دزێك ئەوترێ، ئەوەندە دز بێ شتت لێ بدزێ لەبەرچاوی خۆت و هەستی پێ نەکەیت.

[٤٤٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر ساغ بێ، ئەم داری قەرەداغە ئەو دارەیە، کە یەکێك نزای تەمەن درێژی بۆ یەکێك بکا، پێی ئەڵێ: (یاخوا بە دارەکەی قەرەداغ بی).

[٤٥٠] واتە ئێجگار ڕەوشت و خووی جوانە.

[٤٥١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، بە نائومێدی بچێتەوە جێگای جارانی.

[٤٥٢] واتە فێری زۆر شت بووە.

٤٥٣)- ئەوەندە لاواز بووە، سەگەل چاوی لێ دائەگرن[٤٥٣]

٤٥٤)- ئەوەندەی باوەڕ پێ بکە، بڵێ خوا یەکە[٤٥٤]

٤٥٥)- ئەوەندەی قنگە جنۆکەیەکە[٤٥٥]

٤٥٦)- ئەوەی ئامۆژگاری نەوێ، یارمەتیشی ناوێ[٤٥٦]

٤٥٧)- ئەوەی ئەیخوات نایزانێ، ئەوی تێی ئەووشێ ئەیزانێ[٤٥٧]

٤٥٨)- ئەوەی بۆ گووکەر هەڵ ئەکەوێ، بۆ راوکەر هەڵ ناکەوێ[٤٥٨]

٤٥٩)- ئەوەی با کردی بە باران، باران کردی بە بەفر[٤٥٩]

٤٦٠)- ئەوەی بە بێوەژنی ئەیکەیت، بە کچێنی بت کردایە[٤٦٠]

٤٦١)- ئەوەی بە تەمای دراوسێ بێ، بێشێو سەر ئەنێتەوە[٤٦١]

٤٦٢)- ئەوەی بە گاوان ببڕێ، ماکەر گاینە[٤٦٢]

٤٦٣)- ئەوەی بە فەلاح ببڕێ، دانەوێڵەیە[٤٦٣]

---

[٤٥٣] واتە بە تەمان لە کۆڵانێکا بمرێ و بکەوێ و سەگەل ورگی بدڕن.

[٤٥٤] واتە زۆر درۆزنە، هیچی پێ باوەڕ مەکە.

[٤٥٥] بە شوێنێکی زۆر بچووک ئەوترێ.

[٤٥٦] بە یەکێکی ئەڵێت، کە لە کارێکا ئامۆژگاریت کردبێ و بە گوێی نەکردبێت، لە پاشا تێ شکابێ و داوای یارمەتیت لێ بکات.

[٤٥٧] واتە ئەو کەسەی مەسرەفی ماڵ ئەکات ئەزانێ چی خەرج ئەکا.

[٤٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی باشی لێ هەڵکەوێ بێ ئەوەی بیەوێ بەهرەی لێ وەرگرێ.

[٤٥٩] واتە هەر ستەم لێکراوێ بۆی بلوێ تۆڵەی خۆی لە یەکێکی تر ئەکاتەوە.

[٤٦٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کاتی خۆیا ئیشێکی نەکردبێ و لە پاشا بیکا.

[٤٦١] کەواتە بەتەمای کەس مەبە، هەوڵ و تەقەلای خۆت نەبێ.

[٤٦٢] بە یەکێکی هیچ و پووچی پەست ئەوترێ، کە لە کارێکی پیرۆزا بەهرەمەند نەبێ مەگەر بە شتێکی زۆر بێنرخ.

[٤٦٣] دەوڵەمەندێکی دڵفراوان ئەیڵێ کە دەوڵەتەکەی خەرج بکا و پیاوەتی بە سەرەوە لێ بدات.

٤٦٤)- ئەوەی بە منەوەیە، ناومە بە تۆوە، هەتاکو بمریت بسووتێیت پێوە[٤٦٤]

٤٦٥)- ئەوەی بەوی کرد، بابەدەواری شڕی نەکا[٤٦٥]

٤٦٦)- ئەوەی پێم کرد خێرە، لێم بوو بە گورگ و شێرە[٤٦٦]

٤٦٧)- ئەوەی گا دەیکا، گا نای خوا[٤٦٧]

٤٦٨)- ئەوەی کە خاوەن ماڵ ئەیزانێ دز بیزانێ هیچ لە ماڵا ناهێڵێ[٤٦٨]

٤٦٩)- ئەوەی لای بەندە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە[٤٦٩]

٤٧٠)- ئەوەیش وا لە ژێر بەڕەدا، ئەکەوێتە سەر بەڕە[٤٧٠]

٤٧١)- ئەوجا بزانە کفری کاوولە، ئازای مەجلیسی قۆجە شاوورە[٤٧١]

٤٧٢)- ئەوسا شا، شالیاربوو، تەتەر وێران بوو[٤٧٢]

٤٧٣)- ئەولاد شیرینە، تەربییە لە ئەولاد شیرین ترە[٤٧٣]

٤٧٤)- ئەوی ئەیدەم بە کرێ ئەیدەم بە ترێ[٤٧٤]

---

[٤٦٤] یەکێك ئەیڵێ، کەخۆی ئەنگێکی ببێ، کەچی خۆی بە بێ ئەنگ نیشان بدا، وە ئەنگەکەی خۆی بنێ بە سەر یەکێکی ترا.

[٤٦٥] واتە زۆری شەکانەوە.

[٤٦٦] کەواتە تا ئەتوانی خۆت بپارێزە لە شەڕی ئەو کەسەی کە چاکەی لەگەڵ ئەکەیت.

[٤٦٧] واتە ئەوی دەستت کەوێ نابێ هەمووی بخۆیت، بەڵکو ئەبێ هێندێکی پاشەکەوت بکەیت.

[٤٦٨] چونکە خاوەن ماڵ لە دزەکە زۆرتر ئەترسێ.

[٤٦٩] واتە هەر چی تۆ بتەوێ خوا بۆت ناکا.

[٤٧٠] واتە هەموو شاراوەیەك دەرئەکەوێ.

[٤٧١] قۆجە شاوور: ناوی پیاوێکی هیچ و پووچی بێنرخ بووە لە شاری کفری. بە شوێنێك ئەوترێ کە لە جیاتی پیاوە باشەکان، پیاوە خراپەکان لەسەر کار بن.

[٤٧٢] واتە جاران کە ئەو هەموو پیاوە باشانە بوون، دنیا وێران بوو، چ جای ئێستا.

[٤٧٣] واتە ئەولادی بێ تەربییە نەبوونی باشترە لە بوونی.

[٤٧٤] یەکێك ئەیڵێ، کە ئیشی خۆی خۆی بیکا نەك بە یەکێکی تری بکا بە کرێ، وە ئەو پارەیەی کە ئەدرێ بە کرێ بۆ ئەو جۆرە ئیشانە، بۆ خۆی وە لە خۆیا خەرجی بکا.

٤٧٥)- ئەوی ئەیزانیت گشتی مەڵێ، ئەوی گوێت لێیە بە هەمووی باوەڕ مەکە[٤٧٥]

٤٧٦)- ئەوی بۆ ئەو ڕێکەوتووە، بۆ بزنی دێلێژە ڕێ نەکەوتووە[٤٧٦]

٤٧٧)- ئەوی بۆ جێگەر ئەیکا، بۆ دێگەر نایکا[٤٧٧]

٤٧٨)- ئەوی بۆ خۆتی ڕەوا ئەبینیت، بۆ خەڵقیشی ڕەوا ببینە[٤٧٨]

٤٧٩)- ئەوی بە تەمای نانی ماڵاوسێ بێ، لە برسانا ئەمرێ[٤٧٩]

٤٨٠)- ئەوی بە پەیژەدا سەرکەوێ، ئەبێ لە خوارەوە دەست پێ بکات[٤٨٠]

٤٨١)- ئەوی بە فەلاح ببڕێ، دانەوێڵەیە[٤٨١]

٤٨٢)- ئەوی بە مێرووڵە بتڕێ، تەبەقە تڕانەی ناوێ[٤٨٢]

٤٨٣)- ئەوی بترسێ، ناخەلەسێ[٤٨٣]

٤٨٤)- ئەوی بەسەر ڕۆی، بە ملا ئەڕوا[٤٨٤]

٤٨٥)- ئەوی بخوازێ ڕوویەکی ڕەشە، ئەوی نەیداتێ هەر دوو ڕووی ڕەشە[٤٨٥]

---

[٤٧٥] گشتی مەڵێ: واتە ئەوەندەی بڵێ کە ڕاست بێ.

[٤٧٦] دێلێژە: دێیەکە لە قەرەداغ، ئاوی سارد و لەوەڕی باشی هەیە، لەبەر ئەوە بزنی هەمیشە قەڵەو و بەدەقە، بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر باش بۆی ڕێ کەوتبێ.

[٤٧٧] جێگەر: جگەرە. دیگەر: لە (دگر)ی فارسیەوە هاتووە، بە مەعنای بێگانەیە، واتە بێگانە نابێ بە کەس.

[٤٧٨] واتە خۆت بکە بە ئاوێنە، مەردومی تیا ببینە.

[٤٧٩] کەواتە بە تەمای کەس مەبە، هەوڵ و تەقەلای خۆت نەبێ.

[٤٨٠] واتە هەموو شتێك ئەبێ لە نووکەوە دەست پێ بکات، وە لە بناغەوە سەرکەوێ.

[٤٨١] یەکێکی بخۆرە ئەیڵێ، کە پێی بڵێن، تۆ بۆ ئەوەندە پارە خەرج ئەکەیت وە دەست ناگریتەوە؟ واتە چۆن فەلاح لە هەموو خۆشییەك نائومێدە دانەوێڵەکە نەبێ کە پێی ئەبڕێ، منیش هەر خواردنەکەم بۆ ئەمێنێتەوە.

[٤٨٢] چونکە هەر کەسێ بیخوا هەر ئەتڕێ.

[٤٨٣] واتە ئازا بە لە هیچ مەترسە، وە بە ترسەوە دەست مەدەرە هیچ کارێك.

[٤٨٤] واتە شتی نادروست ئەنجامیشی نادروستە.

[٤٨٥] ڕوویەکی ڕەشە: ئەو ڕووەیەتی کە پێی داوا کردووە، هەر دوو ڕووی ڕەشە: ڕوویەکی بەوە ڕەشە کە داوای لێکراوە و نەیداوە، ڕووەکەی تری بەوە ڕەشە کە ئەو شتەی داوای لێکراوە هەیەتی و نەیداوە.

٤٨٦)- ئەوی بڕوای بە خۆی نییە، شایەنی پشت پێبەستن نییە[٤٨٦]

٤٨٧)- ئەوی بنشێ بە لای خاسەوە، ئەویش ئەپێچرێ بە لباسەوە، ئەوی بنیشێ بەلای حیزەوە، ئەویش ئەپێچرێ بە تیز تیزەوە[٤٨٧]

٤٨٨)- ئەوی تۆ پێی پەستی، من پێی مەستم[٤٨٨]

٤٨٩)- ئەوی تۆراوە، بەشی خوراوە[٤٨٩]

٤٩٠)- ئەوی تۆوی دڕك بچێنێ، تا ماوە گوڵ نابینێ[٤٩٠]

٤٩١)- ئەوی تەڕ بێ، لە باران ناترسێ[٤٩١]

٤٩٢)- ئەوی پشتی ناحەق بگرێ، نۆکەری زاڵمە[٤٩٢]

٤٩٣)- ئەوی پیازی نەدیبێ، قنچکە نێرگس ئەچێنێ[٤٩٣]

٤٩٤)- ئەوی پیشەی ئازاردان بێ، ئەبێ تووشی مل شکان بێ[٤٩٤]

٤٩٥)- ئەوی پێم ئەکرد خێر، لێم بوو بە گورگ و شێر[٤٩٥]

٤٩٦)- ئەوی حوشترەوانی بکا، ئەبێ سەر دەرگاکەی بڵند کا[٤٩٦]

---

[٤٨٦] چونکە مەردوم تا خاوەنی بیر و باوەڕێك نەبێ، هیچی لێ ناوەشێتەوە.

[٤٨٧] واتە لەگەڵ باش بیت باش ئەبێت، وە لەگەڵ خراپ بیت خراپ ئەبیت.

[٤٨٨] چونکە لە دەستووری جیهانە کە ناخۆشی یەکێك خۆشی یەکێکی تربێ.

[٤٨٩] کەوابوو تا ئەتوانی لە هیچ مەتۆرێ.

[٤٩٠] بەڵکوو هەر دڕك ئەبینێ.

[٤٩١] چونکە ئەو کەسەی لە باران بترسێ، لەبەر تەڕ بوونەکەیەتی، کە تۆ تەڕیت لەچی ئەترسیت.

[٤٩٢] چونکە بەو پشتگرتنی ناحەقیە خزمەتی زوڵم ئەکات.

[٤٩٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر نەشارەزایی لە جیاتی شتێك بە شتێکی ترەوە خەریك بێ.

[٤٩٤] چونکە ئەگەر ستەم لێکراوەکانیش دەستی لێ نەوەشێنن، خوا لە باڵی ئەدا.

[٤٩٥] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە خراپەت لەگەڵ بکات، دوای ئەوەی کە تۆ چاکەت لەگەڵ کردبێ.

[٤٩٦] واتە دەستت دایە هەر کارێك، ئەبێ بە پێی ئەو کارە خۆت ئامادە بکەیت.

٤٩٧)- ئەوی دۆست بە دۆستی ئەکا، دوژمن بە دوژمنی ناکا[٤٩٧]

٤٩٨)- ئەوی دەزرییەکی پیا کردیت، تۆ سووژنێکی پیا بکە[٤٩٨]

٤٩٩)- ئەوی دڕك بچێنێ نابێ پێخاوس بگەڕێ[٤٩٩]

٥٠٠)- ئەوی رووتە، مەلکەمووتە[٥٠٠]

٥٠١)- ئەوی زۆر بخوا، زۆر ناژی[٥٠١]

٥٠٢)- ئەوی سەری ئەپۆشێ، ژێری ئەفرۆشێ[٥٠٢]

---

[٤٩٧] چونکە ئەوەندەی دۆست شارەزاتە، دوژمن ئەوەندە شارەزات نییە.

[٤٩٨] واتە هەر کەسێك ستەمێکی لێکردیت، تۆش ستەمەکەی لێ بکەرەوە بە زیادەوە، تا جارێکی تر ستەمت لێ نەکات.

[٤٩٩] بە یەکێکی دوژمندار ئەوترێ.

[٥٠٠] مەلکەمووت: بێنرخە.

[٥٠١] بۆیە قورئان ئەفەرموێ( کلوا و اشربوا و لاتسرفوا) واتە بخۆن و بخۆنەوە و زیادە خۆری مەکەن.

[٥٠٢] لە ئاینی ئیسلاما پەچە نییە، قورئان بە ژنان ئەفەرموێ (ولا یبدین زینتهن لا ماظهر منها) واتە ئەندامی جوانیان دەرنەخەن بۆ بێگانە، مەگەر ئەوەندە نەبێ کە لە مالآ، وە لە ئیش و کارا، دەرئەکەوێ، وەك دەم و چاو و هەر دوو دەست، تا مەچەك، وە هەر دوو قاچ تا قولەپێ، کە ئەمانە لە شەرعا عەورەت نین، بۆیە لە نوێژا دروستە بە دەرەوە بن، ئەوی لە ئاینا دروست نییە بۆ ژنان دەرخستنی، سنگ و مەمك و شان و مل و قۆڵ و لنگە، کە هەرچی شەرم بێ تیا نییە، وە بە ئاشکرا مایەی جوڵاندنی ئارەزووی پیاوە، کە ئەمەش دەردێکە وەك دەردی فەرەنگی، فەرەنگەکان بە دیاری بۆیان هێناوین تا بناغەی رەوشت و خوومان بروخێنن.

گەلی کورد بە تێکڕایی، وە ئەوەی لە سەر سروشت مابێتەوە وەك لادێییەکان هەموو سەربەرزن، وە ناوچەوان و روخساریان بە دەرەوەیە وە هەموو رەوشت و خوویەکی بەرز و بەهێز و ئازایان هەیە، پێویستە لەسەر هەموو باوك و دایکێك، لە پێشەوە شرینقەی رەوشت و خووی بەرز بدەن لە منالەکانیان بە ڕەنگێکی وا کە ئەگەر ئاسمان بڕوخێ، ئەوان لە سنووری ئازایی و مەردی، نەچنە دەرەوە، وە هەروەها بە چاوی ناپاکیش تەماشای ناموسی مەردوم نەکەن.

٥٠٣)- ئەوی گەڕا دڕا، ئەوی کردی بردی[٥٠٣]

٥٠٤)- ئەوی قەرز ئەدا بە دۆست هەر دووکی لە کیس ئەچێ[٥٠٤]

٥٠٥)- ئەوی کەوش دروست بکات، ئەبێ دانیش بەکار بێنێ[٥٠٥]

٥٠٦)- ئەوی کردی بە قسەی ژنێ دەستی داوە لەوێ گونێ[٥٠٦]

٥٠٧)- ئەوی لای بەندە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە[٥٠٧]

٥٠٨)- ئەوی لای دیزەوە دانیشێ، ڕەش ئەبێ[٥٠٨]

٥٠٩)- ئەوی لای کوورەی ئاسنگەرەوە بێ، پڕیشکی بەرئەکەوێ[٥٠٩]

٥١٠)- ئەوی لە ئاش بێ بە ئاشەوانی مەزانە[٥١٠]

٥١١)- ئەوی لە ئاش بێ، شانی ئارداوی ئەبێ[٥١١]

٥١٢)- ئەوی لە تۆ دوورە، ڕەنگی سوورە[٥١٢]

٥١٣)- ئەوی لە دیزە بێ، بە ئەسکوێ دەردێ[٥١٣]

---

[٥٠٣] واتە ئەوی گەڕا بە جیهانا، دڕا ئەوەندە رووپەڕەی جیهانی دی، بەڵام ئەوی ئیشی کرد و رەنجی دا، بەری کردەوەی خۆی برد.

[٥٠٤] واتە قەرزەکەش و دۆستەکەش.

[٥٠٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە خەریکی کارێك بێ، بێئەوەی ئەو رەنجەی کە بیەوێ، بۆی بدا، کە کەوشت دروست کرد، ئەبێ بە دان چەرمیش ڕابکێشێت.

[٥٠٦] ئەمە بۆ هەموو ژنێك نییە، بەڵکو هەر بۆ ژنێکی نەخوێندەوارەی هیچ نەزانە، ئەگینا زۆر ژنی وا هەیە لە پیاو ژیرتر و بە بیرتر و زاناتر و داناترە.

[٥٠٧] چونکە زۆر جار بەندە شتێك بڕیار ئەدا و خوا شتێکی تری بڕیوەتەوە.

[٥٠٨] واتە هاوڕێی خراپ، خراپە.

[٥٠٩] کەواتە تا ئەتوانیت خۆت بپارێزە لە هەموو پڕیشکێك.

[٥١٠]

[٥١١] بە یەکێك ئەوترێ کە لە نزیکی شتێکەوە پڕیشکێکی لێ پەڕی بێ.

[٥١٢] بە یەکێکی خراپ ئەوترێ، کە هاوڕێی خراپ بێ.

[٥١٣] بە یەکێك ئەوترێ کە بیەوێ نەنگێکی تۆ بڵێ، واتە ئەگەر تۆ نەنگی من بڵێیت، منیش نەنگی تۆ هەیە ئەیڵێم، وە هەر چی لە دیزەدا بێ بە ئەسکوێ دەری دێنم.

٥١٤)- ئەوی لە سەر ڕێگا گوو بکات، ئەبێ جنێویش قوبووڵ بکات[٥١٤]

٥١٥)- ئەوی لە شەڕا نەبێ شێرە[٥١٥]

٥١٦)- ئەوی لە شەڕا نەبێ شیری تیژە[٥١٦]

٥١٧)- ئەوی لە کاسەدا بێ، بە کەوچك دەردێ[٥١٧]

٥١٨)- ئەوی لە ماڵم نییە، ئاگای لە حاڵم نییە[٥١٨]

٥١٩)- ئەوی لە مشك بێ، جەواڵ ئەدڕێ[٥١٩]

٥٢٠)- ئەوی لە مشك بێ، هەمبان دڕە[٥٢٠]

٥٢١)- ئەوی لەبەر چاوانە، لەبەر دڵانە[٥٢١]

٥٢٢)- ئەوی لەگەڵ بووکێ نەبێ، لەگەڵ بەربووکێ نییە[٥٢٢]

٥٢٣)- ئەوی لەگەڵ هەوادا بێ، لەگەڵ هەوادا ئەڕوا[٥٢٣]

٥٢٤)- ئەوی منارە بدزێ، کیفیشی بۆ ئەکا[٥٢٤]

٥٢٥)- ئەوی نامگۆڕێتەوە بە ئێستر، نایگۆڕمەوە بە کەر[٥٢٥]

---

[٥١٤] چونکە خەڵق پیس ئەکات.

[٥١٥] چونکە خۆی هەڵئەکێشێ وەك فسفس پاڵەوان.

[٥١٦] چونکە خۆی هەڵئەکێشێ وەك فسفس پاڵەوان.

[٥١٧] تەماشای راڤەی سێ پەند لەمەپێش بکە.

[٥١٨]

[٥١٩] بە ئەوەی زۆردارێکی ستەمکار ئەوترێ، کە ئەمیش وەك باوکی زۆر و ستەمێکی کردبێ، واتە هیچ شتێك بنیانی خۆی ون ناکا.

[٥٢٠] بە ئەوەی زۆردارێکی ستەمکار ئەوترێ، کە ئەمیش وەك باوکی زۆر و ستەمێکی کردبێ، واتە هیچ شتێك بنیانی خۆی ون ناکا.

[٥٢١] چونکە شەرم لە چاو ئەکرێ.

[٥٢٢] چونکە بەربووك نابێ کەسی لەگەڵ بێ.

[٥٢٣] چونکە بە ڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوان پەیدای نەکردووە.

[٥٢٤] کە تیا حەشار بدا واتە هەر کەسێك دەست بداتە هەر کارێك، ئەبێ خۆی بۆ ئامادە بکا.

[٥٢٥] واتە ئەوی حورمەتم نەگرێ باشتر حورمەتی ناگرم.

٥٢٦)- ئەوی ناوکی بویٚ، ئەبیٚ تویٚکڵ بشکیٚنیٚ[٥٢٦]

٥٢٧)- ئەوی نەبیٚ لە دەرپیٚی شڕم، نابیٚ بە کوڕم[٥٢٧]

٥٢٨)- ئەوی هەڵیٚگرت شمشیٚر، نابیٚ گویٚ بداتە شیٚر[٥٢٨]

٥٢٩)- ئەی بووکەکەی ماڵی مەتی، سەرت رووتە و پات پەتی[٥٢٩]

٥٣٠)- ئەی پایزە برا، مەرحەبا[٥٣٠]

٥٣١)- ئەی حاجەت زیٚڕینە، هوٚت ئەکەویٚتە حاجەت گووینە[٥٣١]

٥٣٢)- ئەیباتە سەر کانی و ئاوی نادا[٥٣٢]

٥٣٣)- ئەیەویٚ بدا لە ئاو، لاقی تەڕ نەبیٚ[٥٣٣]

٥٣٤)- ئەیەویٚ ماسی بگریٚ و قنگی تەڕ نەبیٚ[٥٣٤]

٥٣٥)- ئەیخوٚی بیخوٚ، نایخوٚی عەبەلە ئەیخوا[٥٣٥]

---

[٥٢٦] واتە ئەوەی گەنجی بویٚ ئەبیٚ رەنجی بوٚ بدا.

[٥٢٧] تەماشای ئەو پەندە بکە کە ئەڵیٚ(بەلا لە شەرواڵی شڕت، کوڕی کەس نابیٚ بە کوڕت).

[٥٢٨] واتە کە چەکت پیٚ بوو، ئەبیٚ لە هیچ نەترسیت.

[٥٢٩] بە ئافرەتیٚك ئەوتریٚ، کە بەریەرەڵلا بیٚ.

[٥٣٠] بەیەکیٚك ئەوتریٚ، کە تا ئیشیٚکی نەبیٚ نەیەتە لات، وەك ئەو هەژارانەی کە لە پایزانا دەرئەکەون، بوٚ کوٚکردنەوەی دەغڵ و دان لەسەر خەرمانان.

[٥٣١] بەیەکیٚك ئەوتریٚ کە قاپ و قاچاخ نەدا بە دراوسیٚ بە سپاردە (امانە)واتە ئەی ئەو کەسەی حاجەتەکانی خوٚت بە زیٚڕ ئەزانیت، ئەوەندە دڵ ڕەق مەبە، با خوا توٚش وەك ئیٚمە نەکات بە خاوەنی حاجەتی گووینە.

[٥٣٢] بە یەکیٚك ئەوتریٚ کە زوٚر زوٚرزان و فیٚڵباز بیٚ، وە بتوانیٚ مەردوم ئیغفال بکا.

[٥٣٣] بە یەکیٚك ئەوتریٚ کە بیەویٚ گەنجی دەست کەویٚ بە بیٚ رەنج.

[٥٣٤] واتە هەموو کاریٚك جوٚرە هەوڵ و تەقەلایەکی ئەویٚ، وە هیچ شتیٚك بە بیٚهەوڵ دەست ناکەویٚ.

[٥٣٥] بە منالیٚك ئەوتریٚ، کە لە بەشە خواردنەکەی توٚرابیٚ، وادیارە (عەبەلە) منالیٚکی نەوسن بووە، هەر کەسیٚ توٚرابیٚ، ئەو بەشەکەی خواردووە.

٥٣٦)- ئومێدمان بە وەیس بوو، وەیسیش بە سوننی دەرچوو[٥٣٦]

٥٣٧)- ئیتر رۆن بدە لە سەر سنگت[٥٣٧]

٥٣٨)- ئێستر و ماین بە شەڕ دێن، کەر و گا بەر لەقە ئەکەون[٥٣٨]

٥٣٩)- ئێسکت مریَ ئێسك گران، حەسیرە شڕەی گویَ ئاگردان[٥٣٩]

٥٤٠)- ئیسکی ئەکا کانیَ، موسکی ئەبەنە دیوانیَ[٥٤٠]

٥٤١)- ئیش نیشی خاتوونیَ ناو ناویَ مەیمونیَ[٥٤١]

٥٤٢)- ئیش شێرە، دەستت پیَ کرد رێوییە[٥٤٢]

٥٤٣)- ئیش کەرە، تا لێی نەخوڕیت ناڕوا[٥٤٣]

٥٤٤)- ئیش کەرم بمریَ، مشوور خۆرم نەمریَ[٥٤٤]

٥٤٥)- ئیش کەری خۆتی، خۆشەویستی خەڵقی[٥٤٥]

---

[٥٣٦] وەیسی قەرەنی: یەکێکە لەوانەی کە بە خزمەت هاورێی پێغەمبەر گەیشتووە، خوابگاهی لە مایدەشتە لە کوردستانی ئێران، وە زیارەتگای موسڵمانانی ئەو ناوەیە، وا دەرئەکەویَ چەند شیعەیەك لە دوورەوە هاتوون بۆ زیارەتی، لە پاشا کە زانیویانە وەیس سوننییە، ئەم پەندەیان وتووە، ئێستا بە یەکێك ئەوتریَ کە هیوایەکی زۆرت پیَ ببیَ، کەچی بە پێچەوانەی هیواکەی تۆ ئەو دەرچیَ.

[٥٣٧] بە یەکێك ئەوتریَ، کە رقی لەیەکێك بیَ، وە خوا بە ئارەزووی دڵی ئەو پێی نوواندبیَ، وە ئەم دڵی سارێژ بووبیَ.

[٥٣٨] واتە خۆت تێکەڵی جەنگی پیاوی گەورە مەکە.

[٥٣٩] زۆرتر بە پیاوی ماڵیَ ئەوتریَ کە پیر بووبیَ و لە گویَ ئاگردان کەوتبیَ.

[٥٤٠] ئیسکی: عیسایی یە. مووسکی: مووسایی یە، بە یەکێك ئەوتریَ دەستی خۆی وەشاندبیَ و بە کامی خۆی گەیشتبیَ و یەکێکی تر بگیریَ و بخرێتە ژێر گیر و گرفتەوە.

[٥٤١] بە کارێك ئەڵێن یەکێك بیکا و یەکێکی تر ناوبانگی پیَ دەربکات.

[٥٤٢] واتە ئیش کە نەیکەیت هەر بە سەرتەوە ئەمێنێتەوە کە دەستیشت دایە بەرە بەرە کەم ئەبێتەوە.

[٥٤٣] واتە ئیش کە نەیکەیت هەر بە سەرتەوە ئەمێنێتەوە کە دەستیش دایە بەرە بەرە کەم ئەبێتەوە.

[٥٤٤] تەماشای راڤەی پەندی (تەگبیر کەرە نەمریَ، فرمان کەرە بمریَ) بکە.

[٥٤٥] واتە مەردومی لەش سووك خۆشەویستی هەموانە.

٥٤٦)- ئیشی ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ[٥٤٦]

٥٤٧)- ئیشی بەزاری، بۆخم دەچمە یاری[٥٤٧]

٥٤٨)- ئیشی ژنان بیست و چوارن، هەر نان و هەویر دیارن[٥٤٨]

٥٤٩)- ئیشی من راست بێ، ئیشی تۆ ئاسانە[٥٤٩]

٥٥٠)- ئیشی نییە کرداران دەکا، گولی نییە هەوساران دەکا، عەمەلی نییە فەرمانان دەکا[٥٥٠]

٥٥١)- ئیمرۆ چی بچێنین، سبەینێ ئەوە ئەدروینەوە[٥٥١]

٥٥٢)- ئیمرۆ و سبەی ئەکات[٥٥٢]

٥٥٣)- ئیمسال سالّی مەیموونە، ئەمە هەوەڵمانە ئاخۆ ئاخرمان چۆنە[٥٥٣]

٥٥٤)- ئینسان بە وەسیەت نامرێ[٥٥٤]

٥٥٥)- ئینسان بچێتە شاری کوێران، ئەبێ دەست بە چاوەوە بگرێ[٥٥٥]

---

[٥٤٦] نە وەك تەگەرەی تێ بكەوێ.

[٥٤٧] یەكێك ئەیلێ كە هەمیشە چەقەی بێ لەگەڵ دەست و پێوەندا، وە هەمیشە پێیان بلێ: ئەوە بكەن، ئەوە مەكەن، ئەوە وانابێ و وا ئەبێ، واتە خۆم هەستم و بیكەم گەلێ ئاسانترە لەم چەقە چەقەم.

[٥٤٨] واتە ئیش و كاری ژن ئێجگار زۆرن، بەڵام بەشی زۆری وردە ئیشن و نابینرێن، دوانیان نەبێ كە لەبەر چاون.

[٥٤٩] ئەمەش جۆرێكە لە خودپەرستی.

[٥٥٠] بە یەكێك ئەوترێ كە بە خۆرایی خۆی لە هەموو كارێك تێ هەڵقورتێنێ.

[٥٥١] واتە هەر وەك گەنم بچێنین گەنم و جۆ بچێنین جۆ ئەدروینەوە، هەروا چاكەش بچێنین چاكە و خراپە بچێنین خراپە ئەدروینە.

[٥٥٢] بە یەكێك ئەوترێ ، كە تەفرەت بدا و دەستی دەستیت پێ بكات.

[٥٥٣] بە هاودەمێك ئەوترێ كە یەكەم ڕۆژ دڵت بشكێنێ.

[٥٥٤] واتە هەموو كەسێك چ ئارەزوویەكی هەیە بۆ دوای مردنی با هەر لە ئێستاكەوە بی نووسێ.

[٥٥٥] واتە ئەبێ مەردوم لەگەڵ ناوچەدارێ بكەوێ.

٥٥٦)- ئینسان سەر ئەدۆڕێنێ قسە نادۆڕێنێ[٥٥٦]

٥٥٧) ئینسان قەدری وا بە خۆیەوە[٥٥٧]

٥٥٨) ئینسان کە بە خەیاڵ پلاوی لێنا، هەتا چەورتر بێ باشترە[٥٥٨]

٥٥٩) ئینسان کە خۆڵ بکا بە سەر خۆیا، لەدەر ماڵی گەورە بیکا بەسەرخۆیا[٥٥٩]

٥٦٠)- ئینسان لە نزیك کوورەوە بێ پڕیشکی لێ ئەپەڕێ[٥٦٠]

٥٦١)- ئینسان وەك گا هەر لە پێستێکا نابێ[٥٦١]

٥٦٢)- ئینسانی غەریب لە بەرەوە پێی ئەڵێن دانی قەوییە و لە پێشەوە پێی ئەڵێن قنگی قەویە[٥٦٢]

٥٦٣)- ئێوارە وەختە، چرپن بە جەختە[٥٦٣]

---

واتە ئەوی مەردە، قسە ناگێڕێتەوە.

[٥٥٧] واتە ئەگەر کاری جوان بکەیت بەرێزی و کاری ناشرین بکەیت بێرێز ئەبیت.

[٥٥٨] بە یەکێك ئەوترێ کە کردەوەی نەبێ و بە خەیاڵ ئیش بکات.

[٥٥٩] مەبەست لەم دەوڵەمەندە، ئەو دەوڵەمەندە موسڵمانانەیە کە .وڵەتەکەیان بە ماڵی خوا ئەزانن، وە هەژاران و لێقەوماوان بە هاوبەش ئەزانن لە داراییەکانیان.

[٥٦٠] واتە تا ئەتوانیت هاوڕێی پیاوی خراپ مەکە.

[٥٦١] واتە دەوڵەمەندیش ئەبێ و هەژاریش ئەبێ، ساغیش ئەبێ و نەخۆشیش ئەبێ.

[٥٦٢] واتە کەس شەرمی لێ ناکا.

[٥٦٣] بە ئافرەتێکی تەمەڵ ئەوترێ، کە ئێواران بکەوێتە خۆی، وە دەست بکا بە ماڵ پاك کردنەوە.

## (پیتی ب)

١) با بخۆیس تا نەکوتراوین[1]

٢)- با بڕوا سیر بخوا و زۆڕنا لێدا[2]

٣)- با دیزە بەدەرخۆنە بێت[3]

٤)- با کەو بچێتە بانی دار[4]

---

[1] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی پیسکەی دەوڵەمەندی ئاژاڵدار، ژنەکەی بێزوو ئەکات بە سىر و جگەرە، هەر چەند ئەکا دڵی برِوایی نادات گیسکێکی بۆ سەر برِێ، ناچار ئەچێ بۆ شار، بۆ کرِنی سی و جگەرێك ئەمەندە گیرە گیر ئەکات، کابرای قەساب پێی نافرۆشێ، وە بە گاڵتەوە پێی ئەڵێ: سی و جگەر لە فلاَن شار هەرزانە، کابرا بە پێ ملی رێ ئەگرێ بۆ ئەو شارە، ئێوارە وەخت ئەگاتە شارەکە، ماڵێکی گەورە دەرئەکەوێ، ئەچێ ئەبێ بە میوانی ئەو ماڵە، بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕی ئەکەن، دوای نان پێ گەیشتن، ژنی خانە خوێکە دێ بە مێردەکەی ئەڵێ، نان حازرە ئنجا (بخۆین و بی کوتین، یا بی کوتین و بخۆین)؟ میوانەکە زەرد هەڵ ئەگەڕێ لە ترسا، خانەخوێکە، تێئەگات، خێرا پێی ئەڵێ: برالە ئەم خێزانی منە ژنی خزمێکی دەوڵەمەندی پیسکەی خۆمان بووە، وە ئەم کۆشکە هی ئەو بوو، تا مرد نەخۆی و نە ئەم ژنە تێریان لێ نەخوارد، لە پاشا بە وەجاخ کوێری مرد، وە لە ژوورێکی ئەم خانووەدا نێژراوە، وە ژنەکەی شووی کردەوە بە من، وە من هاتمە سەر ئەم ماڵە حازرە، ئێستا بەیانیان و ئێواران کردوومانە بە دەستوور، پێش نان خواردن، یا دوای نان خواردن، گۆڕەکەی ئەدەینە بەر تێلاَ، تا هیلاك ئەبین، ئنجا خێزانەکەم ئەمەی مەبەست بوو کە وتی بخۆین و بی کوتین، یا بی کوتین و بخۆین. کابرا، کە ئەمە ئەبینێ، بەیانی بە پەلە ئەگەڕێتەوە، بەرانێك سەر ئەبڕێ، ژنەکەی واقی ورئەمێنێ وە ئەڵێ پیاوەکە! ئەمە چییە؟ کابراش داستانەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، وە ئەڵێ( با بخۆین تا نەکوتراوین).

[2] بە یەکێك ئەوترێ کە کەتنێکی پێ کرابێ و دەستێکی لێ وەشێنرابێ.

[3] واتە ئەم باسە با هەر بە پەنهانی بمێنێتەوە.

[4] بە یەکێك ئەوترێ، کە داوای شتێکت لێ بکا، واتە هەرگیز بۆت ناکەم، چونکە هەرگیز کەو ناچێتە سەردار.

٥)- با له کوێوه بێ، ئەو لەوێوه شن ئەکا[٥]

٦)- با نۆش لەسەر دەبێ[٦]

٧)- با هەر سیر بخوا و زۆڕنا لێدا[٧]

٨)- باب کوشته خەوی لێ ئەکەوێ، داك مرده خەوی لێ ئەکەوێ، له برسا مرده خەوی لێ ناکەوێ[٨]

٩)- بابێ شەن ئەکا، باران بێ ئاشی ئەگەڕێ[٩]

١٠)- باخ سالێ بەر نەگرێ، نابڕێ[١٠]

١١)- باخ نان ئاسانە، بەرهەم هێنانی گرانە[١١]

١٢)- باخ هی باخەوانە و بێستان هی بێستانەوان[١٢]

١٣)- باخەوان لە کاتی ئەنگورا گوێچکەی ناژنەوێ[١٣]

١٤)- باخەوان لە کاتی ترێدا، گوێی گرانە[١٤]

١٥)- باخەوانی، باشترە لە چاوەڕوانی[١٥]

---

[٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە پێی ڕۆژ هەڵسوڕێ.

[٦] بە یەکێکی ئەڵێت، کە بێکارێکی ترت لە پێشەوە بە سەرا دابێ.

[٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە زەرەرێکی قورسی لێ درابێ. وە هەر بۆڵە بۆڵ و خوتە خوت بکا، وە لەبەر خۆیەوە قسە بڵێ.

[٨] چونکە دەردی برسێتی لە هەموو دەردێ گرانترە.

[٩] تەماشای پەندی چواردەهەم بکە.

[١٠] واتە دەست لە یەکێك هەڵناگیرێ کە سالێ قازانجی بۆت نەبێ.

[١١] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێك دابمەزرێنێ و نەیباتە سەر.

[١٢] واتە ئەو کەسەی کە رەنج بدا لە شتێکا، ئەو شتە بۆ ئەو لە هەموو کەس لە پێشترە.

[١٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی لە ژێر دەستا بێ، وە نەیەوێ بەشی کەسی لێبدا، یا یارمەتی کەسی تیا بدا.

[١٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی لە ژێر دەستا بێ، وە نەیەوێ بەشی کەسی لێبدا، یا یارمەتی کەسی تیا بدا.

[١٥] واتە رەنج بدەیت چاکترە لەوەی چاوەڕوانی دەستی یەکێك بی.

١٦)- باخی بەبەرە[16]

١٧)- بار بەلا یاران، قەت ناگاتە هەواران[17]

١٨)- بار لە باج نانالێنێ[18]

١٩)- بار لە رێوە، یا لە جێوە[19]

٢٠)- بارێ قورئان بنێن لە کەرێ، بیبەنە مەککە و بیهێننەوە هەر کەرە[20]

٢١)- باران نەبارێ، زەوی نەشۆرێ، چەقەڵ گان ئەکا رێوی ئەتۆرێ[21]

٢٢)- باران باری بە تەقە تەق، درز و درومان هاتەوە یەك[22]

٢٣)- باران بباریێ ئاشم ئەگەڕێ، باران نەبارێ جووتم ئەگەڕێ[23]

٢٤)- بارت بگرە و باجت بسێنە[24]

٢٥)- بارە گوێزی لێ نێ، خڕەی نایەت[25]

٢٦)- بارەکەی شووشەیە[26]

٢٧)- باری گەورە، حوشتر ئەیبا[27]

---

[16] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئاواتی هاتبێتە دی.

[17] بە یەکێك ئەوترێ کە ئیشێکی زۆری ببێ، وە کەم کەم بەم و بەوی بکات.

[18] یەکێکی دەوڵەمەند ئەیلێ، کە بە ناوی خەرج و باج، یا دەست گیرۆییەکەوە، پارەی لێ بسێنن، واتە هەر گا هەیە قەیناکات.

[19] واتە کە گەیشتە پێشەوە بیفرۆشە، یا لە پاش چەند رۆژێك بیفرۆشە، بەلام نەکەیت هەڵی گریت بۆ گرانی.

[20] بە یەکێك ئەوترێ، کە تا ئەمرێ، هەر کەر بێت.

[21] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەر شتی وا بتۆرێ، کەهیچ دەخڵی بەسەر ئەوەوە نەبێ.

[22] بە دوو کەس ئەوترێ، کە شیر و تیر لە یەك بسوون، کەچی کوتوپڕ ئاشت ببنەوە، وە هیچ لە بەینیانا نەمێنێ.

[23] واتە لە هەموو لایەکەوە بەهرەمەندم.

[24] واتە تا بە چاوی خۆت شتێك نەبینیت، قسەی لێ مەکە.

[25] واتە زۆر گوێ ڕایەڵ و فەرمانبەرە.

[26] بە یەکێك ئەوترێ ، کە کارێکی ناسکی بە دەستەوە بێ، وە نەتوانێ دەنگی دەرچێ.

[27] واتە پیاو تا گەورەتر بێ، باری لەشی قورستر و گرانتر ئەبێ.

٢٨)- باریکان ئەڕێسیٚ[٢٨]

٢٩)- باز گولی بە جمالّی شێرۆ[٢٩]

٣٠)- باز لە بازگەدا ئەگیریٚ[٣٠]

٣١)- بازاڕ دلۆپەیە[٣١]

٣٢)- بازاڕی گەرمە[٣٢]

٣٣)- بازاڕی کەساسە[٣٣]

٣٤)- بازنی ئالّتوونی لە دەستایە[٣٤]

٣٥)- بازی بازی، بە ریشی باباش بازی[٣٥]

٣٦)- بازی دایە چالّە قووتەکەوە[٣٦]

٣٧)- بالّەخانەت لیٚ کردوم بە کونە چۆلەکە[٣٧]

٣٨)- بالّدار بە بالّ ئەفڕیٚ، بینادەم بە برادەر[٣٨]

---

[٢٨] واتە زۆر درێژە بە قسە ئەدا.

[٢٩] باز: وتەیەکی فارسییە، بە مەعنای دووبارە، ئەم پەندە ئەردەلانییە هەر منالّێك کە کارێکی جوان بکات پێی ئەلّێن: ( گولّیٚ بە جەمالّت)واتە ئافەرین، وادیارە (شێرۆ) ناوێکە، یەکەم جار ئیشێکی جوانی کردووە پێی وتراوە (گولّیٚ بە جەمالّی شێرۆ) ئێستاش هەر منالّێك کارێکی جوان بکات، پێی ئەلّێن (باز گولّیٚ بە جەمالّی شێرۆ).

[٣٠] واتە هەموو شت ئەبیٚ لە هەلی خۆیا بگیریٚ.

[٣١] واتە کەس نازانیٚ کڕیار، کەی دیٚ بۆ لای.

[٣٢] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە دەست کەوتی زۆر بیٚ.

[٣٣] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە دەستکەوتی کەم بیٚ.

[٣٤] بە یەکێکی دەست ڕەنگین ئەوتریٚ، کە پیشەیەك بزانیٚ، وە بە هەولّی بازوی خۆی، بتوانیٚ بژی.

[٣٥] بە یەکێکی لە خۆت منالّتر ئەوتریٚ، کە بیەویٚ فێلّێکت لیٚ بکا.

[٣٦] واتە مرد. لە رووی سووکییەوە بە کار ئەهێنریٚ.

[٣٧] واتە زۆر سەرت ناوەتە سەرم، وە هەراسانت کردووم.

[٣٨] یەکێك بەخۆی ئەلّیٚ کە چەند برادەرێکی ببیٚ، هەر یەکە بە جۆرێك یارمەتی بدەن.

۳۹)- باڵندەیەك بوو، نەی ئەخوێند، کە ئەیخوێند ئەیوت: کو ر

٤٠)- باڵی شکاوە و قاچی ئەبەستن[40]

٤١)- بانگی محەمەد بە ئاشکرا خۆشە[41]

٤٢)- بانێکە و دوو هەوا[42]

٤٣)- باوەژن، دین دوژمن[43]

٤٤)- باوەڕت بەخۆت بێ و پشت بە کەس مەبەستە[44]

٤٥)- باوك بێ برای ئامۆزا فرە[45]

٤٦)- باوك کوژراو دەس هەڵئەگرێ، پلاوخۆر دەس هەڵناگرێ[46]

٤٧)- باوکە بەڵایە، دایکە قەزایە، ژن نیعمەتی خوایە[47]

٤٨)- باوکمان برایە و من چکێ لە تۆ وەجاخزادەترم[48]

---

[39] بە یەکێك ئەوترێ، کە نەزانێ بدوێ، وە هەر چەند قسە بکا، شەکرێك بشکێنێ.

[40] پزیشکێکی ناشی ئەوترێ.

[41] بە شتێکی باش ئەوترێ، کە بە دزییوە بکرێ، واتە وەك بانگ بە ئاشکرا بکرێ باشە.

[42] ئەگێڕنەوە کە ژنێك کوڕێك و کچێکی ئەبێ، کوڕەکەی ژن ئەهێنێ و کچەکەی شوو ئەکات، وە هەر دووکیان لە ماڵی دایکەکەیانا ئەمێننەوە. شەو لەسەر بان کوڕەکەی و بووکەکەی لە لایەکەوە، وە کچەکەی و زاواکەشی لە لایەکی ترەوە ئەنوون، نیوەشەو دایکەکەیان بە سەریانەوە ئەگەڕێ، کە ئەچێتە سەر جێگای بووکەکەی پێی ئەڵێ: گەرمە تۆزێك لە یەك دوور کەونەوە، کە ئەچێتە سەر جێگای زاواکەی ئەڵێ: ساردە نەختێك نزیك کەونەوە، تا شەوێ: کوڕەکەی پێی ئەڵێ: دایە بۆچی ئەمە بانێکە و دوو هەوا، ئنجا ئێستا بە دەستوور و باوێك ئەڵێن کە بەسەر یەکێکا بەراورد بکرێ و بە سەر یەکێکی ترا نەکرێ.

[43] واتە باوەژن وەك دوژمنێکی دینی وایە بۆ هەنەزای خۆی.

[44]

[45] بە یەکێکی دەست دار ئەوترێ، کە لە هەموو لایەکەوە مەردوم خۆیان بکەن بە خزمی.

[46] چونکە هەر کەسە تەماشای قازانجی خۆی ئەکا.

[47] چونکە ئەوی لای ئەم دەست ئەکەوێ، لای ئەوان دەست ناکەوێ.

[48] برایەکی ناوەجاخ ئەیڵێ: بە برایەکی هەژاری خۆی، کە ئەو لەم دەوڵەمەندتر بێ، یا پایەیەکی ببێ.

٤٩)- باوێشکی بۆ ئەدا[٤٩]

٥٠)- باویلێ، باوێکی بەسە[٥٠]

٥١)- بای باڵی خۆت بدە[٥١]

٥٢)- بای دایەوە سەربای بەڕە بۆر[٥٢]

٥٣)- بایە و بە لای گوێیا ئەڕوا[٥٣]

٥٤)- بە بۆنەی دڕکەوە گوڵیش سزا ئەدرێ[٥٤]

٥٥)- بە بۆنی کەبابەوە هات، نەیزانی کەر داخکردنە[٥٥]

٥٦)- بە بێ کینەیی زاڵم باوەڕ مەکە[٥٦]

٥٧)- بە بابێ و بە باران، لە عومری بەفرە زیان[٥٧]

٥٨)- بە باڵی یەکێکی تر ئەفڕێ[٥٨]

٥٩)- بە بوار نەگەیشتووە، دەرپێ دائەکەنێ[٥٩]

---

[٤٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر حەزی لە شتێك بێ و دەستی نەکەوێ.

[٥٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەر هەموو قسەیەك زوێر ببێ.

[٥١] واتە بگەڕێ و پیاسە بکە.

[٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە مەسەلەیەکی گرتبێ بەدەمەوە، وە هەموو جارێ قسە بەرێتەوە سەری.

[٥٣] واتە قسەکە ناچێتە دڵیەوە.

[٥٤] چونکە زۆر جار، دڕکی گوڵەکە، ئەچێ بە دەستی خاوەنەکەیا، وە بەو بۆنەیەوە، گوڵەکەش فڕێ ئەدرێ، بە یەکێکی پاك ئەوترێ کە بەهۆی یەکێکی خراپەوە، دووچاری تۆڵە و سزایەك ببێ.

[٥٥] بەیەکێك ئەوترێ بە هیوایەکی باشەوە روو بکاتە شوێنێك و وادەرنەچێ، وە بە بێ هیوا بگەڕێتەوە.

[٥٦] واتە لە زۆرداری ستەمکار دڵنیا مەبە.

[٥٧] یەکێك بە کاری ئەهێنێ، کە لە هەموو لایەکەوە، زەرەرمەند بێ.

[٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو ئیشێکی بەهۆی ئەم و ئەوەوە بۆ بکرێ.

[٥٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پێش وەختا خۆی ئامادە بکا بۆ کارێك.

٦٠)- بە تا ئەمگرێ و بە لەرز بەرم ئەدا[٦٠]

٦١)- بە تەماشا کردن بوایە، سەگ زوو فێری قەسابی ئەبوو[٦١]

٦٢)- بە تەماشا، نابێتە پاشا[٦٢]

٦٣)- بە تەمای بنکڕ نیم و سەری مدبەقچی ئەشکێنم[٦٣]

٦٤)- بە تەمای فرۆی مانگا زەردە[٦٤]

٦٥)- بە تەمای نیسکێ، لە ئیمانێ مەگەڕێ[٦٥]

٦٦)- بە تەمایە ماسی بگرێ و قنگی تەڕ نەبێ[٦٦]

٦٧)- بە تڕ حەمام گەرم نابێ[٦٧]

٦٨)- بە تڕ گۆیژە ئەکێڵێ[٦٨]

---

[٦٠] واتە لە بەڵایەك نابمەوە، بەڵایەکی تر تووشم ئەبێ.

[٦١] واتە فێربوونی هەموو شتێك، هەر بە خوێندن یا تەماشا کردن نابێ بەڵکو بە مێشك و بە دڵە.

[٦٢] بە یەکێك ئەوترێ کە بە چاوی پیس تەماشای ناموسی مەردوم بکات.

[٦٣] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە بە تەمای خێر و بێری نەبێ، وە ناوی بەرێ بە خراپە.

[٦٤] ئەم مانگا زەردە قەت نەزاوە تا فرۆی ببێ، بە یەکێك ئەوترێ کە هیچ هیوای لێ نەکرێ.

[٦٥] لەناو مەردوما، وادەنگ بڵاوە، کە شۆربای نیسك، خواردنی پێغەمبەران و پیاوچاکان بووە، وە خواردنێکی پیرۆزە، لەبەر ئەوە یەکەم رۆژی رەمەزانان، زۆر رۆژو وان خواردنی هەر نیسکە، ئنجا ئەم پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە هیچ چاکە و خواپەرستیەکی نەبێ، تەنیا نیسك خواردن نەبێ واتە هەموو دەست مایەی ئیمانت نیسك خواردنە، وە هیچ بەڵگە نیشانەیەکت بە دەستەوە نییە لەسەر ئیمان و بڕوا، نیسك خواردن ئەبێ کە ئەمەش هیچ بایەخێکی پێ نییە، کەواتە (بە تەمای نیسکی لە ئیمانێ مەگەڕێ).

[٦٦] واتە هەموو کارێك جۆرە هەوڵێکی ئەوێ، وە بە بێ ئەو هەوڵە ئەو ئیشە جێبەجێ نابێ.

[٦٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە بیەوێ ناوێك وەرگرێ، بێ ئەوەی هەوڵێك بدا پیاوەتیەك بکا، لەو رێیەدا.

[٦٨] واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

٦٩)- به تڕ گوێز ئەشکێنێ[٦٩]

٧٠)- به توندوتیژی ئیش ناچێته سەر، به زبانی شیرین مار له کون دێته دەر[٧٠]

٧١)- به توورەکەی بەتاڵ، ئەسپ ناگیرێ[٧١]

٧٢)- به تیرێ، دوو نیشان ئەشکێنێ[٧٢]

٧٣)- به پەتی خەڵق خۆت مەخنکێنە[٧٣]

٧٤)- به پەڕرێك سەری برە[٧٤]

٧٥)- به پەرێزیا نەچووە[٧٥]

٧٦)- به پەڕێك سەر ئەبڕرێ[٧٦]

٧٧)- به پەلەپیتکە، خۆی ئەتەکێنێ[٧٧]

٧٨)- به پرسیار بەغدا ئەدۆزرێتەوە[٧٨]

٧٩)- به پشیلەیان وت: گووت به دەرمان ئەشێ دەچوو ئەیکرد به ژێر خۆڵەوە[٧٩]

٨٠)- به پشیلەیان وت: گووت به دەرمان ئەشێ دەچوو سەرچاوەی حەمامۆك ئەڕیا[٨٠]

---

[٦٩] واته به دەعیه و دەمارە.

[٧٠] واته تا ئەتوانیت زبانت لەگەڵ هەموو کەسێکا شیرین بێ.

[٧١] واته به فڕ و فێڵ، ئیش ناکرێ.

[٧٢] به قسەیەك ئەوترێ، که دوو مەعنای ببێ، وە به هەر مەعنایەك شتێکی مەبەس بێ.

[٧٣] به یەکێك ئەوترێ که چاو له یەکێکی گەورەتر بکا لەخۆی، وە شتێك بکا که پێی نەکرێ.

[٧٤] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر بەسزمان بێ.

[٧٥] واته نزیکی نەکەوتۆتەوە.

[٧٦] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر بەسزمان بێ.

[٧٧] واته خۆی زۆر پاك و خاوێن رائەگرێ.

[٧٨] پرسا بەو دانابە.

[٧٩] به یەکێك ئەوترێ که لەگەڵ زانی ئیشێکیان پێیەتی، بچێ خۆی بشارێتەوە.

[٨٠] به یەکێك ئەوترێ که لەگەڵ زانی ئیشێکیان پێیەتی، بچێ خۆی بشارێتەوە.

[illegible] به پفێ [illegible] ئەگیرسێ، به تفێ ئه[illegible] تەوە[٨١]

٨٢)- به پیری، ئەچێته بەر هەویر[illegible][٨٢]

٨٣)- به پێکەنینی زالم باوەڕ مەکە[٨٣]

٨٤)- به جاڕیا نەچووە[٨٤]

٨٥)- به جوو سەرت بخوسێنه، بەگاور بیتاشه[٨٥]

٨٦)- به حەوت ئاو شۆراوەتەوە[٨٦]

٨٧)- به حەوت تەور ملی نابڕێتەوە[٨٧]

٨٨)- به حەوت ساڵان کوڕێك، ئەویش بۆره جرێك[٨٨]

٨٩)- بـه حـەوت کەسـان نەئەچـووە شـایی، کـه ئەشچـوو، بـه حـەوتان نەدەهاتە دەرێ[٨٩]

٩٠) به حوشتریان وت: بۆچی ملت درێژە؟ وتی دووربینی پێ ئەکەم[٩٠]

---

[٨١] به یەکێك ئەوترێ، که بەقسەیەك توورە ببێ و به قسەیەك ئاشت بێتەوە.

[٨٢] به یەکێك ئەوترێ، که له پیریدا دەست بداتە ئیشێکی گران.

[٨٣] چونکه دوای پێکەنینەکە، که به سەریا هات، ئەنێرێ بتکوژن بۆ ئەوەی ژنەکەت مـارە بکا، یا خانۆکەت داگیر بکا.

[٨٤] جاڕ: جێگەی هەموو دانەوێڵەیەکە که دروابیتەوە، واته به پەرێزیا نەچووە.

[٨٥] چونکه جوو زۆر دوژمنە، که سەرت بخووسێنێ زۆر چاك هەڵی ئەگلۆفێ تا ئازارت بدا، سەریش تا باش بخوسێنرێ تاشینی خۆشـترە، بـەڵام بـه گـاور بیتاشـه چـونکه لـه جـوو ئەمین ترە.

[٨٦] به شتێك یا به کەسێك ئەوترێ، که له شتێکی تر، یا کەسێکی تر باشتر بێ.

[٨٧] واته قەڵەو و مل ئەستوورە.

[٨٨] بۆره جرە: باڵندەیەکی بۆرە وەك (فشەکڵاونە) بەڵام ئـەم بچـوکترە و بـێ کـڵاوە. بـه هەولدانێك ئەوترێ که ئامانجەکەی شتێکی رێك و پێکی باش نەبێ.

[٨٩] به یەکێك ئەوترێ، که به تکا نەبێ دەست نەداتە کارێك، که دەستیشی دایە، ئنجا بـه تکا نەبێ دەستی لێ هەڵ نەگرێ.

[٩٠] واته مەردووم تا دووربینی بکا، کەمە.

٩١)- بە حوشتریان وت: خەت، وتی نەم کردییە قەت[٩١]

٩٢)- بە حوشتریان وت: کوڕت بوو، وتی باری خۆم لەسەر پشتی خۆمە[٩٢]

٩٣)- بە حینجەوە لەبەریەتی[٩٣]

٩٤)- بە خۆت بخۆ تێر، بە خەڵق مەکە خێر[٩٤]

٩٥)- بە خۆشی زستان وە زەردەخەنەی دوژمن باوەڕ مەکە[٩٥]

٩٦)- بە خۆم بڵێن ئاغا، بە ژنەکەشم بڵێن ئاغاژن[٩٦]

٩٧)- بە خۆی چەندە، بەشی ویی هەر هەندە[٩٧]

٩٨)- بە خاسە خاسە، ریایە کاسە[٩٨]

٩٩)- بە خاڵۆ خاڵۆ، خۆی خستە ماڵۆ[٩٩]

١٠٠)- بە خاڵە خاڵە هات بەلامەوە، بوو بە هەژدیها دای بە پامەوە[١٠٠]

١٠١)- بە خانمانە ئەیکەن و بە کارەکەرانە ئەیرپێژن[١٠١]

---

[٩١] واتە بە حوشتریان وت وەك گاجووت، هێڵێ لەو زەوییە بدە وتی ئەمە کاری من نییە، یەکێك ئەیڵێ کە داوای شتێکی لێبکەن، کە کاری ئەو نەبێ.

[٩٢] واتە کەس یارمەتی کەس نادات.

[٩٣] حینجە: خوێندنەوەی نووسراوە بە باسی سەروبۆر و ژێر و زەنەوە، بە یەکێك ئەوترێ کە شتێك بزانێ بە خۆی و هەموو لك و لۆ و پەراوێزێکییەوە.

[٩٤] بە یەکیك ئەوترێ لە دەمی خۆی و ماڵ و منالی بگێڕێتەوە و بیکا بە خێر، واتە خۆت و منالەکانت تێر بکەیت هەر خێرە.

[٩٥] چونکە کە وەختی خۆیان هات بستت بە قەرز نادەن.

[٩٦] بە تەوسەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە حەزی لە ناوی گەورە بێ.

[٩٧] واتە هەموو کەسێك بە پێی دەسەلاتی خۆی بەشی دراوەتێ.

[٩٨] بە یەکێك ئەوترێ کە خەریکی کارێك بێ، وە هەر ئامۆژگارییەکی بکەیت لەو رووەوە، هەر بڵێ: خاسە، وەکی تریش هیچ.

[٩٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە قسەی خۆش خۆی بسەپێنێ بەسەر یەکێکا.

[١٠٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە قسەی خۆش زەفەرت پێ ببا، تا پێتەوە ئەدا.

[١٠١] خانمی ماڵ، دڵی بە ماڵی خۆی ئەسووتێ، بەلام کارەکەر مەبەسی نییە، وە ئەیرێژێ، بە یەکێك ئەوترێ کە بە چنگە کرێ ماڵ کۆ بکاتەوە وە بە فیڕۆش بەختی بکا.

١٠٢)- بە خەڵقی سەگ ئەوەڕێ، بە من پشیلەی ناتەواو[١٠٢]

١٠٣)- بە خوێنی سەری تینووە[١٠٣]

١٠٤)- بە دۆش ئەژەنێ[١٠٤]

١٠٥)- بە داتە و بە دوێتێ، ئیشێکیان کرد بۆی گووی لێ تێ[١٠٥]

١٠٦)- بە داریان وت: دوژمنێکت بۆ پەیدا بووە ناتهێڵێ، وتی: مەگەر کلکی لە خۆم نەبێ[١٠٦]

١٠٧)- بە دەرزی بیر هەڵناکەندرێ[١٠٧]

١٠٨)- بە دەست بیدە و بە پێ دوای کەوە[١٠٨]

١٠٩)- بە دەستی خۆت نەبێ، خorووی پشتت داناکەوێ[١٠٩]

١١٠)- بە دەستی خۆم، چیم کرد بە خۆم[١١٠]

١١١)- بە دەستی خۆی ئاگری بەرداوەتە ماڵی خۆی[١١١]

١١٢)- بە دەستی خەڵق مار ئەگرێ[١١٢]

١١٣)- بە دەستێك دوو کاڵەك هەڵناگیرێ[١١٣]

---

[١٠٢] یەکێك ئەیلێ، بە یەکێك کە لە خۆی گەلێ خوارتر بێت، وە ناوی ئەمی بە خراپە بردبێ.

[١٠٣] واتە دوژمنێکی زۆر سەختە.

[١٠٤] واتە بە هەموو خواردەمەنیێك رازییە و دائەکەوێ.

[١٠٥] واتە بە دایك و بە کچ ئیشێکی زۆر خراپیان کرد، بە دوو کەس ئەوترێ، کە کارێکی پۆخڵ بکەن.

[١٠٦] واتە ئەگەر تەور کلکی لە خۆم نەبوایە وا قەلاچۆی نەئەکردم.

[١٠٧] واتە بە شتی بچووك کاری گەورە ناکرێ.

[١٠٨] بە یەکێك ئەوترێ کە قەرز بدا بە یەکێك و لە پاشا دوای کەوێ و دەستی نەکەوێتەوە.

[١٠٩] واتە ئیشی خۆت، خۆت نەبێ کەس بە دڵی خۆتی ناکا.

[١١٠] یەکێك ئەیلێ، کە کارێکی کردبێ و پەشیمان بووبێتەوە.

[١١١] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆی خۆی تووش کردبێ.

[١١٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە بەسەر ماڵی خەڵکەوە پیاوەتی بکا.

[١١٣] واتە دوو ئیش بە جارێك مەگرە دەست.

١١٤)- بە دەستێك چەپلە نیادرێ[114]

١١٥)- بە دەم و بە دد... تێی وشیوە[115]

١١٦)- بە دەمێ ئەخۆن و بە قنگێ ئەڕین[116]

١١٧)- بە دەمی یەکا تفیونەتەوە[117]

١١٨)- بە دەنگی مەلا باوەڕ ناکا، بە زەڕەی کەر باوەڕ ئەکا[118]

١١٩)- بە درێژی خۆتا ئەڕوانیت، بە پانی خەڵقیشا بڕوانە[119]

١٢٠)- بە دزی ئیزرائیلەوە ئەگەڕێ[120]

١٢١)- بە دوای کەری تۆپیودا ئەگەڕێ، ناڵی بکێشێتەوە[121]

١٢٢)- بە دوعای پشیلە باران ناباری[122]

١٢٣)- بە دوعای کەر جۆ ناباری[123]

١٢٤)- بە ڕۆژە ڕۆژە ساڵمان بردە سەر، ئەوا بەهار هات قنگمان کەوتە دەر[124]

---

[114] یەکێك ئەیلێ، بە ئاوەڵێکی خۆی کە ئەوەندەی ئەم باشبێ لەگەڵ ئەو، ئەو وانەبێ، ئنجا ئەگەر دووهەم لە هێندێ شتا گلەی کرد لە یەکەم، یەکەم بەم پەندە وەڵامی ئەداتەوە، واتە تۆش وەك من وابە تا منیش لە هەموو شتێکا لەگەڵ تۆدا باش بم.

[115] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆری خەرج کردبێ.

[116] بە دوو کەس ئەوترێ، کە زۆر تێکەڵ بن و هەموو شتێکیان یەك بێ.

[117] بە دوو کەس ئەوترێ، هەرچی ئەمیان بیڵێت، ئەویش بیڵێت.

[118] بە قسەی یەکێکی هیچ و پووچی بێ نرخ باوەڕ ئەکا.

[119] واتە چۆن ڕێزی خۆت ئەگریت، ڕێزی مەردومیش بگرە.

[120] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر پیر و ئیفتادە بێ، واتە وەختی مردنی هاتووە بەڵام لە ئیزرائیل ون بووە.

[121] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پیسکەییدا، گەیشتبێتە پەڕی ئەوپەڕ.

[122] واتە وەنەبێ هەر کەسێك حەزی لە چی بێ، ئەوەی دەست کەوێ.

[123] واتە وەنەبێ هەر کەسێك حەزی لە چی بێ، ئەوەی دەست کەوێ.

[124] بەیەکێك ئەوترێ کە کارێکی زۆر گرنگی ببێ و نەیکا، وە ڕۆژ بە ڕۆژ دوای بخات، تا وەختەکەی بەسەر ئەچێ.

١٢٥)- به رۆژی باران سووتیێ، به رۆژی با بکوژێیتەوه[١٢٥]

١٢٦)- به ڕۆنی خۆی سووری ئەکاتەوە[١٢٦]

١٢٧)- به ڕیش بووایه بزن سەردار ئەبوو[١٢٧]

١٢٨)- به ڕیش نییه به ئیشه[١٢٨]

١٢٩)- به ڕێوییان وت: کێ شاهدته؟وتی کلکم[١٢٩]

١٣٠)- بەڕێز خاوەنی ناکا بێڕێز[١٣٠]

١٣١)- به زۆر بینێرن بۆ مازوان، به دارا هەڵ نارِوانێ[١٣١]

١٣٢)- به زبان شێر ئەکاته ڕێوی[١٣٢]

١٣٣)- به زبانی شیرین مار له کون دێته دەر[١٣٣]

١٣٤)- به زەبری شوولك سەکسار سەما ئەکات[١٣٤]

١٣٥)- به زەرەی کەر بەهار نایەت[١٣٥]

١٣٦)- به زەڵم و تانجەڕۆ، پاك نابێتەوه[١٣٦]

١٣٧)- به زستان جارێك ئەڵێن سارده[١٣٧]

---

[١٢٥] به یەکێك ئەوترێ که تاقه یەك شت به کار بێنێ به گەلێ جۆر.

[١٢٦] واته لەهیچه وشکه منەتی به سەرا ئەکا.

[١٢٧] واته دیمەن پەرست مەبە.

[١٢٨] واته دیمەن پەرست مەبە.

[١٢٩] به یەکێك ئەوترێ، که له کاتی قسه و گفتوگۆدا، خزمێکی خۆی بکاته شاهد.

[١٣٠]

[١٣١] واته ئیش به زۆره ملی ناکرێ.

[١٣٢] واته زبانی زۆر شیرینه.

[١٣٣] واته زبانی شیرین، بۆ مەردوم زۆر پێویسته.

[١٣٤] سەکسار: مەیموونی نێری قنگ سووره، واته هەموو شتێك به زەبر و زەنگ ئەکرێ.

[١٣٥] به یەکێك ئەوترێ، که به هاشه و هووشه هیچی نەهێشتبێتەوه.

[١٣٦] واته زۆر پیس و گڵاوه.

[١٣٧] به یەکێك ئەوترێ، که توانجێکت تێ بگرێ، وه هەموو ڕۆژێك بیلێتەوه واته توانجت که گرته یەکێك، جارێکی تر تێی مەگرەوه.

١٣٨)- بە زستانا پینە و پەڕۆ، بە هاوینان ورد ورد بڕۆ[١٣٨]

١٣٩)- بە زمانی خۆم چیم کرد بەخۆم[١٣٩]

١٤٠)- بە سێ برا کلاوێکیان هەیە[١٤٠]

١٤١)- بە سەبەتەش ناگوێزرێتەوە[١٤١]

١٤٢)- بە سەد تەبیب بە قەد دەردەدارێك نازانێ[١٤٢]

---

[١٣٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە توانجێکت تێ بگرێ، وە هەموو رۆژێك بیلێتەوە واتە توانجت کە گرتە یەکێك، جارێکی تر تێی مەگرەوە.

[١٣٩] ئەگێڕنەوە کە جۆلایەك ژنێکی جوانی ئەبێ، وە بەم بۆنەیەوە زۆر سەرودڵی خۆش ئەبێ، وە هەمیشە بە دەم کارەوە گۆرانی ئەڵێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئاغای ئەو شوێنە، بە بەر ماڵی جۆلادا ئەڕوا، گوێی لە دەنگی گۆرانییەکی زۆر بە جەخت ئەبێ. ئەمیش ئەچێتە ژوورەوە، دوای سلاو لە جۆلا ئەپرسێ ئەڵێ: وا دیارە سەر و دڵت زۆر خۆشە؟ ئەویش ئەڵێ لە سایەی ئاغاوە کارم هەیە و ژنی جوانم هەیە، ئەگەر دڵخۆش نەبم خوا ئەمگرێ، لەم قسانەدا ژنەکەی دێ بە سەرا، ئاغا کە چاوی پێئەکەوێ، زۆری حەز لێ ئەکا کە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ئەنێرێ بە شوێن جۆلا و ژنەکەیا، ئەمانیش بە ناچاری ئەچن، ئاغا ئەڵێ: من ژنەکەم مردووە، ئەم ژنی تۆیە بۆ من باشە، تۆ ئەم ژنە تەلاق بدە، بچۆ ژنێکی تر بۆ خۆت بێنە، خەرجی چی بوێ بۆت ئەدەم، کابرای جۆلا بە ناچاری هەر لەوێ ژنەکەی بۆ تەلاق ئەدا، وەخۆی بە تەنیا ئەگەڕێتەوە وە لەبەر خۆیەوە ئەڵێ (بە زبانی خۆم، چیم کرد بەخۆم) لەپاش ماوەیەك، ئاغا دووبارە بە بەر دەمی ماڵی جۆلادا ئەڕوا، کە تەماشا ئەکا ماڵ کش و مات، دەنگی کەسی لێوەنایەت، کە ئەچێتە ژوورەوە، ئەبینێ وا کابرای جۆلا، بە لەپەوە کەوتووە بۆ تەنیایی خۆی ئەگری، ئاغا زۆر بەزەیی پیا دێتەوە، وە لەگەڵ خۆیا ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە، تاقە کچێکی ئەبێ، لێی مارە ئەکا، لە پاش ماوەیەکی کەم ئاغاش ئەمرێ، هەر چی دارایی ئەبێ ئەمێنێتەوە بۆ ژنی جۆلا، ئنجا کابریا جۆلا ئەڵێ: (ئەگەر وا نەبووایە وا نەئەبوو).

[١٤٠] بە چەند کەسێك ئەوترێ، کە بە هەموویان تاقە شتێك بەکار بێنن.

[١٤١] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر پەرپووت و کەفتەکار بێ.

[١٤٢] چونکە ئەو بە دەستوری تەبیبی شت ئەزانێ، بەلام نەخۆش لە خۆیا شتەکەی تاقی کردۆتەوە.

١٤٣)- به سەد دەرزی گاسنێکی تیا نابێ[١٤٣]

١٤٤)- به سەر ئاوی حەمامەوه پیاوەتی ئەکا[١٤٤]

١٤٥)- به سەر هەلدا مەچۆ[١٤٥]

١٤٦)- به سەرم کەرەوه با به سەلکه پیازێکیش بێ[١٤٦]

١٤٧)- به سەرما نووستوو، بەگەرما هەستاوه[١٤٧]

١٤٨)- به سەریا بێ دۆ و دۆشاو تێکەڵ ئەکا[١٤٨]

١٤٩)- به سکێ تێر و به دوو برسی[١٤٩]

١٥٠)- به سکی خاڵی، ئاگر بازی ناکرێ[١٥٠]

١٥١)- به شەو جەردە، به رۆژ مەردە[١٥١]

١٥٢)- به شوێن کەری تۆپیوا ئەگەڕێ، ناڵی بکێشێتەوه[١٥٢]

١٥٣)- به شیری شوانیش باوەڕ ناکا[١٥٣]

---

[١٤٣] به یەکێکی ناتەواوی نیوه و نیوەچڵ ئەوترێ لە کارێکا، واته به سەد کۆلکه خوێندەوار خوێندەوارێکی به راستی تیا نابێ.

[١٤٤] به یەکێك ئەوترێ، که بیەوێ به خۆڕایی مەردوم مەمنون بکات.

[١٤٥] واته زۆر جار هەل هەڵ ئەکەوێ وەك ئەسپێکی زین کراوی لغاو کراو، وه به بەر دەمتا ئەڕوا، خێرا دەست بدەره لغاوەکەی و سواری بە، چونکه ئەگونجێ جارێکی تر ئەو هەلەت بۆ هەڵ نەکەوێتەوه.

[١٤٦] واته بمخوێنەرەوه با به شتێکی زۆر بێ نرخیش بێ.

[١٤٧] به یەکێکی تەمەڵ ئەوترێ، که له کاتی خۆیا ئیشەکانی نەکا.

[١٤٨] بەیەکێك ئەوترێ که لەگەڵ تووڕە بوو، هەموو قسەیەك بکا.

[١٤٩] به مەردومی هەژاری برسی ئەوترێ.

[١٥٠] واته هیچ شتێك، به بێپاره ناکرێ.

[١٥١] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر و ستەمیش بکات و پیاوەتیشی ببێ.

[١٥٢] واته زۆر لات و هەژاره و داوەشاوه.

[١٥٣] شیری شوان، ئەو شیره بێخەوشەیه که شوان له دەشت ئەیدۆشێ بۆ خواردنی خۆی. به یەکێك ئەوترێ ، که بەدگومان بی، وه هەر چی بێتە بەردەمی وا بزانێ که غەشی تیایه.

١٥٤)- به چ عەیارەیەك بپێورێت، بەو عەیارەیە بۆت ئەپێونەوە[١٥٤]

١٥٥)- بە چەپڵە قوزێ ناچێتە دەرێ[١٥٥]

١٥٦)- بە چرای ڕۆن گەرچەکەوە بگەڕێیت نایدۆزیتەوە[١٥٦]

١٥٧)- بە گۆڕی باوکت مەنازە، مووچەت نان و پیازە[١٥٧]

١٥٨)- بە گایان وت کەی وەختە؟ وتی کە مانگا بەکەڵ بێ[١٥٨]

١٥٩)- بە گورگان خواردووی دا[١٥٩]

١٦٠)- بە گورگیان وت: ئەمڕۆ نۆرە شوانیتە وتی بە خوا پێم پەتیە[١٦٠]

١٦١)- بە گوڵێ بەهار نایەت[١٦١]

١٦٢)- بە گوڵیان وت بۆ وا گەشی؟ وتی باخەوانەکەم مەردە[١٦٢]

١٦٣)- بە گیای بەهارا ناتووڕێنێ[١٦٣]

١٦٤)- بە عارەب مەڵێ مەرحەبا، هەم ئەخوات و هەم ئەبا[١٦٤]

١٦٥)- بە عەبا ئەخوا و، بەعەسا ئەڕوا[١٦٥]

---

[١٥٤] واتە لە دین ودنیادا باشی بکەیت، پاداشت باش و خراپی بکەیت پاداشت خراپ ئەبێ.

[١٥٥] واتە بە شاتە شات و گەزارەکێشانی ئافرەت، خاوەن ماف دەست لە مافی خۆی هەڵناگرێ.

[١٥٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەرنەکەوێ.

[١٥٧] واتە ناز و نیمەتی باوکت هەر نان و پیازە، ئیتر بەچی ئەنازیت.

[١٥٨] لە ڕووی نەنگەوە بە پیاوێکی حەشەری ئەوترێ، لە هێندێ کاتا.

[١٥٩] واتە سەری بە فەتارەت دا.

[١٦٠] بە یەکێك ئەوترێ ، کە کارێکی پیا بدەیت، بە دڵ پێی خۆش بێ کەچی بە زبانیش بڵێ ناتوانم، وە بیانوو بێنێتەوە.

[١٦١] بە یەکێك ئەوترێ کە لە هەموو تەمەنی خۆیا یەك ئیشی چاکی کردبێ.

[١٦٢] یەکێك ئەیڵێ کە زۆر تێر و پڕ و پۆشتە و پەرداخ بێ واتە گەورەکەم زۆر دڵسۆزە.

[١٦٣] واتە ناگاتە بەهار ئەمرێ، بە یەکێکی پیر یا نەخۆش ئەوترێ.

[١٦٤] واتە هێندێکی ئەخوا و ، هێندێکی لەگەڵ خۆیا ئەبا.

[١٦٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە بگەڕێ بۆ ورگ لەوەڕاندن، وە عەبا بدا بە شانیا و هەر ڕۆژەی میوانی ماڵێك بێ، وە ڕۆیشتنەکەی بە قەد درێژی داردەستەکەی بێ.

١٦٦)- بە فەلەك، ئەڵێ وەلەك[١٦٦]

١٦٧)- بە فرمێسكی باوەڕ مەكە، تەماشای كردەوەی بكە[١٦٧]

١٦٨)- بە فیكە مار لە كون دێتە دەر[١٦٨]

١٦٩)- بە قەد بەڕەی خۆت پێ ڕاكێشە[١٦٩]

١٧٠)- بە قسە ئاڵی زەنگانە، بە كردەوە ریخ لە لنگانە[١٧٠]

١٧١)- بە قسەی پشیلان، باران ناباری[١٧١]

١٧٢)- بە قسەی خۆش مار لە كون دێتە دەر[١٧٢]

١٧٣)- بە قسەی مەلا باوەڕ ناكا، بەزەڕەی كەری باوەڕە[١٧٣]

١٧٤)- بە قنگ هەناسە ئەدا[١٧٤]

١٧٥)- بە قنگە خشكێ بەغدا ناگیرێ[١٧٥]

١٧٦)- بە قنگە هەمانە خۆش ئەكا و بە پێ بێشكە رائەژەنێ و بە دەست جۆلایی ئەكا[١٧٦]

١٧٧)- بە قنگەوە خستییە كەندەوە[١٧٧]

---

[١٦٦] بە یەكێك ئەوترێ كە هاتی بێت و قسەی ڕەوابێ.

[١٦٧] بە مەردومی ناپاك ئەوترێ.

[١٦٨] واتە بە قسەی خۆش هەموو كارێك جێبەجێ ئەبێ.

[١٦٩] واتە لە ئەندازەی خۆت زیاتر، هەڵ مەسووڕێ.

[١٧٠] بە یەكێك ئەوترێ كە بە قسە هیچی نەهێشتبێتەوە، بە كردەوەش هیچ.

[١٧١] یەكێك ئەیڵێ بە یەكێك كە بە نارەوا نزای خراپی لێ بكا، واتە تۆ چیت تا خوا نزات گیرا بكا.

[١٧٢] واتە تا ئەتوانیت، قسەت خۆش بێ لەگەڵ مەردوم.

[١٧٣] بە یەكێك ئەوترێ كە بە قسەی ڕاست باوەڕ نەكا و بە قسەی درۆ باوەڕ بكات.

[١٧٤] واتە زۆر تەنگە نەفەسە.

[١٧٥] واتە كاری گەورە بە ئاسانی ناكرێ.

[١٧٦] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە یەك كاتا، بە دوو سێ كارەوە خەریك بێ.

[١٧٧] واتە دەم كوتی كرد.

١٧٨)- بە كارە نییە، بە چارەیە[١٧٨]

١٧٩)- بە كارەكەر بڵێت خانم، كاسە و كەوچك ئەشكێنێ[١٧٩]

١٨٠)- بە كاسەیەك ئەیكەن بە كەوچكێك ئەیخۆن[١٨٠]

١٨١)- بە كاكیلە، نیكل لە قنگی سەگی پیر دەرئەهێنێ[١٨١]

١٨٢)- بە كەر ناوێرێ، بە كورتان شێرە[١٨٢]

١٨٣)- بە كەروێشك دەڵێ: ڕاكە، بە تانجیش ئەڵێ بیگرە[١٨٣]

١٨٤)- بە كەڕیان وت: ئاو بێنە، ئەچوو دەرپێی دائەكەند[١٨٤]

١٨٥)- بە كەریان وت: ئەوە ڕێگاتە، كەچی بە شاخا هەڵئەگەڕا[١٨٥]

١٨٦)- بە كەریان وت: مەعریفەت بنوێنە، لنگی هەڵبڕی و تڕێكی كەند[١٨٦]

١٨٧)- بە كەوچك ئەڵێ: قاچوغ[١٨٧]

١٨٨)- بە كەوچك كۆی ئەكاتەوە، بە ئەسكوێ بڵاوی ئەكاتەوە[١٨٨]

---

[١٧٨] چارە: چهرە و ناوچاوانە، بە یەكێك ئەوترێ كە هەر هەوڵ بدا و هیچی دەست نەكەوێ.

[١٧٩] واتە حورمەتی ناوەجاخ مەگەر قاچت ئەگرێ.

[١٨٠] بە دوو كەس ئەوترێ، كە زۆر تێكەڵ بن.

[١٨١] بە یەكێك ئەوترێ، كە زۆر پەست و چاو برسی بێ، وە بۆ شتێكی هیچ و پووچ خۆی ڕیسوا بكا.

[١٨٢] بە یەكێك ئەوترێ، كە بە دوژمنەكەی خۆی نەوێرێ و بە یەكێكی زەبون بوێرێ.

[١٨٣] بە یەكێكی ناپاكی دوو ڕوو ئەوترێ، كە لەگەڵ هەموو كەسێكا، بە پێی دڵی ئەو قسە بكا.

[١٨٤] بە یەكێك ئەوترێ، كە شتێكی پێ بڵێن و ئەو بچێ شتێكی تر بكا.

[١٨٥] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە ڕێی ڕاست لابدا.

[١٨٦] بە یەكێكی قەبە ئەوترێ، كە لە كۆڕێكی گەورەدا، قسەیەكی ناشرین بكا.

[١٨٧] بە یەكێك ئەوترێ كە لە خۆی گۆڕابێ.

[١٨٨] ئەسكوێ: كەوچكێكی گەورەیە چێشتی شلەی لە مەنجەڵ پێ تێ ئەكرێ. بە یەكێكی دەست بڵاو ئەوترێ كە بە چنگە كرێ پارە پەیدا بكات و بە بێ حساب خەرجی بكات.

١٨٩)- بە کفتە ئەڵێ فلّتە[189]

١٩٠)- بە کڵاو نەگیرێ[190]

١٩١)- بە کلکی ئەخورێ[191]

١٩٢)- بە کونی هەتیتەوە ئەچێ[192]

١٩٣)- بە کێری خەڵق گان ئەکا[193]

١٩٤)- بە کێری خەڵق گان کردن لەزەتی نییە[194]

١٩٥)- بە لای ماکەرا بڕوا، جاشەکەی لێ گل ئەداتەوە[195]

١٩٦)- بە لەعنەت بێ بزن، هەر بن کلکی بگەزن، سەگ و شوان پێکەوە دەبەزن[196]

١٩٧)- بە لەوێچێك ئاو ئەکەوێتە مەلە[197]

١٩٨)- بە مازوان تێشکاوە و بە سیچکان هەڵ ئەسێتەوە[198]

١٩٩)- بە مەقەڵییەوە بڕۆ بۆ سەربان، بە باوەشێن وەرە خوارەوە[199]

---

[189] بە یەکێك ئەوترێ ، کە دان لە دەمیا نەبێ.

[190] واتە زۆر بێ دەسەڵاتە.

[191] بە یەکێك ئەوترێ کە پشتی ئەستوور بێ، بە یەکێك لەخۆی گەورەتر.

[192] واتە زۆر لاوازە.

[193] بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی هیچی لە بارا نەبێ، وە هەرچی ئارەزووی کرد، بە مەردومی بکا.

[194] واتە ئیش ئەوەیە خۆت بیکەیت بۆ خۆت.

[195] بە مەردومی تەمەعکار ئەوترێ.

[196] بە یەکێکی دەم قەڵەباڵغ ئەوترێ، کە زۆر دەم بە هاوار بێ.

[197] بە یەکێکی سووك ئەوترێ، کە بە قسەیەك بکەوێتە سەما.

[198] سیچکە: جۆرێکە لە بەری دارمازوو، وەك گزگل وایە، بەڵام وەك مازوو بە نرخ نییە، بە یەکێك ئەوترێ کە زەرەرێکی زلی کردبێ و بیەوێ بچووك خۆی هەستێنێتەوە.

[199] واتە لە بەهارانا زوو بچۆرە دەرەوە بۆ نووستن، لە پایزانا زوو بڕۆ ژوورەوە، چونکە سەرمای بەهار زەرەری نییە، بەڵام سەرمای پاییز زۆر خراپە.

٢٠٠)- بە مەلایەکیان وت: کاغەزێکمان بۆ بنووسە وتی: قاچم قەڵەشاوە[٢٠٠]

٢٠١)- بە ملاکان خڕی دەکەمەوە، بە ئەسکوان دەیفەوتێنێ[٢٠١]

٢٠٢)- بە منالی لێم باربوو، بە گەورەیی لێم هار بوو[٢٠٢]

٢٠٣)- بە مێردی نییە، بە خولایە[٢٠٣]

٢٠٤)- بە میزی ختتك باران ناباری[٢٠٤]

٢٠٥)- بە ناری و بە نێرگس، پڕی ئەکەن لە تڕ و لە تس[٢٠٥]

٢٠٦)- بە ناڵە ناڵ، بە نووکە نووك، قۆجە دەهۆڵ خۆی کرد بە بووك[٢٠٦]

٢٠٧)- بە نان هات و بە ئاو خورا[٢٠٧]

٢٠٨)- بە نەوگ مەردوم سەر ئەبڕێ[٢٠٨]

---

[٢٠٠] یەکێك قاچی بقەڵەشێ، ناتوانێ بە رێدا بڕوا، مەبەسی مەلا ئەوەیە کە بڵێ خەتەکەم ناخۆشە، ئەگەر ئەم کاغەزە من بینووسم، ئەبێ هەر خۆشم بچم بیخوێنمەوە، کە ناشتوانم بچم، چونکە قاچم قەڵەشاوە.

[٢٠١] ملاك: کەوچکە، یەکێك ئەیلێ، کە بە چنگە کرێ، پارەیەك پەیدا بکات یەکێکی تر بە بێ ژمارە خەرجی بکا.

[٢٠٢] یەکێکی هەژار ئەیلێ: کە منالەکەی بە چنگە کرێ گەورە بکا، تا دەستی لە ئیشێك گیر ئەبێ، ئەو حەلە لە جیاتی پاداش ئازاری بدا.

[٢٠٣] ئەگێڕنەوە کە پیاوێکی ساوێلکەی بەسزمان، کچێکی ئەبێ لە پێش ئەوەی کە شوو بکا، کوڕێکی ئەبێ، ڕۆژێ کابرا لەگەڵ چەند کەسێکا دائەنیشێت باسی منال و منال بوون ئەکەن، کابرای خاوەن کچ ئەڵێ: بە خودای بابم ئەمانە هیچ بە مێردی نییە و بە خولایە، فاتیلەی کچی من شووشی نەکردووە و خولامێکی ئێوەشی بووە.

[٢٠٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە بیەوێ بە پارەیەکی کەم ئیشێکی گەورە بکات، واتە ئەم ئیشە زلە بەم پارە کەمە ناکرێ.

[٢٠٥] (ناری) و (نێرگس) ناوی دوو ژنن. بە دوو کەسی تەمەڵی پیس و پۆخڵ ئەوترێ.

[٢٠٦] بە پیرێژنێکی تەڕپۆش ئەوترێ، کە بە ناز و نووز خۆی بگۆڕێ لە پیاوێك و خۆی لێ مارە بکات.

[٢٠٧] بە شتێك ئەوترێ، کە کوتوپڕ ون ببێ.

[٢٠٨] نەوگ: لبادە. بە یەکێك ئەوترێ کە بە قسەی خۆش و زمانی شیرین پیاو بکوژێ.

٢٠٩)- بە نووستوویی لە هەموو وەختێکی تر چاکترە[٢٠٩]

٢١٠)- بە هەر چاوێ تۆ من ئەبینیت، هەر بەو چاوە منیش تۆ ئەبینم[٢١٠]

٢١١)- بە هەزار زاوا ماڵم نابێ ئاوا[٢١١]

٢١٢)- بە هەزار سووژن گاسنێکی تیا نابێت[٢١٢]

٢١٣)- بە هەشت خۆش بوو، جێی تۆ تیا نەبوو[٢١٣]

٢١٤)- بە هەموو کەس ئەڵێیت خاڵە، پێویستە برای دایکی خۆت بناسیت[٢١٤]

٢١٥)- بە یەك گا گێرە ناکرێ[٢١٥]

٢١٦)- بەتایەکی، نۆزدە رەمەزانان ئەخوات[٢١٦]

٢١٧)- بەتەقەی تفەنگ دەرناکەوێ[٢١٧]

٢١٨)- بەخت رەشم کە بچمە دزی، ئەبێتە مانگەشەو[٢١٨]

٢١٩)- بەخت رەشی کە هات، چ لە کوێستان چە گەرمیان[٢١٩]

٢٢٠)- بەخت ساڵی جارێك لە دەرگای پیاو ئەدات ئەویش لە ماڵ نییە[٢٢٠]

---

[٢٠٩] بە یەکێکی زۆر خراپ ئەوترێ، کە هەمیشە بە کاری خراپەوە خەریك بێ، وەختی نووستن نەبێ.

[٢١٠] واتە بەڕێزم ببینیت بەڕێزت ئەبینم، بەڕێزم نەبینیت بەڕێزت نابینم.

[٢١١] یاخوا هیچ کەسێك پێویست بە زاوا نەبێ.

[٢١٢] بە چەند شتێکی نیوە و نیوە چڵ ئەڵێن، کە شتێکی تەواویان تیا نەبێ.

[٢١٣] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر باسی شتی خۆش بگێڕێتەوە، وە خۆشی هیچی نەبێ.

[٢١٤] تا جیای بکەیتەوە لەم هەموو خاڵە، بە یەکێك ئەوترێ کە بە یەك چاو تەماشای هەموو کەسێك بکا.

[٢١٥] بە کارێك ئەوترێ کە بە یەك کەس نەکرێ.

[٢١٦] واتە بۆ خواردنی رەمەزان بە شوێن بیانودا ئەگەڕێ.

[٢١٧] بەیەکێك ئەوترێ، کە خۆی دەرنەخا.

[٢١٨] واتە کە بەخت نەیکرد، هەموو کارێك پاش و پێش بۆ دێ.

[٢١٩] واتە نەهاتی هەر وەك لە شوێنی ناخۆش ئەبێ، لە شوێنی خۆشیش هەر ئەبێ و ناخۆشی ئەکات.

[٢٢٠] واتە بەخت هەمیشە لەگەڵ مەردوما نییە.

٢٢١)- بەخت لە گەڕایە و پەلۆولە دان ئەشکێنێ[٢٢١]

٢٢٢)- بەختت رەش بێ و خەنەت هەش بێ[٢٢٢]

٢٢٣)- بەختەکەی من، ئەوەندە لارە، ترۆزی ئەچێنم کالیارە[٢٢٣]

٢٢٤)- بەختەوەری تۆپێکە بەدوایا رائەکەیت کە ئەشوەستێ شەقی تێ هەڵئەدەیت[٢٢٤]

٢٢٥)- بەختم لە هەموو شتێکا ڕەشە، تەنیا لە شووتی دا نەبێ سپییە[٢٢٥]

٢٢٦)- بەختی دایك جیازیی کچە[٢٢٦]

٢٢٧)- بەختی رەش، حەوجە بەهەش ناکا[٢٢٧]

٢٢٨)- بەختیەکی بپژێ، یەکێ بۆ یەکێ ئەکوژێ[٢٢٨]

٢٢٩)- بەدبەختی کلافە ئەکا[٢٢٩]

٢٣٠)- بەدترین لە بەد بەدترە، بەد لە بەدترین چاکترە[٢٣٠]

---

[٢٢١] پەلۆولە: چێشتێکە لە رۆن و ئارد و ئاو دروست ئەکرێ، واتە ئادەمی کە نەهاتی هات، لە رێی واوە تێئەشکێ، کە هەرگیز بە بیرا نایەت، ئەگینا قەت بووە، پەلۆولە دان بشکێنێ.

[٢٢٢] هەش: خومە، بە یەکێك ئەوترێ، لە ڕووی نزاوە کە لێی دلگیربیت.

[٢٢٣] یەکێکی زۆر بەدبەخت، بەخۆی ئەڵێ.

[٢٢٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەلێکی بۆ هەڵکەوت و لە دەستی دا.

[٢٢٥] یەکێك ئەیڵێ کە لەهیچ شتێکا بەختی نەبێ.

[٢٢٦] واتە کە دایك بەختدار بوو، کچیشی هەر بەختدار ئەبێ.

[٢٢٧] واتە بەدبەختی کە لەگەڵ یەخەگیری یەکێك بوو، پێویست بەهیچی تر ناکا.

[٢٢٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە مردنی یەکێکی تر بەهرەمەند ببێ.

[٢٢٩] کلافە: چەند هەودایەکە، کە پێکەوە هەڵکرابن، بۆ ئەوەی تاو تاو دەربکێشرێ و کار بکرێ، واتە بەدبەختی ئەوەندە کەوتووە بە سەر یەکا، وەك کرابێ بە کلافە، وە چەند کلافەیەکی کەوتبێ بە سەر یەکا وایە.

[٢٣٠] لە کاتێکا ئەوترێ، کە هاوڕێی بەدت بووبێ، وە ئێستا بەدترێك بووبێ بە هاوڕێت، یاخود بەدترێك هاوڕێت بووبێ، وە ئێستا بەدێك بووبێ بە هاوڕێت.

٢٣١)- بەدەستی خۆی ئاگری بەرداوەتە گیانی خۆی[٢٣١]

٢٣٢)- بەر کە، لە دەست من چوو، سەر بە هەزارەوە نێ[٢٣٢]

٢٣٣)- بەر لە کارێز ئاوی گەرەکە[٢٣٣]

٢٣٤)- بەر لە مەلا ئەچێتە مزگەوت[٢٣٤]

٢٣٥)- بەر لە وەستا دوکان گەرم ئەکا[٢٣٥]

٢٣٦)- بەرازی دەم بەستراوە[٢٣٦]

٢٣٧)- بەرت بابێ و پشتت کەندەڵان[٢٣٧]

٢٣٨)- بەڕە لای تەنکییەوە ئەدڕێ[٢٣٨]

٢٣٩)- بەرەکەت لە نانی تەنك و ریسی باریکایە[٢٣٩]

٢٤٠)- بەرەو با، میز ئەکا[٢٤٠]

٢٤١)- بەڕەی خەڵق، زوو هەڵئەتەکێ[٢٤١]

٢٤٢)- بەرتیل، بەرد، نەرم ئەکا[٢٤٢]

٢٤٣)- بەرخ لە ژێر سەبەتەدا نامێنێتەوە[٢٤٣]

---

[٢٣١] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆی خۆی تووش کردبێ.

[٢٣٢] تەماشای پەندی( بزنە قوت لە من چوو، سەر بنێ بە هەزارەوە) بکە.

[٢٣٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پێش رەنجا گەنجی بوێ.

[٢٣٤] بە مەردومی ریاکار ئەوترێ.

[٢٣٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پێش وەختا دەست بکا بە ئیش.

[٢٣٦] بە کەسێك ئەوترێ، کە رۆژوی رەمەزان بگرێ و نوێژ نەکا.

[٢٣٧] نزایەکە، ئەیکەیت لە یەکێك، کە حەزی لێ نەکەیت.

[٢٣٨] واتە مەردوم ئەبێ بزانێ لە چ لایەکەوە زەبوونە، تا ئاگاداری بکا نەیەڵێ دوژمن زەفەری پێ بەری.

[٢٣٩]

[٢٤٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە دووربینی لە ئیشا نەکا.

[٢٤١] بۆ ئەوەی تۆ هەستی لە سەری، کەواتە تا ئەتوانیت لە سەر بەڕەی کەس دامەنیشە.

[٢٤٢] پیاوی خواپەرست نەبێ کە بەرتیل کاری تێ ناکا.

[٢٤٣] واتە چ ئادەمی و چ گیاندار، هەمیشە بە منالی نامێنێتەوە.

٢٤٤)- بەرخ هەر لە کۆزا نابێ[٢٤٤]

٢٤٥)- بەرخی بازی ئەکات[٢٤٥]

٢٤٦)- بەرخی نێر بۆ سەربڕینە[٢٤٦]

٢٤٧)- بەرد ئەکا بە ئاو[٢٤٧]

٢٤٨)- بەرد بدەیت بە گۆزەدا و گۆزە بدەیت بە بەردا، ئازاییی هەر هی بەردە[٢٤٨]

٢٤٩)- بەرد بشکێنە، دووڕوو مەدوێنە[٢٤٩]

٢٥٠)- بەرد بلەقێ جێی خۆی ناگرێتەوە[٢٥٠]

٢٥١)- بەرد لەجێی خۆی سەنگینە[٢٥١]

٢٥٢)- بەرد نەبووم، چاوم بە بەرد کەوت، بووم بە بەرد[٢٥٢]

٢٥٣)- بەردی بچووکیش، سەر ئەشکێنێ[٢٥٣]

٢٥٤)- بەردی دەشتی و چۆلەکەی دەشتی[٢٥٤]

٢٥٥)- بەردی زلهەلگرتن نیشانەی لێ نەدانە[٢٥٥]

---

[٢٤٤] واتە چ ئادەمی و چ گیاندار، هەمیشە بە منالّی نامێنێتەوە.

[٢٤٥] واتە زۆر کەیف خۆشە.

[٢٤٦] واتە رۆڵەی ولّات ئەبێ پێشمەرگە بن بۆ نیشتمان، وە لەو رێگەیەدا سەری خۆیان دابنێن.

[٢٤٧] بە دەنگێکی خۆش، یا بە قسەی یەکێك ئەوترێ کە کار بکاتە دلّت.

[٢٤٨] چونکە هەر گۆزەکە بە بەردەکە ئەشکێ.

[٢٤٩] واتە لە کانە بەردا خەریکی بەرد شکاندن و دەرهێنانی بە، گەلێ خۆشترە لەوەی کە لەگەڵ دوو رووداقسە بکەیت.

[٢٥٠] تەماشای پەندی شەشەم و حەوتەمی دوای ئەم پەندە بکە.

[٢٥١] واتە هەموو کەسێك لە ولّاتی خۆیا بە نرخ و بەڕێزە.

[٢٥٢] واتە دلّ رەق نەبووم، بەلّام چاوم کەوت بە دلّ رەق، منیش دلّم رەق بوو.

[٢٥٣] واتە دوژمنی بچوکیش بێ، دەستی خۆی هەر ئەوەشێنێ.

[٢٥٤] بە شتێك ئەوترێ، کە پارەی تێنەچێ.

[٢٥٥] بەیەکێك ئەوترێ، کە دەست بداتە کارێکی گەورە وا کە لە توانایا نەبێ.

٢٥٦)- بەردی ناوەتە سەر مەلۆ[٢٥٦]

٢٥٧)- بەردێك كە جوولا جێی خۆی ناگرێتەوە[٢٥٧]

٢٥٨)- بەردێك كە هەڵكەنرا جێی خۆی ناگرێتەوە[٢٥٨]

٢٥٩)- بەردێك نادان بیخاتە گۆمەوە، بە سەد دانا دەرنایەت[٢٥٩]

٢٦٠)- بەرز ئەخوڕێ[٢٦٠]

٢٦١)- بەرز ئەفڕێ، پیا ئەتڕێ[٢٦١]

٢٦٢)- بەرز فڕین ملی پیاو ئەشكێنێ[٢٦٢]

٢٦٣)- بەرز مەفڕە، نزم ئەنیشیتەوە[٢٦٣]

٢٦٤)- بەرزە بەرزە ئەنیشێ[٢٦٤]

٢٦٥)- بەرچاو تەنگی ریسوایی ئەهێنێ[٢٦٥]

٢٦٦)- بەرچاو تێر ئابڕوومەندە[٢٦٦]

٢٦٧)- بەرگی مەڕە و دانی گورگ[٢٦٧]

---

[٢٥٦] مەلۆ: قۆڵێكی گەورەیە لە شتێك كە بە داس دوورابێ، یا بە دەست دەستكەنە كرابێ، بە یەكێك ئەوترێ كە ئیشێكی كرد، هەموو جۆرە دووربینییەكیشی كردبێ.

[٢٥٧] بە یەكێك ئەوترێ، كە دەست بداتە كارێكی گەورە وا كە لە توانایا نەبێ.

[٢٥٨] واتە یەكێك كە شكا، نابێتەوە بە پیاوەكەی جاران.

[٢٥٩] واتە شتێك كە ناشی بیكا، بە سەد دانا راست ناكرێتەوە.

[٢٦٠] بە یەكێك ئەوترێ كە خۆی بە زیاد بزانێ، وە قەپی گەورە داگرێ.

[٢٦١] بەیەكێك ئەوترێ كە دەست بداتە كاری گەورە و زل كە لە توانایا نەبێ.

[٢٦٢] واتە هەموو شت ئەبێ بەرە بەرە، وە لەسەر خۆ بێ، چونكە كە بوو بە بازدان، كەوتن و مل شكانی لە دواوە ئەبێ.

[٢٦٣] بە یەكێك ئەوترێ، كە لووتی بەرزبێ، وە زیاد لە ئەندازەی خۆی قەپ داگرێ.

[٢٦٤] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە هەموو شتێكا زیاد لە ئەندازەی خۆی سەركەوێ.

[٢٦٥] چونكە ناپیاوی لێ پەیدا ئەبێ.

[٢٦٦] چونكە ئازا و دەست و دڵ كراوەیە.

[٢٦٧] بە یەكێك ئەوترێ كە بەدیمەن باش بێ و لە دڵا خراپ بێ.

٢٦٨)- بەرماڵی بەسەر ئاوەوە ئەگەڕێ[٢٦٨]

٢٦٩)- بەڕوو بە کاڵی، بەڕوو بەکوڵاوی بەڕوو بە برژاوی[٢٦٩]

٢٧٠)- بەڕووی دەمی بزنە[٢٧٠]

٢٧١)- بەری تەنگانە کورتە[٢٧١]

٢٧٢)- بەری دەستی خۆی گەست[٢٧٢]

٢٧٣)- بەز بێ و بە پشیلە بسپێرێ[٢٧٣]

٢٧٤)- بەز بە کتك ئەسپێرێ[٢٧٤]

٢٧٥)- بەسەد میچ میچێکی لێ ناباتەوە[٢٧٥]

٢٧٦)- بەسەر حەوت پشقلا باز ئەدا[٢٧٦]

٢٧٧)- بەسەر دۆستیت، بە دڵ کۆستیت[٢٧٧]

٢٧٨)- بەسمە، کوڕە کەچەڵ کەسمە[٢٧٨]

---

[٢٦٨] واتە زۆر موسڵمان و لە خوا ترسە.

[٢٦٩] بە شتێکی کەم نرخ ئەوترێ، کە دوو سێ جۆر خواردەمەنی لێ دروست بکرێ.

[٢٧٠] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك ئەبیستێ کە ئەگەر بزن بەڕوو بخوا، زۆر زوو قەڵەو ئەبێ، ئەمیش بزنە لاتێکی ئەبێ، هەموو جارێك بەڕوو ئەکا بە دەمیەوە دەست ئەدا لە پشتی، بزانێ قەڵەو بووە؟ ئنجا ئەمە بە یەکێك ئەوترێ، کە چاوەڕوانی بەری هەوڵ و تەقەلای خۆی بکا زۆر بە زوویی.

[٢٧١] لە ڕووی دڵخۆشییەوە ئەوترێ بە یەکێك، کە تووشی تەنگانەیەك بووبێ واتە دان بە خۆتا بگرە، ماوەکەی کەمە.

[٢٧٢] واتە پەنجەی خۆی برد بە دەما.

[٢٧٣] بە پیاوی دز و نائەمین ئەوترێ، کە کاروباری مەردومی خرابێتە ژێر دەست.

[٢٧٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێك بداتە دەست یەکێکی نائەمین.

[٢٧٥] بە مەردومی زۆرزان ئەوترێ.

[٢٧٦] لە ڕووی تەوسەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە باسی هێز و توانایی خۆی بکا.

[٢٧٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە دیمەن دۆست و وەکی تریش دوژمن بێ.

[٢٧٨] بە تەوسەوە بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ.

۲۷۹)- بەشەر شەوێك پاشایە شەوێك گەدایە[279]

۲۸۰)- بەشكەر، بەشی كرد، بەشەكەم كەم بوو ئەویشی دامێ پەژارە و خەم بوو[280]

۲۸۱)- بەشی ئاشتی تیا بێڵەرەوە[281]

۲۸۲)- بەشی بەش كرایەوە[282]

۲۸۳)- بەشی چووە سەر بەشان[283]

۲۸٤)- بەشی كابان، یا روورەشییە، یا بێ بەشی[284]

۲۸۵)- بەچكە گەدا، مەخەرە تەما، بە چڵێ كەما، دێتە سەما[285]

۲۸٦)- بەچكە مەلەوان، لە ئاوا ئەخنكێ[286]

۲۸۷)- بەچكەی مراوییە[287]

۲۸۸)- بەگی بێ پارە، وەك بەگی مووشێن وایە[288]

۲۸۹)- بەفری ئاداری، بكەوێ هەتا گوێ داری، نامێنێ تا ئێواری[289]

۲۹۰)- بەڵا لە شەرواڵی شڕت، كوڕی كەس نابێ بە كوڕت[290]

---

[279] واتە مەردوم خۆشیش ئەبینێ و ناخۆشیش ئەبینێ.

[280] هەژارێكی بەدبەخت ئەیڵێ: كە رۆژی كەم، وە خەم و خەفەتی زۆر بێ.

[281] واتە كە چوویت بەگژ یەكێكا، هەموو جۆرە خراپەیەكی لەگەڵا مەكە تا ئەگەر ئاشتتان بووەوە رووت بێ قسەی لەگەڵ بكەیت.

[282] بەیەكێك ئەوترێ، كە بمرێ و داراییەكەی بەشداران بیبەن.

[283] بەیەكێك ئەوترێ، كە بمرێ و داراییەكەی بەشداران بیبەن.

[284] واتە یا چێشتەكەی خراپ دەرئەچێ و رووی زەرد ئەبێ، یا باش دەرئەچێ و هیچ بەر خۆی ناكەوێ.

[285] واتە حورمەتی ناوەجاخ مەگرە چونكە بە دەنكە جۆیەك ئەزەڕێ.

[286] بە یەكێك ئەوترێ ، كە هەر بە باو و باپیرەوە بنازێ.

[287] بە منداڵێكی وەجاخزادە ئەڵێن، كە لە ڕێی باو و باپیری خۆی لانەدا.

[288] واتە بەگ بە پارەوە بەگە، كە پارە نەبوو لەگەڵ بەگی مووشێنا جیاوازی نییە.

[289] چونكە بەهارە و رۆژ بە ناوەڕاستی ئاسمانەوەیە.

[290] بە یەكێك ئەوترێ، كە خۆی كوڕی نەبێ، وە بە كوڕی كچیەوە شانازی بكا.

۲۹۱)- بەڵا لەو کاروانە دات کە کەر پێشەنگی بێ[۲۹۱]

۲۹۲)- بەلکە لە من چوو، سەر بە هەزارەوە نێ[۲۹۲]

۲۹۳)- بەلکە وتی: خۆمم و ئەم سکمە[۲۹۳]

۲۹٤)- بەم نوێنن بە جلی تانجی، پێم بڵێن ژنی حاجی[۲۹٤]

۲۹۵)- بەندە تەڕە و ئاگر ناگرێ[۲۹۵]

۲۹٦)- بەندە لە عاستی عەیبی خۆی کوێرە[۲۹٦]

۲۹۷)- بەندەی بێ عەیب نابێ[۲۹۷]

۲۹۸)- بەهۆی گوڵە گەنمێکەوە، سەد گوڵە مرور ئاو ئەخواتەوە[۲۹۸]

۲۹۹)- بەهاران حەیوان و بەز، هاوینان باخ و رەز، زستانان ئاگر و ئەز[۲۹۹]

۳۰۰)- بەهەزار دەرزی سووژنێکی تیا نابێ[۳۰۰]

۳۰۱)- بەهەموو ئاوی دەریا، چەوێك بەرز ناکاتەوە[۳۰۱]

۳۰۲)- بەهلوولی بەغدایە، رەزا بوو بە کایێ، کاشیان نەدایە[۳۰۲]

۳۰۳)- بەو بایە ئەژیم کە لای تۆوە دێ[۳۰۳]

---

[۲۹۱] بە دەستەیەك ئەڵێن کە سەرکردەکەیان یەکێکی بێ ژیری بێ بیر بێ.

[۲۹۲] واتە ژنێك کە لە دەست من چوو، چی لێ دێ با لێی بێ.

[۲۹۳] بەلکە: ناوی ژنە. یەکێك ئەیلێ، کە هیچ بەرپرسیاری (مسئولیە)یەکی نەبێ.

[۲۹٤] قەرزارێك ئەیلێ، کە داوای قەرزەکەی لێ بکەنەوە و نەیبێ بیداتەوە.

[۲۹۵] یەکێکی جگەر سووتاو ئەیڵێ، کەحەزی بە مردنی خۆی بێ، واتە بەندە تەڕە و ئاگر ناگرێ، ئەگینا ئەبوو ئاگرم تێبەر ببوایە.

[۲۹٦] واتە مەردوم عەیبی خۆی نابینێ.

[۲۹۷] واتە ئادەمی و عەیبیان وتوە، وە هەرگیز بەتەمای مەدری بێ عەیب مەبە.

[۲۹۸] بەیەکێك ئەوترێ ، کە بە بۆنەی ئەوەوە، گەلێ کەسی تر بەهرەمەند ببێ.

[۲۹۹] واتە هەر شتە بۆ ڕۆژی خۆی.

[۳۰۰] بە چەند شتێکی نیوە و نیوە چڵ ئەڵێن، کە شتێکی تەواویان تیا نەبێ.

[۳۰۱] واتە یەکێك خوا بەرزی نەکاتەوە، بەرز نابێتەوە.

[۳۰۲] بە یەکێکی بەڕێز ئەوترێ، کە داوای شتێکی بێ نرخ بکا و نەیدەنێ.

[۳۰۳] یەکێك ئەیلێ بە خۆشەویستێکی خۆی.

٣٠٤)- بەو سەردولکانە گریانم نایە[٣٠٤]

٣٠٥)- بەیار کێڵان و گای لەڕ؟[٣٠٥]

٣٠٦)- بەیانی تا ئێوارێ سەگ ئەخەسێنێ، ئێوارێ پارەی حەق دەستەکەی ئەدا بە حەقی گلاوکردنی دەستیا[٣٠٦]

٣٠٧)- ببێ بە ئاگر، کوێ ئەسووتێنێ[٣٠٧]

٣٠٨)- ببێ بە باران پەڵە نادا بە شانیا[٣٠٨]

٣٠٩)- ببێ بە چەقەڵ، ناتوانی سەری کەلاشم بکرێنیتەوە[٣٠٩]

٣١٠)- بخۆ گۆشتی کێری کەرێ، مەکێشە منەتی سەر کۆنە کەرێ[٣١٠]

٣١١)- بخۆن بەردێکی ڕەش، بکەن خەوێکی خۆش[٣١١]

٣١٢)- بخورە مەبرە[٣١٢]

٣١٣)- بدا بە لای کەرا، جاشەکەی ئەدزێ[٣١٣]

٣١٤)- بدە ڕەنج، بخۆ گەنج[٣١٤]

---

[٣٠٤] سەردولکان: چەمەر چۆپییە، واتە قسەکەت کار لە من ناکا.

[٣٠٥] بەیار: زەوییەکە کە چەند ساڵێك بێ نەکێڵرابێ، بە یەکێك ئەوترێ کە دەرەقەتی کارێك نەیەت.

[٣٠٦] بە یەکێك ئەوترێ ساڵ دوانزە مانگە هەوڵ بدا و هیچی دیار نەبێ.

[٣٠٧] بە یەکێکی بێ دەسەلات ئەوترێ، کەهیچ مەترسی لێ نەکرێ.

[٣٠٨] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر کەر بێ، واتە ژیری (عەقڵ) ببێ بە بارانی پەڵە کە جیهان ئەگرێتەوە، دڵۆپی نادا بە شانی ئەوا.

[٣٠٩] واتە هیچت لە دەست نایەت.

[٣١٠] سەرکۆنە: لۆمەیە، سەرکۆنەکەر: ئەو کەسەیە کە سەر کۆنەت ئەکا. واتە ژیانی ناخۆش بە سەر بەرزییەوە، گەلێ، خۆشترە لە ژیانی خۆش بە سەر شۆڕیی.

[٣١١] واتە لە پێناوی خۆشی پاشەڕۆژا، هەموو ناخۆشییەك بچەژن.

[٣١٢] واتە لەگەڵ ماڵ و منالا توند و تیژ بە، بەڵام دەست مەوەشێنە.

[٣١٣] واتە زۆر دزە.

[٣١٤] واتە تا ڕەنج نەدەیت گەنجت دەست ناکەوێ.

٣١٥)- بده له تەختە، حیزیش بەبەختە[٣١٥]

٣١٦)- بده له هەرد، مەدە له پردی نامەرد[٣١٦]

٣١٧)- برا برایه، بازاڕ جیایه[٣١٧]

٣١٨)- برا بوو بە برازا، کار لە کار ترازا[٣١٨]

٣١٩)- برا له پشت برا بێ، مەگەر بەڵا له لای خوا بێ[٣١٩]

٣٢٠)- برا و برا شەر ئەکا و قەڵتەبان باوەڕ ئەکا[٣٢٠]

٣٢١)- برادەر بگرە بە قەسپێك، بەری مەدە بە ئەسپێك[٣٢١]

٣٢٢)- برام نەبی له دایێ، قەت گریانم لۆت نایێ[٣٢٢]

٣٢٣)- برای دایك جیازە، وەك ماری بێ ئیجازە[٣٢٣]

٣٢٤)- برای گەورە بەو، گووی زیاد مەخۆ[٣٢٤]

٣٢٥)- برایەتی بە زۆر ناگیرێ[٣٢٥]

---

[٣١٥] واتە له هەموو کارێکا بەخت و بێ بەختی هەیە.

[٣١٦] تەماشای راڤەی پەندی (ئاو بت بات لە پردی نامەرد مەپەڕەوە) بکە.

[٣١٧] واتە برایەتی جیایە، وە سەودا و مامەڵەش جیایە.

[٣١٨] واتە کە خزم دوور کەوتەوە، وەك بێگانەی لێ دێ.

[٣١٩] واتە برا ئەبێ لەهەموو تەنگانەیەکا، دەستی بە پشتی براوە بێ تا کەس زەفەریان پێ نەبا.

[٣٢٠] قەڵتەبان: مەردومی نەفامە، بە یەکێك ئەوترێ، کە لای وابێ دوو براکە شەڕیان بوو، بە ئێجگاری لە یەك بڕاون، واتە برا هەر چەند شەڕیشیان بێ، هەر برا و دڵسۆزی یەکن، وە دەست هەڵناگرن.

[٣٢١] واتە دۆست و برادەر زۆر جار ئەگیرێ بە دەنکە خورمایەك، نەکەیت دەستی لێ هەڵگریت بە ئەسپێك.

[٣٢٢] واتە یەکێك برام نەبێ لە دایکم، هەرگیز بۆی ناگریم.

[٣٢٣] واتە برای دایکی لەگەڵ برای باوك و دایکی دا، زۆر جیاوازن، ئەمیان بە ڕاستی برایە، ئەویشیان وەك ماری بێئیجازە وایە. بە یەکێك ئەوترێ کە خزمایەتیەکی دووری ببێ، وە قسەیەکی ناشرین، یا کارێکی خراپی دەربارەت کردبێ.

[٣٢٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ئامۆژگاری برایەکی گەورەی خۆی نەکا.

[٣٢٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە زۆر خۆی بکا بە برات.

**٣٢٦)- برایيمان برایی، کیسەمان جیایی**[٣٢٦]

**٣٢٧)- برسی، سەربەست نابێ**[٣٢٧]

**٣٢٨)- برسێتی، رەگی هاری پێوەیە**[٣٢٨]

**٣٢٩)- برنج ئالیکی کەر نییە**[٣٢٩]

**٣٣٠)- برنجی بێ ڕەنج، خۆشە**[٣٣٠]

**٣٣١)- برنجیان نیشاندا، ماشیان دەرخوارد دا**[٣٣١]

**٣٣٢)- بڕوا بە مشك بکە، بە ئاشەوان مەکە**[٣٣٢]

**٣٣٣)- بڕوانە هام سەران، بزانە چێش مەکەران**[٣٣٣]

**٣٣٤)- برێشکەی جۆ ئەخوا، بە سابوون دەست ئەشوا**[٣٣٤]

**٣٣٥)- بزانە زانست لە کوێ هێلانەی کردووە**[٣٣٥]

**٣٣٦)- بزن ئەڵێ بپژمم و نەترم، بە شاخ قنگی خۆم ئەدڕم**[٣٣٦]

**٣٣٧)- بزن بۆ شەوێك جێی خۆی خۆش ئەکات**[٣٣٧]

---

[٣٢٦] واتە برا هەر چەند برابێ، بەڵام پارە و مامەڵە و حسابیان ئەبێ جیا بێ.

[٣٢٧] چونکە پاسی کولێرەکەی ئەکات، کە مایەی ژنێتی.

[٣٢٨] واتە برسی هەر چی بکا لۆمە ناکرێ.

[٣٢٩] بە یەکێك ئەوترێ کە شایستەی شتێك نەبێ.

[٣٣٠] بە شتێك ئەوترێ کە بێ ئەرك بێتە بەردەست.

[٣٣١] بە یەکێك ئەوترێ کە بیەوێ ژن بێنێ، ئنجا کچێکی جوانی نیشان بدەن و یەکێکی ناشرینی لێ مارە بکەن.

[٣٣٢] واتە ئەگونجێ مشك لە باراشەکەت نەخوات، بەڵام قابیل نییە ئاشەوان لێی نەدزێ.

[٣٣٣] واتە لە مەردومەوە فێری شتی باش ببە.

[٣٣٤] واتە زۆر پاك و تەمیزە.

[٣٣٥] واتە زانین لە کوێیە بۆی بچۆ.

[٣٣٦] بە یەکێکی تەماعکاری پارەپەرەست ئەوترێ، کە هەر چی بەردەست کەوت، خۆی تیا بەدناو بکا.

[٣٣٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە تەمەنێکی رابوردبێ، وە هێشتا خانوویەکی بۆ خۆی دروست نەکردبێ.

۳۳۸)- بزن به تەشپییەك خۆی بەخێو ناكرێ[۳۳۸]

۳۳۹)- بزن به پێی خۆی ئەكرێ به دارا و مەڕێش به پێی خۆی[۳۳۹]

۳٤۰)- بزن تارەت هەڵناگرێ[۳٤۰]

۳٤۱)- بزن خەمی گیانیه و قەساب خەمی بەز[۳٤۱]

۳٤۲)- بـزن دوانـزه مانگـه قنگـی بـه دەرەوەیـه، ئەگـەر هـی مـەڕ جارێـك دەركەوێ لێی ئەكەن بەهەرا[۳٤۲]

۳٤۳)- بزن سمه كرێ ئەكا، جێی شەوی خۆش ئەكا[۳٤۳]

۳٤٤)- بزن شیردا بۆ داپیر، داپیر كلكه قولێم بداتەوه[۳٤٤]

---

[۳۳۸] به یـەكێك ئـەوترێ، كـه هیچـێكی وای نـەبێ و بیـەوێ ژن بێنـێ، واتـه ژن و مـاڵ بـه تەنەكەیەك جۆ و تەشپییەك خۆی بەخێو ناكرێ.

[۳۳۹] واته كەس گوناهی كەس هەڵناگرێ.

[۳٤۰] تارەت: له كهارتی عەرەبیەوه هاتووه كه به مەعنای دەست نوێژه واتـه بـزن دەسـت نوێژ راناگرێ. چونكه زۆر ئـەترێ، بـه یـەكێك ئـەوترێ كـه پـاكی هەڵنـەگرێ، وه زۆر زوو خۆی پیس بكا به كردار یا به گوفتاری خراپ.

[۳٤۱] واته هەر كەس خەمی خۆیەتی.

[۳٤۲] به یەكێك ئەوترێ، كه هەمیشه خەریكی بەدكرداری بێ كەچی یەكێكی تـر كـه لەگـەڵ هەڵەیەكی كرد، خێرا لێی بكا به هەرا.

[۳٤۳] تەماشای شەش پەند پێش ئەم پەنده بكە.

[۳٤٤] ئەگێڕنەوه: كه پیرێژنێك بزنێكی ئەبێ، به شیرەكەی ئەژی، رۆژێ ئـەبینێ شـیرەكەی خوراوه، ڕۆژی دوایی خۆی مات ئـەدا، ئـەبینێ وا پشـیلەیه دێتـه سـەری، ئـەمیش قیمـه كێشێك ئەماڵێ به كلكیا ئەیقرتێنێ، پشیلەكه ئەڕوا، سبەینێ دێته سەر پیرێژنەكە، ئەڵێ: داپیره كلكه قولێم بدەرەوه، ئەویش ئەڵێ: تۆ شیری بزنەكەمت خـواردووه، بچـۆ بـۆ لای دار گەڵام بۆ بێنه تا بیدەم به بزنەكەم شیری زۆر بێ، ئەو حەله كلكه قۆڵێت ئەدەمـەوه، پشیلەكه ئەچێ بۆ لای دار، ئەڵێ: دار گەڵا بكه بۆ بزن، بزن شـیر بـۆ داپـیر، داپـیر كلكـه قولێم داتەوه، داریش ئەڵێ برۆ ئاو بێنـه لـه كـانی بـۆ ژێـرم تـا گـەڵا دەردەم. پشیلەش ئەچێته سەر كانی ئەڵێ: كانی ئاو ده بۆ دار، دار گەڵا كا بۆ بزن، بزن شیر بۆ داپیر، داپیر كلكه قولێم داتەوه كانی ئەڵێ: بـڕۆ كـچ بێنـه لەسـەرم هەڵپـەڕن تـا ئاوەكـەم بتـەقێ بـۆ دارەكه، ئنجا ئەچێ بۆ لای كچ، ئەڵێ: كچ چۆپی كه لەسەر كانی، تا كـانی ئـاودا بـه دار،

٣٤٥)- بزن كە ئەجەلی هات، نانی شوان ئەخوا[٣٤٥]

٣٤٦)- بزن كە خوا بیگرێ، نانی شوان ئەخوا[٣٤٦]

٣٤٧)- بزن لە تاو گیان، قەساب لەتاو گۆشت[٣٤٧]

٣٤٨)- بزن لە حیزیی دا نە ئەچوو بەرێوە، ئەیانكرد بە حەچەی ران[٣٤٨]

٣٤٩)- بزن نەیخورێ بن فیچكی رانی، چ ئیشی هەیە بە نانی شوانی[٣٤٩]

٣٥٠)- بزنێ نەخواردم، كاورێ جرنگانم[٣٥٠]

٣٥١)- بزنە گەڕ، لە دۆی مالانی كردین[٣٥١]

---

دار گەلا كا بۆ بزن، بزن شیردا بە داپیر، داپیر كلكە قولێم داتەوە، ئەویش ئەڵێ: بچۆ بۆ لای وەستا كەوشم بۆ بكا تا بێم هەڵپەڕم ئنجا ئەچێ بۆ لای وەستا، ئەڵێ: وەستا كەوشكە بۆ كچ، كچ چۆپی كا لەسەر كانی، كانی ئاودا بۆ دار، دار گەلا كا بۆ بزن، بزن شیر دا بۆ داپیر، داپیر كلكە قولێم داتەوە، ئەنجا وەستا كەوش ئەكا بۆ كچ، كچیش ئەچێ چۆپی ئەكا لە كانی، كانی ئەتەقێ، دار و درەخت ئاو ئەدا، هەموو گەلا ئەكەن تا بزن تێر ئەخوا و شیرەكەی زۆر ئەبێ، ئنجا داپیر كلكە قولێی پشیلەكە ئەداتەوە. ئێستا ئەم پەندە، بە یەكێك ئەوترێ، كە گیروگرفتی زۆر بێنێتە كارێك وە درەنگ بیدا بەدەستەوە.

[٣٤٥] بە یەكێك ئەوترێ كە توخنی شتێكی خۆشەویست و بە نرخی یەكێك لە خۆی گەورەتر بكەوێ.

[٣٤٦] بە یەكێك ئەوترێ كە توخنی شتێكی خۆشەویست و بە نرخی یەكێك لە خۆی گەورەتر بكەوێ.

[٣٤٧] واتە پەلە ئەكەن.

[٣٤٨] حەچە، ئەو گیان لەبەرەیە كە زەنگۆڵەی ئەكەنە مل و پێش رانی ئەخەن، بە یەكێك ئەوترێ، كە كاروباری خۆی پێ هەڵناسورێ كەچی كاروباری مەردومی پێ ئەسپێرن.

[٣٤٩] واتە كۆمی گەر نەخورێ بزن بۆچی ئەخوا نانی شوان.

[٣٥٠] یەكێك ئەیڵێ، كە قازانجی لە یەكێك نەكردبێ، كەچی ئەمڕۆ لە پێناوی ئەوا تووشی زیان ببێ.

[٣٥١] بە یەكێك ئەوترێ، كە خۆی سوودی بۆت نەبێ، لە سوودی یەكێكی تریشت بكا.

٣٥٢)- بزنە قوت لە من چوو، سەربنێ بە هەزارەوە[٣٥٢]

٣٥٣)- بزنی گەڕۆڵ لە سەرچاوەوە ئاو ئەخواتەوە[٣٥٣]

٣٥٤)- بزنێك ئەقارێنێ كە چۆڕێ شیری ببێ[٣٥٤]

٣٥٥)- بسكەی سمێڵی دێ[٣٥٥]

٣٥٦)- بچۆرە ژێر لۆسێك كە بی توانیت[٣٥٦]

٣٥٧)- بچیە خوراسان، هەر دێیەوە سەر كەوڵ و كاسان[٣٥٧]

٣٥٨)- بچیە سەرداری، ئەكەویە خواری[٣٥٨]

٣٥٩)- بچیتە ئەو شوێنەی كە ئاو ئەڵێ كس[٣٥٩]

٣٦٠)- بچێتە سەر سیروان، وشكی ئەكا[٣٦٠]

٣٦١)- بكوژێ قەساو، ببڕێ قەساو[٣٦١]

٣٦٢)- بلاری بێ، بلادیر بێ، بلا كچ بێ، بلاپیر بێ[٣٦٢]

٣٦٣)- بڵاو بڵاو، سەگی گڵاو[٣٦٣]

---

[٣٥٢] واتە بزن قووت ون بوو، وە لە دەست من چوو، خوای ئەكرد رووی ئەكردە هەزار شوێن، وە سەری ئەنا بە هەزارلاوە.

[٣٥٣] بە یەكێكی بێنرخ ئەوترێ، كە شوێنێكی بەرز و بەنرخی گرتبێ.

[٣٥٤] بە یەكێك ئەوترێ، كە هیچی لەبارا نەبێ و گاڵتەش بەمەردوم بكا.

[٣٥٥] واتە زۆر كەیف خۆشە.

[٣٥٦] واتە دەست مەدەرە شتێك، كە دەرەقەتی نەیەیت.

[٣٥٧] واتە هەر چەند پێ لە بەرەی خۆت راكێشیت، ئاخرێكەی قاچ هەر هەڵكێشیتەوە.

[٣٥٨] واتە زۆر هەوڵی بەرز بوونەوە مەدە، با ملت نەشكێ.

[٣٥٩] نزای خراپە لە یەكێك ئەكرێ، واتە بكەوێتە شوێنێكەوە كە ئاوی تیا دەست نەكەوێ.

[٣٦٠] واتە زۆر بەدبەخت و چارەڕەشە.

[٣٦١] بە یەكێك ئەوترێ، كە هەرچی بكا بیكا، وە هەر خۆی حساب بێ.

[٣٦٢] واتە ئەو رێگایەی كە پیا ئەڕۆیت، رێگا بێ و دوور بێ، چاكترە لەوەی لارێ بێ و نزیك بێ، وە ئەو ژنەی كە ئەی هێنیت كچ بێ و پیر بێ باشترە لەوەی بێوەژن بێ.

[٣٦٣] واتە بڵاوەی لێ بكەن سەگی گڵاو هات، بە یەكێكی زۆر خراپ ئەوترێ كە روو بكاتە كۆڕێك.

٣٦٤)- بلوێر بۆ گایه[٣٦٤]

٣٦٥)- بلوێر بەزێنه[٣٦٥]

٣٦٦)- بلوێر هەر قابیلی شوانه[٣٦٦]

٣٦٧)- بم کوژه و باقیم بەرەوه[٣٦٧]

٣٦٨)- بم نوێنن بە جلی گایە، پێم بڵێن ژنی ئاغایه[٣٦٨]

٣٦٩)- بن کلکی ئەخورێ[٣٦٩]

٣٧٠)- بنوو، بێته خەوت[٣٧٠]

٣٧١)- بنی پێی هاتۆته پشتی پێی[٣٧١]

٣٧٢)- بنێره مشتی، بپەڕه پشتی[٣٧٢]

٣٧٣)- بوار تاقی نەکەیتەوه لێی مەده[٣٧٣]

٣٧٤)- بوو بە حیزی حیزانگاو[٣٧٤]

٣٧٥)- بوو بە خوێنەکەی سیاوەحش، هەر نابڕێتەوه[٣٧٥]

---

[٣٦٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە شتێك نەگا.

[٣٦٥] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر قسەی خۆی ببیەت.

[٣٦٦] واته زۆر چاکی لێ ئەدا.

[٣٦٧] قەرزارێك ئەیڵێ، کە داوای قەرزەکەی لێ بکەنەوه و نەیبێ بیداتەوه.

[٣٦٨] زۆرتر بە ژنێك ئەوترێ، کە چاوی لە ناو و ناوبانگێکی گەوره بێ.

[٣٦٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە حەزی لە جەنگ و ئاژاوەیەك بێ، وه بیەوێ هەڵیگیرسێنێ.

[٣٧٠] بە یەکێك ئەوترێ کە بە تەمای شتێك بێ، کە هەرگیز پێی نەگا.

[٣٧١] واته زۆر گەڕۆکه.

[٣٧٢] واته حیزه.

[٣٧٣]

[٣٧٤] بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ، کە ببێ بە ژێر دەستی یەکێکی هیچ و پووچتر.

[٣٧٥] سیاوەحش: کوڕی کەیکاوسی دووهەمه، کە شای کەیانیەکان بووه لە ئێران، ئەم کوڕه لاو چاکه، ناحەز بەدناوی ئەکا لای باوکی، کە گوایه لەگەڵ (سودابه)ی باوەژنیا، دەستی تێکەڵ کردووه، لەسەر ئەوه شا بڕیاری کوشتنی ئەدا، سیاوەحش کە بەمە ئەزانێ شەو لە ناو ئەڕوا بۆ لای ئەفراسیابی شای تورکستان، کە هاوسنووری ئێران بووه،

٣٧٦)- بوو بە سابرێنەکەی بانی مۆرد[٣٧٦]

٣٧٧)- بوو بە شاییەکەی بناویلە[٣٧٧]

٣٧٨)- بوو، بە ئاردی بەڕوو، بە پەینکەی خۆی ناشێ[٣٧٨]

٣٧٩)- بوو، بە ئاردی ناو دڕکان[٣٧٩]

---

وە دوژمنایەتیان لەناوا بووە، بە گەیشتنی سیاوەحش، ئەفراسیاب زۆر بە ڕێزەوە وەری ئەگرێ، وە کچی خۆی لێ مارە ئەکات، تا بەدخوا بۆی تێ ئەچێنێ لای ئەفراسیاب کە بۆ کوشتنی تۆ و داگیر کردنی ولاتەکەت هاتووە. ئەفراسیاب لە سەر ئەمە ئەیکوژێ، کچەکەی ئەفراسیاب کوڕێکی منالّی لە سیاوەحش ئەبێ، لە ترسی ئەوەی نە وەك ئەویش بکوژێ، بە دزیەوە ئەی نێرێ بۆ لای شوان کارەیەکی خۆیان لە سنووری ئێران. کە بەخێوی بکا. کەیکاووس کە ئەمە ئەبیستێت ڕۆستەم ئەنێرێ کوڕەکەی بۆ ئەهێنێ، وە ناوی ئەنێ (کەی خوسرەو) ئەوسا، سوپایەکی گەورە، ئەنێرێتە سەر ئەفراسیاب، بە سەر کردەیی (تووسی نەوزەر) لەگەلّ ڕۆستەم و چەند پالّەوانێکی ترا، پاش جەنگێکی خوێناوی و کوشتارێکی زۆر، ئەگەڕێتەوە بۆ ئێران، وە ئەم دوژمنایەتی و جەنگ و خوێنرێژییە، درێژە ئەسێنێ، تا کەیکاوس ئەمرێ، وەکەی خوسرەو ئەفراسیاب ئەکوژێ، وە بەم بۆنەیەوە، فیردەوسی لە شانامەدا بە ئەفراسیاب ئەڵێ:

نە گفتم مکوش پوری کاوس را          بە دوشمن مکن روستم و توس را

واتە پێم نەوتی، نەوەی کەیکاوس مەکوژە، وە ڕۆستەم و توس مەکە بە دوژمنی خۆت.

[٣٧٦] کە بزنی ئاوایی گەلەکۆمەکێیان لێکرد و کوشتیان.

[٣٧٧] بناویلە: دێیەکە لە شارباژێر. ئەگێڕنەوە کە جارێك کوێخای ئەم دێیە، شاییەك ئەکات، لە نزیك تەواوبوونی شاییەکە پیاوێکی گەورە بە چەند سوارێکەوە، لا ئەداتە دێکە، وە شاییەکە بە کوێخا تازە ئەکەنەوە، لە پاشا ئەڕوات، هەر ئەو پشت هەلّ ئەکات، تیپەنە سوارێکی تر لائەدەن، ئەمانیش شایی بە کوێخا تازە ئەکەنەوە، ئیتر بەمجۆرە تا ماوەیەکی زۆر شایی درێژە ئەسێنێ. لە پاشدا کوێخای بەسزمان، هیچی نامێنێ و ئاواییەکەی وێران ئەبێ، ئنجا ئێستا ئەم پەندە لە حەلێکا ئەوترێ، کە قسەیەك قسەی زۆر رابکێشێ، یا کارێکی تر بێنێتە پێشەوە.

[٣٧٨] بە یەکێك ئەوترێ کە سەری لێ تێك چووبێ، وە پەرێشان و پەرانگەندە کەوتبێ.

[٣٧٩] بە شتێك ئەوترێ، کە پەرش و بلاّو بووبێتەوە.

٣٨٠)- بوو، بە ترەکەی خەسرەو[٣٨٠]

٣٨١)- بوو، بە گووی مەلوان[٣٨١]

٣٨٢)- بوو، بە کورتانەکەی دەجال[٣٨٢]

٣٨٣)- بوو، بە کوردەکەی لە هەر دوو جەژنان بوو[٣٨٣]

٣٨٤)- بوو، بە کێچ و چووە کەوڵی[٣٨٤]

٣٨٥)- بوو، بە مووی لووت[٣٨٥]

٣٨٦)- بوو، بە هات هاتەکەی رۆم[٣٨٦]

٣٨٧)- بوو، بەکێچ و چووە گوێچکەیەوە[٣٨٧]

٣٨٨)- بوو، بەمارەکەی شێخ هۆمەر لە ملی ئالا[٣٨٨]

٣٨٩)- بوو، بەو رۆژەی قەرەوەیسی تیا کوژرا[٣٨٩]

٣٩٠)- بووە بە میزی حوشتر، هەر بۆ دواوە ئەگەڕێتەوە[٣٩٠]

٣٩١)- بووە، بە بەرەگی گولی لێم نابێتەوە[٣٩١]

٣٩٢)- بووە، بە بەکر مەرگەوەر[٣٩٢]

---

[٣٨٠] بە شتێك ئەوترێ، کە هەر باس بکرێ و باس بکرێتەوە.

[٣٨١] بە شتێك ئەوترێ، کە پەرش و بڵاو بێتەوە.

[٣٨٢] بە شتێك ئەوترێ، کە هەر چەند دەستی بدرێتێ هەوڵی تەواو کردنی بدرێ، تێك بچێ.

[٣٨٣] بە یەکێك ئەوترێ ، کە لە هەر دوو سەرەوە ناهومێد مابێ.

[٣٨٤] بە یەکێك ئەوترێ ، کە لە هەر دوو سەرەوە ناهومێد مابێ.

[٣٨٥] بە یەکێك ئەوترێ کە تۆ لێی وەڕس بی و ئەو لێت نەبێتەوە.

[٣٨٦] بە شتێك ئەوترێ، کە هەر بڵێن: واهات، کەچی هیچیشی دیار نەبێ.

[٣٨٧] واتە زۆری سەرنایە سەر.

[٣٨٨] چیرۆکی ئەم مارە، لە پەندی (شەرعی مار، بەدار) دا نووسراوە.

[٣٨٩] بە ڕۆژێك ئەوترێ، کە زۆر قەڵەباڵغ و چڕ و پڕ بێ، وە بگرە و بردەی زۆری تیا بێ، بەجۆرێك کە مەردوم وەڕس بێ لە خۆی.

[٣٩٠] بە شتێك ئەوترێ، کە ڕۆژ بە ڕۆژ کز بێ و بێنموود بێ.

[٣٩١] بە شتێك ئەوترێ، کە هەمیشە لەگەڵتا بێ و لێت دوور نەکەوێتەوە.

[٣٩٢] بە یەکێکی زۆربڵێ ئەوترێ، کە هەرگیز چاك نەڵێ.

٣٩٣)- بووە، بە بزن مژە، بە زمانێ ئەڵێ خۆش، بە زمانێکیش ئەڵێ مژێ[٣٩٣]

٣٩٤)- بووە، بە بزنەکەی ئەخفەش[٣٩٤]

٣٩٥)- بووە، بە داری پەڵك[٣٩٥]

٣٩٦)- بووە، بە داری سەرەڕێ[٣٩٦]

٣٩٧)- بووە، بە درۆزنەکەی ئاگر لە ماڵچوو[٣٩٧]

٣٩٨)- بووە، بە سووری دوو دووگر[٣٩٨]

٣٩٩)- بووە، بە گاکەی مام عەلی[٣٩٩]

٤٠٠)- بووە، بە گاکەی مامە حاجی، لە هێڵی خاوەنیا ناگەڕێ[٤٠٠]

٤٠١)- بووە، بە گوێزی ناوبێژەنگ[٤٠١]

---

[٣٩٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە خۆشە خۆشە، دەم بژەنێتە خواردنێك تا هەمووی ئەخوا.

[٣٩٤] ئەخفەش، یەکێکە لە زانا ناودارەکان، کە لە ساڵی ٧٩٣ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە، ئەگێڕنەوە کە ئەم زانایە، تاقە بزنێکی دۆشەنی بووە لە ماڵا، بە ڕۆژ کە قوتابیەکانی لێی کۆ ئەبوونەوە دەرسیان ئەخوێند، بزنەکەش ئەهات لە تەنیشتیانەوە ئەکەوت و دەستی ئەکرد بە کاوێژ کردن و سەیر کردنیان، تا لێ ئەبوونەوە، وەك گوێیان لێ بگرێ وابوو، ئیتر لەمەوە بڵاو بۆوە، هەر کەسێك لە شتێك نەگەیشتیایە، پێیان ئەوت، بووە بە بزنەکەی ئەخفەش.

[٣٩٥] بە شتێك ئەوترێ کە بێبەر بێ.

[٣٩٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو ڕۆژ خەڵقی لا بدەنە لای، وە لە لای بحەسێنەوە و بەهرەمەند بن.

[٣٩٧] بە یەکێك ئەوترێ، ئەوەندە درۆی کردبێ کەس پێی باوەڕ نەکا.

[٣٩٨] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر تەماعکار بێ، وە لەبەشی خۆی زیاتر هەڵگرتبێ.

[٣٩٩] ئەگێڕنەوە کە مام عەلی ناوێك، گایەکی بووە، جووتی بۆ هەموو کەسێك کردووە، بۆ خۆی نەبێ، ئنجا پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە خێری بۆ مەردوم ببێ و بۆخۆی نەبێ.

[٤٠٠] هێڵ: کێڕی جووتە، بە یەکێك ئەوترێ، تا بێگانە وێستابێ خزمەتی کەس و کاری خۆی نەکا.

[٤٠١] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەردەمە لە شوێنێك بێ.

٤٠٢)- بووه، به گیسکەکەی هەیاسی خاس[٤٠٢]

٤٠٣)- بووه، به کەری ناو جۆگە، له هەر دوولا ئەخوا[٤٠٣]

٤٠٤)- بووه، به کتکه نەوتینه[٤٠٤]

٤٠٥)- بووه، به کەوڵ سووری بەر لەشکر[٤٠٥]

٤٠٦)- بووه، به مەقەست، هەر کەسێ دەستی بۆ بەرێ، دەم دائەچەقێنێ[٤٠٦]

٤٠٧)- بووه، به مەلەوانەکەی کونده له دەست بەربوو، بەر ئەچێ ئاو ئەیبا، دوا ئەچێ گورگ ئەیخوا[٤٠٧]

٤٠٨)- بووه، به هەورامی له کۆڵی خۆی ئەخوا[٤٠٨]

٤٠٩)- بووەته نێرەکەرەکەی برایمه شینێ، لەجێیان قونێ دەدا، له ماڵدا به سەر ئێمەیدا دایدێڵێ[٤٠٩]

٤١٠)- بووك نیەتی شێوی شەوێ، ئەموستیلەی دەستی ئەوێ[٤١٠]

---

[٤٠٢] ئەگێڕنەوه که سوڵتان مەحموودی غەزنەوی، گیسکێك ئەداته دەست هەیاسی خاس، وه پێی ئەڵێ: ئەم گیسکه تا لێی ئەپرسمەوه نابێ نه زیاد بکا و نه کەم، ئەویش دای ئەبەستێ، بەڵام بێچوه گورگێکیشی به دیارەوه ئەبەستێتەوه، گیسکەکه هەر چەند چاوی به گورگەکه ئەکەوێ له ترسانا گەشه ناکات، که سوڵتان مەحموود لێی ئەپرسێتەوه، ئەبینێ گیسکەکه نه قورس بووه نه سووك، ئنجا ئەمه به یەکێك ئەوترێ که له ترسی شتێك گەشه ناکات.

[٤٠٣] به یەکێك ئەوترێ، که له دوو شوێن بەهرەمەند ببێ.

[٤٠٤] واته چلکن و پیسه.

[٤٠٥] به یەکێك ئەوترێ، که فیتنه و ئاژاوه بگێڕێ.

[٤٠٦] به یەکێکی بێ شەرم ئەوترێ، که لەگەڵ قسەیەکی لەگەڵا بکرێ تووڕه ببێ و قسه بڵێ.

[٤٠٧] به یەکێك ئەوترێ، که له کارێکا گیری خواردبێ، به جۆرێك که نەتوانێ جووڵه بکا.

[٤٠٨] واته له دیاری خۆت مەخۆ.

[٤٠٩] به یەکێك ئەوترێ له ناوماڵ و منالی خۆیا تووڕه و تڕۆ و به زەبر و زەنگ بێ، له دەریشەوه مرۆڤێکی بێ دەسەڵاتی بێدەنگ و سەنگ بێ.

[٤١٠] به یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ که پەلپێك بگرێ.

٤١١)- بووك نیەتی شێوی شەوێ، ئەموستیلەی لێمان ئەوێ[٤١١]

٤١٢)- بووکێ لەگەڵ تۆمە، خەسوو گوێت لێ بێ[٤١٢]

٤١٣)- بووکێ نیەتی شێوی شەوێ ئەموستیلەی لێمان ئەوێ[٤١٣]

٤١٤)- بووکەکەمان جوان بوو بالووکەشی دەردا[٤١٤]

٤١٥)- بووکەکەمان زۆر جوانە، بالووکەیەکیشی لە لێوانە[٤١٥]

٤١٦)- بووکەکەی پەنا دیواریت، ڕۆژ هەموو ڕۆژ بەتاڵیت، بە شەو ناوماڵ ئەماڵیت[٤١٦]

٤١٧)- بووکی پوور، جێگای لەسەر تەنوور[٤١٧]

٤١٨)- بووکی ساڵێ، بەردەرە ماڵی، ئەگەر نەیکرد بیهاوێ چاڵێ[٤١٨]

٤١٩)- بووکی نزیك باوان، بە کەڵکی چی دێ[٤١٩]

٤٢٠)- بووکێکمان هەیە ناشی و نەزان، تاوێ هۆڕ ئەکا و تاوێ خوێدان[٤٢٠]

٤٢١)- بووکێکمان هەیە ناشی و نەزانە، تاوێ هۆڕ ئەکا تاوێ هەمانە[٤٢١]

٤٢٢)- بووکێکمان هێنا بێ بارگە و بنە، کوتەك هەڵ ئەگرێ ئەڵێ ماڵ ماڵی منە[٤٢٢]

---

[٤١١] بەیەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ کە پەڵپێك بگرێ.

[٤١٢] یەکێك ئەیڵێ، کە قسە لەگەڵ یەکێك بکا و یەکێکی تری مەبەس بێ.

[٤١٣] بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ، کە پەڵپێکت لێ بگرێ.

[٤١٤] بە یەکێکی ناشرین ئەوترێ، کە عەیبێکی تریشی لە پەیدا بێ.

[٤١٥] بە یەکێکی ناشرین ئەوترێ، کە عەیبێکی تریشی لە پەیدا بێ.

[٤١٦] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر لە ناوەختا ئیش بکا.

[٤١٧] بە بووکێك ئەڵێن، کە خەسۆکەی پووری بێ، وە لە لای خۆشەویست نەبێ.

[٤١٨]

[٤١٩] چونکە هەمیشە ئەچێتەوە ماڵی باوانی.

[٤٢٠] بە مەردومی ناشی ئەوترێ.

[٤٢١] بە مەردومی ناشی ئەوترێ.

[٤٢٢] بە بووکێك ئەوترێ، کە زەبر و زەنگی ببێ.

٤٢٣)- بووكێكمان هێنا بێ بارگە و بنە، كوتەك هەڵ ئەگرێ ئەڵێ نۆرەمە[٤٢٣]

٤٢٤)- بووم بە كاسەی چاڵەوان[٤٢٤]

٤٢٥)- بووم بەمریشكەكەی رابی، لە هیچ كولانەیەك جێگەم نابێتەوە[٤٢٥]

٤٢٦)- بۆ ئەوە ئەشێ، بە كێری كەر لە پشتی كیسەل بنوسرێ[٤٢٦]

٤٢٧)- بۆ بەرخی هەژار، چ گورگ و چ سوار[٤٢٧]

٤٢٨)- بۆ بەرخی هەژار، گورگ چ هێمن بێ و چ هار[٤٢٨]

٤٢٩)- بۆ پیاوی ژیر، ئیشارەتێك بەسە[٤٢٩]

٤٣٠)- بۆ حسین ناگری، بۆ هەریسە ئەگری[٤٣٠]

٤٣١)- بۆ خەڵقی ئەدا فتوای سەنگەسار، خۆشی كەرەكە ئەگرێتە بەر كار[٤٣١]

٤٣٢)- بۆ دۆستی هەزار كەمە، بۆ دوژمنی یەكێك زۆرە[٤٣٢]

---

[٤٢٣] بە بووكێك ئەوترێ كە زەبر و زەنگی ببێ.

[٤٢٤] جاران چاڵە گەنم پاسەوانی بە سەرەوە بووە، ئەو پاسەوانە كاسەیەكی بووە، هەموو خاوەن چاڵێك پڕ بەو كاسەیە گەنمی داوەتێ، ئنجا چونكە چاڵەكان زۆر بوون، ئەو كاسەیە هەمیشە دەستا و دەستی پێ كراوە، واتە دەستا و دەستەم پێ مەكەن و ئازارم مەدەن.

[٤٢٥]

[٤٢٦] بە قسەیەكی زۆر دوور ئەوترێ، كە ژیری و بیرەوەری نەگرێ.

[٤٢٧] بە دەوڵەمەندێكی زەبوون ئەوترێ، كە هەموو زۆردارێك چاوی تێ بڕی بێ.

[٤٢٨] بە دەوڵەمەندێكی زەبوون ئەوترێ، كە هەموو زۆردارێك چاوی تێ بڕی بێ.

[٤٢٩] واتە دانا بە دركاندن، كەریش بە نەقیزە.

[٤٣٠] واتە ئەوانەی كە بە دیمەن بۆ كوشتنی حسین ئەگرین، بۆ ئەوەیە كە قازانج و دەستكەوتنەكەیان پایەدار بێ، تەنانەت ئەگەر حسین زیندوو بێتەوە و بێتەوە دنیا، هەر ئەوانەی كە بۆی ئەگرین ئەیكوژنەوە و لە ژێر گومەزی زێڕ و زیوا ئەی نێژنەوە و بۆی ئەگرینەوە تا بازاڕەكەیان كز نەبێ و دەستكەوتەكەیان وەك جاران بمێنێ.

[٤٣١] بە یەكێك ئەوترێ، كە گوفتار و كرداری لە یەك جیاواز بێ.

[٤٣٢] چونكە ئەو تاقە یەكە ئەتوانێ ئیشی زل بكا.

٤٣٣)- بۆ دەسماڵێك، قەیسەرییەك ئاگر ئەدا[٤٣٣]

٤٣٤)- بۆ ریش چووم، سمێڵم نایە بانی[٤٣٤]

٤٣٥)- بۆ سۆی لێ هەڵناستێ[٤٣٥]

٤٣٦)- بۆ سی و جگەرێك، مەڕێك مردار ئەكاتەوە[٤٣٦]

٤٣٧)- بۆ گیسكێك، گایەك لە كیس خۆت مەدە[٤٣٧]

٤٣٨)- بۆ فاسق، گەزۆ ئەبارێ[٤٣٨]

٤٣٩)- بۆ قەسابییەك، بزنێك مردار مەكەرەوە[٤٣٩]

٤٤٠)- بۆ كونێك هەزار كون لە خۆت مەكە[٤٤٠]

٤٤١)- بۆ كوێر، شەو و رۆژ چون یەكە[٤٤١]

٤٤٢)- بۆ كێچێك، گایەك لە كیس خۆت مەدە[٤٤٢]

٤٤٣)- بۆ نانێك، ماڵی خۆی جیا ئەكاتەوە[٤٤٣]

٤٤٤)- بۆ نەفسێم نییە، بۆ قەدرێمە[٤٤٤]

---

[٤٣٣] بە یەكێك ئەوترێ كە بۆ قازانجێكی خۆی ماڵی عالەمێك وێران بكا.

[٤٣٤] یەكێك ئەیڵێ: كە بۆ قازانجێك بچێ كەچی بە زەرەرەوە بگەڕێتەوە.

[٤٣٥] واتە زۆر شڕ و وڕە.

[٤٣٦] ئەم پەندە بە مەعنا پەندی پێنجەمە لە پێشەوە.

[٤٣٧] بە مەردومی تەمەعكار ئەوترێ.

[٤٣٨] بە پیاوی خراپی بەختیار ئەوترێ.

[٤٣٩] بە یەكێك ئەوترێ، كە ئیشێك نەزانێ، بیەوێ خۆی بیكا بۆ ئەوەی مز(حق)ی كردنەكەی بۆ بمێنێتەوە.

[٤٤٠] واتە ئەگەر تووشی گرێ كوێرەیەك بوویت لە ژیانتا، وە ویستت ئەو گرێیە بكەیتەوە، باشی بكەرەوە، وە گرێ كوێرەی تر بۆ خۆت پەیدا مەكە.

[٤٤١] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە كارێكا نەشارەزا بێ.

[٤٤٢] بە مەردومی تەمەعكار ئەوترێ.

[٤٤٣] بە مەردومی رژدی چرووك ئەوترێ.

[٤٤٤] یەكێك ئەیڵێ، كە لە ناو كۆمەڵێكا خواردنێك یا خواردنەوەیەك بگێڕێ و بەم نەدرێ، وە گلەیی بكات، واتە گلەیەكەم بۆ خواردنەكە نییە بەڵكو بۆ ئاوەڵ كەمییە.

٤٤٥)- بۆ ئەوس خۆی خستە حەوز[٤٤٥]

٤٤٦)- بۆ هەر دەردە و مەردێك[٤٤٦]

٤٤٧)- بۆ یەكێ بمرە، بۆت بمرێ[٤٤٧]

٤٤٨)- بۆت ئەنووسمە كەڵتەكە، لای برا كۆڵ[٤٤٨]

٤٤٩)- بۆرە نەبێ، بازە بێ، دەستە و ساری تازە بێ[٤٤٩]

٤٥٠)- بۆز بەلەڕیی[٤٥٠]

٤٥١)- بۆچ خومخانەیە[٤٥١]

٤٥٢)- بۆچ سێبەری بن ئەشكەوتە[٤٥٢]

٤٥٣)- بۆق، پیوە بدا ئەوعی مار نییە[٤٥٣]

٤٥٤)- بۆنی شیری خاو لە دەمی دێ[٤٥٤]

---

[٤٤٥] بە یەكێك ئەوترێ كە لەگەڵ چاوی كەوت بە خواردن، ئەنگە ئەزانێ چییە.

[٤٤٦] واتە بۆ هەر گرێیەك، مەردێك هەیە كە بیكاتەوە.

[٤٤٧] واتە دڵسۆزی لەگەڵ یەكێكا بكە، كە ئەویش لەگەڵ تۆدا دڵسۆز بێ.

[٤٤٨] كەڵتەكە: ناوی دێیەكە. یەكێك ئەیڵێ بە یەكێك، كە دووهەم بەڵێنی شتێكی دابێ پێی، لە پاشا حەواڵەی بكا بۆ شوێنێكی كوور، وە بۆ لای یەكێكی هیچ و پووچ، كە گۆیا ئەو شتەكەی بداتێ.

[٤٤٩] زۆرتر لە زبان یەكێكەوە ئەوترێ كە هەر چاوی لە ژن هێنانەوە بێ.

[٤٥٠] ئەگێڕنەوە كە كابرایەك ئەسپێكی بۆزی لەڕی ئەبێ، بەهار دێت ئەسپەكە تێر ئەخوا و قەڵەو ئەبێتەوە، وە دەست ئەكا بە حیلە حیل و چەپۆكان ڕۆژێك كابرای خاوەنی ئەخاتە خوارەوە، ئەمیش ئەڵێ: (بۆز بە لەڕی) ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە كار دێنرێ بۆ هەموو كەسێك كە لە پاش هەژاری دەوڵەمەند ببێ و لەخۆی بگۆڕێ.

[٤٥١] بە یەكێك ئەوترێ، كە داوای كارێكی قورست لێ بكا بە زوو بە زوویی، واتە وا زوو بە زوو تەواو نابێ.

[٤٥٢] بە یەكێك ئەوترێ كە خوو بداتە شوێنێك، وە هەمیشە بچێ لەوێ رابوێرێ، واتە ئەوەندە مەیە.

[٤٥٣] واتە ستەمی ستەمكاری بچووك گەلێ لە ستەمی ستەمكاری گەورە قورسترە و گران ترە.

[٤٥٤] واتە منداڵە.

٤٥٥)- بۆیه ئەڵێم هاوین خۆشە، چونکه کەس ناڵێ، مام گونان داپۆشه[٤٥٥]

٤٥٦)- بۆیه پێت ئەڵێم مامه، چۆڵەکەم بۆ بگریت[٤٥٦]

٤٥٧)- بۆیه لێت ئەدەم پێستەکه نەخورێ، که خورا چی تیا ئەمێنێ[٤٥٧]

٤٥٨)- بۆیه نەرژاوه، نەپژێ[٤٥٨]

٤٥٩)- بیانووی تڕ نانی جۆینه[٤٥٩]

٤٦٠)- بێژنگ ئەباته بەر مانگا[٤٦٠]

٤٦١)- بێژنگێ بگره به رووتەوه[٤٦١]

٤٦٢)- بێ ئەو پەنجه ناکا به ئاوا[٤٦٢]

٤٦٣)- بێ "نا" ئەیژەن، ئێستا نایشی به دەستەوەیه[٤٦٣]

---

[٤٥٥] واته هەرچی بوو به تێکڕا له ناو مەردوما، ئەنگی تیا نامێنێ.

[٤٥٦] یەکێکی بچوك به یەکێکی گەورەی ئەڵێ، واته بۆیه بچوکیت ئەکەم، که چاوت لێمەوه بێ.

[٤٥٧] ئەڵێن دەباخچییەك شاگردێکی تەمەڵی ئەبێ، رۆژێ پێستەیەکی ئەداتێ که چاکی بکا، وه پێشەکی تێر و پڕی تێهەڵ ئەدا، وه ئەم پەندەی پێ ئەڵێ، واته (علاجی واقعه پێش از وقوع باید کرد).

[٤٥٨] له ماڵێکی گەورەدا، که به پای پیلان تیا بکرێ و تیا بخورێ، ئەگەر یەکێك وتی: ئەمه خوا هەڵناگرێ، تۆزێ دەست بگرنەوه، بەم پەنده، وەڵام ئەدرێتەوه، واته بۆیه بەم ڕەنگه هەڵڕژێنراوه، که بش پژێ و خەساریش ببێ

[٤٥٩] به یەکێك ئەوترێ، که ئیشێکی ناشرینی قەوماندبێ، وه بیانوویەکی هیچ و پووچی بۆ بنێتەوه.

[٤٦٠] به یەکێك ئەوترێ، که لەوەپێش لەبەر لووت بەرزی شتێکی نەویستبێ له پاشا زۆر بۆی پەشیمان ببێتەوه، وه به هەموو رەنگێك هەوڵی بۆ بدات.

[٤٦١] به تەوسەوه به یەکێك ئەوترێ: که له کارێکا شەرم بکا.

[٤٦٢] واته زۆر فەرمانبەریەتی.

[٤٦٣] "نا" زۆرنایه، واته جاران بێهۆ، کەوتبووه جووڵه جووڵ و هەلکەسەما، ئێستا هۆشی به دەستەوەیه.

٤٦٤)- بێ بڕ لە زێ مەدە[٤٦٤]

٤٦٥)- بێ بوار لە ئاو ئەدا[٤٦٥]

٤٦٦)- بێ دەرپێ گەورە بووە، بۆیە وا هەڵچووە[٤٦٦]

٤٦٧)- بێ دەرپێ، دوو گەز جاو ئەسێنێ لە خوا[٤٦٧]

٤٦٨)- بێ دەست شکاندن، نگین ئەشکێنێ[٤٦٨]

٤٦٩)- بێ دەنگە وەك مێروو، بەسامە وەك نێروو[٤٦٩]

٤٧٠)- بیر بە دەرزی هەڵناکەندرێ[٤٧٠]

٤٧١)- بێستان بێ سەرەکەر، نابێ[٤٧١]

٤٧٢)- بیسم الله کردن، کاری کەم چیزییە[٤٧٢]

٤٧٣)- بێچووی مراوییە[٤٧٣]

٤٧٤)- بێ زۆڕنا هەڵئەپەڕێ[٤٧٤]

---

[٤٦٤] بڕ: بوارە، واتە بێ بوار لە ئاو مەدە، بە یەکێك ئەوترێ کە لە کاروبار ورد نەبێتەوە.

[٤٦٥] بڕ: بوارە، واتە بێ بوار لە ئاو مەدە، بە یەکێك ئەوترێ کە لە کاروبار ورد نەبێتەوە.

[٤٦٦] بە یەکێك ئەوترێ کە لە کۆڵانان گەورە بووبێ.

[٤٦٧] واتە هەر کەسێك بە هەر چی پێویست بێ، لە بیری ئەوەدایە.

[٤٦٨] بە یەکێ ئەوترێ، کە هەر بە قسە، یەکێك بشکێنێ، بێ ئەوەی دەستی لێ بوەشێنێ.

[٤٦٩] نێروو: لەشکرە، بە یەکێك ئەوترێ کە بێدەنگ و بەسام بێ.

[٤٧٠] واتە هەموو کارێك چەند جۆرە ئامێر و هۆکارێکی تایبەتی ئەوێ، کە بە بێ ئەو شتانە ئەو کارە ناکرێ، ئنجا مەبەست لەم پەندە ئەوەیە کە هەر کارەی بە ئامێری خۆی ئەبێ بکرێ.

[٤٧١] واتە هەموو شتێ، روویەکی ناشرینی ئەبێ ببێ.

[٤٧٢] واتە شت کە کەم بوو– بۆ ئەوەی پیت و بەرەکەتی تێ بکەوێ بیسم اللەی زۆری بۆ ئەکرێ، بەڵام کە شتەکە زۆر بوو ئەوەندە بسم اللەی لە سەر ناکرێ.

[٤٧٣] بێچووی مراوی وەك باوك و دایکەکەی هەر کە سەری لە هێلکە جووقا، مەلەوانە، ئنجا ئەمە بە یەکێك ئەوترێ کە کوڕی پیاوێکی باش بێ، وە ئەمیش هەر لە منداڵیەوە وەك باوکی باش بێ.

[٤٧٤] واتە بە بێ هۆ کەوتۆتە جووڵە جووڵ و ئەلکەسەما. بە کەسێك ئەوترێ کە شووڵی بێ عاری لێ هەڵکێشابێ.

٤٧٥)- بێگانه بێده، له سای بێگانه نیشتن هەر نائومێده[٤٧٥]

٤٧٦)- بێگانە، یەك مەیدانه[٤٧٦]

٤٧٧)- بێعار، دای له دەریا وتی: تەڕ تەڕ نەباشەد[٤٧٧]

٤٧٨)- بێعار، دای له دەریا، تەڕ نەبوو[٤٧٨]

٤٧٩)- بێعاریان خسته جەهەنەمەوە، وتی دارەکەی تەڕە[٤٧٩]

٤٨٠)- بێعاریان خسته جەهەنەمەوە، وتی سەرمامه[٤٨٠]

٤٨١)- بێکەسی هەر بۆ خوا باشه[٤٨١]

٤٨٢)- بێلەقوڕ بەدەست خەڵقەوە ئاسانه[٤٨٢]

٤٨٣)- بێ ناوی، له بەدناوی چاکتره[٤٨٣]

٤٨٤)- بێوەژن ئەستوونێ ماڵی زێڕ بێ، خێری پێ دەشێ[٤٨٤]

٤٨٥)- بێوەژن بەتەمای مارەیی نەبوو، داوای هەشت یەکی ئەکرد[٤٨٥]

٤٨٦)- بێوڵەم بوو بە دوو، تێرم نەخوارد له گوو[٤٨٦]

---

[٤٧٥] بێده: بەده، نیشتن: دانیشتن.

[٤٧٦] واته بێگانه ئەگەر لەگەڵتابێ، هەر له یەك مەیدانا لەگەڵتا ئەبێ، بەڵام خزم لە هەموو مەیدانێکا لەگەڵتایه، خۆش یا ناخۆش.

[٤٧٧] به مەردومی بێعار ئەڵێن، که هیچی پێ نەنگ نەبێ.

[٤٧٨] واته شت که کەم بوو– بۆ ئەوەی پیت و بەرەکەتی تێ بکەوێ بیسم اللەی زۆری بۆ ئەکرێ، بەڵام که شتەکه زۆر بوو ئەوەنده بسم اللەی له سەر ناکرێ.

[٤٧٩] به مەردومی بێعار ئەڵێن، که هیچی پێ نەنگ نەبێ.

[٤٨٠] به مەردومی بێعار ئەڵێن، که هیچی پێ نەنگ نەبێ.

[٤٨١] مەردومی بێکەس ئەیڵێ، که خوا نەبێ کەسی تر شك نەبا.

[٤٨٢] به یەکێك ئەوترێ، که ئیشی قورس و گرانی مەردوم به سووك و ئاسان بزانێ.

[٤٨٣] چونکه بێناو کەس ناوی نابات نه به باش و نه به خراپ، بەڵام بەدناو هەموو کەسێك تف و نەفرین (لەعنەت)ی لێ ئەکات.

[٤٨٤] چونکه هەمیشه ئەکروزێتەوه و خۆی نەدارا نیشان ئەدا.

[٤٨٥] به یەکێك ئەوترێ، که زیاد له مافی خۆی داوا بکا.

[٤٨٦] ژنێکی هەژار ئەیڵێ: که منداڵەکانی زۆر بووبن، وه گوزەرانیان بەم بۆنەیەوه، کەم و کورِ بووبێ.

# (پیتی پێ)

١)   پا ئەدا لە پەین[١]

٢)-   پادار بگرە، بێ پێ ماڵی وێمانە[٢]

٣)-   پاژنەم نەبێ بەخوێنێ، نامداتێ سەڵکێ ترخێنێ[٣]

٤)-   پارە بۆ نامەرد، روو زەردیی دێنێ[٤]

٥)-   پارە بدەیت، مەلا لە مزگەوت دەرئەکەیت[٥]

٦)-   پارە پارە ئەهێنێ[٦]

٧)-   پارە چڵکی دەستە[٧]

٨)-   پارەت کە بوو، کەس ناپرسێ کوڕی کێیت[٨]

٩)-   پارەی خەڵق، کیسە ئەدڕێنێ[٩]

١٠)-   پارەی زۆر، سەرشۆڕی دێنێ[١٠]

---

[١] بەیەکێك ئەوترێ کە نەتوانێ تۆڵەی خۆی بسێنێ لە یەکێك.

[٢] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی لادێیی ترێ رەشکە هەڵ ئەخات بۆ ئەوەی بیکات بە مێوژ، لە پاشا کە ئەچێ کۆی بکاتەوە، تەماشا ئەکات وا قالۆنچەی رەشی زۆری پێوە نیشتووە، وە قالۆنچەکان ئەیانەوێ بڕۆن، کابرا وائەزانێ کە ئەمانەش هەر مێوژن، خێرا ئەڵێ( پادار بگرە، بێ پێ ماڵی وێمانە) واتە ئەوانەی کە ئەڕۆن بیانگرە، ئەوانیکەی تر هی خۆمانە.

[٣] واتە دەستوور و باوی خوا وایە لە جیهانا، تا هەوڵ نەدەیت هیچت دەست ناکەوێ.

[٤] چونکە لە شوێنی خۆیا خەرجی ناکا.

[٥] واتە بە پارە، هەموو شتێك ئەکرێ.

[٦] واتە بە بێ پارە، کەسابەت ناکرێ.

[٧] واتە خەرج ئەبێ و ئەڕوا.

[٨] واتە ئەمڕۆ هەموو شتێکە.

[٩] واتە مەردوم شتی خەڵقی لە لا قورسە، کەواتە تا زوو بیدەیتەوە درەنگە.

[١٠] واتە پارەدار لەبەر ئاگاداری پارەکەی، ناوێرێ لە شوێنی خۆیا نە قسەیەکی پیاوانە بکا و نە کارێکی مەردانە بنوێنێ.

١١)- پارەی چەرمگ، بۆ رۆژی رەش[١١]

١٢)- پاروو لە دەم داکەوێ، بۆ کۆش باشە[١٢]

١٣)- پاروو هەتا نەجوریٚ، قووت نادریٚ[١٣]

١٤)- پاشای سەر تەختی، بنوارە وەختی[١٤]

١٥)- پاچکە بدیت بە ناکەس، هەوەس رانی ئەکا[١٥]

١٦)- پاڵی لیٚ داوەتەوە[١٦]

١٧)- پایزە بەهاری بنیادەمە[١٧]

١٨)- پایزە برا[١٨]

١٩)- پەتی درۆ کورتە[١٩]

٢٠)- پەتی سواڵی مل دائەبڕیٚ[٢٠]

٢١)- پەڕۆیەك، لەمن دادڕە[٢١]

---

[١١] تەماشای (ماڵی سپی بۆ رۆژی رەش ) بکە.

[١٢] واتە خێر بۆ خوێش، نەك بۆ دەروێش.

[١٣] واتە قسە تا پوختە نەکەیت نەیڵێیت.

[١٤] واتە پیاوی گەورە، ئەبیٚ بزانێت کەی ئەچیتە لای، وە چۆن قسەی لەگەڵ ئەگەیت.

[١٥] واتە ناوەجاخ، کە تێری خوارد ئەزەڕیٚ.

[١٦] بەیەکێك ئەوتریٚ کە ئەو ئیشەی هەیەتی، بن بەستی کردبیٚ، وە بیٚ خەم لیٚی دانیشتبیٚ.

[١٧] واتە هەر وەك بەهار، بەهاری ئاژەڵ و حەیواناتە بەهۆی زۆری گژ و گیاوە، پایزیش بەهاری ئادەمیە بەهۆی زۆری هەموو جۆرە میوە و خواردەمەنیەکەوە.

[١٨] بەیەکێك ئەڵێن کە لە ساڵا هەر پایزان دەرکەویٚ و بیٚ بۆ لات، کە ڕەز و باخات رازاونەتەوە بە میوەهات.

[١٩] چونکە هەموو درۆیەك پاش چەند رۆژێك دەرئەکەویٚ.

[٢٠] واتە سەر بەمەردوم شۆڕ ئەکات، بە یەکێك ئەوتریٚ کە داوای شت لە مەردوم بکا.

[٢١] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە لە شتێکا بۆڵە بۆڵ بکات، واتە منیش وەك تۆ وامە وە بۆڵە بۆڵیش ناکەم، کەواتە چاو لە من بکە.

٢٢)- پەرژین بۆ پیاوی بە شەرمە[٢٢]

٢٣)- پەرژین بۆ حەڵاڵ زادەیە[٢٣]

٢٤)- پەرژینی پیاو ئەدەبە[٢٤]

٢٥)- پەشیمان شاخی لێ بڕوایە شاخی لێ ئەڕوا[٢٥]

٢٦)- پەشیمانی بێ کەڵکە[٢٦]

٢٧)- پەشیمانی داد نادات[٢٧]

٢٨)- پەشیمانی نەوتن لە پەشیمانی وتن چاکترە[٢٨]

٢٩)- پەلەپیتکەم لێدەیت شەق ئەبەم[٢٩]

٣٠)- پەڵووڵەش، دەم ئەسووتێنێ[٣٠]

٣١)- پەموانە، بۆ هەموانە[٣١]

٣٢)- پەمووش، لە شارەزوور زۆرە[٣٢]

٣٣)- پەنجە بنێ دەمی، نایگەزێ[٣٣]

---

[٢٢] چونکە هەموو کەسێك ئەتوانێ بە سەر پەرژیندا بازبدا، یا پەرژینەکە لابەرێ بەڵام شەرم ئەکات کە شتی وا بکات.

[٢٣] واتە یەکێ حەڵاڵزادە بێ، لە پەرژین ئەگەڕێتەوە، بەڵام دز پەرژین ئەشکێنێ.

[٢٤] واتە ئەگەر پەرژینی شەرم و شکۆ نەبێ، هەموو کەسێك ئەتوانێ کاری خراپ بکات.

[٢٥] واتە تا ئەتوانیت کارێکی وا مەکە کە پەشیمان ببیتەوە.

[٢٦] واتە کە هەلێکت لە دەست دەرچوو، ناگەڕێتەوە، کەواتە مەیەڵە لە دەستت دەرچێ.

[٢٧] واتە کە هەلێکت لە دەست دەرچوو، ناگەڕێتەوە، کەواتە مەیەڵە لە دەستت دەرچێ.

[٢٨] واتە پەشیمان بوونەوە لە نەکردنی قسەیەك، باشترە لە پەشیمان بوونەوە لە کردنی.

[٢٩] واتە ئەوەندە خەمبارم.

[٣٠] بە یەکێکی بێ نرخی بێ نموود ئەوترێ کە دەستێك بوەشێنێ، یا قسەیەك بهاوێژێ.

[٣١] بەشتێك ئەوترێ، کە بۆ هەموان بێ.

[٣٢] بە یەکێك ئەوترێ کە داوای شتێکت لێ بکات، تۆش بڵێیت نییە، واتە نیمە بۆت بکڕم، کابراش تێ نەکات بڵێ: لە بازاڕ زۆرە، تۆش ئەڵێیت (پەمووش لە شارەزوور زۆرە) واتە کە پارە نەبوو بەچی بیکڕم.

[٣٣] واتە زۆر ساوێلکە و بێ دەسەڵاتە.

٣٤)- پەنجەی خۆی ئەکورۆژێ[٣٤]

٣٥)- پەنجەی خۆی برد بە دەما[٣٥]

٣٦)- پەنجەی خۆی گەست[٣٦]

٣٧)- پەنجەی دەستان هەموو چون یەك نین[٣٧]

٣٨)- پەیمان هەورە، بە جێهێنانی بارانە[٣٨]

٣٩)- پەیمانەی تەواو پڕ بووگە[٣٩]

٤٠)- پڕ کۆشمە لە نان و دۆ، نازانم شوێنی باوانم ها لە کۆ[٤٠]

٤١)- پرسا بە و دانا بە[٤١]

٤٢)- پشتکۆڵی پشت دەرگامە[٤٢]

٤٣)- پشتم سەفین بێ، تف لە ئاسنیش ئەکەم[٤٣]

٤٤)- پشتی دەستی خۆی برد بە دەما[٤٤]

٤٥)- پشتی یەکتری، نادەن لە زەوی[٤٥]

---

[٣٤] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر رقی هەستابێ.

[٣٥] واتە زۆر پەشیمان بووەوە.

[٣٦] واتە زۆر پەشیمان بووەوە.

[٣٧] بە یەکێك ئەوترێ کە سەرسام بێ لە دوو برای باوك و دایکی کە یەکێکیان زۆر چاك و ئەوی تریان خراپ بێ. واتە پەنجەی دەستێك چۆن لە یەك جیان بە درێژی و کورتی، براش ئاوان.

[٣٨] واتە مەبەست لە پەیمان بەجێ هێنانەکەیەتی.

[٣٩] واتە کاسەی پڕ بووە.

[٤٠] بە یەکێکی بێ باوان ئەوترێ، کە لە خۆشی دا نوقوم بووبێ.

[٤١] واتە هەر چیت نەزانی، پرس بکە.

[٤٢] واتە دڵسۆز و پاسەوانم.

[٤٣] سەفین: ناوی شاخێکە لە پشت شەقڵاوەوە، واتە کە پشتیوانم بوو، لەکەس ناترسم.

[٤٤] تەماشای (پەنجەی خۆی گەست) بکە.

[٤٥] بە دوو دۆستی گیانی بە گیانی ئەوترێ.

٤٦)- پشتێنی لێ بکەرەوە[٤٦]

٤٧)- پشقلێ بخەرە ژێر پێت[٤٧]

٤٨)- پشقلێ بخەرە ژێر زمانت[٤٨]

٤٩)- پشیلە باڵی ببوایە، تۆوی چۆلەکەی ئەبڕی[٤٩]

٥٠)- پشیلە بێچووی خۆی نەوێ، حەوت ماڵی ناگێڕێ[٥٠]

٥١)- پشیلە دووگی دیوە[٥١]

٥٢)- پشیلە لە ماڵی ناشتا ناکات[٥٢]

٥٣)- پشیلە وتوویەتی: یاخوا لە ماڵێکا بم پیرێژنێکی کوێری تیا بێ.[٥٣]

٥٤)- پشیلە، دەمی نەئەگەیشتە دووگ، ئەویت سوێرە[٥٤]

٥٥)- پشیلە، گووی بە دەرمان ئەشیا، کونا و کون ئەیشاردەوە[٥٥]

٥٦)- پشیلە، لە دوای جگەر عەودالە، دەمی نایگاتێ ئەڵێ تاڵە[٥٦]

٥٧)- پشیلە، لە ماڵ نییە و مشکان تلیلیانە[٥٧]

---

[٤٦] واتە دڵنیابە و لە هیچ مەترسە.

[٤٧] لە ڕووی سووکیەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە باڵای زۆر کورت بێ، وە دەستی نەگاتە شتێك.

[٤٨] لە ڕووی سووکیەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە باڵای زۆر کورت بێ، وە دەستی نەگاتە شتێك.

[٤٩] واتە خوا دەست بە زۆرداری ستەم کار نادات.

[٥٠] واتە هەموو گیان لەبەرێك، بێچووی خۆی خۆش ئەوێ.

[٥١] بە یەکێك ئەوترێ کە دوای تەماعێك کەوتبێ.

[٥٢] واتە زۆر چروکە.

[٥٣] بە یەکێکی چاوبرسی ئەوترێ، کە بووبێ بە هاوکاری یەکێکی گێلۆکە و بەسزمان.

[٥٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێکی بۆ نەبێ و بڵێ حەزم لێی نییە.

[٥٥] بە یەکێك ئەوترێ، لە پاش ئەوەی کە بزانێ ئیشێکیان پێیەتی خۆی بشارێتەوە.

[٥٦] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی دەست نەکەوێ و بڵێ ناخۆشە.

[٥٧] بە خێزانێك ئەوترێ، کە گەورەکەیان لە ماڵ نەبێ، وە ئەوان بە سەربەستی بێن و بچن و قسە بکەن.

٥٨)- پشیلەی کوێر، شت لە ژێر چنگی دەرناهێنێ[٥٨]

٥٩)- پف لە بۆڵە مرِ ئەکات[٥٩]

٦٠)- پلارێکمان تێبگرە، هەر باشە[٦٠]

٦١)- پلاو خۆران پاڵداوە، جۆ خۆران هۆی داوە[٦١]

٦٢)- پلکە شەمام، هەموو رۆژێ حەمام[٦٢]

٦٣)- پلێ هات و پلێ چوو، ئەویشی رست خاوەوە بوو[٦٣]

٦٤)- پوور ئەگەر گونی ببوایە، ئەبوو بە مام[٦٤]

٦٥)- پوورە فەرەنگێز تۆ تەشیەکەی من بڕێس هێنەکەی خۆت بدە بە نیوەرێس[٦٥]

٦٦)- پوورە مەستان، کاسە بدە و کاسە بستان[٦٦]

٦٧)- پووش، لە کا ئەبژێرێ[٦٧]

٦٨)- پووشێکی، دایە دەست[٦٨]

---

[٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر پیسکە و چروك بێ.

[٥٩] بۆڵە مرِ: ژیلەمۆیە، واتە ئاسنی سارد ئەکوتێ.

[٦٠] بە خۆشەویستێك ئەوترێ، واتە بە پلارێکیش بمان خوێنێتەوە هەر خۆشە.

[٦١] واتە ئەوان پاڵیان داوەتەوە و ئەمانیش رەنج ئەدەن و عەرەق ئەرێژن.

[٦٢] بە ژنێك ئەوترێ کە هەمیشە خەریکی خۆشتن و جل گۆرِین بێ.

[٦٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە کارێکەوە خەریك بێ تا ماوەیەك لە پاشا هەڵی بوەشێنێتەوە.

[٦٤] بە یەکێك ئەوترێ کە لە هەموو قسە و گفتوگۆیەکا بڵێ: ئەگەر ئەوە وابوایە وا ئەبوو.

[٦٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشەکەی خۆی بە تۆ بکات وە ئیشەکەی تۆ بهێڵێتەوە بۆ یەکێکی تر.

[٦٦] واتە کاسە دراوسێتی، ئەنێریت، کاسە دراوسێتیت بۆ ئانێرن.

[٦٧] بە شتێکی ئێجگار زۆر ئەڵێن، کە لە شتێکی تری هەڵبـژێرێت، واتە چۆن پووش لە کا نابژێرێ، ئەم شتەش لەو شتە نابژێرێ.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە پارەی یەکێکی بە دەستەوە بێ، لە پاشا پێی بڵێ زەرەرم کردووە، وە پارەکەم هەموو لە ناو چووە.

٦٩)- پووڵ، ئەکا بە پەڕۆ[٦٩]

٧٠)- پیادە ئەزانێ سوار تەنگەی بەربووە[٧٠]

٧١)- پیازی بۆ پاك ئەکا[٧١]

٧٢)- پیازی عەودالآنە، خواردنی هەیە و بردنی نییە[٧٢]

٧٣)- پیاما بکە شوژن، بانگم بکە ئاغا ژن[٧٣]

٧٤)- پیاو ئەبێ لەسەر بەرەی خەڵق هەستێ[٧٤]

٧٥)- پیاو ئەو پیاوەیە، بچێتە هەوێ و بێتەوە[٧٥]

٧٦)- پیاو بە تەمای دروایێ بێ، بێ شێو سەر ئەنێتەوە[٧٦]

٧٧)- پیاو بە گەورەیی فێری پلاوخواردن بێ دەست بۆ لووتی ئەبا[٧٧]

٧٨)- پیاو بە قسەی خۆی دەبەسترێتەوە[٧٨]

٧٩)- پیاو بوخچەیە، تا نەیکەیتەوە، نازانی چی تیایە[٧٩]

٨٠)- پیاو تا نەترێ بە چوارمەشقی دانانیشێ[٨٠]

---

[٦٩] بە یەکێك ئەوترێ کە نرخی پارە نەزانێ.

[٧٠] واتە بچوك ئەزانێ کە گەورە نەنگی چیە لە ناو کۆمەڵدا.

[٧١] واتە مەرایی ئەکات.

[٧٢] پیازی عەودالآنە، لەبەر ناسکی نابرێ بۆ شوێنان، ئنجا ئێستا بە هەموو شتێك ئەوترێ، کە خواردنی ببێ و بردنی نەبێ.

[٧٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە حەزی لەگەورەیی بێ.

[٧٤] واتە مەرنوم،هەر چەند رۆژێك ئەتوانێ میوانی یەکێك بێ.

[٧٥] واتە پیاو ئەو کەسەیە، بچێ بۆ کارێك و بیکات و بە دروستی بگەڕێتەوە.

[٧٦] واتە بە تەمای کەس مەبە، وە هەمیشە هەر بە کردەوەی خۆت پشت ببەستە.

[٧٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە تازە فێری شتێك بووبێ و هەڵەی تیا بکات.

[٧٨] واتە کە قسەیەکت کرد، ئەبێ بیبەتە سەر.

[٧٩] کردنەوەشی بە قسە کردنیەتی.

[٨٠] واتە تا هەڵە نەکا و رۆژگار دەرسی قورس و گرانی نەداتێ، پوختە نابێ، وە بە رەحەتی دانانیشێ.

٨١)- پیاو دوو ژنە، وەك کەوگیر جەرگی کون کونە[٨١]

٨٢)- پیاو قوتابییە و رۆژگار مامۆستا[٨٢]

٨٣)- پیاو کە ئالتیرەم نانی خوارد ئەبێ فلتیرەم عەقلی ببێ[٨٣]

٨٤)- پیاو کە پیر بوو چۆلەکەی پێ ئەگرن[٨٤]

٨٥)- پیاو کە زۆری وت، چاکیش ئەڵێ و خراپیش ئەڵێ[٨٥]

٨٦)- پیاو کە گولۆڵەی کەوتە لێژی، کەس خاسی پێ نایەژی[٨٦]

٨٧)- پیاو کە لە ژن بە بیانوو بوو، ئەڵێ: ئارد ئەبێژی، قنگ ئەلەقێنی[٨٧]

٨٨)- پیاو کە لە ماڵا نەبوو، ژنی ئەدرێ بە شوو[٨٨]

٨٩)- پیاو کە ناچار بوو، بە جوولەکە ئەڵێ بە ریشی مەردانەت قەسەم[٨٩]

٩٠)- پیاو کە ناچار بوو، بە دۆستی دایکی ئەڵێ لالە[٩٠]

٩١)- پیاو لە بنەماڵ نابڕێ[٩١]

٩٢)- پیاو لە دەویتی بترسێ، ژن ناهێنێ[٩٢]

٩٣)- پیاو لە کوانووی خۆیەوە ئاو ئەچێتە ژێری[٩٣]

---

[٨١] چونکە هەر دوو لا، هەر ئازاری ئەدەن.

[٨٢] واتە تا ئەتوانیت، دەرس لە بەسەرهاتی رۆژگار وەربگرە.

[٨٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەڵەیەکی زلی کردبێ.

[٨٤] واتە پیاو نابێ بە خۆڕایی دانیشێ، بەڵکو کردن هەتا مردن.

[٨٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆربڵێ بێ، وە رێی بکەوێتە هەموو قسەیەکەوە.

[٨٦] واتە تا ئەتوانیت کارێکی وا مەکە گولۆڵەت بکەوێتە لێژی.

[٨٧] واتە پیاو کە لە سەر بیانوو بوو، پەکی ناکەوێ.

[٨٨] واتە هەمیشە ئەبێ ئاگات لە ماڵ و منالت بێ.

[٨٩] واتە ناچاری هەموو شتێ بە مەردوم ئەکا.

[٩٠] واتە ناچاری هەموو شتێ بە مەردوم ئەکا.

[٩١] چونکە رەوشت و خووی بەرزی ئەو بنەماڵە، کاری خۆی هەر ئەکا.

[٩٢] واتە پیاو نابێ لە ترسی زبانی خەڵق دەست لە ژیان هەڵگرێ.

[٩٣] یەکێك ئەیڵێ، کە بەهۆی خزمێکییەوە، زەفەری پێ برا بێ.

٩٤)- پیاو لەماڵی خۆیا ملی شا ئەپەڕێنێ[٩٤]

٩٥)- پیاو نابێ دروایسێی حوشترەوان بێ ئەگەر بوو، ئەبێ دەرکی قاپییەکەی بەرزکاتەوە[٩٥]

٩٦)- پیاو نەمرێ، بە هەموو ئاواتێك ئەگا[٩٦]

٩٧)- پیاو هەر جارێك ئەمرێ[٩٧]

٩٨)- پیاوەتی ئەگەر بە ریش بێ، سابرێن لە هەموو کەس پیاوترە[٩٨]

٩٩)- پیاوەتی بە سەر ئاوی حەمامەوە ئەکات[٩٩]

١٠٠)- پیاوەتی، بە ئیشە نەك بە ڕیشە[١٠٠]

١٠١)- پیاوی دەستەوسان، چ لە گەرمیان چ لە کوێستان[١٠١]

١٠٢)- پیاوی ژیر ئەوەیە، لە پێش بیر کردنەوەدا نەیەتە وتار[١٠٢]

١٠٣)- پیاوی سەر راست شەریکی دەوڵەمەندە[١٠٣]

١٠٤)- پیاوی چرووك پاسەوانی پارەکەیەتی[١٠٤]

١٠٥)- پیاوی گولە، تڕی زلە[١٠٥]

---

[٩٤] چونکە لە کەس ناترسێ و هەرچی بڵێ ئەیلێ.

[٩٥] واتە هاوڕێیی هەر کەسێکت کرد، ئەبێ، وەك ئەو بێ.

[٩٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەدوای ماوەیەکی زۆر، بە ئاواتێکی گرنگی خۆی بگا.

[٩٧] واتە نابێ سەرشۆڕی قبووڵ بکات، ئەگینا هەموو دەمێك، جارێ، ئەمرێ.

[٩٨] چونکە ریشی درێژترە.

[٩٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە پیاوەتی بە سەر ماڵی مەردومەوە بکا.

[١٠٠] واتە هەرگیز دیمەن پەرست مەبە.

[١٠١] واتە لە هیچ لایەکیان رەنجی پێ نادرێ.

[١٠٢] بەڵکو هەموو قسەیەك بکولێنێ، ئنجا دەری بێنێ.

[١٠٣] چونکە هەمیشە دەستی ئەگرێ و پارەی ئەداتێ بە قەرز.

[١٠٤] چونکە لێی خەرج ناکا.

[١٠٥] چونکە هەستی ناتەواوی (مرکبی نقصی) هەیە.

۱۰٦)- پیاوی فەقیر، لای باوە ئەتسیٚ[106]

۱۰۷)- پیاوی کورت بە قەیسەری دا بڕوا سەر دائەنوێنیٚ[107]

۱۰۸)- پیاوی نابووت، خزمی دوور و قەرزی کۆن بە یاد ئەکا[108]

۱۰۹)- پێخاوسی باشترە لە پێلاوی تەنگ، بیٚ ماڵی باشترە لە ماڵی بەجەنگ[109]

۱۱۰)- پیر لە پیری مەڕوانە، لە هەوڵ و داوی بڕوانە[110]

۱۱۱)- پیر لە پیری نییە لەسەر گوزەشتەیی یە[111]

۱۱۲)- پیر و تەرپۆش، هاتوونەتە جۆش[112]

۱۱۳)- پیر، تا نەکا تەگبیر، نابیٚ بە میر[113]

۱۱٤)- پیرە، بە ڕا و تەگبیرە[114]

۱۱٥)- پیری و سەد عەیب[115]

۱۱٦)- پیری و فەقیری، هەر دوم بە کیری[116]

۱۱۷)- پیرێژنی ئەوە دنیایە، دڵداری خۆی لە بیر نایە، ئەکا مەنعی من و یابە[117]

---

[106] واتە ئەوەندە بەدبەختە، تسەکەشی لە لایەکی واوە دەرئەچیٚ کە با بی با بە سەر مەردوما، تا پێی بزانن و جنێوی پیٚ بدەن.

[107] چونکە هەست بە ناتەواوی خۆی ئەکات، وە ئەیەویٚ پڕی بکاتەوە.

[108] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە لەبەر نەبوونی دەفتەری کۆن بخوێنێتەوە.

[109]

[110] بە پیرێك ئەوتریٚ کە بە بڕشت بیٚ، وە لە ماڵا خاوەنی زەبر و زەنگ بیٚ.

[111] واتە پیر کە شارەزایە لە تەمەن درێژی نییە، بەڵکو لە قاڵبوون و دنیا بینینێتی.

[112] بەو ژنانە ئەوترێن، کە لە ڕەشبەڵەکا کۆ ئەبنەوە.

[113] واتە پیر بە ژیری و بیر ئەبیٚ بە میر، نەك بە تەمەن درێژی.

[114] بە پیرێکی ژیری بە بیر ئەوتریٚ.

[115] پیرێك ئەیڵیٚ، کە نەنگی پیرێتی لیٚ دەرکەوتبیٚ.

[116] واتە نە بە پیری پەستم، نە بە هەژاری.

[117] بە پیرێژنێك ئەوتریٚ کە بە سەر کوڕ، یا کچێکی گەنجا بیٚ، وە هێندیٚ شتی وای لیٚ قەدەغە بکا، کە خۆی کرد بێتی.

١١٨)- پێستەکەی ئەوی کێشاوە بە سەر خۆیا[118]

١١٩)- پێستی بێ عاری کێشا بە ڕووی خۆیا[119]

١٢٠)- پێستی سەگ بە دەباخ پاك نابێتەوە[120]

١٢١)- پێستی قورواق بە دەباخ ناژێ[121]

١٢٢)- پێستی لە دەباخ نایەت[122]

١٢٣)- پێش ئەوەی بچیتە ناو بیر، بیر لە هاتنە دەرەوەت بکە[123]

١٢٤)- پێشەی خۆی شکاندووە[124]

١٢٥)- پێشەی رەش نەکردگە[125]

١٢٦)- پێشکەوتووی دواکەوتووە[126]

١٢٧)- پێشینان کردیان، تۆ خواردت، تۆش بیکە و مەردوم بیخۆن[127]

١٢٨)- پێچکە چوارە، بە ژمارە[128]

١٢٩)- پێچی دارێ، لە پەنای شایی باشترە[129]

---

[118] بە یەکێك ئەوترێ کە رەوشت و خووی یەکێکی تری گرتبێ.

[119] واتە بێ شەرمی نواند.

[120] بەیەکێك ئەوترێ، کە خەریکی ئامۆژگاری یەکێکی بۆگەنی پیس بێ، کە بیهێنێتە سەر ڕێیەکی راست، واتە بە تەمای چاکبونی شتی وا مەبە، وە خۆتی پێوە ماندوو مەکە.

[121] بە کارێك ئەوترێ کە نرخی ئەوەی نەبێ رەنجی تیا بدەیت.

[122] بە شتێك ئەوترێ، کە هیوای خێرت بێ نەبێ.

[123] چونکە ئەگەر بیر نەکەیتەوە ئەچیتە ناوی و ناتوانی بێیتە دەرەوە.

[124] پێشە ئێسقانە، بە یەکێك ئەوترێ کە هەڵەیەکی زلی کردبێ بە جۆرێکی وا کە بۆی پینە نەکرێ.

[125] واتە منداڵە هێشتا خۆی دانەڕشتووە.

[126] بە یەکێك ئەوترێ، هەر چەند هەوڵ بدا بۆ شتێك هەر لە دواوە بێ.

[127]

[128] لە کاتێکا بە کار دێنرێ، کە دەم قاڵبەك ببێ لە ژمارە و حسابێکا، واتە ئەمە ئەوەندەیە بە بێ زیاد و کەم.

[129] چونکە لە یەکەمدا منەتباری تیا نییە.

۱۳۰)- پێچی مێزەرێکە[۱۳۰]

۱۳۱)- پێکەنینی زۆر گریانی لە دوایە[۱۳۱]

۱۳۲)- پێکەوە ناچنە جەوالێکەوە[۱۳۲]

۱۳۳)- پێڵاوە شرێکی لە دیوانا هەیە[۱۳۳]

۱۳٤)- پێمان لێ مەبڕە[۱۳٤]

۱۳۵)- پینەکەری، روو سپی کەری[۱۳۵]

۱۳٦)- پینەی شینە بە دەرقنگیەوە[۱۳٦]

۱۳۷)- پێنج پەنجەی دەست هەمو چۆن یەك نین[۱۳۷]

۱۳۸)- پێوانەی پڕ بووە[۱۳۸]

۱۳۹)- پێی زل نەگبەتە، سەری زل دەوڵەتە[۱۳۹]

۱٤۰)- پێی چرا تاریکە[۱٤۰]

---

[۱۳۰] بە یەکێك ئەوترێ، کە ماوەیەکی پێ زۆر بێ، واتە ئەم ساڵە یا ئەم دوو ساڵە کە تۆ تیا ئەچیتە دەرەوە بۆ خوێندن، هەر بە قەد پێچێکی سەر پێچەکەتە.

[۱۳۱] واتە زۆر پێ مەکەنە، چونکە سەر ئەکێشێ بۆ ناخۆشی.

[۱۳۲] واتە سروشت و رەوشت و خوویان لە یەکەوە دوورە.

[۱۳۳] بە یەکێك ئەوترێ کە خزمێکی یا ئاشنایەکی لە دەوڵەتا، یا لە ماڵە گەورەیەکا ببێ.

[۱۳٤] واتە ناو بە ناو سەرمان بدە.

[۱۳۵] واتە ئەوانەی پینەی کاڵا ئەکەن، رووی خۆیان . . چی ئەکەن، لە ناو کۆمەڵەدا، وە ئەوانەی کە لەبەر تەمەڵی پینە ناکەن، وە بە بەرگی دڕاوەوە ئەچنە ناو مەردومەوە، رووی خۆیان رەش ئەکەن.

[۱۳٦] بە یەکێك ئەوترێ کە نەنگێکی پێوە بێ لەناو مەردوما.

[۱۳۷] بە چەند برایەك ئەوترێ ، کە وەك یەك نەبن لە رەوشت و خوودا.

[۱۳۸] واتە کاسەی پڕ بووە.

[۱۳۹] چونکە نیشانەی زۆری ژیری و بیرە.

[۱٤۰] بە یەکێك ئەوترێ ، خزمەتی بێگانە بکا، نەك کەس و کاری خۆی، وەك چرا کە چوار دەوری روناك ئەکاتەوە، ژێری خۆی نەبێ.

١٤١)- پێیەكی لێرەیە و پێیەكی لە بەغدا[١٤١]

١٤٢)- پێ بە قەد بەڕەی خۆت ڕاكێشە[١٤٢]

١٤٣)- پێ بكەنە لەگەڵ دنیا، بگری بۆ خۆت بە تەنیا[١٤٣]

١٤٤)- پێ لە سۆسنان مەنی[١٤٤]

١٤٥)- پێ لەو پشكۆیە نانێ[١٤٥]

---

[١٤١] بە یەكێك ئەوترێ كە هەمیشە لە ناوەندی دوو شوێنی دوورا هاتوچۆ بكات.

[١٤٢] واتە زیاد لە ئەندازەی خۆت خەرج مەكە، وە لە هیچ شتێكا لە سنووری خۆت مەچۆرە دەرەوە.

[١٤٣] واتە پێكەنینت بە ئاشكرابێ، بەڵام كەس بە خەم و خەفەتت نەزانێ تا دوژمن پێت خۆش نەبێ.

[١٤٤] سۆسنا: گوڵە سۆسەنە. بە یەكێك ئەوترێ لە رووی هەڕەشەوەكە كارێكی خراپی كردبێ، واتە جارێكی تر ئەو كارە نەكەیتەوە، وەك بڵێیت: جارێكی تر پێ نەنێیت لەو پشكۆیە.

[١٤٥] واتە ئەو بەڵێنە نادات، وە ناچێتە ژێری.

# (پیتی تێ)

١)- تا ئەڵێ بەرسیلە، ترێ پێ ئەگا[١]

٢)- تا ئەڵێ بەهار، هاوین دێ[٢]

٣)- تا ئەڵێ هاڵە، هەنگوور پێئەگا[٣]

٤)- تا ئەم بایە لەم کونەوە بێ، ئەم ئاگرە ناگرێ[٤]

٥)- تا ئەم بایە لەم کونەوە بێ، هیچ[٥]

٦)- تا ئێوارە قەزوان بخۆیت، بە گوێزێك ئەتگەمێ[٦]

٧)- تا بۆ خۆمم سەند قیر سپی بوو[٧]

٨)- تا بۆ خۆمم سەند قیر وتی چەق[٨]

---

[١] بەرسیلە. هەنگور: ترێیە. یەکێك ئەوترێ کە زۆر سست بێ لە ئیش کردنا.

[٢] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر سست بێ لە ئیش کردنا.

[٣] هاڵە: بەرسیلە. هەنگور: ترێیە. بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر سست بێ لە ئیش کردنا.

[٤] یەکێك ئەیلێ، کە بە ئیشێکەوە خەریك بێ، بەڵام دەنگ و باسێك ببێ نەیەڵێ ئەو ئیشە سەر بگرێ.

[٥] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك لە دەشت، وە لەبەر ڕەشەبا، قاوتی تـوو ئـەخوا وە هـەر چـەند قاوتەکە ئەبا بۆ دەمی، ڕەشـەباکە لێـی ئـەفڕێنێ. یـەکێك لـەو کاتـەدا دێ، وە لەلایـەوە دائەنیشێ، وە لێی ئەپرسێ: خاڵە ئەوە چی ئەخۆیت؟ ئـەمیش ئـەڵێ: تـا ئـەم بایـە لـەم کونەوە بێ هیچ.

[٦] یەکێکی چوست و چالاك بە یەکێکی سستی دەستە پاچەی ئەڵێ.

[٧] واتە زۆر بە گران دەستم کەوت.

[٨] واتە زۆر بە گران دەستم کەوت.

٩)- تا به شەو نەڕۆیت، بەڕۆژ ناگەیتە مەنزڵ[٩]

١٠)- تا بەد نەبینیّ، بەدخانە بە یاد ناکا[١٠]

١١)- تا بەڕوو زۆر بیّ سمۆرە برسیەتی[١١]

١٢)- تا تۆ خەریکی ئامۆژگاری من بوویت، من مێشم ژمارد بە گونی کەرەکەوە[١٢]

١٣)- تا تۆو نەوەشێنیت، خەرمان هەڵ ناگریت[١٣]

١٤)- تا پیریّ ئەمریّ، هەزار جوان ئەمریّ[١٤]

١٥)- تا جێی رم نەکەیتەوە، نەی چەقێنیت[١٥]

١٦)- تا جێی سەنگ نەکەیتەوە دای مەکوتە[١٦]

١٧)- تا خان ئەسازیّ، لەشکر ئەترازیّ[١٧]

١٨)- تا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت[١٨]

---

[٩] جاران کە بە کەر و بار سەفەر ئەکرا، لە پێش شەبەقا بە ماوەیەکی زۆر ئەکەوتنە ریّ، ئنجا بۆ نیوەڕۆ ئەگەیشتنە قۆناغ، واتە کەس بەبیّ هەوڵ و تەقەلا، ناگاتە پاشە رۆژێکی باش.

[١٠] بە یەکێك ئەوتریّ، کە لەوەپێش خانەی لیّ ناخۆش بووبیّ، بەهۆی بەدێکەوە، وە ئێستا لەو بەدە خراپتری بووبیّ بە کۆڵکەوە وە بە ناچاری یادی بەدخانەکەی جاران بکاتەوە.

[١١] بە مەردومی چاوچنۆك ئەوتریّ.

[١٢] بە یەکێك ئەوتریّ کە هیچ ئامۆژگارییەك وەرنەگریّ.

[١٣] واتە تا رەنج نەدەیت، گەنجت دەست ناکەوێت.

[١٤] چونکە پیری پشت کۆم، وەك کەوان وایە، تا خۆی ئەشکیّ هەزاران تیری قنج و قیت ئەکا بە ژێر خاکەوە.

[١٥] واتە تا جێی قسە نەکەیتەوە قسەکە نەکەیت.

[١٦] واتە تا جێی قسە نەکەیتەوە قسەکە نەکەیت.

[١٧] بە یەکێکی تەمەڵ ئەوتریّ، کە درەنگ ریّ بکەویّ.

[١٨] یەکێك ئەیڵیّ، کە گلەییەکی ببیّ لە یەکێك، کەچی لە پێش ئەوەی ئەم گلەییەکەی بکا، کابرا دەست پێشکەری بکا لە گلەیی کردنا.

١٩)- تا دەستی نەکەوێ لە گونی نازانێ نێرە[١٩]

٢٠)- تا ژێر بیری کردەوە شێت لە ئاو پەڕییەوە[٢٠]

٢١)- تا ڕێوی قەواڵەی خۆی خوێندەوە، پێستیان گورو لە قنگەوە[٢١]

٢٢)- تا زۆرتر بژییت، زۆرتر ئەبینیت[٢٢]

٢٣)- تا زەوی ئاو نەخواتەوە، گیا ئاو ناخواتەوە[٢٣]

٢٤)- تا شوو ئەکەیت میریت، کە شووت کرد گزیریت، کە سکت کرد پیریت[٢٤]

٢٥)- تا چاڵ پڕ نەبێ، کۆش پڕ نابێ[٢٥]

٢٦)- تا گوو نەکا، نازانێ قنگی لە کوێوەیە[٢٦]

٢٧)- تا گووی قیرینی پێ نەکا، وازی لێ ناهێنێ[٢٧]

---

[١٩] واتە گا بە گونیا ئەناسێ، یەعنی زۆر نادانە.

[٢٠] واتە هەر چی زۆر بیر کاتەوە لە کارێك پڕ کێشی کەم ئەبێ.

[٢١] بە یەکێك ئەوترێ کە بە سادەیی، خۆی تێکەڵ بکات بـە دەنـگ و باسـێکی خـراپ، وە بەو بۆنەیەوە دووچاری چورتم ببێ، وە بە هەزار حاڵ وە لە دوای ماوەیـەکی دووردرێـژ، تا دەرئەکەوێ، کە ئەم لەو کارەدا نییە، واتە ئاگات لە خۆت بێ تووشـی شـتی وانـەبیت، چونکە زۆر کەس تا قەباڵەی خۆی خوێندۆتەوە سەری تیا چووە.

[٢٢] بۆیە ئادەمی تا بە ساڵا بچێ پوختەتر ئەبێ.

[٢٣] ئەم پەندە ئامۆژگارییەکی زۆر بەرز و بەنرخە بۆ هەموو کەسێك کە لە نیشتمانێکا بژی، کە ئەبێ لە پێش خۆیا، خزمـەتی نیشتمانەکەی بکـات بـە تێکڕایـی، تـا خۆشـی لـە نـاو هـەموانا بەهرەمەنـد ببـێ، نابینیـت تـا زەوی کـە نیشـتمانە ئـاو نەخواتـەوە، گیـا ئـاو ناخواتەوە، هەرگیز دیوتە گیا بەبێ زەوی ئاو بخواتەوە، ئەوانەی کـە وەك گەنـەی گـونی سەگ هەر بۆ خۆیان ئەژین، وە قازانجی کۆمەڵە و گەڵ ئەکەن بە قوربانی قازانجی خۆیان ئەوانە ئەبێ وەك گەنە بفلیقێنرێنەوە.

[٢٤] بە کچێك ئەوترێ کە هێشتا شووی نەکردبێ.

[٢٥] بە یەکێکی دەوڵەمەند ئەوترێ، کە بمرێ و بنێژرێ لە چاڵە قووتەیەکدا، وە خزمـەکانی بەشدار ببن، وە کۆشی لێ پڕ بکەن.

[٢٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر کەودەن و تێنەگەیشتووە بێت.

[٢٧] واتە زۆر ئازار و سزای ئەدا.

٢٨)- تا گوێرەکە بە گا ئەکەیت، خوێنی خۆت بە ئاو ئەکەیت[٢٨]

٢٩)- تا فەرز وەستابێ، سوننەت بەتاڵە[٢٩]

٣٠)- تا کۆسپێك نەڕمێ، کەندێك پڕ نابێتەوە[٣٠]

٣١)- تا کەر لە بەغدا نەزەڕێ، بەری نادا[٣١]

٣٢)- تا کەندێ نەڕووخێ، کەندەڵانێ پڕ نابێتەوە[٣٢]

٣٣)- تا کچی، میری، کە شوت کرد گزیری، کە سکێکت کرد پیری[٣٣]

٣٤)- تا کونێك ئەگری، کونێکی تری تێ ئەبێ[٣٤]

٣٥)- تا کێوێك نەڕووخێ، کەندەڵانێك پڕ نابێتەوە[٣٥]

٣٦)- تا ما جووتێ کەوش نەبوو لە پای، کە مرد حەوت بوو لە سەرینای[٣٦]

٣٧)- تا ما مراندی، کە مردیش تڕاندی[٣٧]

---

[٢٨] واتە تا منداڵێك پێ ئەگەیەنیت ، جەرگت ئەبێ بە ئاو.

[٢٩] واتە تا شتی گرنگ پێویست بێ، مەردوم نابێ بە شتی هیچ و پووچەوە خەریك بێ.

[٣٠] لە کاتێکا ئەوترێ، کە دەوڵەمەندێك بمرێ، وە ماڵێکی زۆر بە جێ بێڵێ بۆ چەند خزمێکی هەژاری.

[٣١] جاران کە منداڵێك دەستی ببردایە بۆ قرژاڵ، بە گاڵتەوە پێیان ئەوت دەستت ئەگرێ، ئەو حەلە تا کەر لە بەغدا نەزەڕێ بەرت نادا.

[٣٢] تەماشای پەندی سێهەم بکە لە پێش ئەم پەندەوە.

[٣٣]

[٣٤] زۆرتر یەکێکی گوزەران تەنگ ئەیلێ، کە دەستکەوتەکەی بەشی پێویستی ڕۆژانەی نەکات.

[٣٥] تەماشای پەندی پێنجەم بکە لە پێش ئەم پەندەوە.

[٣٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ژیانیا ڕێزی نەگیرێ لە لایەن کەس و کاریەوە، بەڵام دوای مردنی خێری بۆ بکەن.

[٣٧] بە پیاوێك ئەوترێ، کە لەگەڵ ژنەکەیا خراپ بێ، کە خۆشی مرد گوبەنگ و دەردیسەری بۆ بەجێ بێڵێ.

۳۸)- تا ماڵ وەستابێ مزگەوت حەرامە[38]

۳۹)- تا مەقاش ببێ، دەستی خۆت مەسووتێنە[39]

٤٠)- تا مەلا مەلا بوو، ئا ئەمە بوار بوو[40]

٤١)- تا من، وتم بسم الله، ئەو وتی: الحمدالله[41]

٤٢)- تا نەبێ سەمەرێ، نابێ خەبەرێ[42]

٤٣)- تا نەچێتە جەواڵ نابێ بە ماڵ[43]

٤٤)- تا نەیچەشێ، نایزانێ[44]

٤٥)- تا نەینایە تەبەق، نەیوت: الله سەدەق[45]

٤٦)- تاجی ئەدەب لەسەر نێ، هەموو جیهان لەبەر نێ[46]

٤٧)- تاریکی شەو، چرای نایڕەوێنێتەوە[47]

٤٨)- تاریکی مانگ سەر لە ئێوارە دیارە[48]

---

[38] واتە لە خۆت و ماڵ و منداڵت نەمێنێتەوە، بەخێر ناشێ.

[39] واتە تا ئیش بە پارە بکرێ لەشی خۆت مەخەرە نارەحەتیەوە.

[40] ئەگێڕنەوە کە جارێك مەلای مەزبورە سا لەبەر هەر شتێك بووە خۆی ئەمرێنێ، پیاوانی دێ لێی کۆ ئەبنەوە، دوای شیوەن و گریان ئەیشۆن و کفنی ئەکەن و ئەیبەن بۆ گۆڕستان، لە ڕێ بە چەمێك ئەگەن ئەپرسن: بوار کامەیە؟ هەر یەکە قسەیەك ئەکات، ئنجا مەلا سەر بەرز ئەکاتەوە ئەڵێ تا مەلا مەلا بوو، ئا ئەمە بوار بوو.

[41] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کاتی خواردنا پەلەپەل بکا.

[42] ئەم پەندە لە مەعنای ئەو پەندە فارسیەدایە کە ئەڵێ:(تا نباشد چیزکی، مردم نگویند چیزها) واتە تا قسەیەکی بچووك نەبێ مەردوم قسەی زۆر ناکەن.

[43] واتە هەر چێکت کڕی تاوەری نەگری جێی دڵنایی نییە.

[44] بە یەکێك ئەوترێ کە تامی شتێکی نەکردبێ.

[45] واتە تا لێی نەقەوما و تووشی چورتم نەبوو، باوەڕی نەکرد.

[46] مەبەس لەم ئەدەبە شەرم و شکۆمە، ئەگەر مەبەست زانین و ویژەش بێ هەر ئەبێ.

[47] بە بەڵایەکی زۆر گەورە ئەوترێ، کە زوو بە زوو، وە بە ئاسانی لە بیر نەچێتەوە.

[48] واتە هەر کارێك، کە نەچێتە سەر، لە پێشەوە دیارە.

٤٩)- تازە هاتە روو، کۆنە نرایە پشت کەندوو[49]

٥٠)- تاژی ولات، بە کەروێشکی ولات، رست ئەکرێ[50]

٥١)- تاس بشکێ نەك بزرنگێ[51]

٥٢)- تاقانە، یا شێتە یا دێوانە[52]

٥٣)- تاکێ کەوش وە تاکێ کەلاش، ماندوو نەبیت مام تەڕەماش[53]

٥٤)- تالان کراو بە ماڵ ئەبێ، سکەڕۆ بە ماڵ نابێ[54]

٥٥)- تاڵی و سوێری جیهانی زۆر چەشتووە[55]

٥٦)- تان و پۆ ئاوریشمە[56]

٥٧)- تانجی قۆچاخ، لە وەختی راوا گوی دێ[57]

٥٨)- تانجی وەتەن کەروێشکی وەتەن ئەگرێ[58]

٥٩)- تانجی، کوێخا بێ و ڕێوی برا زاوا بێ[59]

---

[49] بە یەکێك ئەوترێ کە ژنێکی تازەی هێنا، ئیتر لە ژنە کۆنەکەی نەپرسێتەوە.

[50] رست کردن: پەت خستنە قەلاتەی ملی تانجی و راکێشانیەتی.

[51] واتە مەردوم بمرێ نەك دەنگی بزڕێ.

[52] چونکە ئەوەندەی باوك و دایکی بە دەمیەوە ئەدەن، ئەگەر خۆشی ئەوەندەی تری نایە سەر ئەوا ئەبێ بە دێوانە، وە ئەگەر دوو ئەوەندەی تری نایە سەر ئەوا ئەبێ بە شێتی پەتەڕی، هێندێ جار نارەسەنی خۆشی و هاوڕێکانیشی ئەبێ بە سەربار، ئەو حەلە ئەبێ بە هار.

[53] بە یەکێکی سووك ئەوترێ کە بێتە لات، وە تۆش گاڵتەی پێ بکەیت.

[54] چونکە یەکەم لە ژیانیا جارێك تالان ئەکرێ، بەلام سکەڕۆ هەموو ڕۆژێ خۆی تالان ئەکا.

[55] واتە باش پوختە بووە لە جیهانا.

[56] بە یەکێك ئەوترێ کە لە باوك و دایکیەوە وەجاخزادە بێ.

[57] قۆچاخ: خێرا.

[58] چونکە شارەزای هەموو کون و بن بنچکێکە.

[59] بە گاڵتە و تیتاڵییەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە کارێکی پێ سپێرابێ.

٦٠)- تانجیەکەی ئەحمەدی ساغایە، لە وەختی راوا گوی دێ[٦٠]

٦١)- تاوێ گەش ئەبمەوە، تاوێ رەش ئەبمەوە[٦١]

٦٢)- تاوانکار وا بە لای یارەوە، بێتاوان سەری وا بە دارەوە[٦٢]

٦٣)- تای جوانان، گەردێ لە بانان[٦٣]

٦٤)- تایی گان ئەکا و دۆڵاوی ئەیبژێرێ[٦٤]

٦٥)- تەبەقە تڕانەت کەوتە سەر[٦٥]

٦٦)- تەبەقی پڕ ئاشتی ماڵە[٦٦]

٦٧)- تەپڵی بێعاری کوتاوە[٦٧]

٦٨)- تەپڵی خستە ژێر عەباوە[٦٨]

٦٩)- تەپڵی دڕاوە[٦٩]

٧٠)- تەپڵی زڕاوە[٧٠]

٧١)- تەختە و پنە و قیمەکێش، ڕێکەوتووە قەوم و خوێش[٧١]

---

[٦٠] بە یەکێك ئەوترێ کە لە وەختی پێویست و گرنگا خۆی ون کات.

[٦١] واتە تاوێ خۆشی ئەبینم و تاوێ تاڵی.

[٦٢] بە یەکێکی بێ گوناە ئەوترێ، کە لە باتی گوناهبارێك تووش ببێ.

[٦٣] واتە نەخۆشی گەنج بە سوڕانەوەیەکی کەم نامێنێ.

[٦٤] (تا) و (دۆلاو) دوو دێن لە نزیك شاری سنەوە. بە دوو کەس ئەوترێ، کە یەکێکیان کەیف بکا و ئەویتریان تووشی تۆڵە وسزا ببێ.

[٦٥] بە یەکێك ئەوترێ کە گرەوێکی دۆڕاندبێ.

[٦٦] واتە ماڵ کە دەوڵەمەند بوو، ئیتر مەبەستی هەموو لایەك بە جێ دێ وە کەس لە کەس زویر نابێ.

[٦٧] بە یەکێك ئەوترێ کە پەردەی شەرمی فڕێدابێ.

[٦٨] بە پیاوێکی پایەدار ئەوترێ، کە هەر نەنگێك رووی تێ بکا بیەوێ بە پایەکەی داپۆشێ.

[٦٩] بە یەکێك ئەوترێ کە بەهۆی شتێکەوە بێ ڕێز بووبێ.

[٧٠] بە یەکێك ئەوترێ کە نەنگێکی بووبێ و دەرکەوتبێ.

[٧١] بە چەند کەسێك ئەوترێ، لە کەس و کار و خزم و خوێش، کە زویربووبن و ئاشتیان بووبێتەوە، وە کۆ بووبنەوە.

٧٢)- تەرازوو شەرمی لە کەس نییە[٧٢]

٧٣)- تەڕە تۆڵەکەی ناگاتێ[٧٣]

٧٤)- تەسەی پڕ ئاشتی ماڵە[٧٤]

٧٥)- تەشتی زێڕین بنێ بە سەرتەوە[٧٥]

٧٦)- تەشپی ترێنە[٧٦]

٧٧)- تەشی ڕێس تەشی ڕێس بێ، بە کێری کەریش تەشی ئەڕێسێ[٧٧]

٧٨)- تەشی لە بەر ئەڕێسێ[٧٨]

٧٩)- تەشییەك موو بادە، خۆت لە بێ حەیا لادە[٧٩]

٨٠)- تەگبیر کەرە نەمرێ، فرمان کەرە بمرێ[٨٠]

٨١)- تەعریفی خۆ کردن پەموو جوونە[٨١]

٨٢)- تەعزێی دەوڵەمەند، شایی فەقیرە[٨٢]

---

[٧٢] واتە کە لەگەڵ کێش تەواو بوو تەرازوو دێتەوە.

[٧٣] بە شتی زۆر هەرزان ئەوترێ.

[٧٤] مەبەس لەم پەندە و پەندی یەکە.

[٧٥] واتە دنیا زۆر ئەمینە، وە لەهیچ مەترسە.

[٧٦] واتە زۆرخۆرە.

[٧٧] بە یەکێك ئەوترێ کە بۆ کردنی کارێك بیانوو بێنێتەوە.

[٧٨] واتە مەرایی ئەکات.

[٧٩] بەڵام بەداخەوە، ئەمرۆ بێحەیای وا هەیە، قورئانیش بخوێنێت هەر یەخەت ئەگرێ.

[٨٠] واتە ئەگەر بمرێ بچووك بمرێ، نەك گەورە و سەرۆکی ماڵ.

[٨١] پەموو: لۆکەیە، واتە لۆکە جوون چەند ناشرینە، تەعریفی خۆ کردنیش لە ناو مەردوما، ئەوەندە ناشرینە.

[٨٢] چونکە زۆر کەس لە هەژاران لەو تەعزیەیە بەهرەمەند ئەبن، هەر یەکەی بە جۆرێك، بەم رەنگە قورئان خوێن و قاوەکەر و جگەرە دەر و ئاوگێڕ و دەست و پێوەند پارە وەرئەگرن، دەستەیەك لە زانایان و هەژاران پارەی بۆ ئەکەن بە ئیسقات لەناو خۆیانا، دەستەیەکی تر لەوانەی کە قورئانیان لەبەرە لە سەر قەبرەکەی قورئان ئەخوێنن تا ئەیخەنە ئێوارێی جومعە، لە پاش ئەوە ئنجا دەستەیەکی تر خەتمی تەهلیلەی لەسەر ئەکەن، نەك تاقە خەتمێك بەڵکو دوان و سیان و زیاتر، هەر وەك دوو سێ قورئان خوێن

٨٣)- تەقەی سەری دێ[٨٣]

٨٤)- تەڵە بە قنگ ئەتەقێنێ[٨٤]

٨٥)- تەماشای مەنجەڵ کەو کەوگیری لێداگرە[٨٥]

٨٦)- تەماع سەری نەبڕیت سەرت ئەبڕێ[٨٦]

٨٧)- تەماع وا لەولای ئەرواحەوە[٨٧]

٨٨)- تەمەڵ ئەڵێ هەمووی ئەخۆم، دوایی ئەڵێ چیم کرد بە خۆم[٨٨]

٨٩)- تەمەن گەیشتە چل، ئادەمی ئەبێتە جل[٨٩]

٩٠)- تەنها خۆر، هاوڕێی شەیتانە[٩٠]

٩١)- تەنوور بە گەرمی نەیهێنێتەوە، بە ساردی نایهێنیتەوە[٩١]

٩٢)- تەنوور تا گەرمە نان ئەبرژێنێ[٩٢]

---

بە درێژایی ساڵ قورئانی بۆ ئەخوێنن، خۆ پڵاو و گۆشتی پرسە و حەڵوای سێ ڕۆژگانەکەی هەر مەپرسە کە بە سەدەها کەس لێی ئەخۆن، جگە لە جل و بەرگی مردۆکە کە بە سەر هەژارانا دابەش ئەکرێ، هەر یەکە بە پێی خۆی.

[٨٣] واتە تێ ناگات.

[٨٤] بە مەردومی فێڵباز ئەوترێ.

[٨٥] ئەم پەندە لە مەعنای پەندی (کوزی کاران ببینە و قەپچوکی لە ماستی داگرە) دایە.

[٨٦] چونکە هەرچی رووزەردی هەیە، هەمووی لە تەماعەوە تووشی مەردوم ئەبێ.

[٨٧] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بە تەمەع بێ، وە لە پێناوی تەمەعا سەری خۆی دابنێ.

[٨٨] واتە هەموو زۆرخۆرێك دوایی پەشیمان ئەبێتەوە.

[٨٩] واتە ئارەزووی دانیشتن ئەکات.

[٩٠] بەیەکێك ئەوترێ کە هەر چێکی هەیە هەر بۆ خۆی بێ، وە کەس لێی بەهرەمەند نەبێ.

[٩١] هێنانەوەی تەنوور، تێکدانی ئاگرەکەیەتی دوای دامردنەوەی لەگەڵ هەڵدانەوەی بە خاکەناز بۆ ئەوەی لەپێش داخستنەوە یا چەند نانێکی تری پێ بکرێ ، کە بەمە ئەڵێن پشت دانەوە.

[٩٢] واتە هەموو ئیشێك زوو راپەڕێنە.

٩٣)- تەنیایی، لە ئاوەڵی خراپ باشترە[٩٣]

٩٤)- تەواو مای دۆکڵیومان هێنایەوە[٩٤]

٩٥)- تەور کلکی خۆی نابڕێتەوە[٩٥]

٩٦)- تەونێ کەوتەدار، هەر دێتە خوار[٩٦]

٩٧)- تەیر بە باڵ ئەفڕێ، ژن بە مێرد ئەخوڕێ[٩٧]

٩٨)- تەیر هەیە گۆشتی ئەخورێ، تەیر هەیە گۆشتی ئەدرێتێ[٩٨]

٩٩)- تەیری گوڵ عاشق بەداری زەقنەمووتە[٩٩]

١٠٠)- تڕ بێ و بەردەمی رەشەبا کەوێ[١٠٠]

١٠١)- تڕ بێ و لە قوونی کەرێ بێتە دەرێ[١٠١]

١٠٢)- تڕ بە تڕ ئەڵێ: پاڵەپەستۆ[١٠٢]

١٠٣)- تڕ زلی باوان دەروێش[١٠٣]

---

[٩٣] ئەم پەندە لە مەعنای فەرموودەیەکی پێغەمبەرایە کە ئەفەرموێ (الوحدە خیر من جلیس السوا) واتە تەنیایی لە ئاوەڵی خراپ باشترە. کاتێك ئەوترێ، کە لە ئاوەڵێکەوە تووشی زیانێك بووبیت.

[٩٤] مای دۆکڵیو هێنانەوە: تێکدانی ماستاوی دۆکڵیوە تا دێتە کوڵ، بێ ئەوەی دەستی لێ بەر بدرێ. بە یەکێك ئەوترێ کە بڕیاری کردنی کارێك بدات تا تەواو ئەبێ، کەچی لە نیوەیا دەستی لێ هەڵگرێ.

[٩٥] واتە گەورە دەستی ناچێتە بچووکی خۆی.

[٩٦] واتە هەموو کارێ هەرئەوەندە گرانە، تا دەستی پێ ئەکرێ، ئیتر تەواو ئەبێ.

[٩٧] بە یەکێك ئەوترێ کە بە هۆی یەکێکی ترەوە بخوڕێ.

[٩٨] واتە ئادەمی وا هەیە ئەبێ خزمەت بکا و ئادەمی واش هەیە ئەبێ خزمەت بکرێ.

[٩٩] بە یەکێك ئەوترێ کە عاشق بە شتێکی هیچ و پووچ بێ.

[١٠٠] لە کاتێکا ئەوترێ، کە قسەیەکی نهێنی کەوتبێتە بەردەمی یەکێکی دەم دڕاو.

[١٠١] بە یەکێکی دەم دڕاوی بێژیری و بیر ئەوترێ، کە قسەیەکی ناشرین بکا لە چەند شوێنێك.

[١٠٢] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر تڕ بکەنێ.

[١٠٣] بە یەکێکی بە دەعیە و دەمار ئەوترێ، کە لە خێزانێکی هەژاری نەدارا بێ.

١٠٤)- ترِ لەی وێم، سرِ لەی وێم[104]

١٠٥)- تر، کێ کەندی؟ بێگانە[105]

١٠٦)- ترێ بە دارەوە، هەنجیر بە بارەوە[106]

١٠٧)- ترێ گوێژە ئەکێڵێ[107]

١٠٨)- ترێ وا بە کێوی دەماوەندەوە[108]

١٠٩)- تراوی و خەستی چێشت مشتێکە[109]

١١٠)- ترە لە تەوراسی چی، هەمزە لە هەباسی چی[110]

١١١)- ترەکەی ترِ نییە، جەواڵ درە[111]

١١٢)- ترخێنە تا بمێنێتەوە، پرگ هەڵ ئەهێنێ[112]

١١٣)- ترس نیوەی لەشکرە[113]

١١٤)- تروسکەیەکی چاو لە سەد گۆچان باشترە[114]

---

[104] واتە سرِی خۆم و ترِی خۆم.

[105] بێگانەیەك ئەیڵێ لە ناو کۆمەڵێکا، کە هەرچی روویدا هەر بە سەر ئەویا بێنن.

[106] واتە ترێ لە دارەکەی بکەیتەوە و بیخۆیت زۆر خۆشە، هەروەها هەنجیر شەوێك لە بارابێ و شل ببێ و شیرەکەی بمرێ ئنجا خۆشە.

[107] گوێژە: ناوی شاخێکی بەرزە لە رۆژهەڵاتی سلێمانی، دەماوەند شاخێکی بەرزە لە ئێران، واتە زۆر بە دەعیەیە.

[108] گوێژە: ناوی شاخێکی بەرزە لە رۆژهەڵاتی سلێمانی، دەماوەند شاخێکی بەرزە لە ئێران، واتە زۆر بە دەعیەیە.

[109] واتە مەنجەڵێك شۆربای شل و روون، بە مشتێك بەر، خەست ئەبێتەوە، بە یەکێك ئەوترێ ، کە لە کارێکا چرووکی بکا، بە جۆرێك کە پێوەی دیار بێ واتە ئەگەر شتێکی کەمی ترت خەرج بکردایە، ئەم کەم و کورییە نەئەبوو.

[110] بە یەکێك ئەوترێ کە وەرامەکەی پەیوەندی نەبێ بەو پرسیارەی کە لێی کراوە.

[111] واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

[112] بە شتێك ئەوترێ، تا بمێنێتەوە خراپتر ببێ.

[113] واتە دوو لەشکری بەقەد یەك، کە بەرانبەری یەك وێستان، کامیان ترسا ئەبێ بە نیوەی ئەویکەی تر، یا ئەو ئەبێ بە دوو ئەوەندەی ئەم.

[114] واتە کەمی خۆت لە زۆری خەڵق چاکترە.

۱۱۵)- ترِی بە پێچ کەوتووە[115]

۱۱٦)- ترِی بە کوتەك نانەویّ[116]

۱۱۷)- ترِی خۆی و گێزەر، لە یەك ناکاتەوە[117]

۱۱۸)- ترِی رۆیوە و تسی ماوە[118]

۱۱۹)- ترِی گۆیژە کون ئەکا[119]

۱۲۰)- ترِی گوێزی کوێر ئەشکێنیّ[120]

۱۲۱)- تف بۆ ئاسمان هەڵ ئەدەم، ئەکەوێتە سەر سمێڵم، بۆ ئەرزی هەڵ ئەدەم، ئەکەوێتە سەر ریشم[121]

۱۲۲)- تف ببینیّ لە زەویدا، پەلاماری ئەدا وا ئەزانیّ پارەیە[122]

۱۲۳)- تف رۆکرا، هەڵناگیرێتەوە[123]

۱۲٤)- تف هەڵدەی، رووی خۆت ئەگرێتەوە[124]

۱۲۵)- تفەنگ بە تاریکییەوە ئەنیّ[125]

۱۲٦)- تفەنگ بە زەردەواڵەوە ئەنیّ[126]

---

[115] بە یەکێك ئەوتریّ، کە بە درۆ خۆی نەخۆش خستبیّ.

[116] واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

[117] واتە زۆر بیّ عەقڵە.

[118] بە شتێك ئەوتریّ کە نیوە گیان بووبیّ.

[119] گۆیژە: ناوی شاخێکی بەرزە لە رۆژهەلاتی سلێمانی، دەماوەند شاخێکی بەرزە لە ئێران، واتە زۆر بە دەعیەیە.

[120] گۆیژە: ناوی شاخێکی بەرزە لە رۆژهەلاتی سلێمانی، دەماوەند شاخێکی بەرزە لە ئێران، واتە زۆر بە دەعیەیە.

[121] تەماشای پەندی سێهەیم بکە لە دوای ئەم پەندەوە.

[122] بە یەکێك ئەوتریّ کە زۆر نەدارا بیّ، وە پارەی کەم بەخۆیەوە دیبیّ.

[123] واتە قسەیەك کە کراو، بەڵێنێك کە درا، ئەبیّ ببرێتە سەر.

[124] بە یەکێك ئەوتریّ کە ناوی کەسێکی خۆی بە خراپە بەریّ.

[125] بە یەکێك ئەوتریّ کە بە گوترە قسە بکا.

[126] بە یەکێك ئەوتریّ کە بۆ شتێکی هیچ و پووچ پارەیەکی زۆر خەرج بکات.

١٢٧)- تفی خۆت بکه و برۆ[١٢٧]

١٢٨)- تفی سەربەرەوژوور، ناوچاوانی خاوەنی ئەگرێتەوە[١٢٨]

١٢٩)- تکەکە بە شاهد بە[١٢٩]

١٣٠)- تڵپی تەڕی تیا نەماوە[١٣٠]

١٣١)- تنیش بدەم و تفیش[١٣١]

١٣٢)- تورکە، ڕێی خۆیان نەئەدا، ئەیوت تیر و کەوانەکەم بەرنە ماڵی ئاغا[١٣٢]

١٣٣)- تورمە، هەر چەند کۆنیش بێ، ناگرێ بە پێتاو[١٣٣]

---

[١٢٧] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك لە ڕێگا بە چەمێك ئەگا، هەر چەند ئەکات ناوێرێ لێی بدات، یەکێك پێی ئەڵێ: لێرەوە لێی بدە ناتبا، ئەویش ئەڵێ ئەی ئەگەر بردمی؟ ئەمیش ئەڵێ ئەگەر بردتی تفێکم لێ بکە، کابراش لە ئاوەکە ئەدا، کە ئەگاتە نێرینەکەی، ئاو راینەفرێنێ، هاوار ئەکاتە کابرا ئەڵێ: کاکە وا ئاو بردمی ئەمیش ئەڵێ: تفی خۆت بکە و برۆ. ئنجا ئێستا ئەم پەندە، بە یەکێك ئەوترێ کە نەوێرێ کارێك بکات، وە تۆ هانە هانەی بدەیت لە سەر کردنی، وە ئەو لە سەر قسەکەی تۆ بیکات و تێ بشکێ.

[١٢٨] ئەم پەندە بە مەعنا دوو پەند پێش خۆیەتی.

[١٢٩] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك ئەیەوێ ژنەکەی خۆی بکوژێ تا ژنێکی تازە بێنێ بە ناوی دار کردنەوە ئەیبا بۆ کێو، لەوێ هەر چەند ژنەکە هاوار ئەکا و ئەپاڕێتەوە، بێ سوود ئەبێ، لەو حەلەدا کە ئەیدا بە زەویدا دڵۆپەی ئەشکەوتەکە ئەکەوێتە خوارەوە، ژنەکە ئەڵێ(تکەکە تۆ بە شاهد بە؟ کابرا لە پاشدا ژنە تازەکە ئەهێنێ و هەر شتێ: روو ئەدات ئەڵێ: پیاوەکە ئەمە چییە، هەر قسەیەك ئەبێ، تۆ ئەڵێیت: تکەکە بە شاهد بە؟ ئەمیش خۆی ناگرێ قسەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، ژنەش لەمە دڵی لە مێردەکەی کرێ ئەبێ، ئەچێ بە کەس و کاری ژنە کوژراوەکە ئەڵێ، ئەوانیش ناکەنە نامەردی کابرا ئەکوژن. ئنجا ئێستا ئەم پەندە لە کاتێکا بە کار دێنرێ، کە شتێك روو بدات، وە کەس بە دیارەوە نەبێ.

[١٣٠] بە یەکێك ئەوترێ کە پیر بووبێ و هیچی لە بارا نەمابێ.

[١٣١] بە یەکێك ئەوترێ کە داوای دوو شتی وای لێ بکەن کە هەر دووکیانی پێ ناخۆش بێ.

[١٣٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە بەرێز نەبێ لای یەکێك، کەچی وا نیشان بدا کە بەڕێزە لەلای.

[١٣٣] واتە شتی باش با کۆنیش بێ هەر پەسەند و بە نرخە.

١٣٤)- توشەی مەردوم برسێتی ناشێکنێ[134]

١٣٥)- توند بیگرە شل دێ، شل بیگرە هیچ دێ[135]

١٣٦)- توو مەشك من بژەن، من مەشك ماڵ میر[136]

١٣٧)- تووشی گون رەشی خۆت ئەبیت[137]

١٣٨)- تووشی نێری شەش گون بووە[138]

١٣٩)- تووکەی سمێڵی دێ[139]

١٤٠)- توولّ بە تەڕی نەچەمێتەوە، ناچەمێتەوە[140]

١٤١)- توێکڵی تس ئەگرێتەوە[141]

١٤٢)- تۆ ئەتەوێ لە قەڵانیشی بکەیت و لە کۆترانیش[142]

١٤٣)- تۆ بنوو وەستای نجار، خوا یەکەو دەروو هەزار[143]

١٤٤)- تۆ کاڵەك خۆریت، یا بێستان ڕن؟[144]

---

[134] واتە کە برسیت بوو، با تۆشەبەرەکەشت پڕ بێ لە نان، کە نەیخۆیت بە تۆ چی؟

[135] واتە هەموو کارێك کە بە شل بیگری ئەبێ بە هیچ بەڵام کە بە توند گیرا باشترە.

[136] بە یەکێك ئەوترێ بە تەوسەوە کە داوای ئیشەکەی خۆی لە تۆ بکات، تا خۆی ئیش بۆ یەکێکی تر بکات.

[137] واتە من ئیمڕۆ نازت ئەکێشم، بەڵام ڕۆژێ ئەبێ تووشی یەکێکی وابیت، کە نازت نەکێشێ، بەڵکو ئازاریشت بدات.

[138] بە یەکێك ئەوترێ کە تووشی بەڵایەکی گەورە ببێ.

[139] واتە زۆر کەیف خۆشە.

[140] واتە هەموو شتێك ئەبێ بە منالّی تەربیە بدرێ.

[141] واتە لە هەموو موو ئەکاتەوە.

[142] بە یەکێك ئەوترێ، کە بیەوێ نائومێدت بکات لە هەموو ڕوویەکەوە.

[143] چیرۆکی ئەم پەندە لە راڤە (شرح)ی پەندی ( خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە)دا نووسراوە.

[144] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر خواردنی لە سەر بێ بە بێ مەسرەف، کەچی پرسیار لە مەسرەف بکات.

١٤٥)- تۆ له حەمه ئاشەوانی چاکتر نازانی[١٤٥]

١٤٦)- تۆ لەگەڵ عام یا عام لەگەڵ تۆ[١٤٦]

١٤٧)- تۆ مەنێکی من دوو مەنم، بێجگه له گورز و کەمەندم[١٤٧]

١٤٨)- تۆ مەیکه خوا بتداتێ[١٤٨]

١٤٩)- تۆ موویەك ئەبینی، من دەستپێچکێك موو[١٤٩]

١٥٠)- تۆ نه، مزگەوت[١٥٠]

١٥١)- تۆ هەنگاوێك روو به من بێ، تا من ده هەنگاو روو به تۆ بێم[١٥١]

١٥٢)- تۆبەی گورگ مەرگه[١٥٢]

١٥٣)- تۆپینی کەر، زەماوەندی سەگه[١٥٣]

١٥٤)- تۆش نەبی به یارم، خوا ئەسازێنێ کارم[١٥٤]

١٥٥)- تۆفانی مێرووله، دڵۆپێ ئاوه[١٥٥]

١٥٦)- تۆڵه به تۆڵه، قازانجی زۆره[١٥٦]

---

[١٤٥] واته تۆش نادانێکی وەك حەمه ئاشەوان.

[١٤٦] به یەکێك ئەوترێ که کارێکی وا بکات که هیچ کەس لێی رازی نەبێ.

[١٤٧] یەکێك به یەکێکی ئەڵێ له ڕووی هەڕەشەوه.

[١٤٨] واته به بێ هەول و تەقەلا خوا هیچت ناداتێ، به یەکێك ئەوترێ، که هیچ نەکا و بەتەمای خوا بێ.

[١٤٩] واته تۆ بەقەد من شارەزا نیت وه به قەد من شت نابینیت.

[١٥٠] میوانێك ئەیلێ که خانه خوێکەی لێی لالووت بێ، واته منەت هەڵناگرم، ئەگەر له ماڵەکەی تۆشا نەبم، له خانەی خوادا ئەبم.

[١٥١] به یەکێك ئەوترێ که گلەیی کەم هاتوچۆیت لێ بکات.

[١٥٢] واته پیاوی خراپ به مردن نەبێ دەست له خراپه هەڵ ناگرێ.

[١٥٣] ئاشکرایه که له کوێدا بەکار دێنرێ.

[١٥٤] واته خوا کەسی بێ کەسانه.

[١٥٥] به هەژارێکی بێکەس ئەوترێ، که تووشی گرێیەکی بچکۆلانه بووبێ، هەر چەند بکا بۆی نەکرێتەوه.

[١٥٦] چونکه ئەگەر وانەکەیت بەرانبەرەکەت یاخی ئەبێ، وه جارێکی تر خراپترت لەگەڵ ئەکات، بەڵام که وەڵامت دایەوه به خراپه، ئەو حەله له شوێنی خۆی ئەوێستێ، وەکو

١٥٧)- تۆڵە بە سەبرە، بەڵام بە زەبرە[157]

١٥٨)- تۆڵەی شیری بە شیری و تۆڵەی کیری بە کیری[158]

١٥٩)- تۆم کۆنە، لە دڵیا وەشیاگە[159]

١٦٠)- تۆم کرد بە جوڵا، مەکۆم بدزیت[160]

١٦١)- تێ بکۆشە لێ بنۆشە[161]

١٦٢)- تێر ئاگای لە برسی نییە[162]

١٦٣)- تیر ئەخا و کەوان ئەشارێتەوە[163]

١٦٤)- تیر لە تیردانیا نەماوە[164]

١٦٥)- تیر لە کەوان دەرچوو، ناگەڕێتەوە[165]

---

قورئان ئەفەرموێ(جزا سیئە سیئە بمیلها) واتە پاداشتی خراپەیە بە وێنەی خۆی، ئەمە لەگەڵ کەسێکا وایە کە بە خراپە نەبێ چارە نەکرێ، بەڵام لەگەڵ یەکێکی باشا کە خراپەکەی لە ڕووی هەڵەوە بێ، چاک وایە بەرانبەری بکەیت بە چاکە، وەکو قورئان ئەفەرموێ (فمن عفا واصلح فاجره علی الله) واتە ئەگەر کەسێك خۆش بوو وە ناحەزەکەی ئاشت کردەوە، ئەوە پاداشتی لە سەر خوایە.

[157] واتە تۆڵە، کە دواکەوت، بزانە کە زۆر بە زەبر ئەبێ.

[158] شیر تێغێکی قورس و درێژ و بڕندەیە، ئەم پەندە زۆرتر لە ناو عەشایەر بە کار دێنرێ، واتە یەکێك شیرمان لێ بدا شیری لێ ئەدەین، وە یەکێك ژنمان لێبێنێ ژنی لێ ئەهێنین.

[159] بە یەکێك ئەوترێ کە قینێکی کۆنی لە دڵا بێ.

[160] بە یەکێکی ناوەجاخ ئەوترێ، کە لە تۆوە فێری شتێك بووبێ، کەچی ئەمڕۆ ملە ملەت لەگەڵ بکات.

[161] بە یەکێکی لەش ساغ ئەوترێ، واتە تا تێکۆشیت دەستکەوتت زۆرتر ئەبێ، ئەو حەلە تۆش بە ئارەزووی خۆت ڕابوێرە.

[162] واتە دەوڵەمەند ئاگای لە هەژار نییە.

[163] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پەناوە پلاری قسە بهاوێژێ.

[164] بە یەکێك ئەوترێ کە ئەو هێزەی بوویەتی لە کارێکا نەیمابێ.

[165] واتە ئاگات لە هەموو قسەیەکت بێ، چونکە کە دەرچوو تێ ئەپەڕێ.

١٦٦)- تێر نەخۆرە بانگی کردووە[١٦٦]

١٦٧)- تێر نەخواردن لە باوك مردن خراپترە[١٦٧]

١٦٨)- تیر و شیر، لە یەك ئەسوون[١٦٨]

١٦٩)- تێر، ئەیکوتایە قنگی برسی، ئەیووت: هەرزانی هەی هەرزانی[١٦٩]

١٧٠)- تێر، نای بە قنگی برسییەوە، وتی هەرزانی هەی هەرزانی[١٧٠]

١٧١)- تێرم خواردووە لە کاکڵان نۆرەی توێکڵانە[١٧١]

١٧٢)- تێرم کە و لە خوارەوە دامنێ[١٧٢]

١٧٣)- تێرم و غار ئەکەم[١٧٣]

١٧٤)- تیری بێ نیشان، مەوەشێنە[١٧٤]

١٧٥)- تیرێك و دوو نیشانە[١٧٥]

١٧٦)- تیشکی رۆژ بە بێژنگ ناگیرێ[١٧٦]

---

[١٦٦] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر تێر نەخوات.

[١٦٧] واتە برسێتی دەردێکی بێ دەرمانە.

[١٦٨] واتە زۆر دوژمنی یەکن.

[١٦٩] واتە بەشی زۆری دەوڵەمەند لە کەمینی هەژاران، تا لە کاتی تەنگانە و چەڵەمەیانا، شتیان لێ بکڕن بە هەرزان.

[١٧٠] هەمیشە دەوڵەمەند لەهەژاری هەژار بەهرەمەند ئەبێ، بەم رەنگە لە گرانیدا چی بێ لە دەستی ئەسێنێ بە چەند تەنەکەیەك گەنم و جۆ، ئنجا ئەگەر ماڵی بە دەستەوە نەما، ئەو حەلە تەمەع ئەکاتە ناموسی ژنەکەی و کچەکەی و کوڕەکەی، وەك لەم پەندەوە دەرئەکەوێ.

[١٧١] یەکێك ئەیڵێ کە سوودی لە هاوڕێیەتی یەکێك نەدیبێ، وە ئێستا یەکێکی هیچ و پوچتر بیەوێ ببێ بە هاوڕێی.

[١٧٢] واتە ئیشەکەم بۆ جێبەجێ بکە، نەك لە سەری سەرەوە دام بنێی.

[١٧٣] یەکێك ئەیڵێ کە پارەی ببێ، وە بە ئارەزووی خۆی خەرجی بکات.

[١٧٤] واتە دەستت دایە هەر کارێك، وای دەست بدەرێ کە باشی بکەیت.

[١٧٥] بە قسەیەك ئەوترێ کە دوو ئیش بکات.

[١٧٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە بیەوێ بە قسەی هیچ و پووچ پیاوێکی گەورە بچوك بکاتەوە.

۱۷۷)- تێگەیشتن لە مێوژە ڕەشکە خۆشترە[۱۷۷]

۱۷۸)- تیغی ئێستا ئەوەندە نابڕێ[۱۷۸]

۱۷۹)- تیغی گەیاندە سەر ئێسقان[۱۷۹]

۱۸۰)- تیکە تا نەیجووی، قووت نادرێ[۱۸۰]

۱۸۱)- تیکە لە دەم داکەوت بۆ ناو کۆشە[۱۸۱]

۱۸۲)- تیکە، شەش بێ و خۆش بێ[۱۸۲]

۱۸۳)- تیکەی خۆش و ڕێی لابەلا[۱۸۳]

۱۸٤)- تیکەی زل، هەم دەم ئەدڕێ، هەم قنگ[۱۸٤]

۱۸۵)- تیکەیێ کەمتر، برایێ زیاتر[۱۸۵]

۱۸٦)- تینو ئاو لە خەوا ئەبینێ و بێ دەرپێ دوو گەز جاو[۱۸٦]

۱۸۷)- تینو هەر ئاوی لە بیرە[۱۸۷]

---

[۱۷۷] هەر وەك تێنەگەیشتن لە زەهرە مار ناخۆشترە.

[۱۷۸] واتە نە بەلێنی ئێستا وەك جاران بڕ ئەکات، وە نە کەس وەك جاران بە بڕشتە.

[۱۷۹] واتە زۆر ئازاری پێ گەیاند.

[۱۸۰] واتە هەموو ئیشێك جۆرە هەوڵ و تەقەلایەکی ئەوێ.

[۱۸۱] واتە شتێك کە لە خۆت زیاد بوو، ئەبێ بگا بە خزم و خوێش و کەس و کار.

[۱۸۲] واتە ئەبێ چاکی و باشی خواردن، مەبەستر بێ لە زۆری.

[۱۸۳] بە یەکێك ئەوترێ کە بە خۆشی راببوێرێ، وە لە خەڵق لابێ.

[۱۸٤] واتە شتی لە ئەندازە بەدەر، لە هەموو سەرێکەوە زەرەرە.

[۱۸۵] واتە ئەگەر خۆت پارویەك کەمتر بخۆیت و بیدەیت بە هەژارێك ئەو حەلە برادەرێك قازانج ئەکەیت.

[۱۸٦] واتە هەموو کەسێك لە بیری ئەو شتە دایە کە پێویستێتی.

[۱۸۷] واتە هەموو کەسێك لە بیری ئەو شتە دایە کە پێویستێتی.

# پیتی جیم

١)- جارێك خەڵەتاندمت خوا بت گرێ، جاری دووهەم خەڵەتاندمت خوا خۆم بگرێ[١]

٢)- جاشی کولکن، گوێرەکەی ورگن، منالی لیکن پەسەندن[٢]

٣)- جام ئەڵێ بشکێم و نەزرنگێم[٣]

٤)- جاو لە گازر ناناڵێنێ[٤]

٥)- جەرگ ئازاری هەیە و بێزاری نییە[٥]

٦)- جەزای مشت، پێ لەقەیە[٦]

٧)- جەنگ بە کۆنە قینەوە ئەکرێ[٧]

٨)- جەنگ خۆش نییە، جەنگنامەکەی خۆشە[٨]

---

[١] چونکە جاری یەکەم نەمناسیت، بەلام جاری دووهەم ناسیمیت ئیتر نەئەبوو بخەڵەتێم.

[٢] چونکە جاری یەکەم نەمناسیت، بەلام جاری دووهەم ناسیمیت ئیتر نەئەبوو بخەڵەتێم.

[٣] واتە مەردوم مردنی خۆشترە لە بەدناوی.

[٤] واتە جاو کە بوو بە جاو بەرگەی گازریش ئەگرێ، واتە هەموو خاوەن پیشەیەك لە پیشەی خۆی ناناڵێنێ.

[٥] ئەم تا ئەندازەیەك وایە، کە لەوە تێپەڕی، بێزاریش دەست پێ ئەکا.

[٦] واتە تۆڵە، ئەبێ سەخت تر و بە زەبرتر بێ.

[٧] واتە ئەگەر کۆنە قین نەبێ لە ئارادا، دەم قاڵییەکی بچووك ئەوە ناهێنێ کە دوو دۆست لە سەری زویر بن، وە دەست لە دۆستایەتیەکی کۆن هەڵبگرن.

[٨] کە هەر دوو دەستە دائەنیشن، یەکەمیان سەربەرز و کەیف خۆش، دووهەمیان سەرشۆڕ و بێ کەیف.

٩)- جەنگ کوژاوەتەوە، چلّمن بە شوێن دارا ئەگەڕێ[٩]

١٠)- جەهەننەم لە دەری بگەڕێتەوە، نەك لە ناوی[١٠]

١١)- جەهێلّە رووتەی بە گوێ بانەوە، گوو ڕەق هەلاّتوو بە لای رانەوە[١١]

١٢)- جنێو مەدە بە باوکی سەگم، منیش جنێو ئەدەم بە باوکی بەگت[١٢]

١٣)- جواب هەر شەق نییە[١٣]

١٤)- جوابی دوور درۆیە[١٤]

١٥)- جوابی نادان بێدەنگیە[١٥]

١٦)- جوان لەبەر بەروبێشکەدا بناسە[١٦]

١٧)- جوانوو بەردەرە ڕەوگ، هۆگری چاکان بوو، ئومێدت پێی ببێ[١٧]

١٨)- جوانی ئافرەت وا بە ڕەوشت و خویەوە[١٨]

١٩)- جوانی بەدەن بزر ئەبێ، جوانی نەفسێ ئەمێنێ[١٩]

٢٠)- جوانی هەموو درۆیە، شەرت هەر چاو و برۆیە[٢٠]

---

[٩] بە یەکێك ئەوترێ کە لە پاش بڕانەوەی کارێك، ئنجا ئەم بە شوێنیا بسوورێتەوە.

[١٠] واتە زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە هەر باشە.

[١١] بە جەهێلّێکی رووتی چلّکنی هەژار ئەوترێ، کە لەسەر بانەوە تەماشای حەوشی مالاّن بکات.

[١٢] واتە جنێو بە کەس مەدە، تا جنێوت پێ نەدەن.

[١٣] واتە جوابی وا هەیە، لە سەد شەق ناخۆشترە.

[١٤] چونکە تا ئەگاتە تۆ، بەگەلێ جۆر ئەگۆڕێ.

[١٥] چونکە نادان وەك پیسی وایە، تا بیجولّێنی بۆن ئەداتەوە.

[١٦] بە ژنێك ئەوترێ کە پاش منالّبوون ئنجا خۆی دارێژێ و جوان ببێ.

[١٧] واتە چۆن رەسەن دوای ماینێکی رەسەن و نارەسەن دوای گوێلە بارگیرێك ئەکەوێ، منالّیش کە چووە ناو منالاّنەوە رێ و شوێنی خۆی ون ناکات.

[١٨]

[١٩]

[٢٠] چونکە لە پێش هەموو ئەندامێکا ئەبینرێ.

٢١)- جوانی و هەرزەیی[٢١]

٢٢)- جوت لە سەرا، درویّنە لە بەرا[٢٢]

٢٣)- جومعە ببارۆ شەممە خۆشکەرۆ، شەممە ببارۆ پیّنج و شەش کەرۆ[٢٣]

٢٤)- جومعەی پیّ تەواو نابیّ[٢٤]

٢٥)- جوو، لە دین ئەبیّ، لە خویّن نابیّ[٢٥]

٢٦)- جوو، لەترسا، فەقیّ لە برسا، دۆم بۆ پەڕۆ خۆش خۆش ئەڕۆ[٢٦]

٢٧)- جووتە گایەکی لە نەگبەتیدا ئەگەڕیّ[٢٧]

٢٨)- جووتیار، کوونی بیّ، گا، کاویّژی بۆ ئەکا[٢٨]

٢٩)- جووجەڵە ئەکوژیّ و هیّلکە هەڵ ئەهیّنیّ[٢٩]

٣٠)- جووجەڵە، لە پایزا ئەژمیّریّ[٣٠]

٣١)- جووجەڵەی بەهار، لە پایزا بژمیّرە[٣١]

---

[٢١] واتە لە یەك جیا نابنەوە.

[٢٢] جووت کە لە شویّنیّکی بەرزەوە دەست پیّکرا، جووتەکە بە رەوانی ئەڕوا بە بیّ لیّخوڕین، درویّنەش کە لە خوارە دەست پیّکرا، سەپانەکە بە قنج و قیتی درویّنەکە ئەکات، بیّ ئەوەی پشتی کۆم ببیّتەوە، ئنجا ئەم پەندە بە کاریّك ئەوتریّ کە زۆر لە بار بیّ.

[٢٣] ئەم دەستوورە، زۆر جار راست دەرئەچیّ.

[٢٤] واتە بە پیاوی ناژمیّریّ.

[٢٥] بە یەکیّك ئەوتریّ کە پارەپەرەست بیّ، بەجۆریّك کە دەست لە دینی هەڵبگریّ، بەڵام دەست لە شتیّکی خۆی هەڵنەگریّ.

[٢٦] ئەم پەندە لە مەعنای ئەم پەندە دایە کە ئەڵیّ (بەرخ هەر لە ناو کۆزا نابیّ)

[٢٧] بە یەکیّك ئەوتریّ کە زۆر بەدبەخت بیّ.

[٢٨] کە ئاراش بوو لە کاتی جووت و گیّرەدا کاویّژی لە بیر ئەباتەوە.

[٢٩] بە یەکیّك ئەوتریّ، کە بە رەنجی شان پارە پەیدا بکات کەچی بە فیڕۆ لە بەردی بدات.

[٣٠] کە پاك ئەبیّتەوە لە مردن، نەك لە بەهار و هاوینا.

[٣١] واتە ئەو حەلە دەرئەکەویّ چی ماوە و چی نەماوە.

٣٢)- جووچك، پەلامار بە بنچك[٣٢]

٣٣)- جووچكە هەتا دەمرێ لە بن قەرتاڵەدا نابێ[٣٣]

٣٤)- جوولەكەش، خوایەكی هەیە[٣٤]

٣٥)- جوولەكەی نابووت، دەفتەری كۆن ئەخوێنێتەوە[٣٥]

٣٦)- جۆ بە دیوارا هەڵ ئەگێڕێ[٣٦]

٣٧)- جۆگەلە، دەریا لێڵ ناكات[٣٧]

٣٨)- جۆگەیێ ئاوی پیا بڕوا، زەحمەتە وشك ببێ[٣٨]

٣٩)- جۆگەیە هەڵ بگرە ئاوی پیا بڕوا[٣٩]

٤٠)- جۆلا بێ كفن ئەمرێ[٤٠]

٤١)- جۆلا بە سەر دڕی خۆی نارازییە[٤١]

٤٢)- جۆلا كراسی نەبوو تۆپێ جاوی لە خەوا ئەدی[٤٢]

٤٣)- جێ پێ ببینە، ئنجا هەنگاو بنێ[٤٣]

٤٤)- جێگای برین پڕ ئەبێتەوە، جێگای قسە پڕ نابێتەوە[٤٤]

---

[٣٢] بەیەكێكی زەبوون ئەوترێ، كە پەنا بەرێ بۆ یەكێكی لەخۆی بەهێزتر.

[٣٣] ئەم پەندە لە مەعنای ئەم پەندە دایە كە ئەڵێ (بەرخ هەر لە ناو كۆزا نابێ)

[٣٤] ستەم لێكراوێكی گوناهبار ئەیڵێ كە ستەمێكی لێكرابێ، واتە من گوناهباریش بم خوایەكم هەیە كە تۆڵەم بسێنێ.

[٣٥] بە یەكێك ئەوترێ، كە لەبەر نەبوونی شتی كۆن بخوێنێتەوە.

[٣٦] واتە كاری وا قورس و گران ئەكا كە بە كەم كەس ئەكرێ.

[٣٧] واتە پیاوی گەورە بە قسەی ئەم و ئەو ناشكێ.

[٣٨] واتە باوی ناو كۆمەڵ هەلگرتن، زۆر گرانە.

[٣٩] واتە كارێك بكە بەهرەی ببێ.

[٤٠] ئەمە وەك ئەو پەندە وایە كە ئەڵێ: ماڵی پڕ لە رازیانەیە و بە دڵیەشە ئەمرێ.

[٤١] بە یەكێك ئەوترێ كە بە شتی خۆی نارازیی بێ، وە هەوڵ بۆ شتی بێگانە بدات.

[٤٢] واتە هەموو كەسێك لە خولیای شتێكایە كە پێویستی بێ.

[٤٣] نەوەك بكەوێتە چاڵێكەوە.

[٤٤] چونكە دووهەم كاری گرتووە.

٤٥)- جێگای مەردان، سەر تەندوورە[٤٥]

٤٦)- جێی بازان، بازی لێ نابڕێ[٤٦]

٤٧)- جێی سەبرێی سوتاوە[٤٧]

٤٨)- جێی سەرم بکەرەوە، خۆم جێی قنگم ئەکەمەوە[٤٨]

٤٩)- جێی سەری نابێتەوە هەوڵی جێی قنگیەتی[٤٩]

---

[٤٥] واتە پیاوی مەرد ئەوەیە کە نوێنی خۆی بدا بە میوان، وە خۆی لە سەر تەندووری گەرم بنوێ بە بێ نوێن.

[٤٦] ئەگەر خوا یاربێ.

[٤٧] جێی سەبر: دڵە، بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بەپەرۆش بێ.

[٤٨] لە سەر ئەم پەندە چیرۆکێك ئەگێڕنەوە کە گۆیا لە پایزا بزن بە مەڕ ئەڵێ: با پێکەوە شوێنێك دروست بکەین بۆ زستانمان کە تیا بحەوێینەوە، مەر ئەڵێ: دووگی خۆم خۆش بێ شوێنم ناوێ، بزن ئەچێ شوێنێك بۆ خۆی دروست ئەکا، لە زستانا کە سەرما و بەفر و باران دێ مەڕ ئەچێ بۆ لای بزن ئەڵێ: جێگام بکەرەوە، ئەڵێ: جێگام نییە، مەڕ ئەڵێ جێی سەرم بکەرەوە، خۆم جێی قنگم ئەکەمەوە، بزن ئەوەشی ناداتێ، وە مەڕ تا بەیانی لەسەرمانا هەڵئەلەرزێ.

[٤٩] ئەم پەندە لە مەعنای پەندی (ڕێوی نەئەچوو بە کونەوە هەژگێکی ئەبەست بە کونەوە) دایە.

# پیتی چێ

١)- چ باگم هەیە، دراوم هەیە[1]

٢)- چ باکمە، کوڕە کەچەڵە کاکمە[2]

٣)- چ بڵێی حەسەن کەچەڵ، چ بڵێی کەچەڵ حەسەن[3]

٤)- چ خوای گورگ و چ خوای سوار[4]

٥)- چ کەرەکە بەریتە لای بارەکە، چ بارەکە بەریتە لای کەرەکە[5]

٦)- چ کەویژێ، چ مەویژێ[6]

٧)- چ کێوژێ و چ مێوژێ[7]

---

[1] یەکێك ئەیلێ، کە بە پارەی زۆر یاخی بووبێ.

[2] بە تەوسەوە یەکێك بە یەکێکی ئەڵێ.

[3] بە قسەیەك ئەوترێ، کە بە دوو جۆر بکرێ، وە هەر دوکی وەك یەك وابێ.

[4] واتە هیچ جیاوازییەك نییە لە ناوەندی ئەم دوانەدا، گورگ مەڕەکە بفرێنێ، یا پیاو خراپ بیبا.

[5] بە کارێك ئەوترێ کە بە دوو جۆر بکرێ، وە هەر دوکی وەك یەك وابێ.

[6] کێوژ: باتمانە، ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی هەورامی حەزی لە مێوژ ئەبێ ئەچێ تۆزێك بکڕێ بیخوات، لە رێ دەنکە مێوژێك ئەدۆزێتەوە، هەڵ ئەگرێ و ئەیخوات، وە بەرودوا ئەگەڕێتەوە، وە ئەڵێ: چ کێوژێ، چ مێوژێ، واتە بەو دەنکە مێوژە ئارەزووەکەی پێ چووە سەر ئیتر پێویست بە مێوژ کڕین نەما، نموونەی ئەم پەندە پەندێکی ترە کە ئەڵێ: (دیداری یاران چ ساڵێك و چ ساتێك)

[7] کێوژ: باتمانە، ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی هەورامی حەزی لە مێوژ ئەبێ ئەچێ تۆزێك بکڕێ بیخوات، لە رێ دەنکە مێوژێك ئەدۆزێتەوە،هەڵ ئەگرێ و ئەیخوات، وە بەرودوا ئەگەڕێتەوە، وە ئەڵێ: چ کێوژێ، چ مێوژێ، واتە بەو دەنکە مێوژە ئارەزووەکەی پێ چووە سەر ئیتر پێویست بە مێوژ کڕین نەما، نموونەی ئەم پەندە پەندێکی ترە کە ئەڵێ: (دیداری یاران چ ساڵێك و چ ساتێك)

٨)- چ له بار بچێ، چ له سوار بچێ[٨]

٩)- چارەی ڕێ، ڕۆینه، چارەی خەو، نوستنه[٩]

١٠)- چارەی نەخۆر، بخۆرە[١٠]

١١)- چاکه ئیستخارەی ناوێ[١١]

١٢)- چاکه بکه و بیده به دەم ئاوا[١٢]

١٣)- چاکه له چاکه ئاوسه[١٣]

١٤)- چاکه له چاکه ئەبێتەوە[١٤]

١٥)- چاکیان سووژنه، کونێك له بنه[١٥]

١٦)- چاڵ هەڵکەن، هەمیشه له چاڵایه[١٦]

١٧)- چاو به چاو ئەکەوێ و ڕووو به ڕوو[١٧]

١٨)- چاو برسی ئابڕووی نییه[١٨]

---

[٨] ژنێك ئەیلێ، که منالێکی لەبار بچێ، وە کەس و کاری پێی بلێن: خەم مەخۆ. ئەمە ئەوە ناهێنێ، ئەمیش ئەلێ: چ له بار بچێ، چ له سواربچێ، واته ئەم منالە ئەگەر بمایە، ئەبوو به سوارێك.

[٩] واته هیچیان دوا مەخه له کاتی خۆیان.

[١٠] واته ماڵی خۆ نەخۆر، بۆ چەکمه بۆر.

[١١] ئیستخارە: بەوە ئەلێن کارێکت که هاته پێش، وە نەتزانی بیکەیت یا نەیکەیت، شەو پێش نوستن، دەست نوێژ ئەشۆیت، وە دوو رکات نوێژ ئەکەیت له پاشا له خوا ئەپاڕێتەوە که له خەوا ڕێی ڕاستت نیشان بدات، تا کارەکه بکەیت، یا نەیکەیت، واته کاری چاك به بێ ئیستخارە بکه.

[١٢] واته مەردوم چاکه ئەبێ بکات هەر لەبەر ئەوەی که چاکەیه.

[١٣] واته که چاکەت کرد چاکه دێته ڕێت.

[١٤] واته که چاکەت کرد چاکه دێته ڕێت.

[١٥] به دوو کەس یا زیاتر ئەوترێ، که یەك له یەك بەدتر بن.

[١٦] واته هەر کەسێ چاڵ بۆ مەردوم هەڵکەنێ، خۆی تێی ئەکەوێ.

[١٧] به یەکێك ئەوترێ که بیەوێ کارێکی ناشرین بکات لەگەڵ یەکێکی تر، واته ئەم کارە مەکه، چونکه سبەینێ چاوتان به یەك ئەکەوێتەوە وە تەریق ئەبیتەوە.

[١٨] چونکه بۆ شتێکی هیچ و پووچ ڕەنگ زەردی به سەر خۆیا ئەهێنێ.

١٩)- چاو تیژ، نابڕوودارە[١٩]

٢٠)- چاو چاو، دەرناکات[٢٠]

٢١)- چاو چووە خەو، قنگ ئەچێتە پاشایی[٢١]

٢٢)- چاو لە دەست بیت، دەست بەستەیت[٢٢]

٢٣)- چاو لە چاو شەرم ئەکات[٢٣]

٢٤)- چاوێ دوژمنی خۆی پێ نەناسێ، بۆ کوێر بوون باشە[٢٤]

٢٥)- چاوێ کە یەشا بۆ دەرکێشان باشە[٢٥]

٢٦)- چاوێ لە دەرێ، خۆڵی تێوەرێ[٢٦]

٢٧)- چاوبازە، ناگیرێ[٢٧]

٢٨)- چاوت لە دەرکە بێ، قوونت لەگوڕکەی بێ[٢٨]

٢٩)- چاوت نەفرێ[٢٩]

---

[١٩] چونکە روو زەردی بە سەر خۆیا ناهێنێ.

[٢٠] واتە زۆر تاریکە.

[٢١] ئیتر شەرم لە کەس ناکات، بە کەیفی خۆی هەرچی وردە وانێکێکی ببێ بەری ئەداتەوە.

[٢٢] چونکە ناوێریت هیچ بکەیت و هیچ بڵێیت، لە ترسی ئەو کەسەی کە چاوت لە دەستێتی.

[٢٣] واتە کارێکت کەبوو، خۆت دوای کەوە، چونکە ئەو شەرمەی کە لە چاوی خۆت ئەکرێ، لە کەسی تر ناکرێ.

[٢٤] واتە مەردوم ئەبێ دوژمنی خۆی بناسێ.

[٢٥] باوکێك بە کوڕێکی خۆی ئەڵێ کە لێی زویر بێ و دەریکات.

[٢٦] واتە ئەو ژنەی کە چاوی لە پیاوی بێگانە بێ، هەر دوو چاوی کوێر بێ.

[٢٧] یەکێك ئەیڵێ کە پێی بڵێن بۆ ئەوەندە تەماشای ژنی نامەحرەم ئەکەیت.

[٢٨] گوڕکە: ئاگردانە، واتە لە ژووریشەوە بی، ئەبێ ئاگاداری دەرەوەی ماڵی خۆت بکەیت.

[٢٩] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە چاوەڕوانی ناخۆشییەك بێ بۆت، واتە بەڕێوەیە خۆشی لەخۆت.

٣٠)- چاوی جن دەردێنێ[٣٠]

٣١)- چاوی ڕەشمان کاڵ بووەوە[٣١]

٣٢)- چاوی سوور بووە[٣٢]

٣٣)- چاوی چۆتە پشتی سەری[٣٣]

٣٤)- چاوی مار دەردێنێ[٣٤]

٣٥)- چەپەرە شڕە، چ پێوە بێ، چ لێوەبێ[٣٥]

٣٦)- چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێ[٣٦]

٣٧)- چەرخی لە چەمەر کێشا[٣٧]

٣٨)- چەرمی گونی خۆت بخۆ، منەتی قەساب هەڵمەگرە[٣٨]

٣٩)- چەقۆ بە دەستی هەڵنایەت[٣٩]

٤٠)- چەقۆ دروست ئەکا و مشتووی تێ ناخا[٤٠]

٤١)- چەقەڵ بۆ چەم، ڕەخش بۆ ڕۆستەم[٤١]

٤٢)- چەل و مەلە بە سەرمەوە[٤٢]

---

[٣٠] بە یەکێکی جرپنی جەربەزە ئەوترێ.

[٣١] یەکێك ئەیڵێ کە بە تەمای شتێکی باش بووبێ، لە پاشا نائومێد ببێ.

[٣٢] بە یەکێك ئەوترێ کە یاخی بووبێ.

[٣٣] واتە زۆر تووڕە بووە.

[٣٤] واتە زۆر دەستی ڕاستە.

[٣٥] بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ، کە بوون و نەبوونی وەك یەك وابێ.

[٣٦] واتە دۆستایەتی لە دوولاوە ئەبێ، نەك هەر لە لایەکەوە.

[٣٧] واتە تۆڵەی لێ سەند.

[٣٨] چەند جوانە ئەم هەمەتە بەرزە.

[٣٩] هەڵنایەت: واتە تیژ نابێ، بەیەکێك ئەوترێ کە ئیشی لەبەر نەڕوات.

[٤٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکت بۆ بکا بە نیوە و نیوەچڵ.

[٤١] واتە هەر کەسێك شایستەی چی بێ، ئەوەی ئەدرێتێ.

[٤٢] یەکێك ئەیڵێ، کە یەکێکی بووبێ بە تووشەوە، بۆ ئەوەی ئیشێکی کە هەیە بۆی بکات، یا بەخێوی بکا تا ئەمرێ.

٤٣)- چەڵتە وەشێن رهندەی عامە[٤٣]

٤٤)- چەم بێ چەقەڵ نابێ[٤٤]

٤٥)- چەمی درۆ سەرچاوەکەی کورتە[٤٥]

٤٦)- چەند سال بە رۆژوو بوو، ئەنجامی بە گوو بەربانگی کردەوە[٤٦]

٤٧)- چەند ساڵە گەدایە، شەوی جومعە نازانێ[٤٧]

٤٨)- چەوەندەرێك لەو ئەرزە هەڵکەنە[٤٨]

٤٩)- چرا شەوقی بۆ ژێر خۆی نییە[٤٩]

٥٠)- چرا لە پێشەوە نەڕوا، لە پشتەوە رووناکی نادات[٥٠]

٥١)- چرا هەڵکە گووی تیاماوە[٥١]

٥٢)- چرای درۆ بێ شەوقە[٥٢]

٥٣)- چرای کەس تا رۆژ ناگڕێ[٥٣]

٥٤)- چرای نابووتی هەڵکرد[٥٤]

---

[٤٣] واتە چەنەباز، هەموو کەسێ لێی بێزارە.

[٤٤] واتە لە هەموو تیرە و نەتەوەیەکا، پیاوی خراپ هەڵ ئەکەوێ.

[٤٥] چونکە زوو دەرئەکەوێ.

[٤٦] بە یەکێکی ئاخر شەڕ ئەوترێ.

[٤٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە شارەزای پیشەی خۆی نەبێ.

[٤٨] بە یەکێك ئەوترێ کە بیەوێ بە بێ هەوڵ و تەقەلا شتێکی دەست کەوێ، واتە چۆن چەوەندەرێك لە خۆیەوە سەوز نابێ لە زەوی هەش شتێکیش لە خۆیەوە دەست ناکەوێ.

[٤٩] واتە گەورە ئەبێ وەك چرا رووناکی بۆ دەوروبەری خۆی بێ وەك پیرەمێرد ئەڵێ: گەورە ئەوەیە شێوەی شەمعی بێ بۆ خۆی بسووتێ و نەفعی جەمعی بێ.

[٥٠] واتە گەورە و سەرکردە ئەبێ خۆی لە پێشەوە بڕوا و ببێ بە سەرمەشق.

[٥١] بە یەکێك ئەوترێ کە بەشی دۆستایەتی نەهێشتبێتەوە.

[٥٢] واتە درۆ زۆر بڕ ناکات.

[٥٣] واتە هیچ کەس تا سەر بەختی یار نابێ.

[٥٤] واتە بانگی نابووتی دا.

٥٥)- چل نان و قەرزیان نەوتووە[٥٥]

٥٦)- چلەی چاوی دێ[٥٦]

٥٧)- چوار پینەی کەیت ناگاتە بەهار[٥٧]

٥٨)- چواله بە خوێوە، ڕێواس بە پێوە[٥٨]

٥٩)- چواله درۆزن، بەلالووك عەیار، هەنار گوڵی گرت، بەهار هەی بەهار[٥٩]

٦٠)- چوكڵەشكێن خۆی ئەشكێنێ[٦٠]

٦١)- چوو بۆ خورما خواردن[٦١]

٦٢)- چوو بۆ ڕەشكە وتی: گاڵی تیایە[٦٢]

٦٣)- چوو بۆ ریش سمێڵی نایە بان[٦٣]

٦٤)- چوو بە چەقی لەعنەتا[٦٤]

٦٥)- چووە دوور، بوو بە پوور[٦٥]

---

[٥٥] چونكە زۆرە.

[٥٦] بە یەكێك ئەوترێ، كە بێدار بێ و چاوی ببینێ، ئەبێژرێ، ئیمشەو هەر چڵەی چاوم هاتووە.

[٥٧] واتە زۆر پیرە یا زۆر نەخۆشە.

[٥٨] ڕێواس كە بە پێوە بێ خواردنی خۆشترە، چونكە تەڕ و ناسك و ئاودارە، بەلام كە كراو دانرا، سیس ئەبێ و ئاوی نامێنێ.

[٥٩] واتە نە بە چواله باوەڕ بكە و نە بە بەلالووك چونكە ئەویان زوو گوڵ ئەكا و ئەمیان درەنگ.

[٦٠] واتە یەكێك خزمی خۆی بشكێنێ، خۆی ئەشكێنێ.

[٦١] بە یەكێك ئەوترێ لە ڕووی سووكییەوە كە بمرێ، واتە مرد.

[٦٢] واتە ناتدەمێ.

[٦٣] بە یەكێك ئەوترێ كە دوای كارێك بكەوێ بۆ ئەوەی قازانجێك بكات كەچی تووشی زیان ببێ.

[٦٤] بە یەكێك ئەوترێ كە لە رقانا كارێك نەكا.

[٦٥] بە كارەكەرێكی بێنرخ ئەوترێ، لە ماڵێكا كە شوو بكا بە پیاوێكی دەوڵەمەند، ئنجا بەو بۆنەیەوە، هاتوچۆی بكەن بە گەرمی.

٦٦)- چووم بۆ ڕاو، کەروێشك هات بە پیرمەوە[٦٦]

٦٧)- چوون بە دەست خۆمە، هاتنەوە بەدەست خۆم نییە[٦٧]

٦٨)- چۆتە سەرداریێ، نایەتە خواریێ[٦٨]

٦٩)- چۆلەکە، خۆت چیت و گۆشتاوت چییە[٦٩]

٧٠)- چۆلەکە، هازت کامە، تا بازت کام بێ[٧٠]

٧١)- چۆلەکەی ئیمساڵ بەهی پاری وت: تۆ جیکە جیك ئەزانیت[٧١]

٧٢)- چۆلەکەی دەشتی و بەردی دەشتی[٧٢]

٧٣)- چۆلەکەیەکی ناودەست، باشترە لە دە چۆلەکەی سەر درەخت[٧٣]

٧٤)- چۆمی درۆ.... سەرچاوەی نزیکە[٧٤]

٧٥)- چی بچێنیت، ئەوە ئەدوریتەوە[٧٥]

٧٦)- چێشت بە گەرمی ناگەڕێتەوە[٧٦]

---

[٦٦] وا بلاوە کە ڕێوی بە پیر یەکێکەوە بچێ باشە، بەلام کەروێشك خراپە، یەکێك ئەیلێ، کە بچێ بۆ کارێك بەلام لە ڕێ شتێکی وا ببینێ نیشان بدات کە ئەو کارە نابێ.

[٦٧] چونکە نازانیت لە گەڕانەوەدا چی روو ئەدات.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ کە لە سەر قسەیەك رق بگرێ و دەستی لێ هەڵنەگرێ.

[٦٩] هاز: هێزە. بە یەکێکی بێنموود ئەوترێ، کە بەڵێنی یارمەتیەکت پێ بدات.

[٧٠] هاز: هێزە. بە یەکێکی بێنموود ئەوترێ، کە بەڵێنی یارمەتیەکت پێ بدات.

[٧١] بە گەنجێك ئەوترێ، لە رووی سەر کۆنەوە کە بە یەکێك بڵێ لە خۆی گەورەتر و داناتر: تۆ فلان ئیش ئەزانیت.

[٧٢] بە شتێك ئەوترێ، کە پارەی تێنەچێ.

[٧٣] چونکە ئەم یەکە هی خۆتە و بە دەستتەوەیە.

[٧٤] واتە درۆ زوو دەرئەکەوێ.

[٧٥] واتە چاك بکەیت، چاك دێتە ڕێت، خراپ بکەیت خراپ دێتە ڕێت.

[٧٦] واتە ئەگەر ئەو کەسەی چێشتەکەی بۆ ئەچێ، لەوێ نەبوو، ئەبێ ئەو چێشتە ببرێ بۆ ماڵێکی هەژار، تا نەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خاوەنی.

٧٧)- چێشتی دوو کەیبانوو، سوێر خوێ دەرئەچێ[77]

٧٨)- چیلکە شکێن خۆی ئەشکێنێ[78]

٧٩)- چێو بنێن بە ورگییەوە، ناگەڕێتەوە[79]

٨٠)- چێو لە تاریکی ئەکوتێ[80]

---

[77] بە کارێك ئەوترێ کە دوو کەس سەرپەرشتی بکەن، وە کەسیان ئاگای لەویتر نەبێ.

[78] واتە یەکێك بە ئیشی منداڵانەوە خەریك بێ، خۆی بێنرخ ئەکا.

[79] واتە زۆر سوورە لەسەر چوون بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی ئەچێ.

[80] بە یەکێك ئەوتری، کە لە نەشارەزاییەوە قسە بکا.

# پیتی ح

١)- حاجی، حاجی له مه‌ککه ئه‌بینێ[١]

٢)- حازر خۆری بەر سێبەرە[٢]

٣)- حازر، بە قەرز مەدە[٣]

٤)- حاشا لەو خوێنەی، شەوی بەسەرابێ[٤]

٥)- حاکم ببێ بە پرد بە سەریا مەڕۆ[٥]

٦)- حاکم بە قسەی گەدا خەڵق ئەگرێ، بەڵام بە تکای ئەو کەس بەرنادا[٦]

٧)- حاڵی قنگی خۆشە[٧]

٨)- حاڵی لە ڕەنگی بپرسە[٨]

٩)- حەپحەپ ئەکەم، چاوی دوژمن کوێر ئەکەم[٩]

١٠)- حەرام بخۆم، شەلەم بخۆم؟[١٠]

١١)- حەرام زۆری، باکی لە گرانی نییە[١١]

---

[١] واتە هەر کەس هاوڕێی خۆی، لەشوێنی خۆی ئەبینێ.

[٢] بە یەکێك ئەوترێ ، کە هەر خواردنی لەسەر بێ، بێ ئەوەی پارەیەك خەرج بکات.

[٣] ئەوەك قەرزەکەت دەست نەکەوێتەوە.

[٤] واتە تۆڵە ئەبێ زۆر زوو بسێنرێ.

[٥] مەبەست لە حاکم، کاربەدەستە، واتە لێی دڵنیا مەبە.

[٦] واتە پیاوی لات و بێدەسەڵات خراپەی لە دەست دێ بەڵام چاکەی لە دەست نایەت.

[٧] بە یەکێك ئەوترێ کە لە وەزعێکی ناخۆشا بێ، لەگەڵ ئەمیشە کە زۆر ئامۆژگاری کرابێ و نەیگرێبێتە گوێ.

[٨] واتە پێویست بەوە ناکا باسی حاڵی بکەیت، چونکە هەر کەس سەیری بکا، ئەزانێ لە چ حاڵێکایە.

[٩] واتە هەموو کەس بە ئەندازەیەك پێویستە بە چاو و راو.

[١٠] واتە نابێ مەردوم بۆ قازانجێکی کەم خۆی بخاتە ئازارێکی زۆرەوە.

[١١] واتە یەکێك حەرام خۆربێ، لە گرانی ناترسێ، چونکە ماڵی حەرام زۆرە کە بیخوا.

١٢)- حەریف حەریفی خۆی ئەناسێ[١٢]

١٣)- حەسەد، دەردێکی بێ دەرمانە[١٣]

١٤)- حەش ئەگەر بڵێن هێلکەی کرد کردوویەتی؟[١٤]

١٥)- حەفتت ببێ بە بوون، یەکت نەبێ بە چون[١٥]

١٦)- حەفتی بمرێ لە باوان، کلی نابڕێ لە چاوان[١٦]

١٧)- حەق بە حەق، نانێکی رەق[١٧]

١٨)- حەق فەوتاوە وەك ترِی بن گۆم[١٨]

١٩)- حەق نادرێ، ئەسێنرێ[١٩]

٢٠)- حەق، ئاو رائەوەستێنێ[٢٠]

٢١)- حەقە حەقدارم، بەشە بەشدارم[٢١]

٢٢)- حەقدار لە حەقی خۆی واز دێنێ، شاهد واز ناهێنێ[٢٢]

٢٣)- حەقی بزنی کۆڵ بە سەر شاخدارەوە نامێنێ[٢٣]

٢٤)- حەقی کفن بە من ببڕێ، مردوو گۆڕ بە گۆڕ بێ[٢٤]

٢٥)- حەقی من بدە، حەقی تۆ ئاسانە[٢٥]

---

[١٢] واتە هەموو کەس هاوپیشەی خۆی ئەناسێ.

[١٣] چارەی هەر لە خوا ترسانە.

[١٤] واتە نە نەیکردووە، وە هەر چی وترا لە ژیری و بیرەوە دوور بوو باوەڕی پێ مەکە.

[١٥] واتە ئافرەت حەوت جار منالّی ببێ، بە قەد منالێك کە لە باری بچێ ئێش و ئازاری نابێ.

[١٦] بە ئافرەتێکی دلّتەڕ ئەوترێ کە بۆ مردنی کەس عادەتی خۆی تێك نەدا.

[١٧] یەکێك ئەیلّی کە حەقێکی بە سەر یەکێکەوە بووبێ و لێی سەندبێ.

[١٨] چونکە کەس دانی پیانانێ.

[١٩] ئەمە جاران وابوو.

[٢٠] بەلاّم داخەکەم مرۆڤی بێئینساف راناوەستێنێ.

[٢١] ئەمە بەشدارێك ئەیلێ کە داوای بەشی خۆی بکات لە کەلەپووری مردوکەی.

[٢٢] بە یەکێك ئەوترێ کە دەخلّی بە سەر ئیشێکەوە نەبێ و دەستیشی لێ هەلّنەگرێت.

[٢٣] واتە دادپرسە، حەقی کەس ون ناکات.

[٢٤] واتە هەموو کەسێك هەر چاوی لە قازانجی خۆیەوەیەتی.

[٢٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە داوای حەقی خۆی بکات لە پێش ئەوەی کە حەقی تۆ بدات.

٢٦)- حەڵاڵ بنی باریکە و سەری قەویێ، حەرام بنی قەوییە و سەری باریک[٢٦]

٢٧)- حەڵاڵ خۆری، کەم دەسەڵاتییە[٢٧]

٢٨)- حەڵوا خۆری سەر زیارەتە[٢٨]

٢٩)- حەمام بە ترِ گەرم نابێ[٢٩]

٣٠)- حەنجەرە، لە پەنجەرە، دەرنەچێ باشە[٣٠]

٣١)- حەواڵەی سەرچاڵە بەفرە[٣١]

٣٢)- حەیا باری کردووە[٣٢]

٣٣)- حەیا بە چاوەوەیە[٣٣]

٣٤)- حەیا دڵۆپێکە کە تکا تکا[٣٤]

٣٥)- حەیران و ساوەر قەد پیر نابێ، کاروانی ئاش تەواو نابێ[٣٥]

٣٦)- حساب حسابە و کاکە برایە[٣٦]

---

[٢٦] واتە ماڵی حەڵاڵ کەمیش بێ پیتی زۆرە، بەڵام حەرام زۆریش بێ هەر بێ پیتە.

[٢٧] واتە زۆر و ستەم لەگەڵ سروشتی ئادەمی دا تێکەڵە، سا مەگەر دینی بە راستی دەرمانی ئەم نەخۆشییە بکات.

[٢٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو شتێکی بە خۆڕایی دەست کەوێ.

[٢٩] واتە ئیشی گەورە،هەر بە قسە ناکرێ.

[٣٠] واتە لە کاتی قسە کردنا زۆر دەنگ بەرز مەکەرەوە.

[٣١] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە حەواڵەت بکاتە سەر هەزار یا چرووکێکی دەست قووچاو، واتە ئەم حەواڵەیە، وەك حەواڵەیەك وایە کە بکرێتە سەر چاڵە بەفری شاخەکان، واتە بەفرەکە چەند سارد و سڕە کە ئەچێتە سەری، کابراش وایە.

[٣٢] واتە شەرم نەماوە، بە یەکێك ئەوترێ کە بێشەرمیەکی نواندبێ.

[٣٣] واتە چاو لە چاو شەرم ئەکات، کە چاو نەبوو شەرمیش نامێنێ.

[٣٤] واتە تا ئەتوانیت ئاگاداری ئەو دڵۆپە بکە، مەیەڵە بتکێ نە لە ناوچەوانی خۆتا، وە نە لە ناوچەوانی یەکێکی ترا بەرانبەر بەخۆت.

[٣٥] واتە نە گۆرانی حەیران کۆن ئەبێ و نە ساوەر، وە ئەم دوانە بە درێژایی ژیان هەر ئەمێنن، هەر وەك باراشی ئاش هەر ئەمێنێ.

[٣٦] واتە برایەتی و مامەڵە لە یەك جیان، وە نابێ تێکەڵی یەك بکرێن.

٣٧)- حوشتر بشمرێ باری حەوت کەر هەڵناگرێ[٣٧]

٣٨)- حوشتر و حەمام؟ مەیمون و عەبا[٣٨]

٣٩)- حوشتر و فەرزییان نەوتوە[٣٩]

٤٠)- حوشتر و کەپولەیان نەوتووە[٤٠]

٤١)- حوشتر و هەڵپەڕین، گامێش و هەڵفڕین[٤١]

٤٢)- حوکمی حاکمە و مەرگی مفاجات[٤٢]

٤٣)- حیز بە خاڵۆی خۆی فێرە[٤٣]

٤٤)- حیز و ئازا پێك هاتن، هەر دوو وەك یەك دەرهاتن[٤٤]

٤٥)- حیزی بە دەستیاو ناشێ[٤٥]

٤٦)- حیزی و سەلامەتی[٤٦]

٤٧)- حیزی و قەرزداری قەت لە بیر ناچن[٤٧]

٤٨)- حیزیش بە بەختە[٤٨]

٤٩)- حیلم لە عیلم چاکترە[٤٩]

---

[٣٧] دەوڵەمەندێکی نابووت ئەیڵێ، کە هەژارێك گاڵتەی پێ بکا. واتە من هەر پـەنا و پەسیۆ بگـەڕێم لە ماڵەکەما، بەقەد دە ماڵی وەك تۆ شت کۆ ئەکەمەوە.

[٣٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ ئیشێکا خەریك بێ کە هیچی لێ نەزانێ.

[٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ ئیشێکا خەریك بێ کە هیچی لێ نەزانێ.

[٤٠] کەپولە: کەمۆڵەیەکی بچکۆلانەیە، مزی شای پێ ئەگیرێ بۆ شوان، بە خواردنێکی کـەم ئـەوترێ کە بدرێ بە زۆر خۆرێك.

[٤١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ ئیشێکا خەریك بێ کە هیچی لێ نەزانێ.

[٤٢] واتە ئەبێ مل کەچی بۆ بکرێ.

[٤٣] چونکە بە کەسی تر ناوێرێ.

[٤٤] واتە ئازا کە بوو بە هاودەمی حیز، ئەمیش وەك ئەوی لێدێ.

[٤٥] بە یەکێك ئەوترێ کە پاداشی حیزی بە حیزی بداتەوە.

[٤٦] واتە لە هێندێ کاتا ئەگەر قسەیەك قووت بدەیتەوە لە شەڕێك دوور ئەکەویتەوە.

[٤٧]

[٤٨] واتە بە هێندێ کەسەوە دێ و بە هێندێکیشەوە نایێ.

[٤٩] چونکە خاوەنی یەکەم بە بێ دووهەم ئەتوانێ بژی، بەڵام خاوەنی دووهەم بە بێ یەکەم ناتوانـێ بژی.

# پیتی خێ

١)- خار نایەتە ڕێی دڵپاك[١]

٢)- خازەی خوشکم ترێکی کەند، مەگەر گڵ لێم ببیەت[٢]

٣)- خاس کەیت بۆ خۆتە و خراپ کەیت بۆ خۆتە[٣]

٤)- خاڵۆی تەماکۆ فرۆش، ئەگەر فنگت نییە بەجۆش، چیتە لە خاڵۆی تەماتە فرۆش[٤]

٥)- خاڵۆی دەستەوسان، چ لە گەرمیان و چ لە کوێستان[٥]

٦)- خالان خوارزا مەزن ئەکەن، مامان برازا بزر ئەکەن[٦]

٧)- خانەی چۆڵم، باشترە لە خانەی شەڕم[٧]

٨)- خانزاد ئەوە مایە و ئەوەش قازانج[٨]

٩)- خانوو مەگرە، تا دراوسێ ئەناسی[٩]

---

[١] چونکە گوفتار و کرداری پاکە، کەسێکیش کە وابوو کەس لێی دلگیر نابێ.

[٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی نهێنی لە لابێ، وە خۆی بۆ ئەم و ئەوی بگێڕێتەوە، کەچی پێشیان بڵێ تکا ئەکەم مەیگێڕنەوە.

[٣] ئەمە لە مەعنای ئەو ئایەتی قورئانە دایە کە ئەفەرموێ( من عمل صالحا فلنفسه و من اسا فعليها).

[٤] واتە ئەوەی بەجۆش نەبێ، دەخڵی بە سەر خەڵکەوە نییە.

[٥] بە مەردومی تەمەڵی دەستەوسان ئەوترێ.

[٦] واتە خاڵ خوشکەزای خۆشتر ئەوێ لە مام بۆ برازا.

[٧] واتە ماڵەکەم چۆڵ بێ باشترە لەوەی پڕ بێ لە ماڵ و منالی بە جەنگ و ئاژاوە.

[٨]

[٩] واتە ئەگەر باش بوو ببە بە دراوسێی، وە ئەگەر خراپ بوو، بڕۆ بۆ شوێنێکی تر.

١٠)- خانووی پڕ لە شووشە بەردێکی بەسە[10]

١١)- خانووی دوو کەیبانوو خۆڵی تا ئەژنۆیە[11]

١٢)- خانووی فەقیر، مانگەشەو چرایەتی[12]

١٣)- خانوویەك تێك دەیت تۆزت هەر لێ ئەنیشێ[13]

١٤)- خاوەن کەر لە پشتی کەرەوە نابینرێ[14]

١٥)- خاوەن ماڵ دەستی هەڵگرت، دز ئەڵێ حەق ئەگەیەنم بە جێی خۆی[15]

١٦)- خاوەنی باخ و بێستان شەرمەزارە بە زستان[16]

١٧)- خەبەر بدەن بە هێز نەجرت، کارەکەر، کارەکەری گرت[17]

١٨)- خەتا من چییە بەختەکەم شەڕە، کۆچم ئاوێتەی کۆچی سەگ وەڕە[18]

١٩)- خەتە سووری، لە خۆم دوری[19]

---

[10] ئەم پەندە، لە مەعنای ئەو پەندە دایە کە ئەڵێ:( یەکێك خانووی لە شووشە بێ، بەرد ناگرێتە خانووی کەس).

[11] واتە ماڵی دووژنە، کەسیان لە داخی ئەویتریان، گوێ نادا بە کاروباری ناو ماڵ، لەبەر ئەوە، ماڵەکە بە پەشێوی ئەمێنێتەوە.

[12] یەکێك ئەیلێ، کە لە ڕوویەکەوە کەم و کوورییەکی ببێ.

[13] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کارێکا چلکن بووبێ.

[14] مەبەست ئەو کەسانەن کە مەردوم هەڵ ئەسوڕێنن بە ئارەزووی دڵی خۆیان، وە هەر چیان بوێ پێیان ئەکەن، بێ ئەوەی پێ بزانرێن یا خۆیان ئاشکرا بکەن.

[15] لە کاتێکا بە کاردێنرێ، کە خاوەن حەق دەستی لە حەقەکەی خۆی هەڵگرتبێ، کەچی یەکێکی تر دەستی لێ هەڵ نەگرێ.

[16] چونکە لە هاوینا بەشی کەسی لێنەداوە.

[17] هێز نەجرت: یەزدی جورد یەزدی گوردە، کە یەکێکە لە شاکانی زنجیرەی ساسانی ، کە لە پێش ئیسلاما ئێران و عێراق و کوردستانیان حوکم کردووە، واتە دنیا پڕ بووە لە شتی سەیر، وە مەردومی بوودەڵەی بێ ناونیشان، هاتوونەتە پێشەوە.

[18] یەکێك ئەیلێ، کە تووشی بووبێ بە تووشی چەند کەسێکی زۆربڵێی هەڵەوەڕەوە.

[19] یەکێك ئەیلێ، کە خەمی مەردومی نەبێ بەڵکو هەر خەمی خۆی بێ.

٢٠)- خەتەنە سوننەتە، نەك لە بنا[٢٠]

٢١)- خەر بەستە، خاوەن رەستە[٢١]

٢٢)- خەر، وەترپین لە چنگ گورگ رزگاری نابێ[٢٢]

٢٣)- خەرگەل، شێخ گەل، شێخ گەل، خەرگەل[٢٣]

٢٤)- خەرمان کوتاندن کاری بزن نییە[٢٤]

٢٥)- خەزێم بوو بە برنووتی، هەموو فلقێك کردیە لووتی[٢٥]

٢٦)- خەزێنە هەمیشە لە وێرانەدا شاراوەتەوە[٢٦]

٢٧)- خەسوو بە دوو جووت گایە[٢٧]

٢٨)- خەسوو لەگەڵ تۆمە، بووکێ تۆ گوێت لێ بێ[٢٨]

٢٩)- خەڵاتەکەی خاڵە بەگە[٢٩]

٣٠)- خەلە فرۆش هەواڵی مەن ئەپرسێ[٣٠]

---

[٢٠] واتە لە چاکەشا نابێ مەردوم پێی لێ هەڵبڕێ.

[٢١] خەر:کەرە: واتە ئەوی کەری بەستەوە بێغائلە ئەبێ، بە یەکێك ئەوترێ کە بنج و بنـاوانی کاری خۆی ببەستێ.

[٢٢] بە ستەم لێکراوێك ئەوترێ کە زاکوزووکی بێ بە دەست زۆردارێکی ستەمکارەوە.

[٢٣]

[٢٤] واتە فرمانی قورس و گران، بە هەموو کەسێك ناکرێ.

[٢٥] خەزێم: بە حەلقەیەکی زێڕ ئەڵێن کە جاران ژنانی ماقوڵ و دەوڵەمەند ئەیانکردە لووتیان، بە یەکێکی هەژار ئەوترێ کە چاو لە ژنی پیاوێکی گەورە بکات، وە بۆ فیز و دەمار ئـەمیش وەك ئەو شتی قورس و گران بکات بە خۆیا.

[٢٦] زۆرتر بە کچێکی جوانی رێك و پێك ئەوترێ کە لە ماڵێکی هەژاردا بدۆزرێتەوە.

[٢٧] واتە بەقەد دوو جووت گا، خێر و بێری هەیە بۆ زاواکەی، لەبەر خاتری کچەکەی.

[٢٨] لە کاتێکا ئەوترێ کە لەگەڵ یەکێکا قسە بکەیت و مەبەستت یەکێکی تر بێ.

[٢٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە خەڵاتێك بدا بە یەکێك و لێی بسێنێتەوە.

[٣٠] واتە هەر کەسە هەواڵی ئەو شتە ئەپرسێ کە خۆی پێویستێتی.

٣١)- خەلەی خۆم و گەلەی خۆم[31]

٣٢)- خەڵقی کاغەزی سپی ئەخوێننەوە[32]

٣٣)- خەڵکی بلاوێنێ قۆچکە بەسەرێ، ئێمەش بلاوێنین هۆڵی کەرێ[33]

٣٤)- خەڵوەش ئەکێشێ و بەنگیش ئەکێشێ[34]

٣٥)- خەمان لە خۆت مەکە بار، دەنا دوو گونت پێدا دێنێتە خوار[35]

٣٦)- خەمی ئەوەم نییە ئاو بردوویەتی، خەمی ئەوەمە کلکی قنجە[36]

٣٧)- خەمی نان بخۆ، خەربزە ئاوە[37]

٣٨)- خەنە، کە زۆر بوو، لە گونان ئەگیرێ[38]

٣٩)- خەنجەر لە کا ئەدا[39]

٤٠)- خەنجەری بێ کالان، لەش بریندار ناکا[40]

٤١)- خەنجەری دەبان لە کێلانا ناوەستی[41]

---

[31] واتە دەخلّم بە سەر کەسەوە نییە.

[32] واتە ئاگاتان لە خۆتان بێ، بزانن چی ئەڵێن و چی ئەکەن.

[33] ژنێکی بێ منالّ ئەیلّێ بەخۆی.

[34] خەڵوە کێشان: چوونە ناو ژوورێکی پەنا و خەریك بوونە بە تەنها بە خوا پەرستیەوە، لەگەڵ بە رۆژوو بوون و کەم خواردنا.

[35]

[36] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك ئاو ئەیبا، دەست بەرز ئەکاتەوە تا فریای کەون، هاوڕێکەی وا ئەزانێ کلکی لێ رواوە، ئێستا بە یەکێك ئەوترێ کە لە پێناوی شتێکی سووکا لەناو بچێ، واتە خەفەتی لەناو چوونی ناخۆم بەڵکو خەفەتی ئەوە ئەخۆم کە ناوێکی سووکی کەوتۆتە دوا.

[37] خەربزە: بە فارسی کاڵەکە. بە یەکێك ئەوترێ، کە شتی هیچ و پووچ بکڕێ و شتی گرنگیش هیچ.

[38] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەست بڵاوی بکا لە شتێکی زۆرا.

[39] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە بێ پارێز، دەست بوەشێنێ، یا پارە خەرج بکا.

[40]

[41] بە یەکێك ئەوترێ، کە هونەرێکی ببێ و لە پڕ دەریخات.

٤٢)- خەنجەری لێ دەیت خوێنی لێ نایەت[٤٢]

٤٣)- خەو برای مەرگە[٤٣]

٤٤)- خەوی ئاشە و پاشە، بە خەبەر بوونەوە، لە سەر دەرناچێ[٤٤]

٤٥)- خەوی شەو، شەرمەزاری رۆژە[٤٥]

٤٦)- خەوی نایە و بیانووی کێچە[٤٦]

٤٧)- خەیارە، لە گۆفکی را دیارە[٤٧]

٤٨)- خەیاڵ پلاوە[٤٨]

٤٩)- خڕ و مڕ بێ، هەر کۆڵەکەی پڕ بێ[٤٩]

٥٠)- خراپە بە هەموو کەس، چاکە بە کەم کەس[٥٠]

٥١)- خزم پەرژین نەشکێنێ، بە کەس ناشکێ[٥١]

٥٢)- خزم گۆشتت بخوات، ئێسقانت ناشکێنێ[٥٢]

---

[٤٢] واتە زۆر رقی هەستاوە.

[٤٣] واتە نوستوو، نە دەسەلاتی هیچی هەیە، وە نە ئاگای لە هیچە.

[٤٤] یەکێك ئەیلێ، کە ماوەیەکی زۆر لە ژێر باری زۆر و ستەم و دەست درێژیدا بێ، لە پاشا کە ئەو زۆر و ستەمەش نەمێنێ، ئەو کەسە هەر بیری ناچێتەوە.

[٤٥] لە شوێنێك وایە کە ئائەمینی ببێ، وە بە شەو لەگەڵ نوستیت ماڵەکەت تالان بکەن.

[٤٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە کارێکی بە سەرەوە بێ نەیکا، وە بیانوویەکی بۆ بێنێتەوە کە تەواو نەبێ.

[٤٧]

[٤٨] بە قسەیەك ئەوترێ، کە زۆر گەورە و بێجێ و بێئەنجام بێ.

[٤٩] بە یەکێکی تەمەعاری دنیا پەرست ئەوترێ، کە هیچ کەسێکی مەبەست نەبێ تەنیا خۆی نەبێ، وە هەر بیەوێ گیرفانی خۆی لێ پڕ کا و کوڵی خۆی داگرێ.

[٥٠] واتە خراپە بە هەموو کەسێك ئەکرێ، بەڵام چاکە بە کەم کەس ئەکرێ.

[٥١] واتە ئەو پڕ کێشیەی (زاتکردن) کە خزم هەیەتی، کەسی تر نییەتی.

[٥٢] چونکە بەشی خزمایەتی تیا ئەهێڵێتەوە.

٥٣)- خزم قیبلەیە، قەت خراپ نابێ[٥٣]

٥٤)- خزمایەتیەکەیان، خزمایەتی کەر و خوڵەمێشە[٥٤]

٥٥)- خزمەتی قنگ کردن، خەڵاتی تسە[٥٥]

٥٦)- خزمی بەرێ، بەرێ بەرێ، خزمی پشتێ، دەشتێ بە دەشتێ[٥٦]

٥٧)- خزمی خەزوری سەپانیماڵی شێخییە[٥٧]

٥٨)- خزمی خراپ گونی قۆڕە، نە ئەتوانی بیبڕێ، نە ئەتوانی هەڵی گری[٥٨]

٥٩)- خزمی ژنان بەرە بەرە، خزمی پیاوان دەربەدەرە[٥٩]

٦٠)- خزمی زەن، پلاو بزەن، خزمی ریش، لەسەر کەوش و کەڵاش بنیش[٦٠]

٦١)- خلە بار ئەکا بلە کەپر ئەکا[٦١]

٦٢)- خلیسکان تۆڵەی پەلە کەرە[٦٢]

---

[٥٣] واتە خزم لە کاتی تەنگانەدا رووی تێ ئەکرێ وەك رووگە (قبلە).

[٥٤] بە دوو کەس ئەوترێ کە خزمایەتییەکی زۆر دووریان بێ.

[٥٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە خزمەتی نامەرد بکا، واتە لە خراپە زیاتر دەست گیرت نابێ.

[٥٦] تەماشای پەندی و بکە.

[٥٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە درۆ خۆی کردبێ بەخزمی یەکێك لە دەست و پێوەندی پیاوێکی گەورە.

[٥٨] واتە ئەیبڕی ئەمرێ، نایبڕی ئابڕووت ئەبا.

[٥٩] لەم دوو پەندە و پەندی هەژدەهەمینەوە دەرئەکەوێ کە ژن لە زۆر کۆنەوە لە کوردستانا لای مێردی زۆر بەرێز بووە، وە هەرچی ژن کردبێتی پیاو قسەی تیا نەکردووە، بۆیە ژنیش هەمیشە خزمی خۆی پێش خزمی مێرد خستووە.

[٦٠] لەم دوو پەندە و پەندی هەژدەهەمینەوە دەرئەکەوێ کە ژن لە زۆر کۆنەوە لە کوردستانا لای مێردی زۆر بەرێز بووە، وە هەرچی ژن کردبێتی پیاو قسەی تیا نەکردووە، بۆیە ژنیش هەمیشە خزمی خۆی پێش خزمی مێرد خستووە.

[٦١] بە یەکێك ئەوترێ کە دەست بداتە کارێك دوای ئەوەی کە مەردوم دەست لەو کارە هەڵ بگرن.

[٦٢] واتە ئەگەر پەلەی نەکردایە، هەڵنەئەخلیسکا.

٦٣)- خو بزه له بابت کەویٚ، نەهێڵی چینچکێك له عاردی کەویٚ[٦٣]

٦٤)- خوا ئەم دەست محتاجی ئەو دەست نەکا[٦٤]

٦٥)- خوا ئەیدا و نازانیٚ بیخوا[٦٥]

٦٦)- خوا ئەیدا، خواگیر لیٚ ناگەڕیٚ[٦٦]

٦٧)- خوا بۆ هەر کونه مشکیٚ، مشکێکی داناوه[٦٧]

٦٨)- خوا به تیزم کا، به تیزم، به تیزی فره حیزم کا[٦٨]

٦٩)- خوا به زەبر و به سەبره[٦٩]

٧٠)- خوا بدا مەرگم، زاوا نەکا بەرگم[٧٠]

٧١)- خوا بیبڕیٚ چەرخی زەمانه، مەلا (.........) ئەویٚ سەر قەڵەمانه[٧١]

٧٢)- خوا بیدا له هێڵێك ئەیدا[٧٢]

---

[٦٣] خوپزه: نۆکەری ناو ماڵه، به یەکێك ئەوتریٚ، که خواردنێکی بۆ دانرا هیچی لیٚ نەمێنێتەوه، یا خێر و بێرێکی کەوته ژێر دەست، هیچی له دەست هەڵنەوەریٚ.

[٦٤] چ جای ئەوەی که یەکێك محتاجی یەکێکی تر بیٚ.

[٦٥] بەیەکێك ئەوتریٚ که زۆری بیٚ و نەزانیٚ خەرجی بکات.

[٦٦] خواگیر: خوا گرتوو.

[٦٧] واته هیچ شتێك بیٚخاوەن نییه.

[٦٨] یەکێکی خانەدانی لیٚ قەوماو ئەیڵیٚ، که یەکێکی بیٚحورمەت گاڵتەی پیٚ بکا.

[٦٩]

[٧٠] چ جای ئەوەی که یەکێك محتاجی یەکێکی تر بیٚ.

[٧١] ئەمەیه که ئەڵیٚ: سەگی سپی بۆ بارخانەی لۆکه زەرەری هەیه، ئاخۆ چ کۆلکه مەلایەکی، نەخوێندەواری، بیٚدینی، بیٚشەرمی ساختەچی، له جیاتی سەر قەڵەمانەی نوشتەیەك، دلوای ئیشێکی ناشرینی له ئافرەتێکی داوێن پاك، که ئەویش له تۆڵەی ئەم قسەیەدا، ئەم پەندەی وتوه وه بەم پەنده وێنەیەکی ئەم ڕووداوەی گرتووه، که تا جیهان جیهان بیٚ هەر ئەخوێنرێت و ئەخوێنرێتەوه.

[٧٢] به یەکێك ئەوتریٚ که له کارێکی بچکۆله قازانجێکی گەورەی کردبیٚ.

٧٣)- خوا تا سەر بدا، رزقیش ئەدا[٧٣]

٧٤)- خوا تا کێو نەبینێ بەفری تێناکا[٧٤]

٧٥)- خوا تەختە تاش نییە، تەختە رێك خەرە[٧٥]

٧٦)- خوا پێ بە مار نادا[٧٦]

٧٧)- خوا حەقی بزنی کۆڵ لە بزنی شاخدار، ئەسێنێ[٧٧]

٧٨)- خوا خۆی ئەمێنێ و مولکی[٧٨]

٧٩)- خوا خراپتر نەدا[٧٩]

٨٠)- خوا داران بگرێ، ئێمەی خستە مەنمەنەی مالان[٨٠]

٨١)- خوا داری بۆیە بەرز کردۆتەوە، کە چۆلەکەی پێوە بنیشێتەوە[٨١]

٨٢)- خوا داوێتی لەقەی لێمەدە[٨٢]

٨٣)- خوا دەردیش ئەدا و دەرمانیش ئەدا[٨٣]

---

[٧٣] واتە سەری بێ رزق لە ژێر خاکایە.

[٧٤] واتە تا خوا یەکێك بە خراپ نەزانێ، تووشی خراپەی ناکات.

[٧٥] واتە خوا دارتاش نییە تەختەت بۆ بتاشێ بە پێی پێویستت، بەڵکو دارت بۆ دروست ئەکات تا تۆش لێی دروست بکەیت.

[٧٦] واتە زۆرداری ستەمکار، با هەر بێ دەست بێ.

[٧٧] یەکێکی زەبوونی ستەم لێکراو ئەیڵێ، بەزۆردارێکی ستەمکار.

[٧٨] بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی هەڵگرێ بۆ پاشەڕۆژێکی دوور.

[٧٩] واتە لە هەر تەنگانە و ناخۆشیەکدا بیت، خوا تەنگانەی ناخۆشتری لەلایە.

[٨٠] واتە خوا دار بەڕووی ئیمساڵ بگرێ کە بەڕووی نەگرت، ئەگینا ئێمە نەئەکەوتینە مەنمەنەی ئارد لەم و لەو.

[٨١] بە یەکێکی گەورە ئەوترێ، کە دەستی کەس نەگرێ، واتە خوا پیاوی گەورەی بۆیە گەورە کردووە، کە دەستی هەژار و لێ قەوماو بگرێ.

[٨٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە خوا چاکەیەکی لەگەڵا کردبێ و پێ نەزانێ.

[٨٣] دەردەکە وەك دڵۆپە کوتوپڕ پەیدا ئەبێ، بەڵام دەرمانەکەی ئەبێ بە شوێنیا بگەڕێیت لای پزیشك.

٨٤)- خوا دەرێك ئەگرێ و دەرێكی تر ئەكاتەوە[٨٤]

٨٥)- خوا دەڵێ: لە تۆ حەرەكەت، لە من بەرەكەت[٨٥]

٨٦)- خوا دەمی منی بە ئەسكەنە هەڵ نەكەندووە[٨٦]

٨٧)- خوا دێر گیرە و سەخت گیرە[٨٧]

٨٨)- خوا رۆژ نیشانی ماری سرش نەدا[٨٨]

٨٩)- خوا راستە و راستی لێ خۆش دێ[٨٩]

٩٠)- خوا سەبری بچووكی چل ساڵە[٩٠]

٩١)- خوا سەرما بە پێی حاڵ ئەدا[٩١]

٩٢)- خوا سەرما بە قەدمر بەرگ ئەدا[٩٢]

---

[٨٤] بە یەكێك ئەوترێ كە لەتەنگانەیەكا بێ، وە دەرگای لێ داخرابێ.

[٨٥] واتە خوا نەیكردووە بە باو زێڕ وزیو بنێرێ بۆ بەندەی خۆی، بەڵكو ئەوەی كردووە بە باو كە تۆ هەوڵ بدەیت و بە شوێن پێ بژێوی خۆتا بگەرێیت، ئەوسا خواش رزقت بۆ بنێرێ.

[٨٦] واتە خواردن و خواردنەوەی ئەوێ.

[٨٧] واتە با ستەمكار بەوە یاخی نەبێ كەوا خوا چەند رۆژێ مۆڵەتی داوە، ئەوە بۆ ئەوەیە كە بیر بكاتەوە، نەك لەبەر ئەوەیە كە خوا بیری چۆتەوە.

[٨٨] واتە زۆرداری ستەمكار، هەر سڕ بێ و گەرمی نەبێتەوە، تا بە كەسەوە نەدات.

[٨٩] لەبەر ئەوە قورئان لە شوێنا باسی راستی ئەكات، وە هانە هانەی مەردومی لە سەر ئەدات.

[٩٠] چونكە هەموو تۆڵەیەك كە ئەیسێنێ لە گوناهبارێك، ئەبێ بە پێی دەستوور و باوێك بێ كە خوا دایناوە لە جیهانا، وە ئەمە ساڵەهای ساڵی ئەوێ تا بنەڕەتی بۆ دائەمەزرێ، مەگەر هێندێ گوناهی زۆر زل نەبێ كە خێرا خوا لە باڵی خاوەنی ئەدا، وە هەر بە ئاسمانەوە ئەیكا بە كۆی زووخاڵ.

[٩١] هەژارێكی لەش ساغی رەش و رووت ئەیڵێ، لە زستانێكی ساردا بە دەوڵەمەندێك، كە لە سەرمانا خۆی پێچابێتەوە.

[٩٢] هەژارێكی لەش ساغی رەش و رووت ئەیڵێ، لە زستانێكی ساردا بە دەوڵەمەندێك، كە لە سەرمانا خۆی پێچابێتەوە.

٩٣)- خوا غەزەب بگرێ لە بزن، نانی شوان ئەخوا[٩٣]

٩٤)- خوا غەزەب بگرێ لە مێرووله باڵی ئەداتێ[٩٤]

٩٥)- خوا کە سەری دا کڵاویش ئەدا[٩٥]

٩٦)- خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردووە[٩٦]

٩٧)- خوا لە سوڵتان مەحموود گەورەترە[٩٧]

٩٨)- خوا لە کاری خۆی بۆتەوە[٩٨]

٩٩)- خوا ماڵی داوە بە جوو کێری داوە بە نێرەکەر[٩٩]

١٠٠)- خوا نانی بڕیوە و پێغەمبەر دۆ[١٠٠]

١٠١)- خوا نەجاڕ نییە و تەختە تاشە، قەحبە و گەواد بۆ یەك باشە[١٠١]

---

[٩٣] واتە توخنی شتی خۆشەویستی هیچ کەس مەکەوە.

[٩٤] تا بفڕێ و مەل بە حەواوە بیخوات.

[٩٥]

[٩٦] واتە ئاگاداری هەموو شتێك ئەکا.

[٩٧] ئەگێڕنەوە، کە (سوڵتان مەحمود)ی غەزنەوی، رقی لە دارتاشێك هەڵ ئەستێ، ئێوارە وەختە، ئەکاتە سەری، ئەڵێ ئیمشەو تا بەیانی بارێ ئاردی دارم ئەوێ، کابرا خەمی لێ دێ، شەو ژنەکەی پێی ئەڵێ: پیاوەکە: وەورە بنوو. خوا لە سوڵتان مەحموود گەورەترە، بەیانی لەگەڵ شەبەق ئەدات دێن بە شوێن دارتاشا، کابرا لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانیا دەست ئەکەن بەگریان، کە دەرگا ئەکەنەوە تەماشا ئەکەن وا سوڵتان مەحموود مردووە و هاتوون بە شوێن دارتاشەکەدا کە سندوقی بۆ دروست کا.

[٩٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە دوای بوونی کارێك ئەم بکەوێتە پەلە پەل، واتە تازە پەلەپەل بۆچی ئەکەیت؟ خۆ ئیشەکە تەولو بووە.

[٩٩] واتە هەر کەسێك شایستەی چی بێ دراوێتێ.

[١٠٠] بە یەکێکی زۆر هەژاری رەجاڵی رەش و رووت ئەوترێ.

[١٠١] بە ژن و پیاوێکی خراپ ئەوترێ کە بۆ یەك رێکەوتبن.

١٠٢)- خوا یار بێ با شیرت داربێ[١٠٢]

١٠٣)- خوا یار بێ، با دوژمن هەزار بێ[١٠٣]

١٠٤)- خوار دانیشە، راست بڵێ[١٠٤]

١٠٥)- خواردن ئاگای لە برا نییە[١٠٥]

١٠٦)- خواردن گەندوگووە، شتن رەنگ و رووە[١٠٦]

١٠٧)- خواردن قابلی هەموو کەسە، جلك قابلی هەموو کەس نییە[١٠٧]

١٠٨)- خواردی تێرە، وتی سوێرە[١٠٨]

١٠٩)- خواردی تیکە و کردی فیکە[١٠٩]

١١٠)- خوازبێنی کەر، نەزەر بێ، ناو گوڵانەکەی گێزەر بێ، ئاخۆ ئەو شاییە چۆن بێ[١١٠]

---

[١٠٢] واتە کە خوا یارمەتیدەرت بوو، دوژمنت هەزار بێ، یا شیرەکەی دەستت دار بێ مەترسە.

[١٠٣] واتە کە خوا یارمەتیدەرت بوو، دوژمنت هەزار بێ، یا شیرەکەی دەستت دار بێ مەترسە.

[١٠٤] واتە خوار دانیشیت و رێك و رەوان قسە بکەیت باشترە لەوەی رێك دانیشیت و خوار و خێچ بدوێیت.

[١٠٥] واتە مەردومی برسی کە خواردنیان بۆ دانا ئاگای لە برا نامێنێ.

[١٠٦] بە یەکێکی پۆخڵی چڵێس ئەوترێ، کە هەر خواردنی مەبەست بێ نەك پاك و تەمیزی.

[١٠٧] چونکە مێندێ کەس بەرگی لێ نایەت.

[١٠٨] بە یەکێك ئەوترێ کە لە دوای خواردنی شتێ بە تێر و پڕی ئنجا نەنگی لێ بدۆزێتەوە.

[١٠٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە شوێنێك بەهرەیەك وەرگرێ، وە دوای ئەوە زوو بە زوو، بڕوا و ئەو شوێنە بەجێ بێڵێ.

[١١٠] بە خوازبێنیەك ئەوترێ کە خوازبێنی کەرەکەی یەکێکی بێنموود بێ، وە گوڵاڵانەکەشی، شتێکی بێنرخ بێ.

١١١)- خواشی ئەویٚ و خورماشی ئەویٚ[١١١]

١١٢)- خوام لیٚ لارە و بەندەم لیٚ بیٚزارە[١١٢]

١١٣)- خوای گەرمیان و کویٚستان هەر یەکیٚکە[١١٣]

١١٤)- خوای قولی، نای لە ملی[١١٤]

١١٥)- خوردە ماڵ، مەندە میرات[١١٥]

١١٦)- خورماش لە بەغا زۆرە[١١٦]

١١٧)- خورمای بابی یان، داوەتیٚ[١١٧]

١١٨)- خوشك و برا شەڕیانە، لەسەر دەنکە زەنگیانە[١١٨]

١١٩)- خوشکەکەت لەخۆراسان تری و نانەکەت لیٚرە بوو بە جۆ[١١٩]

---

[١١١] خوا: خویٚیە: دیارە کە خویٚ و خورما بە یەکەوە ناخوریٚن، بە یەکیٚك ئەوتریٚ کە دوو شتی وا داوا بکا، کە هەرگیز کۆ نەبنەوە.

[١١٢] یەکیٚك ئەیلیٚ کە لای خواش و لای بەندەش روو ڕەش بیٚ.

[١١٣] بە یەکیٚك ئەوتریٚ، کە لەبەر کووڕی ڕۆژی خۆی، بیەویٚ شویٚنیٚك بەجیٚ بیٚڵیٚ، وە بچیٚ بۆ شویٚنیٚکی تر.

[١١٤] بە یەکیٚك ئەوتریٚ، کە زۆر و ستەمیٚکی لە یەکیٚك کردبیٚ، وە ئیٚستا خوا پیٚی نواندبیٚ.

[١١٥] واتە هەرچی بخۆیت ئەوە ماڵی خۆتە، وە هەر چیش بمیٚنیٚتەوە ئەبیٚ بە ماڵی میراتگر.

[١١٦] تەماشای ڕاڤەی پەندی (پەمووش لە شارەزوور زۆرە) بکە.

[١١٧] بە یەکیٚك ئەوتریٚ، کە دەست لە بیر و باوەڕیٚکی هیچ و پووچ هەڵنەگریٚ.

[١١٨] بە دووکەس ئەوتریٚ، کە لە سەر شتیٚکی هیچ و پووچ بچن بە گژ یەکا.

[١١٩] ئەگیٚڕنەوە کە ژنیٚك دۆستیٚکی ئەبیٚ، میٚردەکەی کە ئاردی گەنمی بۆ ئەکڕیٚ، هەموو جاریٚ ئەیکا بەنان و کولیٚرە چەورە بۆ خۆی و دۆستەکەی، وە لە ئاردی جۆ نان ئەکا بۆ میٚردەکەی، هەموو جاریٚ میٚردەکەی پیٚی ئەڵیٚ: ئافرەت من هەر ئاردی گەنم ئەکڕم و تۆ هەر نانی جۆم دەرخوارد ئەدەیت، ئەویش ئەڵیٚ من بڵیٚم چی؟ قەباحەتی خوشکەکەتە، چونکە هەر چەند ئەو ئەتریٚ لە خۆراسان، نانەکەی تۆ لیٚرە ئەبیٚ بە جۆ، کابرا، لەبەر ساویلەکەیی خۆی بڕوا ئەکا، وە ئەچیٚ بۆ سەر خوشکەکەی لە خۆراسان، وە تیٚروپڕی تیٚ هەڵئەدا، کە خوشکەکەی ئەپرسیٚ بۆ لیٚم ئەدەیت؟ ئەڵیٚ تۆ بۆچی ئەوەندە ئەتریت، وە هەموو جاریٚ نانەکەی ئیٚمە ئەکەیت بە جۆ، خوشکەکەی تیٚ ئەگا مەسەلە چییە، ناچار بە

١٢٠)- خوليا، سەرمايەی مفلسە[120]

١٢١)- خوم شێواوە[121]

١٢٢)- خونچەی ئازادی بەخوێن ئەگەشێتەوە[122]

١٢٣)- خووی ئەوی گرتووە و بۆنی ئەو ئەدا[123]

١٢٤)- خووی شیری، هەتا پیری[124]

١٢٥)- خوویەك بە شیری، مەگەر بمیری[125]

١٢٦)- خوویەك گیرا بە شیری، تەرك ناكرێ بە پیری[126]

١٢٧)- خوویەكی گرت بە شیری، تەركی ناكات بە پیری[127]

١٢٨)- خوێناوی بخواتەوە ئۆخەی ناكا[128]

١٢٩)- خوێنی بۆ گەڕی ئەشێ[129]

---

براكەی ئەڵێ: براله وا نییه كه حاڵی كراویت، ببێت و نەبێ ئەم ژنی تۆیە دۆستی هەیە، وە نانە گەنمەكەی تۆ دەرخواردی ئەو ئەدا، بچۆرەوە خۆتیان لێ مات بدە، وە لە ناوەختا بچۆرە ژوورەوە بزانە چی ئەبینیت، كە ئەچێتەوە تەماشا ئەكا راستە، وە خوشكەكەی چی پێ وتوە، وایە، ئێستا ئەمە بەیەكێك ئەوترێ كە قسەیەكی ناپەسەندی وا بكا.

[120] چونكە هیچی نییە پێوەی خەریك بێ خوليا ئەبێ.

[121] لە كاتێكا ئەوترێ، كە ئاژاوە بێ و دنیا تێك چووبێ.

[122] چونكە ئازادی و سەربەخۆیی هەر بە خوێن سەندراوە.

[123] بە یەكێك ئەوترێ، كە چاو لە یەكێك بكا، وە بیەوێ بچێتە سەر رەوشت و خووی ئەو.

[124] كەواتە تا ئەتوانن خووی جوان فێری منالّتان بكەن.

[125] كەواتە تا ئەتوانن خووی جوان فێری منالّتان بكەن.

[126] كەواتە تا ئەتوانن خووی جوان فێری منالّتان بكەن.

[127] كەواتە تا ئەتوانن خووی جوان فێری منالّتان بكەن.

[128] واتە زۆری رق لێیە.

[129] بەیەكێكی چەتڵەمەزی پیسی بۆگەنی نالەبار ئەوترێ، واتە خوێنی زۆر پیسە، وە پیسی بە پیسیەوە ئەڕوا.

۱۳۰)- خوێنی کردە کاسەوە[130]

۱۳۱)- خۆ ئەسپی نۆربە ناخوات[131]

۱۳۲)- خۆ بەڕوو نییە، لە قەپولکی دەرچێ[132]

۱۳۳)- خۆ بن مەمکی نەڕزییوە[133]

۱۳٤)- خۆ پەسەندی، مایەی ریسواییە[134]

۱۳٥)- خۆ دەمی ئەو قنگی خۆی نییە بیقووچێنێ[135]

۱۳٦)- خۆ سەری کەر نەبووە، بە سەد تمەن[136]

۱۳۷)- خۆ ماست نییە بە لێوتەوە دیار بێ[137]

۱۳۸)- خۆ مریشك نیم بە دەنووك شەڕ بکەم[138]

۱۳۹)- خۆ نانم بە سەر ساجەوە نەسووتاوە[139]

---

[130] واتە زۆر قسەی خراپی دەربارە کرد.

[131] بە یەکێك ئەوترێ کە پێی ناخۆش بێ میوان رووی تێ بکات، واتە بۆچت پێ ناخۆشە، خۆ ئەسپەکەی نۆربە جۆ ناخوات.

[132] دایکی کچێك ئەیلێ، کە داوای کچەکەی بکەن و نەیدا، واتە هێشتا منالە، وە پەلەی شو کردنی نییە.

[133] دایکی کچێك ئەیلێ، کە داوای کچەکەی بکەن و نەیدا، واتە هێشتا منالە، وە پەلەی شو کردنی نییە.

[134] واتە تا ئەتوانیت لە ناو خەلْقا خۆت پەسەند مەکە.

[135] ئەقشەی ئەم پەندە بە چوار کەس ئەکێشرێ، بەم رەنگە یەکێك قسە زۆر ئەکات، یەکێکیش بە سەریا دێ کە ئەوەندە قسە نەکات. سێهەمێك بە دووهەم ئەلێ: بۆ خاتری خوا رزگارمان بکە لەدەمی ئەم چەنەبازە، چوارەمێکیش ئەلێ: خۆ دەمی کابرای چەنەباز قنگی خۆی نییە تا بیقووچێنێ و رزگارتان بکات.

[136] واتە خۆ گرانیەکی وا نییە کە هیچ دەست نەکەوێ. بە یەکێکی رژد و چرووك ئەوترێ.

[137] بە یەکێك ئەوترێ، کە حاشا لە قسەیەکی خۆی بکات.

[138] واتە هەموو جەنگ کەرێك، جۆرە چەکێکی ئەوێ، وە جەنگ بە بێ چەك ناکرێ.

[139] واتە پەلەم نییە.

١٤٠)- خۆ، له خۆ ئەکوتێ، بێگانه له کولۆری دارا[١٤٠]

١٤١)- خۆت بکه تێره، به من مەکه خێره[١٤١]

١٤٢)- خۆت بکوژی بۆ بۆره پیاو، ئەڵێ به دەردی خوا مرد[١٤٢]

١٤٣)- خۆت سەری خۆت نەخورێنیت، به کەس ناخورێت[١٤٣]

١٤٤)- خۆت له دەست چوویت، خوا عەقڵ به منالّت بدات[١٤٤]

١٤٥)- خۆت مەکه به مەقاش[١٤٥]

١٤٦)- خۆت مەکوته جەوته[١٤٦]

١٤٧)- خۆت هەڵترێنه، بارت سەنگینه[١٤٧]

١٤٨)- خۆرەتاوی قەراغ بان، دەوامی نییه[١٤٨]

١٤٩)- خۆشه ئاگر خۆشه دوو، برا خاسه نەوەك شوو[١٤٩]

١٥٠)- خۆشت بێ و ترشت بێ، ئەبێ وابێ[١٥٠]

١٥١)- خۆشەویستی، دوور و نزیکی بۆ نییه[١٥١]

---

[١٤٠] واته خزم پرسیار له خزم ئەکات نەك له بێگانه.

[١٤١] به یەکێك ئەوترێ، که ماڵی خۆی به دەمیا نەچێ، کەچی به هاشه و هوشەش، بەڵێنی پیاوەتی به مەردوم بدا.

[١٤٢] بەڵام که وەجاخزاده بوو دوای مردنیشت، پاداشتت ئەداتەوه، وه خێرت بۆ ئەکات.

[١٤٣] واته هەر کەس ئەبێ خۆی خەمی خۆی بخوات.

[١٤٤] به یەکێك ئەوترێ، که له قسەیەکا پلارێکت تێ بگرێ، واته خۆت به بێ عەقڵی بردته سەر، خوا عەقڵ به منالّەکەت بدات.

[١٤٥] تا ئاگرت پێ خۆش کەن، یا ئاگرت پێ هەڵگرن.

[١٤٦] تەماشای راڤەی (مەیکوته جەوته) بکه.

[١٤٧]

[١٤٨] به یەکێك ئەوترێ، که له ئاخر و ئۆخری ئیشێکا پیا بگات.

[١٤٩] تەماشای راڤەی پەندی (نه ئاگر و نه دوو، هیچی نابێ به شوو) بکه.

[١٥٠] واته رازی بێ و رازی نەبێ، ئەبێ ئەو کاره وابێ.

[١٥١] واته یەکێکت خۆش ویست هەر خۆشت ئەوێ با دووریش بکەوێتەوه.

١٥٢)- خۆشی بنۆشی، ئەبێ تاڵیش قوبوڵ بکەیت[152]

١٥٣)- خۆڵ بە سەر شاری بێ حاکم[153]

١٥٤)- خۆڵ لە خۆڵگای گەورە ئەپێوری[154]

١٥٥)- خۆڵی بەرکوانووی خۆت بخۆیت، لە پلاوی بێگانە چاکترە[155]

١٥٦)- خۆڵی خۆت مەدە بە پوولی خەڵق[156]

١٥٧)- خۆڵی لە دۆشاوی خۆی کرد[157]

١٥٨)- خۆم و دارێ، وام لە شارێ[158]

١٥٩)- خۆمار نیم بە گڵ بژیم[159]

١٦٠)- خۆی بە گورگان خواردن دا[160]

١٦١)- خۆی خستۆتە ساجی عەلی[161]

١٦٢)- خۆی ریشی نییە و بە کۆستە پێئەکەنێ[162]

---

[152] دڵخۆشی یەکێکی پێ ئەدرێتەوە، کە لە دوای خۆشیەك، تووشی ناخۆشی بووبێ.

[153] چونکە هەموو ستەمێکی تیا ئەکرێ.

[154] واتە هەر وەك گڵ لە گڵنجانی گەورە ئەبرێ، مەردومیش تا نزیکی ماڵی گەورە و خانەوادەی گەورە بێ، بەهرەمەند ئەبێ.

[155] ئافەرین پێشینانی بەڕێز، بۆ خۆتان و ئامۆژگاری بەرزتان.

[156] بە یەکێك ئەوترێ، کە بیەوێ زەمینێکی خۆی بفرۆشێ.

[157] واتە بە دەستی خۆی، ماڵی خۆی وێران کرد.

[158] یەکێك ئەیڵێ، کە ئەرکی کەسی بە سەرەوە نەبێ، وە هەر خۆی و دار دەستەکەی بێ، لە هەر لایەك دانیشێ دانیشێ.

[159] واتە هەموو کەسێك، پێ بژیوێکی ئەوێ.

[160] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆی بە دەستی خۆی تووشی بەڵایەکی زۆر گەورە بکات.

[161] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر چێکی بووبێ لە بەردی دابێ.

[162] واتە مەردوم خۆی کە عەیبێکی تیا بوو، ئیتر نابێ ئەو عەیبە لە یەکێکی تر بگرێ.

١٦٣)- خۆی گەیاندە حاڵی جاو[١٦٣]

١٦٤)- خۆی کێشایەوە[١٦٤]

١٦٥)- خۆی لێرەیە، کلکی لە بەغدا تۆز ئەکا[١٦٥]

١٦٦)- خۆی لێکردوین بە بوخچەی پەڕۆ[١٦٦]

١٦٧)- خۆی لێکردوین بە هەناری شیرین[١٦٧]

١٦٨)- خۆی لێکردوین بە هەنگوینی شەمە تلێنکە[١٦٨]

١٦٩)- خۆی مامرە، هێلکەی قاز ئەکا[١٦٩]

١٧٠)- خۆی نایکا، خوا بۆی ئەکا[١٧٠]

١٧١)- خێر بێ و بێر بێ، بە سەرتا رژێ[١٧١]

١٧٢)- خێر بە خوێش، نەك بە دەروێش[١٧٢]

١٧٣)- خێڵە و خوار و خێڵە و ژوور، بزنە بەلە و جاجمە سوور[١٧٣]

---

[١٦٣] واتە خۆی خستە حاڵی گیانەڵاو.

[١٦٤] واتە مرد.

[١٦٥] بە یەکێکی بزێوی نارەحەت ئەوترێ، کە هەمیشە هەر ئاژاوە بنێتەوە.

[١٦٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەرمانا بەرگی چڵکن و دڕاوی زۆری لەبەر کردبێ.

[١٦٧] واتە خۆی خۆشەویست کردووە.

[١٦٨] واتە زۆر خۆی خۆشەویست کردووە.

[١٦٩] بە یەکێك ئەوترێ کە لاسایی لە خۆی گەورەتر بکاتەوە کە ئاخرێکەی قنگی ئەدڕێ.

[١٧٠] بەیەکێك ئەوترێ، کە خوا کاری باشی بۆ بکات، بێئەوەی خۆی هەوڵی بۆ بدا.

[١٧١] لە کاتێکا ئەوترێ، کە باسی خێر و بێرێك بکرێ.

[١٧٢] واتە تاخزمی هەژاری خۆت وێستابێ، خێرت بە کەسی تر ناشێ.

[١٧٣] واتە هیچی نییە، بزنە بەلێك و جاجمە سوورێك نەبێ.

# پیتی دال

١)- داد لە دەست کەپەنەکە بۆر، ماڵ لە خاوەن ماڵ ئەسێنێ بە زۆر[1]

٢)- دار ئەڵێ: ئەگەر تەور کلکی لە خۆم نەبوایە نەی ئەبڕیمەوە[2]

٣)- دار بە بەرەکەی ئەناسرێ[3]

٤)- دار بە پوازی خۆی ئەقڵیشێ[4]

٥)- دار بە گەورەیی ناچەمێتەوە[5]

٦)- دار بە کونی زەردەواڵەدا ئەکا[6]

٧)- دار پوازی لە خۆی نەبێ ناقڵیشێ[7]

٨)- دار پیر ئەبێ، جارێك بازی بە سەرەوە ئەنیشێ[8]

٩)- دار دەستێتی[9]

١٠)- دار کەلار بوو، سێبەریشی لارە[10]

---

[1] کەپەنەك: فەرەنجی یە، بە مەردومی زۆرداری ستەمکار ئەوترێ.

[2] واتە ئەگەر خزم و خوێش یارمەتی دوژمن نەدەن، دوژمن بە کامی خۆی ناگا.

[3] واتە مرۆڤ بە بەرهەمی ئەندازەی پیاوەتی دەرئەکەوێ.

[4] بە یەکێك ئەوترێ کە بەهۆی خزمێکی خۆیەوە دوژمن زەفەری پێ بەرێ.

[5] واتە پەروەردەی منال ئەبێ لە منالیەوە بێ، نەك دوای گەورەیی.

[6] واتە ئاژاوە ئەنێتەوە و فیتنە بەرپا ئەکا.

[7] تەماشای راڤەی پەندی پێنجەم بکە.

[8] واتە مەردوم لە هەموو ژیانیا جارێك بەخت رووی تێئەکات، ئەبێ ئاگای لە خۆی بێ لە دەستی نەدا.

[9] تەماشای راڤەی پەندی ٢٦ بکە.

[10] بە یەکێکی خراپ ئەوترێ، کە هەموو کارێکی هەر بە خراپە بکا، واتە خراپ چاکەی لێ ناوەشێتەوە.

١١)- دار كرمی لەخۆی نەبێ هەزار ساڵ ئەژی[11]

١٢)- دار لە شوێنی خۆی راقەنێ هیشك ئەبێ[12]

١٣)- دار لەگەڵ تۆمە، دیوار گوێت لێ بێ[13]

١٤)- دار نەبێ، ڕژوو لە کوێ ئەبێ[14]

١٥)- دار نەرم بێ، کرم ئەیخوا[15]

١٦)- دار نییە نەهەژابێ، کچ نییە نەگەوزابێ[16]

١٧)- دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە[17]

١٨)- دار و دیوار گوێی هەیە[18]

١٩)- دار و گۆشت ئاشنایەتیان نییە[19]

٢٠)- دار وتی: تەور ئەگەر کلکی لە خۆم نەبوایە نەیئەبڕیمەوە[20]

٢١)- دارا و نەدار گشت ماتی خەمە[21]

---

[11] تەماشای راڤەی پەندی پێنجەم و هەشتەم بکە.

[12] واتە هەموو شتێك کە لە شوێنی خۆی جووڵا و لەق بوو، لە ناو ئەچێ.

[13] تەماشای پەندی (بووکێ لەگەڵ تۆمە، خەسوو گوێت لێ بێ) بکە.

[14] بە شتێك ئەوترێ خۆی نەبێ و داوای بەروبوومی بکرێ.

[15] واتە مەردوم نابێ ئەوەندە نەرم و شل بێ تەماعی تێبکرێ.

[16] چونکە هەر دووکیان بەری خۆشیان هەیە، بۆ چنینی هەر ئەبێ پیایاندا هەلگەڕێیت.

[17] واتە مەردومی ناپاك، زۆر ترسنۆکە، وە زوو بە زوو دەرئەکەوێ.

[18] واتە بە سپایی قسە بکە، وە هەمیشە ئاگات لە قسەی خۆت بێ.

[19] واتە ئەگەر لە ژن یا لە منداڵت دا، بە دار لێیان مەدە، چونکە مەبەس لەو لێدانە، تۆڵەسەندن و ئازار پێگەیاندنیان نییە، بەڵکو هەر بۆ ئەوەیە نیشانیان بدەیت، کە تۆ لەو ئیشەیان ناڕازیت، ئنجا ئەوە بە ناوچەوان گرژ کردن بێ، یا بە زللەیەکی سووك بێ یا بە هەر شتێکی تری وابێ کە بە پێی تەربیەی ئەمرۆ هەڵە نەبێ.

[20] واتە ئەگەر ناپاکی ناوخۆ نەبێ، دوژمن ناتوانێ دەست بە سەر نیشتمان بگرێ.

[21] واتە هەموو کەس بە پێی خۆی خەمێکی هەیە.

٢٢)- داران له دووره‌وه سه‌ریان زه‌نێره[٢٢]

٢٣)- داره‌كه‌ی سه‌ر كه‌ل، پرده‌كه‌ی گاڕان[٢٣]

٢٤)- داره‌وانیشه و شاخه‌وانیشه[٢٤]

٢٥)- داری بێ گه‌ڵا نرخی نییه، خوشكی بێ برا زینه‌تی نییه[٢٥]

٢٦)- داری بێبه‌ر بۆ بڕین باشه[٢٦]

٢٧)- داری تاقه‌دار قه‌ت نابێ به دار، دۆستی دوور له وڵات قه‌ت نابێ به‌یار[٢٧]

٢٨)- داری پیره‌دار، به دار نابێ، یاری دوور، به یار نابێ[٢٨]

٢٩)- داری دا به رۆحیا[٢٩]

٣٠)- داری ده‌ستێتی[٣٠]

٣١)- داری گه‌نده‌ڵ بۆ بڕین باشه[٣١]

---

[٢٢] واته پیاوی گه‌وره‌ی ناودار له دووریشه‌وه هه‌ر دیار و ناسراوه.

[٢٣] زۆر جار یه‌كێك قسه‌یه‌ك ئه‌كا، یه‌كێكی تر تێناگات له قسه‌كه، وه به قسه‌یه‌كی وا وه‌لامی ئه‌داته‌وه، كه هه‌رچی په‌یوه‌ندی بێت نیه‌تی به قسه‌ی كابراوه، ئنجا به‌رانبه‌ره‌كه‌ی ئه‌م په‌نده‌ی پێ ئه‌ڵێ، واته ئه‌م دوو قسه‌یه چی به سه‌ر چیه‌وه‌یه هێندێكیش ئه‌ڵێن(داره‌كه‌ی سه‌ركه‌ل، پرده‌كه‌ی قشلاخ) گاڕان: ناوی كه‌لێكه له ناوچه‌ی مه‌ریوان، هه‌ر وه‌ك قشلاخ: ناوه بۆ دێیه‌ك له جوانرۆ، وه كه‌وتۆته دامێنی كێوی (شاهۆ)وه.

[٢٤] واته له زۆر شتا شاره‌زا و ئاگاداره.

[٢٥]

[٢٦] واته هه‌موو شت ئه‌بێ به پێی خۆی كه‌ڵكێكی ببێ.

[٢٧]

[٢٨] واته ده‌ستیان لێهه‌لگره.

[٢٩] واته تۆڵه‌ی خۆی لێسه‌ند.

[٣٠] به یه‌كێك ئه‌وترێ، كه هه‌موو ئیشێكت بۆ بكا، وه ئه‌گه‌ر ئه‌وت به ده‌سته‌وه نه‌بێ، په‌كت بكه‌وێ.

[٣١] واته شتی خراپ لابه‌ره.

٣٢)-  داری گەندەڵ بەدار نابێ[٣٢]

٣٣)-  داری قەرەداغ پەلکی دەرمانە، خۆزگەم بەو خوشکەی برای میوانە[٣٣]

٣٤)- داری نەرم، مێرووله ئەیخوا[٣٤]

٣٥)-  داریان لە قنگی ئەبرێ، ئەیوت: ئەم تەقە تەقە چییە؟[٣٥]

٣٦)-  دارێك خوا غەزەبی لێ گرت، ئەبێ بە چەقەنەی ئاش[٣٦]

٣٧)-  دارێکم بە دەستەوەیە هەر دوو سەری گواوییە[٣٧]

٣٨)-  دارێکی بۆ کرد[٣٨]

٣٩)-  داس لە سەپان مەشارەوە[٣٩]

٤٠)- داکت کورد و بابت کورد، ئەم عنوانەت لە کێ گرت[٤٠]

٤١)-  داکی خۆم کابانە، تێر ئەخۆم کفتانە[٤١]

٤٢)- داماوی، سەری پیاو ئەکا بە ماڵی دوژمنا[٤٢]

٤٣)- دان ئێشان، چارەی کێشان[٤٣]

---

[٣٢] واتە شتی خراپ لابەرە.

[٣٣] بە یەکێك ئەوترێ خزمێکی زۆر نزیکی میوانی بێ.

[٣٤] واتە مەردوم کە زەبوون بوو، هەموو کەسێك تەمەعی تێئەکا.

[٣٥] بە مەردومی بێعار ئەوترێ.

[٣٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە خوا سەری لێ بشێوێنێ و ئاوارەی بکات.

[٣٧] یەکێك ئەیڵێ، کە ئیشێکی لەبەر بێ، بە هەر لایەکا بیکات لە ڕوویەکەوە خراپ بێ.

[٣٨] واتە تۆڵەی لێسەند.

[٣٩] واتە هەر کەسە شایستەی چییە، بیدەرە دەستی.

[٤٠] بە یەکێك ئەوترێ کە دەعیە و دەمارێکی لە خۆیەوە پەیدا کردبێ.

[٤١] یەکێك ئەیڵێ کە خزمێکی نزیکی لە خانەدانێکا دامەزرابێ بە ڕەنگێك کە بتوانێ هەموو جۆرە خواردەمەنیەکی بۆ بنێرێ.

[٤٢] یاخوا کەس تووشی ئەو ڕۆژە رەشە نەبێ.

[٤٣] واتە هەموو ناخۆشیەك، ئەبێ لە بنا ریشەکێش بکرێ.

٤٤)- دان كێشان و گیان كێشان[٤٤]

٤٥)- دانا به دركاندن، كەر به نەقیزە[٤٥]

٤٦)- دانا به دركاندن، نادان به كوتەك[٤٦]

٤٧)- دانویان پێكەوە ناكوڵێ[٤٧]

٤٨)- دانی لێ تیژ كردووە[٤٨]

٤٩)- دانیان له یەك سپی بۆتەوە[٤٩]

٥٠)- داوێ بۆ خەڵقی دابنێیت، له پێی خۆت ئەئاڵێ[٥٠]

٥١)- داوای رەشكەی كرد، وتی ساوەرم له سەر هەڵ خستووە[٥١]

٥٢)- داویە له حەوت ئاو، قولی تەڕ نەبووە[٥٢]

٥٣)- دایە ببینە، دوێتە بخوازە[٥٣]

٥٤)- دایە بمەردە و باوە بوازە، بۆ خۆت بگەڕێ قەلەندەر خاسە[٥٤]

---

[٤٤] واته جاران ئازاریان وەك یەك وابوو، بەڵام ئێستا بەهۆی بەنجەوە گەلێ لە جاران باشترە.

[٤٥] به یەكێكی تەمەڵی تەوەزەل ئەوترێ، كه چاو له ئیش و كار بقوچێنێ.

[٤٦] به یەكێكی تەمەڵی تەوەزەل ئەوترێ، كه چاو له ئیش و كار بقوچێنێ.

[٤٧] به دوو كەس ئەوترێ، كه دژی یەكتر بن، وە پێكەوە هەڵنەكەن.

[٤٨] واته مرخی لێ خۆش كردووە.

[٤٩] به دوو كەس ئەوترێ، كه له پێشەوە شەرمیان له یەك كردبێ، له پاشا بەرە بەرە روویان كرابێتەوە، به ئەندازەیەك كه قسه بڵێن به یەك.

[٥٠]

[٥١] واته ناتدەمێ، ئەگینا ساوەر له سەر رەشكە چۆن هەڵئەخرێ.

[٥٢] واته له ژیانیا قاڵ بووە.

[٥٣] دوێت: كچە، واته كه دایك ژیر بوو، كچەكەشی ژیر ئەبێ، ئەو حەله بیخوازە.

[٥٤] واته دایك بمرێ و باوك با بڕوا بۆ گەڕانی خۆی، ئەو حەله تۆش به ئارەزووی خۆت بگەڕێ، منداڵێكی سەر به دەرەوەی تێنەگەیشتوو وا ئەڵێ، كه پەروەردەی باوك پەسەند نەكا، وە حەزی لەبەر بەرەڵڵایی بێ.

٥٥)- دایە! تا تۆ ئامۆژگاری منت کرد، سەد و سی مێشم بە گونی کەرەکەو ژمارد[٥٥]

٥٦)- دایەت نەمەندەن، بابەت نەباسا، بۆ خۆت بگەڕێ قەلەندەر ئاسا[٥٦]

٥٧)- دایەن لە حاڵی مناڵ بەڵەدە[٥٧]

٥٨)- دایك لای ئەولاد قەد کۆن نابێ[٥٨]

٥٩)- دایك مەدحی کچ بکات، مەگەر خاڵوان بیخوازێ[٥٩]

٦٠)- دایك و باوك گوناه ئەکا و فرزەند گیرۆدە ئەبێ[٦٠]

٦١)- دایك و باوك لە قازییە، مناڵ لە وازییە[٦١]

٦٢)- دایکت بمرێ جافر، حەڵوا شیرین نەفس کافر[٦٢]

٦٣)- دایکم وەوی، باوکم وەوی، ئەگەیتە جێ بۆم ئەکەی دارێکی قەوی[٦٣]

---

[٥٥] ئەگێڕنەوە کە دایکێك ئامۆژگاری کوڕێکی خۆی کردووە، لە پاشا ئەمیش وای پێوتووە، ئنجا ئێستا بە یەکێك ئەوترێ کە ئامۆژگاری وەرنەگرێ.

[٥٦] تەماشای پەندی ٥٩ بکە.

[٥٧] واتە مەردوم کاتێك شارەزای سروشتی یەکێك ئەبێ، کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵیا هەڵسابێ و دانیشتبێ.

[٥٨] چونکە لە مناڵییەوە هەرچی خێر و خۆشی هەیە لێی دیوە.

[٥٩] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی ببێ کەس باشی نەڵێ خۆی نەبێ، واتە ئەم قسانی تۆیە مەگەر لە گوێچکەی کەس و کاری خۆتا کار بکات.

[٦٠] وایە زۆر جار فرزەند بە گوناهی باوك، یا دایکەوە گیرۆدە ئەبێ.

[٦١] واتە ماڵ، ئاگای لە ئاژاوەی باوك و دایك نییە.

[٦٢] ئەگێڕنەوە کە ژنێك کوڕێکی ئەبێ ناوی جەعفەر ئەبێ، ڕۆژێك کوڕەکەی بە ئیش ئەچێتە دەرەوە، ئەو ڕۆژە حەڵوای شەکریان ئەبێ و هەموو بەشی خۆیان ئەخۆن، هەر بەشەکەی جافر ئەمێنێتەوە لە گوێ ئاگردانەکە، دایکی هەر ساتە نە ساتێك کەوچکێك لە بەشەکەی جافر ئەخوات، تا هیچی تیا نامێنێ، کە جافر دێتەوە داوای بەشەکەی ئەکات، دایکی ئەڵێ: (دایکت بمرێ جافر، حەڵوا شیرین، نەفس کافر).

[٦٣] وەوی: ژنی کوڕە کە پێی ئەڵێن: بووك خەسوو بە بووکی خۆی ئەڵێ پێش گواستنەوەی.

٦٤)- دایکی بووکێ ئەکورکێنێ، چەکمە ڕەقە ئەخوسێنێ[٦٤]

٦٥)- دایکی بووکێ شەقییە، ئەگەر بترێ حەقییە[٦٥]

٦٦)- دایکی دایکم چارۆ کەماوی، دەست چەورەکەت بە منا ئەساوی[٦٦]

٦٧)- دایکی دز یا سنگ ئەخوا، یا سنگ ئەکوتێ[٦٧]

٦٨)- دایکی کراس ڕەش نەمردووە[٦٨]

٦٩)- دایکی کراس کەوە نەبڕاوە[٦٩]

٧٠)- دایکی منالان، ئەخوا نان و چنگالان[٧٠]

٧١)- دە بدە و هەشت، بگرە مشت[٧١]

٧٢)- دەرەقەتی نایە و خەوی گولی پێوە ئەبینێ[٧٢]

---

[٦٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە خوا دەروویەکی لێکردبێتەوە، وە لە خۆشیانا ئەوەندە بگری بە فرمێسکەکەی چەکمەیەکی کۆنی پێ بخوسێتەوە.

[٦٥] واتە ئەوەندە ماندووە، زۆر لە ئازار و سزادایە.

[٦٦] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە نەنگیکی خۆی بێنێ بە سەر تۆدا.

[٦٧] واتە یا سنگی مریشك و قەلی دزراوە ئەخوا، یا کوڕەکەی لە دزیدا ئەکوژرێ و لە سنگی خۆی ئەدا، مەبەس ئەوەیە هەر کەسێ ڕێگای مەترسی بگرێ، هێندێ جار سەر ئەکەوێ و هێندێ جار تووش ئەبێ.

[٦٨] ئەبێ یەکێك حەزی لە کچێك کردبێ و داوای کردبێ، وە ئەو کچە دایکێکی کراس ڕەش یا شینی بووبێ و تەگەرەی تێ خستبێ، هەر کەسێك تەگەرە بخاتە کارێکی خێرەوە، یەکێك لەم دوو پەندەی بۆ ئەخوێنرێتەوە.

[٦٩] ئەبێ یەکێك حەزی لە کچێك کردبێ و داوای کردبێ، وە ئەو کچە دایکێکی کراس ڕەش یا شینی بووبێ و تەگەرەی تێ خستبێ، هەر کەسێك تەگەرە بخاتە کارێکی خێرەوە، یەکێك لەم دوو پەندەی بۆ ئەخوێنرێتەوە.

[٧٠] دایك کە منالی زۆری بوو، هەر یەکێکیان داوای جۆرە خواردنێك ئەکا، وە ورك بۆ شتێك ئەگرێ، دایکەکەیش بە ناچاری بۆیان ئەکا، ئەو حەلە، خۆشی تێریان لێ ئەخوا.

[٧١] واتە دەی قەرز بدە و بە هەشتی حازر.

[٧٢] بە یەکێك ئەوترێ ، کە دەرەقەتی یەکێك تر نەیە و نوقلانەی خراپی بۆ لێبدا.

٧٣)- دەرەکی هات، بنەکی دەرکرد[٧٣]

٧٤)- دەردەدار بە، تا بە دەرمان بگەیت[٧٤]

٧٥)- دەردی جوانان، دلۆپەی بانان[٧٥]

٧٦)- دەردی دڵ، بۆ ژێر گڵ[٧٦]

٧٧)- دەردی دڵت بە یەکێك بڵێ خەمخوارت بێ ئەگینا پێت خۆش ئەبێ[٧٧]

٧٨)- دەردی سەعاتێك ئیش، خۆشی ساڵێك لە بیر ئەباتەوە[٧٨]

٧٩)- دەرزی لە چاوی خۆتا ببینە، ئنجا گاسن لە چاوی خەڵقا[٧٩]

٨٠)- دەرزی هەڵ دەی، ناکەوێتە زەوی[٨٠]

٨١)- دەرزییەك بکە بە خۆتا، ئنجا سوژنێك بکە بە خەڵقا[٨١]

٨٢)- دەرگای خۆت داخە و سەگی دراوسێ بە دز مەکە[٨٢]

٨٣)- دەرگای کەس مەتەقێنە، تا دەرگات نەتەقێنن[٨٣]

---

[٧٣] یەکێك ئەیڵێ، کە دەریەدەر ببێ لە جێگا و ڕێگای خۆی بەهۆی یەکێکی دەرەکییەوە.

[٧٤] واتە پێویستی ژیان، ئادەمی ئەبا بۆ دۆزینەوەی دەرمان و داهێنانی هەزاران شت.

[٧٥] واتە نەخۆشی گەنج، وەك دلۆپەی بان زۆر زوو ئەوێستێتەوە و چاك ئەبێتەوە.

[٧٦] یەکێك ئەیڵێ، کە گرێیەك لە دڵیا بێ و نەتوانێ بیڵێت.

[٧٧]

[٧٨]

[٧٩] بە یەکێك ئەوترێ کە ڕەنگی خەڵق ببینێ و ڕەنگی خۆی نەبینێ، واتە هەر دەمێك ڕەنگێکی بچوکی خۆتت دی ئنجا ناوی ڕەنگی مەردوم ببە.

[٨٠] واتە زۆر قەڵەبالغە.

[٨١] واتە هەرچی خۆت پێت گرانە، بزانە کە خەڵقیش پێی گرانە.

[٨٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئاگاداری ماڵی خۆی ناکا تا ئەدزرێ، ئەو حەلە ئنجا ئەیهێنێ بە سەرئەم و ئەوا.

[٨٣] ئەمە باوێکی تێکڕایی خوایە لە جیهانا، بە دەگمەنیش کەس لێی دەرنەچووە و دەرناچێ.

٨٤)- دەرگایەك لە فەقیر داخرێ، بۆ حەكیم ئەكرێتەوە[٨٤]

٨٥)- دەرگەی بە چەپەرە، سەی حەوحەوكەرە[٨٥]

٨٦)- دەركراو كە دەستی رۆی، دەستی برا ئەشكێنێ[٨٦]

٨٧)- دەرمانی دوور شفایە[٨٧]

٨٨)- دەرمانی را رەفتەنە، دەرمانی خەو خەفتنە[٨٨]

٨٩)- دەروەزە كیمیایە[٨٩]

٩٠)- دەروێش بە[٩٠]

٩١)- دەروێش دۆخواز بێ دۆ زۆرە[٩١]

٩٢)- دەروێشی، بە سەر خۆشی[٩٢]

٩٣)- دەریا، بە دەمی سەگ پیس نابێ[٩٣]

٩٤)- دەزووی وشك دانێتی[٩٤]

---

[٨٤] واتە یەكێك ماڵی خۆی لە هەژار بگێڕێتەوە، خواش لەوی ئەگێڕێتەوە، بەم رەنگە یا خۆی یا كەسێكی نەخۆش ئەخا، وە ئەوەی لە هەژارەكەی گێڕاوەتەوە بەیەك و دە وە، ئەبێ بیدا بە دەرمان و پزیشك.

[٨٥] بە یەكێك ئەوترێ كە خانووی رێك و پێكی قاپی داری ببێ.

[٨٦] چوكە بە كۆنە قینەوە شەڕ ئەكا.

[٨٧] چونكە بڕوای پێیەتی، وە بە شتێكی باشی ئەزانێ، وە لەم بیر و باوەڕەی خۆی بەهرەمەند ئەبێ.

[٨٨] واتە كە لە سەر سەفەر بووی زوو بكەوەرە ڕێ، وە كە خەوت هات زوو بنوو.

[٨٩] دەروەزە: دەروازەیە، واتە هەڵوێستان لە بەر دەرگای دەرەوە بۆ سوالكردن كیمیایە، چونكە هەموو رۆژێ بە بێ دەستمایە، شتی زۆر ئەهێنیتەوە.

[٩٠] بە یەكێك ئەوترێ، كە پێت بڵێ: ئەم بەرگەی لەبەرتایە ناشرین، یا ئەم خواردنەی كە ئەیخۆیت ناخۆشە، واتە مەردوم لە دنیادا ئەبێ بە هەموو شت قەناعەت بكات.

[٩١] یەكێك ئەیڵێ، كە شتێكی كەم نرخی نەبووبێ و پەیدای كردبێ ز

[٩٢] واتە هەژاری بە دڵخۆشیەوە خۆشە.

[٩٣] واتە پیاوی گەورە بە قسەی ئەم و ئەو ناشكێ.

[٩٤] بە یەكێك ئەوترێ، كە هەرچی لە بەرا بێ، تەڕ بووبێ.

٩٥)- دەست ئەکا بە دەمی سەگا[٩٥]

٩٦)- دەست ئەکا بە دەمی شێرا[٩٦]

٩٧)- دەست ئیش ئەکا و چاو ئەترسێ[٩٧]

٩٨)- دەست باڵای دەستە[٩٨]

٩٩)- دەست بخەرە دەمی، ناتوانێ بی گەزێت[٩٩]

١٠٠)- دەست بخەرە لاس، دەم بخەرە ماس[١٠٠]

١٠١)- دەست بدەرە دارێ، بکوژە مارێ[١٠١]

١٠٢)- دەست بگرە بە کڵاوی خۆتەوە با نەیبا[١٠٢]

١٠٣)- دەست بڵاو، بە پیر گەدایەوە ئەچێ[١٠٣]

١٠٤)- دەست پان کەیتەوە، لە پێ ئەکەویت[١٠٤]

١٠٥)- دەست خەڕۆ کەر، لەماڵ وێران کەر خراپترە[١٠٥]

١٠٦)- دەست خەڕۆ کردن، دوژمنی دێنێ[١٠٦]

١٠٧)- دەست خەڕۆت کردم، ڕەنجەڕۆم مەکە[١٠٧]

---

[٩٥] واتە زۆر جەربەزە و بێحەیایە.

[٩٦] واتە زۆر ئازایە.

[٩٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە تۆ ئیشێك بکەیت و ئەو بترسێ.

[٩٨] واتە لە ژوور هەموو جۆرە کەسێکەوە، کەسێکی بەرزتر هەیە.

[٩٩] واتە زۆر بەسزمان و گێلۆکەیە.

[١٠٠] لاس: شیاکەیە، واتە تا ئاژەڵ بەرهەم نەهێنی، ماستت دەست ناکەوێ بیخۆیت.

[١٠١] واتە هەرچی خراپ بوو، سەری پان بکەرەوە.

[١٠٢] واتە دەخڵت بە سەر هیچەوە نەبێ، وە بێدەنگ دانیشە.

[١٠٣] چونکە پاشە ڕۆژی لە بیر نییە، وە ڕۆژێ ئەبێ کە هەژار بکەوێ.

[١٠٤] واتە فێری سواڵکردن ببیت، لە ئیشکردن ئەکەویت.

[١٠٥] چونکە یەکەم بە ناوی دۆستایەتییەوەیە، بەڵام دووهەم دوژمنە.

[١٠٦] کەواتە تا ئەتوانیت، کەس دەست خەڕۆ مەکە.

[١٠٧] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە بەڵێنێکی گرنگی پێ دابێ و بۆی نەکردبێ، واتە ئەوەت بۆ نەکردم، یارمەتیەکی ترم بدە.

١٠٨)- دەست دەست ئەناسێ[١٠٨]

١٠٩)- دەست سپییە[١٠٩]

١١٠)- دەست شکا و کاری پێئەکرێ، دڵشکاو کاری پێ ناکرێ[١١٠]

١١١)- دەست گیرانی کەس، ناشیرین نییە[١١١]

١١٢)- دەست فرمان ئەکا و چاو ئەترسێ[١١٢]

١١٣)- دەست لە بانی دەست، زۆرە[١١٣]

١١٤)- دەست لە دەست و قوەت لە خوا[١١٤]

١١٥)- دەست لە گونان درێژترە[١١٥]

١١٦)- دەست لە هۆڕی پڕا ئەگێڕێتەوە[١١٦]

١١٧)- دەستێ بۆ بەخشیش درێژ بکرێ، باشترە لە دەستێ بۆ وەرگرتن[١١٧]

١١٨)- دەستێ بۆ دزی و قنگێ بە حیزی فێر بووبێ، بە مردن نەبێ رزگاری نابێ[١١٨]

---

[١٠٨] واتە شتێکت کە لە یەکێك خواست، ئەبێ بیدەیتەوە دەست خۆی.

[١٠٩] واتە پیشەیەك نازانێ کە پێی بژی.

[١١٠] چونکە ئادەمی بە دڵەوە وێستاوە، کە دڵەکە شکا، خۆشی پەکی ئەکەوێ.

[١١١] واتە هەموو کەسێك کە شتێکی هەڵبژارد بە پێی ئارەزووی خۆیەتی، وە لە دڵی خۆیا پەسەندە.

[١١٢] بە یەکێك ئەوترێ، بە دەست ئیش بکا، بەڵام لەبەر زۆری ئیشەکەش– کە بە چاو ئەیبینێ– بترسێ.

[١١٣] واتە لە ژوور هەموو خاوەن پیشەیەکەوە، یەکێکی وا هەیە کە گەلێ بەرزتر بێ لەو پیشەیەدا.

[١١٤] لە کاتێکا ئەیلێیت کە دەست بدەیتە کارێکی گەورە و پشت ببەستیت بە خوا.

[١١٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە بۆ کارێك بچێ و هەروا بێتەوە.

[١١٦] بە دەوڵەمەندێك ئەوترێ، کە لەداراییەکەی بەشی هەژاری لێنەدا.

[١١٧]

[١١٨]

١١٩)- دەستێ شەرع بیبڕێ، خوێنی نییە[119]

١٢٠)- دەستێ کە فێر بوو بە گەنەکاری، عاری نایە تۆ لە شەرمەزاری[120]

١٢١)- دەستاوی بووکێ، لە چاومان گیرێ[121]

١٢٢)- دەستت بە کەوگیر بێ چاوت لە فەقیر بێ[122]

١٢٣)- دەستە شکێنم مەکە[123]

١٢٤)- دەستە چەورەکەی خۆت مەسوو بە سەر منا[124]

١٢٥)- دەستە چەورەکەی، سوو بەسەر منا[125]

١٢٦)- دەستت کە شکا جێی خۆی ناگرێتەوە[126]

١٢٧)- دەستت هەتا بە هەنگوینە دەیمژی، کە نەما دەیگەزی[127]

١٢٨)- دەستە و ئەژنۆ دانیشت[128]

١٢٩)- دەستەیەك ماڵ ئەکەن دەستەیەك ماڵە کۆڵە[129]

١٣٠)- دەستم گرتووە بە کڵاوی خۆمەوە[130]

---

[119] چونکە لە سەر حەقە.

[120] واتە یەکێك کە فێری بەدخوویی بوو، ئەنگ و شەرمەزاری لەلا نامێنێ.

[121] بە یەکێك ئەوترێ کە خزمەتێکی بێنرخی خۆی بداتەوە بە چاوتا.

[122] واتە لە کاتی چێشت تێ کردنا، ئەگەر هەژار هاتە بەر دەرگاکەت، بێ بەشی مەکە.

[123] بە یەکێك ئەوترێ، کە بەڵێنێکی پێ دابیت، واتە بەڵێنەکەت ببەرە سەر.

[124] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە تاوانەکەی خۆی بسەپێنێ بە سەر تۆدا.

[125] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە تاوانەکەی خۆی بسەپێنێ بە سەر تۆدا.

[126] واتە مەردوم تا ئەتوانێ نەیەڵێ ئەنگ رووی تێ بکات، چونکە کە رووی تێکرد ئەو کەسە نابێتەوە بە کەسەکەی جاران.

[127] واتە زۆر بێ وەفایە.

[128] واتە بە بێکار.

[129] بە یەکێك ئەوترێ کە بە کارێکی منالانەوە خەریك بێ، واتە هاوتەمەنی تۆ خەریکی ئیشی گەورە و پیاوانەن.

[130] کە با هات نەیبا، واتە تێکەڵی هیچ شتێك نابم.

۱۳۱)- دەستم لە سەنێرە و دەمم لە پەنێرە[131]

۱۳۲)- دەستم لە هەویرە هەر ئەوەندەم لە بیرە[132]

۱۳۳)- دەستی ئەسپ درێژ بێ[133]

۱۳٤)- دەستی بڕاوە لە هەموو لایێ، مەگەر دەست بگرێ بە کرۆکەمایێ[134]

۱۳٥)- دەستی بڕیم[135]

۱۳٦)- دەستی بزنەکە بخەرە ناو کاسەکە[136]

۱۳۷)- دەستی بڵاوە[137]

۱۳۸)- دەستی بێگانە هەر بۆ ئەوە باشە کە ماری پێ بکوژیت[138]

---

[131] سەنێر: شیاکەیە، یەکێك ئەیڵێ، کە ئاژەڵدار بێ، وە هەمیشە دەستی لە شیاکەدا بێ، واتە هەر چەند هەمیشە دەستم لە شیاکەدایە، بەڵام هەمیشەش دەمم لە خواردنی پەنیر و ماستایە.

[132] ئەگێڕنەوە کە ژنێك بوو، زۆری شوو کردبوو، ڕۆژێ هەویر ئەشێلێ، لێی ئەپرسن، چەند شووت کردووە، ئەویش ئەڵێ: (پێنج و پێنج و پێنجی تریش، حەسەن بێ ریش، ئەولا قامیش، باوکی منداڵەکانیش) ئنجا ئەڵێ: (دەستم لە هەویرە، هەر ئەوەندەم لە بیرە).

[133] بە تەوسەوە سوپاسی یەکێکی پێ ئەکەیت کە ناوی چاکەی خۆی ببات بە سەرتەوە.

[134] بە یەکێك ئەوترێ، کە کەسی بە دەستەوە نەمابێ.

[135] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیخفالی کردبێت.

[136] بزن کە سەر بڕا، پێستەکەی دەردێ و خۆش ئەکرێ بۆ ئاو تێکردن، ئنجا لە دەمەکەیەوە ئاوی تێ ئەکرێ و بە بەنێکی ڕەش ئەبەسترێ، یەکێك لە دەستەکانی تەرخان ئەکرێ بۆ ئاو لێ ڕۆ کردن، وە بە بەنی دەمەکەی ئەویش ئەبەسترێ، ئنجا هەر کەسێك تینووی بوو، بەنی دەستەکەی ئەکاتەوە، وە لەوێوە ئاوەڕۆ ئەکرێ بۆ ناو کاسەکە، کەواتە کە وترا : (دەستی بزنە بخەرە ناو کاسەکە) واتە کاسەیەك ئاو بێنە.

[137] واتە هەر چی بێتە دەست خەرجی ئەکا.

[138] چونکە دڵسۆز نییە.

١٣٩)- دەستی تەماع درێژە[139]

١٤٠)- دەستی خۆی برد بە دەما[140]

١٤١)- دەستی خۆی نییە و ماری پێ ئەگرێ[141]

١٤٢)- دەستی خەڵقە و ماری پێ ئەگرێ[142]

١٤٣)- دەستی خێری نایە سەر[143]

١٤٤)- دەستی دوانزە ئیمامی بڕیوە، بە شوێن چواردە مەعصوما ئەگەڕێ[144]

١٤٥)- دەستی شەیتان شکێ[145]

١٤٦)- دەستی شکاو جێی خۆی ناگرێتەوە[146]

---

[139] یەکێك ئەیڵێ، کە یەکێکی تر لە وەختی خواردنا شتێکی لێ نزیك بخاتەوە، واتە زەحمەت مەکێشە، خۆم دەستم ئەیگاتێ.

[140] واتە پەشیمان بووەوە، وە پەنجەی خۆی گەست.

[141] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێکی گران بە یەکێك بکات.

[142] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێکی گران بە یەکێك بکات.

[143] بە یەکێك ئەوترێ، بە تەوسەوە، کە لە جیاتی ئەوەی قازانج بگەیەنێ بە یەکێك، زیانی پێ بگەیەنێ.

[144] دوانزە ئیمام لای شیعە ئەمانەن (١)ئیمامی عەلی (٢) حەسەن (٣)حسێن، کوڕانی ئیمامی عەلی (٤)عەلی کوڕی حسێن (٥)محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی حسێن کە پێی ئەڵێن :باقر(٦)جەعفەری کوڕی محەمەدی کوڕی عەلی، کە پێی ئەڵێن :صادق (٧)مووسای کوڕی ئیمام جەعفەری صادق کە پێی ئەڵێن :کازم (٨)عەلی کوڕی مووسای کازم، کە پێی ئەڵێن عەلی رەزا (٩)محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی مووسای کازم کە پێی ئەڵێن جەواد (١٠)عەلی کوڕی محەمەدی کوڕی عەلی کوڕی مووسا، کە پێی ئەڵێن هادی (١١)حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی محەمەد، کە پێی ئەڵێن عەسکەری (١٢)ئەحمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی، کە پێی ئەڵێن مەهدی. چواردە مەعصوم: ئەم دوانزەیەن لەگەڵ پێغەمبەر و فاتیمەدا.

[145] یەکێك ئەیڵێ، کە لە نەکردنی کارێك، یا نە وتنی قسەیەك پەشیمان بێ. واتە دەستی شەیتان شکێ من ئەم هەڵەم بۆ لە کیس خۆم دا.

[146] واتە هەر کەسێك شکا، جێی خۆی ناگرێتەوە، کەواتە تا ئەتوانیت ئاگاداری خۆت بکە لەشکان.

١٤٧)- دەستی کەس، پشتی کەس، ناخورێنێ[١٤٧]

١٤٨)- دەستی کرد بە زاخا[١٤٨]

١٤٩)- دەستی لە بنی هەمانەوە دەرچوو[١٤٩]

١٥٠)- دەستی لە دنیا شتووە[١٥٠]

١٥١)- دەستی لە هەموو بنچکان بڕاوە[١٥١]

١٥٢)- دەستی لێ بشۆ[١٥٢]

١٥٣)- دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرە[١٥٣]

١٥٤)- دەستی نایە ماڵی خۆی[١٥٤]

١٥٥)- دەستی وا لە کیسەی خەلیفەدا[١٥٥]

١٥٦)- دەستیان لە دەستە، تۆیان مەبەستە[١٥٦]

١٥٧)- دەستیش ئەوەشێنێ و هاواریش ئەکا[١٥٧]

١٥٨)- دەستێك بە تەنیا تەقەی نایەت[١٥٨]

١٥٩)- دەستێك حاکم بیبڕێ خوێنی نییە[١٥٩]

---

[١٤٧] واتە هەموو کەسێك ئەبێ خۆی خەمی خۆی بخوا.

[١٤٨] واتە دەست خەڕۆی کرد.

[١٤٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچی بە دەستەوە نەمابێ، وە بێ دەست مایە مابێتەوە.

[١٥٠] واتە دەستی لە دنیا هەڵگرتووە.

[١٥١] واتە کەسی بە دەستەوە نەماوە.

[١٥٢] واتە بە تەمای مەبە.

[١٥٣] چونکە ئیش ئەکا و پارە پەیدا ئەکا.

[١٥٤] واتە دەستی کرد بە خەرجکردن بە زۆری.

[١٥٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەرچی خەرج کا لەماڵی یەکێکی تر بێ.

[١٥٦] واتە ئەوان دەستیان داوەتە یەك بۆ ئەوەی تۆ بخەن.

[١٥٧] بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ مەردوما باش نەبێ، کەچی کە یەکێك لەگەڵ ئەوا کارێکی خراپی کرد، یا ناوێکی برد، دەست بکا بە بۆڵە بۆڵ.

[١٥٨] واتە چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێ.

[١٥٩] چونکە لە سەر حەقە و فەرمانەکەی رەوایە.

١٦٠)- دەستێك شكا، راست ناگیرێتەوە[١٦٠]

١٦١)- دەستێك نەتوانم بیبڕم، ماچی ئەکەم[١٦١]

١٦٢)- دەش فامێ، دەش گریە[١٦٢]

١٦٣)- دەگا پەڕەنە، مەتیلێ کەڕەنە[١٦٣]

١٦٤)- دەعیە و دەماری نێرەکەر نایکێشێ[١٦٤]

١٦٥)- دەفێ دەنگ نادا[١٦٥]

١٦٦)- دەفە وانە، دەرحەق بە زەمانە[١٦٦]

١٦٧)- دەفری بێ سەرپۆش پووشی تێ ئەکەوێ[١٦٧]

١٦٨)- دەك ناڵبەندت کوێر بێ[١٦٨]

---

[١٦٠] واتە تا ئەتوانیت مەیەڵە شتی ناخۆش رووت تێ بکات، چونکە کە رووی تێ کردیت، جێی سارێژ نابێت.

[١٦١] واتە مەردوم لە جیهانا ئەبێ ژیر بێ، وە بزانێ ئیدارە بکا.

[١٦٢] بە یەکێك ئەوترێ ، بزانێ ئەو ئیشەی ئەیکا خراپە، کەچی بیشی کات، لە پاشا بشگری بۆ کردنی.

[١٦٣] دەگا: دێ، مەتی: پوور، واتە دێ پڕە لە دەنگ و باس، پووری کەڕە گوێی لە هیچ نییە. بە یەکێك ئەوترێ، کە ئاگای لە دەنگ و باسێکی گرنگ نەبێ کە بڵاوبۆتەوە.

[١٦٤] واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

[١٦٥] بە یەکێك ئەوترێ کە قسەی نبیسترێ، وە لەبەر ئەوە بێدەنگ دانیشتبێ.

[١٦٦] دەفە: تەختەیەکی پانە، جۆلا لەکار کردنا، تەنراوی پێ سفت ئەکا، دانە: شتێك وەك شانە، بەڵام گەورەتر و درێژترە، هەودای رایەڵی تەنراوی پیا هاتوچۆ ئەکا، لە کاتی جۆلاییدا، واتە باشی و خراپی دەفە و دانە، بە پێی رۆژە.

[١٦٧] واتە هەموو شتێك ئەبێ بە پێی خۆی پارێزگاری بکرێ.

[١٦٨] جاران ولاخ کە ناڵ ئەکرا سمی زۆر چاك ئەکرا لە هەموو لایەکەوە، ئەگەر لە لایەکەوە تۆزێ سمی بوایە، ئەو ولاخە ناو بە ناو ئەلەنگی، وە ئەزانرا کە باش ناڵ نەکراوە، وە ئەو دۆعایە لە ناڵبەندەکەی ئەکرا، ئنجا ئێستا بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی ناشرینی لێوە روو بدات، واتە ئەو کەسەی تەربیەی کردوویت کوێر بێ.

١٦٩)- دەككە نا، مەككە[١٦٩]

١٧٠)- دەڵەك تسنە و پێستیشی ئەکەن بە کەوڵی شایی[١٧٠]

١٧١)- دەم ئەخوا و چاو شەرم ئەکا[١٧١]

١٧٢)- دەم بوەستێ، سەر سەلامەتە[١٧٢]

١٧٣)- دەم تەڕی، کاسە وشك[١٧٣]

١٧٤)- دەمە، چیت لێ کەمە[١٧٤]

١٧٥)- دەمم نەبێ ها کەم، پێم نەبێ راکەم، قوڕی کوێ بە سەرا کەم[١٧٥]

١٧٦)- دەمی بگریت، بە قنگ قسە ئەکا[١٧٦]

١٧٧)- دەمی بوو بە تاقی چۆڵ[١٧٧]

١٧٨)- دەمی بوو بە تاقی چرا[١٧٨]

١٧٩)- دەمی بوو بەتەڵەی تەقیو[١٧٩]

---

[١٦٩] دەككە: شارێکە لە پاکستان، ئەم پەندە لە جێی (تۆ نا مزگەوت) بەکار دێنرێ.

[١٧٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە دیمەن هیچ و پووچ وبێکەڵك بێ، کەچی لە شتێکا زۆر باش و بە بەهرە بێ.

[١٧١] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر بخوا لەسەر خوانی مەردوم، وە بە چاو شەرمیش بکا لە خانەخوێکەی.

[١٧٢] واتە هەر کەس ئاگای لە دەمی خۆی نەبێ، سەری تیا ئەچێ.

[١٧٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە قسە هیچی نەهێشتبێتەوە، وەکی تریش هیچی لە بارا نەبێ.

[١٧٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە وتنی قسەی باشا بەخیل بێ، واتە دەمەکە چیت لێ کەمە ئەبێتەوە ئەگەر قسەیەکی باش بکەیت.

[١٧٥] یەکێك ئەیڵێ، کە زۆر خەفەتبار بێ، وە نەشتوانێت سکاڵای خۆی بکات.

[١٧٦] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆربڵێ بێت.

[١٧٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی پێ وترا، دەم داچەقێنێ و بێ وەڵام بمێنێتەوە.

[١٧٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی پێ وترا، دەم داچەقێنێ و بێ وەڵام بمێنێتەوە.

[١٧٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی پێ وترا، دەم داچەقێنێ و بێ وەڵام بمێنێتەوە.

١٨٠)- دەمی پڕ لە خوێنە[١٨٠]

١٨١)- دەمی خەڵکی، مشتی خۆم نییە، بیَنووقێنم[١٨١]

١٨٢)- دەمی دا بە یەکا[١٨٢]

١٨٣)- دەمی سەگ، بە تیکە ببەستە[١٨٣]

١٨٤)- دەمی چۆتە گوو چنینەوە[١٨٤]

١٨٥)- دەمی چۆتە کلیلە[١٨٥]

١٨٦)- دەمی چووە بە خوری خۆیا[١٨٦]

١٨٧)- دەمی گۆ ناکا[١٨٧]

١٨٨)- دەمی لۆرك و پەنیریَ، پیَچکم بە قوونی فەقیریَ[١٨٨]

١٨٩)- دەمی نایگاتیَ، ئەڵیَ سوێرە[١٨٩]

١٩٠)- دەنگ ئەکەم بەد ناوم، دەنگ ناکەم تەنگاوم[١٩٠]

---

[١٨٠] بە یەکێك ئەوتریَ، کە تازە خۆشەویستێکی مردبیَ.

[١٨١] واتە دەمی خەڵق بە من ناگیریَ.

[١٨٢] واتە مرد و گیانی دەرچوو.

[١٨٣] واتە ئەو سواڵکەرە بیَ شەرمە دەم دڕاوانە کە ئەیانەویَ هەر بە بیَ حەیایی شتت لیَ بسێنن، تۆش بە تیکە دەمیان ببەستە.

[١٨٤] بە یەکێك ئەوتری، لە رووی سووکیەوە کە زۆر لەڕ و لاواز بووبیَ.

[١٨٥] بە یەکێك ئەوتریَ، کە قسەی بۆ نەکریَ، ئنجا لەبەر نەخۆشی بیَ یا لەبەر شتێکی تر بیَ.

[١٨٦] واتە دەمی چۆتە کلیلە.

[١٨٧] واتە قسەی بە ڕەوانی بۆ ناکریَ.

[١٨٨] واتە کاتێك "لۆرك" و "پەنیر" زۆر ئەبیَ لە بەهارانا، ئێمەمانان – کە ساڵ دوانزە مانگە خزمەتی ئاژەڵ ئەکەین بۆ ئەو رۆژە – لە خواردنیا مڕ ئەبین – هەژاریش کە بە تەمەڵی دائەنیشیَ – دەم ئەگریَ بە قوتەوە.

[١٨٩] بە یەکێك ئەوتریَ، دەستی نەگاتە شتێك، کەچی وا نیشان بدا کە ئەم خۆی نایەویَ.

[١٩٠] یەکێك ئەیلیَ، کە شتێکی ناشرین ببینیَ و نەتوانیَ قسە بکا.

١٩١)- دەنگم خۆش بوایە، بۆ خۆم ئەگریام[١٩١]

١٩٢)- دەنگی خۆی بیستۆتەوە[١٩٢]

١٩٣)- دەنگی دەهۆڵ لە دوور خۆشە[١٩٣]

١٩٤)- دەنگی هەیە و رەنگی نییە[١٩٤]

١٩٥)- دەهۆڵ درا دەنگی بڕا[١٩٥]

١٩٦)- دەوار، بە گازر، سپی نابێتەوە[١٩٦]

١٩٧)- دەوەرە ئەم کەرە لەو قوڕە دەربێنە[١٩٧]

١٩٨)- دەوەرە چیت دیوە بێگێڕەرەوە[١٩٨]

١٩٩)- دەوەن ئاخری ئەبێتەدار[١٩٩]

٢٠٠)- دەوەن بە ئاشە[٢٠٠]

---

[١٩١] واتە ئەگەر شتێکم پێ بکرایە، چارەی دەردی خۆمم ئەکرد.

[١٩٢] بە یەکێك ئەوترێ کە باسی خۆی بە باشی یا بە خراپ ببیستێتەوە لەم و لەو.

[١٩٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە ناو و شۆرەتێکی گەورەی ببێ، کەچی بێکەڵك و بێنرخیش بێ.

[١٩٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەنگ و باسی ببێ و خۆی دیار نەبێ.

[١٩٥] بە چاو راوێ ئەوترێ، کە درۆکەی دەرکەوێ.

[١٩٦] بە مەردومی رەش ئەوترێ، کە هەزار جار خۆی بشوا بە لفکە و سابوون، سپی نەبێتەوە.

[١٩٧] بە یەکێکی هەرزەی نەفام ئەوترێ، کە بە هەرزەیی، خۆی تووشی چورتمێك بکات.

[١٩٨] یەکێك ئەیڵێ، کە یەکێك لە رویا قسەیەك بکات، کە ئەم هەرگیز بە دڵیا نەهاتبێ، کە ئەو ئەم قسەیەی پێ بڵێ.

[١٩٩] واتە هەموو شتێك، لە پێشەوە بچووکە، بەرە بەرە گەورە ئەبێت.

[٢٠٠] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك، باراش ئەبا بۆ ئاش، لە رێگا بە خاوەن باراشێکی تر ئەگات کە لە ئاش ئەگەڕێتەوە، وە پرسیاری ئاشەکەی لێ ئەکات، ئەویش ئەڵێ: زۆر قەڵەباڵغە، وە بە گران نۆرەت بەر ئەکەوێ، ئەمیش ئەڵێ: کێ حەدی هەیە پێش من بکەوێ، بە خوا لەوێ بوومایە ئەم ئەهێشت تۆش پێش بکەویت، کابراش ئەڵێ: دە با ئەم دەوەنە دابنێین بە ئاش، وە من ئاردەکەی خۆمی پیا ئەکەم، بزانم تۆ چۆن

٢٠١)- دەوڵەتی جوانی، ئەوە تا شوانی، دەوڵەتی پیری، ئەوەتا میری[٢٠١]

٢٠٢)- دەوڵەمەند پیرۆزت بێ، فەقیر لە کوێت بوو[٢٠٢]

٢٠٣)- دەوڵەمەند، ئەیەڵێ بە ئاش بێتەوە، هەژار نایەڵێ، لە ساج بێتەوە[٢٠٣]

٢٠٤)- دەوڵەمەند، گووی چەورە[٢٠٤]

٢٠٥)- دەوڵەمەندان، هۆهۆی جووتیانە، بێوڵەتانیش، قاسپەی کەویانە[٢٠٥]

٢٠٦)- دەوڵەمەندی، بەدڵە، نەك بە ماڵ گەورەیی بەعەقڵە، نەك بە ساڵ[٢٠٦]

٢٠٧)- ددان لە سنگی هاتیە[٢٠٧]

---

نایەڵێت؟ وە بارە ئاردەکەی ئەهێنێ کە بیکاتەوە ناو دەوەنەکە، کابراکەی تر توند دەستی ئەگرێ، وە ئەم خۆی رائەپسکێنێ، وە هێندێ لە ئاردەکەی ئەرێژێ، دووبارە کابرا دەستی ئەگرێ و ئەم خۆی رائەپسکێنێتەوە، وە هێندێکی تر لەئاردەکە ئەکاتەوە ناو دەوەنەکە تا هەموو ئاردەکەی خۆی بە با ئەدات، ئنجا ئەبێ بە شەڕیان، وە تێر و پڕ لەیەك ئەدەن، وە سەر و گوێلاکی یەکتری ئەشکێنن، ئێستا ئەمە بە دوو کەسی بێ عەقڵ ئەوترێ، کە لە سەر شتێکی هیچ و پووچ، دەم قاڵییان ببێ، وە بچن بە گژ یەکا، وە هەر دوو لایان زەرەرمەند بن.

[٢٠١] واتە ئادەمی تا گەنجە و توانای ئیشی هەیە دەوڵەمەندە با شوانیش بێ.

[٢٠٢] بە یەکێك ئەوترێ، بە تەوسەوە کە بە هەژارێك بڵێ: ئەمەت لە کوێ بوو، واتە دەوڵەمەند هەزار شتی ببێ، کەس پرسیاری لێ ناکا، بەڵکو هەر پرسیار لە هەژار ئەکرێ.

[٢٠٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە خواردنی شتێکا زۆر بە پەلە بێ.

[٢٠٤] واتە هەموو شتێکی دەوڵەمەند لای هەژار نرخێکی هەیە، تەنانەت گووەکەشی.

[٢٠٥] واتە بەختیاران بە پێویستی ژیانەوە خەریکن، بەدبەختانیش بە شتی منداڵانەوە خەریکن.

[٢٠٦] واتە دەوڵەمەند، کەسێکە، کە دڵی فراوان بێ، با نەشی بێ، وە هەژار کەسێکە، کە رووناکی لە دڵیا نەبێ، با زۆریشی ببێ، هەر وەك گەورە ئەوەیە کە ژیر بێ، با بە تەمەنیش منداڵ بێ، وە بچوك ئەوەیە، کە ژیر نەبێ با تەمەنیشی زۆر بێ.

[٢٠٧] بە یەکێکی فێڵبازی زۆرزان ئەوترێ.

٢٠٨)- ددانێ خۆی خۆش ئەوێ و نانی پێ ناخوات[٢٠٨]

٢٠٩)- درۆ بێدەسەلاتە هەموو کەس پێی ئەوێرێ[٢٠٩]

٢١٠)- درۆ بەدڵا ناچێ[٢١٠]

٢١١)- درۆ شیرینە بەرەکەی تاڵە[٢١١]

٢١٢)- درۆ گوێرەکە نییە، بە دوای ئادەمیدا بقوڕێنێ[٢١٢]

٢١٣)- درۆ فەقیرە[٢١٣]

٢١٤)- درۆ لە دوای مردن ئەکرێ[٢١٤]

٢١٥)- درۆ ماوەی کورتە[٢١٥]

٢١٦)- درۆ مەنزڵی کۆتایە[٢١٦]

٢١٧)- درۆ ناچێتە دڵەوە[٢١٧]

٢١٨)- درۆ نە فەرزە و، نە سوننەت[٢١٨]

٢١٩)- درۆ هێشتا لە دەم دەرنەچووە لۆقە ئەکات[٢١٩]

---

[٢٠٨] بە یەکێك ئەوترێ کە ماڵی خۆی بە دەما نەچێ.

[٢٠٩] مەرد نەبێ.

[٢١٠] چونکە هەر لە پێشەوە دیارە کە درۆیە.

[٢١١]

[٢١٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە حاشا لە درۆیەکی خۆی بکا.

[٢١٣] تەماشای پەندی دوای ئەم پەندە بکە.

[٢١٤] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە درۆیەکی بە دەمتەوە کردبێ، وە هیچ نەترسابێ لەوەی کە ڕۆژێ چاوی پێت کەوێتەوە، وە درۆکەی دەرکەوێ.

[٢١٥] واتە زوو دەرئەکەوێ.

[٢١٦] واتە کەم بڕ ئەکا.

[٢١٧] چونکە بە سەر و گوێلاکیا دیارە کە درۆیە.

[٢١٨] واتە بۆچی ئەم خەلقە وا شێت گیرن لە سەری.

[٢١٩] بە درۆیەك ئەوترێ کە زۆر ناقۆلا و نالەبار بێ، وە هەر لە سەرەتاوە دەرکەوێ کە درۆیە.

٢٢٠)- درۆ، کەری فەقیرە[٢٢٠]

٢٢١)- درۆزن دوژمنی خوایە[٢٢١]

٢٢٢)- درۆزن شتی لە بیر نامێنێ[٢٢٢]

٢٢٣)- درۆزن کەم هۆشە[٢٢٣]

٢٢٤)- درۆزن هەر جارێك ناشتا ئەکا[٢٢٤]

٢٢٥)- درۆزن، ئاگر لە ماڵیشی بەرببێ، کەس باوەڕی پێناکات[٢٢٥]

٢٢٦)- دراوسێ لە دراوسێ، ئەگرێ سەراسێ[٢٢٦]

٢٢٧)- درای مەزن، نابێتە گۆپاڵ[٢٢٧]

٢٢٨)- درەخت لە پێشا، ناوکەیەکە[٢٢٨]

٢٢٩)- دڕك بەو بچۆ بە چاوی دوژمنا[٢٢٩]

٢٣٠)- دڕك بکێڵیت، دڕك دێتە ڕێت[٢٣٠]

٢٣١)- دڕك ترێ ناگرێ[٢٣١]

---

[٢٢٠] واتە درۆ کەرێکی هەژارە هەموو کەسێك سواری ئەبێ، یا درۆ کەری مەردومی هەژارە، واتە یەکێك سواری ئەبێ کە هەژار بێ لە ژێری و بیرا.

[٢٢١] لەبەر ئەوە قورئان لە ٣٧٣ شوێن ناوی درۆ ئەبا، وە جڵەوگیری لێئەکات، کە یەکێك لەو ئایەتانە ئەفەرموێ (فنجعل لعنه‌الله على الكاذبين).

[٢٢٢] چونکە لە خۆیەوە شت هەڵئەبەستێ، وە هیچێ ڕووی نەداوە تا لە بیری بمێنێ.

[٢٢٣] واتە ئەمەندە درۆ ئەکات، ئاگای لە درۆکانی خۆی نامێنێ.

[٢٢٤] واتە هەر جارێك پێی باوەڕ ئەکەن.

[٢٢٥] ئەمە بچووکترین سزای درۆزنە لە جیهانا، ئنجا ئەبێ سزای ڕۆژی دوایی چی بێ.

[٢٢٦] سەراسێ: خووە، واتە فێری خووی یەکتری ئەبن.

[٢٢٧] گۆپاڵ، گۆچانی ئەستوورە. واتە دار بە گەورەیی ناچەمێتەوە.

[٢٢٨] واتە هەموو شتێ، لە سەرەتاوە بچووکە و بەرە بەرە گەورە ئەبێ.

[٢٢٩] واتە لە هیچ گۆشەیەکەوە زەبوونی نیشان مەدە بەرانبەر بە دوژمن.

[٢٣٠] واتە ئەگەر خراپە بکەیت لەگەڵ مەردوم ئەوانیش خراپەت لەگەڵ ئەکەن، هەر وەك چاکەیان لەگەڵ بکەیت چاکەت لەگەڵ ئەکەن.

[٢٣١] واتە چاوەڕوانی شتی باش لە پیاوی خراپ مەکە.

٢٣٢)- درێژ دەڕواو کورت دێتەوە[٢٣٢]

٢٣٣)- دز ئەوەندەی ستەمە، کەلەبەر، رەشکا[٢٣٣]

٢٣٤)- دز بازاڕی شێواوی ئەوێ[٢٣٤]

٢٣٥)- دز بە ڕێیەکدا ئەڕوا و خاوەن ماڵ بە هەزار رێدا[٢٣٥]

٢٣٦)- دز بدوێنە، هەر باسی پەیژەت بۆ ئەکا[٢٣٦]

٢٣٧)- دز خێرابێ، تاریکە شەو زۆرە[٢٣٧]

٢٣٨)- دز دز ئەناسێ[٢٣٨]

٢٣٩)- دز لە دزی بێ، هەر تاریکەشەو زۆرە[٢٣٩]

٢٤٠)- دز لە سەگ وەڕ ناترسێ، بەڵام ئەسڵەمێتەوە[٢٤٠]

٢٤١)- دز و پاسەوان کردەیان یەك خەن، بە کونە بانا حوشتر سەر ئەخەن[٢٤١]

٢٤٢)- دز و ماڵخۆ ئەگەر یەك بن، گا لە کولانەوە سەر ئەخەن[٢٤٢]

---

[٢٣٢] بە یەکێکی بێ بڕشت ئەوترێ کە دوای هەر کارێك بکەوێ لەم سەرەوە بە هیواوە بڕوا و لەو سەرەوە بێ هیوا بگەڕێتەوە.

[٢٣٣] دوای ئەوە ئیتر سامی ئەشکێ، واتە هەموو گوناهێك تا جارێك ئەیکەت سامی هەیە، دوای ئەوە سام ئەشکێ، ئنجا پیاوی ژیر ئەوەیە ئەو سامەی کە خوا دیاناوە لە سەر هەموو گوناهێك، نەیشکێنێ.

[٢٣٤] چونکە باشتر دزی تیا ئەکات.

[٢٣٥] واتە ماڵ دزراو، نازانێ سۆراخی ماڵەکەی لە کوێوە بکا.

[٢٣٦] چونکە بیری شەو و رۆژی هەر لای دزیی و پەیژەی دزییە.

[٢٣٧] واتە مەردوم لە ئیش کردن بێ وەخت زۆرە.

[٢٣٨] چونکە شارەزای یەکن.

[٢٣٩] تەماشای راڤەی پەندی ٨٩ بکە.

[٢٤٠] وە باشتر خۆی بۆ گورج ئەکاتەوە.

[٢٤١] بە دوو دز ئەوترێ، کە یەك بکەون، یەکێکیان لە ماڵەوە و ئەویتریان لە دەرەوە.

[٢٤٢] بە دوو دز ئەوترێ، کە یەك بکەون، یەکێکیان لە ماڵەوە و ئەویتریان لە دەرەوە.

٢٤٣)- دز یەکێك و شك هەزار[٢٤٣]

٢٤٤)- دزی خۆماڵی، دەرگا بەتاڵی[٢٤٤]

٢٤٥)- دزی گای خۆیەتی[٢٤٥]

٢٤٦)- دزی لە کۆزی خۆدایە[٢٤٦]

٢٤٧)- دزی ماڵی ناگیرێ[٢٤٧]

٢٤٨)- دزی ناشی لە کادان ئەدا[٢٤٨]

٢٤٩)- دزی ناوماڵ ناگیرێ[٢٤٩]

٢٥٠)- دشی دشێ، بەچی ئەچێ[٢٥٠]

٢٥١)- دڵۆپە، ئاسنیش کون ئەکا[٢٥١]

٢٥٢)- دڵ ئاگای لە دڵە[٢٥٢]

٢٥٣)- دڵ ئاوێنەی دڵە[٢٥٣]

٢٥٤)- دڵ بە درۆ نابێ گرۆ[٢٥٤]

---

[٢٤٣] لە دزییەکدا ئەوترێ، کە کەس نەزانێ دزەکە کێیە.

[٢٤٤] واتە دزی ناوماڵ، هەمیشە دەرگای بۆ لەسەر پشتە.

[٢٤٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە دزی لە شتێك بکا کە لە ئەنجاما بۆ خۆی بێ.

[٢٤٦] واتە دزی ماڵیە.

[٢٤٧] بە یەکێك ئەوترێ، لە دانیشتوانی ناوماڵ، کە دزی لە ماڵەکە بکا.

[٢٤٨] بە دزێك ئەوترێ، کە لە دزی نەزانێ.

[٢٤٩] بە یەکێك ئەوترێ لە دەست و پێوەند، کە هەر چەند شتێکی لێ هەڵکەوێ بیدزێ.

[٢٥٠] دش: خوشکی مێردە، یەکێك ئەیلێ، کە هیچ جۆرە قازانجێکی دەست نەکەوێ. لە خزمێکی دوورییەوە، واتە کە خزم ئەوەندە دوور بوو بە تەماعی چی بم؟

[٢٥١] چونکە بە پشووە، واتە هەر کارێك وابێ، بێ بەر نابێ.

[٢٥٢] چونکە هەرچی بە دڵا تێپەڕێت، لە روخسارا، دەرئەکەوێ، وە بە چاوی دڵ ئەخوێنرێتەوە.

[٢٥٣] چونکە هەرچی بە دڵا تێپەڕێت، لە روخسارا، دەرئەکەوێ، وە بە چاوی دڵ ئەخوێنرێتەوە.

[٢٥٤] گرۆ: هۆگر، واتە دڵ بە خۆڕایی هۆگری یەکێك نابێ.

٢٥٥)- دڵ بەرد نییە لە پەڕەی گوڵ ناسکترە[٢٥٥]

٢٥٦)- دڵ تەماشای دڵ ئەکا[٢٥٦]

٢٥٧)- دڵ پیر نابێ، چاو تێر نابێ[٢٥٧]

٢٥٨)- دڵ سفرە نییە، بۆ هەموو کەسێك بکرێتەوە[٢٥٨]

٢٥٩)- دڵ لە دڵ ئاگایە[٢٥٩]

٢٦٠)- دڵ لە دڵ ئەڕوانێ[٢٦٠]

٢٦١)- دڵ لە دڵ مەدە[٢٦١]

٢٦٢)- دڵ مێشە، لە گووش ئەنیشێ[٢٦٢]

٢٦٣)- دڵ و دڵخواز، ئەبێ بە نان و پیاز[٢٦٣]

٢٦٤)- دڵ وەك شووشە وایە، کە شکا ئەشکێ[٢٦٤]

٢٦٥)- دڵم پڕیەتی، دەمم زەردوویيەتی[٢٦٥]

٢٦٦)- دڵم وەك گونی هەلاج لێ ئەدا[٢٦٦]

---

[٢٥٥] یەکێك ئەیڵێ: کە بە قسەیەك، یا کردەوەیەك، دڵی یەشابێ.

[٢٥٦] تەماشای راڤەی (دڵ لە دڵ ئەڕوانێ) بکە.

[٢٥٧] واتە ئارەزووی مرۆڤ تا مردن هەر ئەمێنێ.

[٢٥٨] واتە هەرچی لە دڵا بێ ناوترێ.

[٢٥٩] واتە دڵ ئاگای لە دڵە.

[٢٦٠] یەکێك بە یەکێکی ئەڵێ، کە خۆشی بوێ، با خۆشی نەوێ، واتە من خۆشم ئەوێ چونکە ئەویش منی خۆش ئەوێ، یا خۆشم ناوێ چونکە ئەویش منی خۆش ناوێ.

[٢٦١] واتە دڵنیابە.

[٢٦٢] بە پیاوێکی گەورە ئەوترێ، کە حەزی لە ژنێکی پەستی هیچ و پووچ کردبێ.

[٢٦٣] واتە لە پاش ماوەیەك وەك نان و پیاز بێ نرخ ئەبێ.

[٢٦٤] واتە تا ئەتوانیت دڵی مەردوم راگرە.

[٢٦٥] یەکێك ئەیڵێ، کە قسەی زۆر لە دڵیا بێ، وە ئەتوانێ بیانڵێ.

[٢٦٦] یەکێك ئەیڵێ کە لە ترسانا دڵی هەڵپەڕێ.

٢٦٧)- دڵی دڵخواز و نان و پیاز[٢٦٧]

٢٦٨)- دڵی کەس مەیەشێنە، کە یەشانت بیٚ خەم مەبە[٢٦٨]

٢٦٩)- دڵی وەك گونی هەلاج لێئەدا[٢٦٩]

٢٧٠)- دڵێکە و شاعەباس بردوویەتی[٢٧٠]

٢٧١)- دنیا بۆ دنیایە[٢٧١]

٢٧٢)- دنیا بۆیە خۆشە بیٚ دەرگەیە[٢٧٢]

٢٧٣)- دنیا بازاڕی خوایە[٢٧٣]

٢٧٤)- دنیا بە درۆ و قیامەت بە ڕاست[٢٧٤]

٢٧٥)- دنیا بەهەشتی بلّحانە، گاهی بخۆ، راهی بڕۆ[٢٧٥]

٢٧٦)- دنیا بەهەشتی کەرانە[٢٧٦]

٢٧٧)- دنیا بنی قووڵە[٢٧٧]

٢٧٨)- دنیا بووە بە سەڵتەماوی، ئێمەش بووین بە قلیچکە گواوی[٢٧٨]

---

[٢٦٧] واتە لەگەڵ دڵخوازی خۆتا بیت و نان و پیاز بخۆیت گەلیٚ خۆشترە لەوەی کە لەگەڵ دڵخوازا نەبیت با هەزاران ناز و نیعمەتیشت لە پێش بیٚ.

[٢٦٨] واتە کە شیرت وەشاند، ئەبیٚ قەڵغانت پیٚ بیٚ.

[٢٦٩] واتە زۆر ئەترسیٚ لە شتێك.

[٢٧٠] بە یەکێك ئەوتریٚ، کەحەزی لە شتێك کردبیٚ و پەشیمان نەبێتەو لێی.

[٢٧١] واتە تۆ باش بیت، باش ئەبم، خراپ بیت، خراپ ئەبم.

[٢٧٢] واتە مەردوم بە ئارەزووی خۆی دێت و دەڕوا، بەڵام ئێستا بەداخەوە لە سەد لاوە دەرگا داخراوە.

[٢٧٣] واتە هەموو کەسێك ئەتوانیٚ لە بازاڕی دنیادا، رەزای خوا بکڕیٚ، بە کردەوەی جوان و رەوشت و خووی بەرز.

[٢٧٤] واتە ئەگەر لە دنیادا درۆ بچێتە سەر، لە قیامەتا ناچێتە سەر.

[٢٧٥] چونکە هیچ ئامانجێکیان نییە خواردن و خواردنەوە نەبیٚ.

[٢٧٦] چونکە هیچ ئامانجێکیان نییە خواردن و خواردنەوە نەبیٚ.

[٢٧٧] واتە مەردوم ئەبیٚ زۆر وریا و دووربین بیٚ.

[٢٧٨] یەکێکی بووەی لێقەوماو ئەیڵیٚ، بە یەکێکی هیچ و پووچ، کە ئەمڕۆ هەڵگەڕابێت.

٢٧٩)- دنیا تا سەر بۆ کەس نامێنێ[٢٧٩]

٢٨٠)- دنیا جووڵە جووڵێتی، موختار قوونە قوونێتی[٢٨٠]

٢٨١)- دنیا حەریف ئەیخوا، یا زەریف[٢٨١]

٢٨٢)- دنیا خەرمیزە[٢٨٢]

٢٨٣)- دنیا دارایی دەردی دڵە، شوو کردن پەڕەی گوڵە[٢٨٣]

٢٨٤)- دنیا دەوران دەورانە[٢٨٤]

٢٨٥)- دنیا دوو دەرگەیە، لەوەی دێیی، لەوەی دەرئەچیت[٢٨٥]

٢٨٦)- دنیا چەمە هەموو شتێکی تیایە[٢٨٦]

٢٨٧)- دنیا گوڵێکە، هەر دەمە لە چەشنێکە[٢٨٧]

٢٨٨)- دنیا کێ خواردی؟ زبان لووسان، لووس و پووسان، بێ نامووسان[٢٨٨]

٢٨٩)- دنیا کەرە سواری بە هەڕە[٢٨٩]

٢٩٠)- دنیا کڵاو کڵاوە[٢٩٠]

٢٩١)- دنیا کویرە و دویرە[٢٩١]

---

[٢٧٩]

[٢٨٠] واتە دنیا لە پێشکەوتنایە، پیاوی نائەهل قنگە قنگێتی کە دەرنەکرێ.

[٢٨١] یەکەم بەهۆی زمانی لووسەوە و دووهەم بە هۆی روخساری جوانەوە. چونکە نە کۆڵ ئەدا و نە هیچیشی پێ نەنگە.

[٢٨٢] واتە هەر یەکێك شتێکی کرد، ئیتر مەردوم چاوی لێئەکەن.

[٢٨٣]

[٢٨٤] واتە هەر رۆژەی لەگەڵ یەکێکە، وە بەدەم یەکێکەوە پێئەکەنێ.

[٢٨٥] واتە هەزارساڵ بژیت نە لە هاتنت تێ ئەگەیت، نە لە چوونت.

[٢٨٦] لە چاك و لە خراپ.

[٢٨٧] دەمێ سوور و دەمێ شین.

[٢٨٨] ئەم دنیا بۆگەنە، هەر پیرۆزی ئەم سێ دەستەیە بێ.

[٢٨٩] واتە زۆر وردی مەکەرەوە.

[٢٩٠] واتە هەر رۆژەی لەگەڵ یەکێکە، وە بەدەم یەکێکەوە پێئەکەنێ.

[٢٩١] واتە دنیا قووڵە و رێگای دوورە.

**٢٩٢)- دنيا له هەی هەی، كۆسته له خەمی ريش**[٢٩٢]

**٢٩٣)- دنيا هەوره، گورگ دەمی چەوره**[٢٩٣]

**٢٩٤)- دنيا وەك ماستی مەيو وايه**[٢٩٤]

**٢٩٥)- دنيا يا زۆردار ئەيخوا يا بێعار**[٢٩٥]

**٢٩٦)- دنياش دەيەوێ، قيامەتيش دەيەوێ**[٢٩٦]

**٢٩٧)- دنيای بە دەست و دەم گرتووه**[٢٩٧]

**٢٩٨)- دنيای بە هەر دوو دەست گرتووه**[٢٩٨]

**٢٩٩)- دنيای لێ بووه بە چەرمی چۆلەكە**[٢٩٩]

**٣٠٠)- دنيای لێ بووه بە كونە مشك، جێی تيا نابێتەوه**[٣٠٠]

**٣٠١)- دنيايه و گەزگەزێن، دەستم هەيه گەزت ئەكەم، دەستت بوو گەزم بكە**[٣٠١]

**٣٠٢)- دوا دواييه و ناپياويه**[٣٠٢]

---

[٢٩٢] بە يەكێك ئەوترێ بە شتێكی زۆر هيچ و پووچەوه خەريك بێ، وه بێ ئاگا بێ لە شتی گرنگ.

[٢٩٣] بەيەكێك ئەوترێ كە لە كاتێكی ئاژاوه و نائەمينيدا، هەر رۆژه لە لايەكەوه دەست بوەشێنێ.

[٢٩٤] واته ئەمين و بە ئاسايشه.

[٢٩٥] زۆردار بە زۆرداری خۆی ئەيخوا، بێعاريش بە بێعاری خۆی.

[٢٩٦] خۆزگە بەوانەی كە بۆ هەر دوو لا ئيش ئەكەن، وه لە هيچيانا درێغی ناكەن.

[٢٩٧] واته زۆر هەوڵی بۆ ئەدا.

[٢٩٨] واته زۆر هەوڵی بۆ ئەدا.

[٢٩٩] بە يەكێك ئەوترێ، كە لەبەر خەم و خەفەتێك دنيای لێ تەنگ بووبێ.

[٣٠٠]

[٣٠١] گەز گەزێن: واته گاز گرتن لە يەكتری، واته ئەمرۆ من دەستم هەيه، دەستی خۆم ئەوەشێنم، تۆش سبەينێ دەستت بوو دەستی خۆت بوەشێنه.

[٣٠٢] بە يەكێك ئەوترێ، كە تا كاری پێت بێ دڵت راگرێ، كە لەگەڵ كاريشی پێت نەما دەربەستت نەبێ.

٣٠٣)- دویَ و پیَر، ئەمرۆت بەخێر[٣٠٣]

٣٠٤)- دوان زۆرە و یەکێك کەمە[٣٠٤]

٣٠٥)- دوای رووتکردنەوە، تەشتی تەلاّبنیّ بە سەرتەوە[٣٠٥]

٣٠٦)- دوای شەڕ ئاشتیە[٣٠٦]

٣٠٧)- دوای کلاّوی بابردوو کەوتووە[٣٠٧]

٣٠٨)- دوای مردن رەحمەت چاکە[٣٠٨]

٣٠٩)- دوژمن بکەیت بە دۆست، دۆست مەکە بە دوژمن[٣٠٩]

٣١٠)- دوژمن قەت بە دۆست نابیّ[٣١٠]

---

[٣٠٣] واتە ئەمە دوو رۆژە تۆ هاتوویت، کوێرا وا هار بوویت؟!

[٣٠٤] واتە منالّ یەکێکی کەمە، چونکە کە مرد پیاو بیّوەجاخ ئەمێنێتەوە، دوانیش زۆرە، چونکە نە بەخێو ئەکریّ و نە پەروەردە.

[٣٠٥] چونکە هیچت پیّ نەماوە تا لیّی بترسیت.

[٣٠٦] واتە جەنگ و ناکۆکی، نابیّ بە درێژایی ژیان بیّ.

[٣٠٧] بە یەکێك ئەوتریّ، دوای کارێکی وا کەوتبیّ کە هەرگیز بۆی نەبیّ.

[٣٠٨] ئەمە بۆ مردویەکە کە چاکەی لە خراپەی زیاتر بیّ، یا ئەگەر خراپەی زۆری کردبیّ، لە رووی نادانییەوە بووبیّ، یا خراپەکانی هەمووی هەر لە بەنی خۆی و خوادا بووبیّ، بەلاّم ئەگەر یەکێك خراپ بووبیّ لەگەلّ نیشتمان و هاونیشتمانیا، وە مایەی دووبەرەکی و ئاژاوە و ناکۆکی و پاشکەوتنی ولاّت بووبیّ، بۆ ئەوانە دوای مردنیان نەفرین چاکە، تا هەموو خراپێك بسلّەمێتەوە لە خراپیەکەی، وە تێبگات کە دوای مردن، بەشی نەفرینە بە تێکڕایی، خوا لە قورئانا نەفرینی کردووە لە گەلی (عاد) و (پمود) و (لوگ) و (فرعون) دوای مردنیان بە هەزاران سالّ، هەر وەك ئەفەرمویّ (والزین ینقچون عهد الله من بعد میپاقه و یقگعون ما امر الله به ان یوصل و یفسدون فی الارچ اولئك لهم اللعنه و لهم سوو الدار) واتە ئەوانەی پەیمانی خوا ئەپچڕن لە دوای بەستنی، وە هەرچی خوا فەرمانی داوە بە پەیوەندی کردنی ئەوان ئەیفوتێنن، وە ئاژاوە ئەنێنەوە لە ولاّتا، ئەمانە نەفرینی خوا و سزای دۆزەخ بەشیانە.

[٣٠٩]

[٣١٠]

٣١١)- دوژمن کەریشی بگێیت هەر چاکە[٣١١]

٣١٢)- دوژمن لەماڵت نائومێد بێ[٣١٢]

٣١٣)- دوژمن نینۆکی نەبێ خۆی پێ بخورێنێ[٣١٣]

٣١٤)- دوژمن هەر دوژمنە، با خۆشی لە ئاوی زەمزەم هەڵێنێ[٣١٤]

٣١٥)- دوژمن یەك.... دۆست هەزار[٣١٥]

٣١٦)- دوژمن، بچوکیش بێ، ئیشی زل ئەکا[٣١٦]

٣١٧)- دوژمن، هێدی بکەرەوە، ئنجا تەپ بدەرە سەری[٣١٧]

٣١٨)- دوژمنایەتی زانا، لە دۆستایەتی نەزان خۆشترە[٣١٨]

٣١٩)- دوژمنی خۆی بە شەکر ئەخنکێنێ[٣١٩]

٣٢٠)- دوژمنی دانا بوو بە دۆستم، چاوەڕێم کەی بکەوێ کۆستم[٣٢٠]

٣٢١)- دوژمنی دانا لە دۆستی نادان باشترە[٣٢١]

٣٢٢)- دوژمنێك زۆرە، سەد دۆست کەمە[٣٢٢]

---

[٣١١] واتە بە هەر رەنگێ دڵ گیری بکەیت، هەر باشە.

[٣١٢] واتە لە ماڵتا بە کامی خۆی نەگات.

[٣١٣]

[٣١٤]

[٣١٥] واتە تا دۆستت زۆرتر و دوژمن کەمتر بێ باشترە.

[٣١٦] واتە دوژمندار ئەبێ هەمیشە ئاگای لە خۆی بێ.

[٣١٧] واتە لە ماڵتا بە کامی خۆی نەگات.

[٣١٨] چونکە دوژمنی زانا زیانیشت پێ بگەیەنێ وات پێ ناگەیەنێ کە بزانیت لەوەوەیە، بەڵام دۆستی نەزان روو بە روو جووتەی وات لێئەدا، حەوت پەراسووت ئەشکێنێ.

[٣١٩] بە یەکێکی ژیر و دانا ئەوترێ، کە دوژمنی خۆی بە خزمەت و پیاوەتی بکوژێ.

[٣٢٠] چونکە بە جۆرێکی وا ریشەی ژیانی ئەبڕێتەوە، کە ئەم پێنەزانێت.

[٣٢١] چونکە هەر چۆنێك بێ، دانا بێ پەردە دوژمنایەتیت لەگەڵ ناکا، بەڵام دۆستی نادان هەر ساتە نا ساتێك، لە سەر شتێکی هیچ و پووچ یەخەت ئەگرێ.

[٣٢٢] واتە تا دۆستت زۆرتر و دوژمن کەمتر بێ باشترە.

٣٢٣)- دورِ دورِ شێخ لەنگەر[٣٢٣]

٣٢٤)- دوعای کەر قوڵ ببوایە، جۆی بۆ ئەباری[٣٢٤]

٣٢٥)- دوعای کرد میز نەکا بە خۆیا، گوشی کرد بە خۆیا[٣٢٥]

٣٢٦)- دوکانی بەکرو، دوو قاڵب سابوون[٣٢٦]

٣٢٧)- دوو ئاو بە نانێك[٣٢٧]

٣٢٨)- دوو پشقلی بکردایە، گۆشتی ئەخورا[٣٢٨]

٣٢٩)- دوو پیت و لەتێکی خوێندووە[٣٢٩]

٣٣٠)- دوو جولەکە لە سەر ماڵی موسوڵمان شەڕیانە[٣٣٠]

٣٣١)- دوو دڵ مەبە، ئەگەر بووشی دڵتەنگ مەبە[٣٣١]

٣٣٢)- دوو روو، بێ ئابڕووە[٣٣٢]

٣٣٣)- دوو گا لە دۆڵێ رەنگی یەك ناگرن، بەڵام خولقی یەك ئەگرن[٣٣٣]

---

[٣٢٣] بە کەسێك ئەوترێ، کە قسەیەکی گرتبێ بە دەمەوە، وە هەر کە قسەیەکی تر بکا، خێرا بیباتەوە سەر ئەو باسە.

[٣٢٤] بە یەکێك ئەوترێ کە دوعای خراپت لێ بکا.

[٣٢٥] ئەگێڕنەوە: کە ژنێك منالێکی ئەبێ، هەموو شەو میز ئەکا بە خۆیا، ژنە ئەچێتە لای دوعا نووسێ، دوعایەکی بۆ بنوسێ و کە میز نەکا بە خۆیا، دوای دوعاکە، هەموو شەو گووش ئەکا بە خۆیا، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم پەندە وتراوە، بە یەکێك ئەوتری کە دەست بداتە کارێك تا باشتری بکا، کەچی خراپتری کا.

[٣٢٦] بە شتێکی کەم و کووڕ ئەوترێ.

[٣٢٧] یەکێك ئەیڵێ کە برسی بێن وە لە جیاتی نان، ئاو بخواتەوە.

[٣٢٨] بە مەردومی گێژ و وێژ و سادە و کەرەواڵە، ئەوترێ.

[٣٢٩] پیت: حەرفە، بە یەکێك ئەوترێ کە خوێندەوارییەکی کەمی ببێ.

[٣٣٠] بە دوو کەس، یا دوو دەستە ئەوترێ، کە لە سەر ماڵی یەکێك یا دەستەیەك کەوتبنە مشت و مڕ.

[٣٣١]

[٣٣٢] بۆیە رووی دێ، لەگەڵ هەموو کەسێکا بە روویەك بوێستێ و بە زبانێك بدوێ.

[٣٣٣] واتە ئاوەڵ، خووی ئاوەڵ ئەگرێ.

٣٣٤)- دوو فەلە كاروانێكە، دوو ژنا حەمامێكە دوو كەران گاڕانێكە[٣٣٤]

٣٣٥)- دوو فوو و سەبرێكی ئەوێ[٣٣٥]

٣٣٦)- دوو كاڵەك بە دەستێ هەڵناگیرێ[٣٣٦]

٣٣٧)- دوو كەس بچن بۆ لای قازی، هەر یەكێكیان دێتەوە بە رازی[٣٣٧]

٣٣٨)- دوو كەس لە پشتی بێژنگەوە سەیری یەكتری بكەن، ئەم چۆن ئەو ئەبینێ، ئەویش ئەم وا ئەبینێ[٣٣٨]

٣٣٩)- دوو مەمك لە باخەڵێكا بن، هەڵئەتەقێن بە یەكا[٣٣٩]

٣٤٠)- دوو نینۆكان دەخورێنم، دوو كەسان بە شەڕ دێنم[٣٤٠]

٣٤١)- دوور بڕۆ و دروست وەرەوە[٣٤١]

---

[٣٣٤] واتە چونكە یەكەمیان زۆر قسە ئەكەن، وە دووهەمیان زۆر دەنگە دەنگ ئەكەن، وە سێهەمیان زۆر تەپە تەپ ئەكەن.

[٣٣٥] ئەگێڕنەوە كە دوو كەس دائەنیشن بۆ نان خواردن، میوانەكە خێرا یاپراخێك هەڵ ئەگرێ كە ئەیخاتە دەمی، ئەبینێ زۆر گەرمە، رووشی نایە تفی بكاتەوە، ناچار سەر بەرز ئەكاتەوە بۆ بن میچی خانۆكە و ئەڵێ ئەم خانووە چەندی تێ چووە؟ ئەڵێ: دوو فوو و سەبرێكن ئنجا ئێستا بە یەكێك ئەوترێ، كە لە كارێكا زۆر پەلە بكات خۆی پەشیمان بێتەوە.

[٣٣٦] واتە دوو مەبەستی جوێی لە یەكەوە دوور، لە كاتێكا بە یەك كەس ناكرێ.

[٣٣٧] چونكە هەر یەكێكیان خاوەن مافە و حوكمی بۆ ئەدرێ.

[٣٣٨] واتە هەر كەسێك بە چاوێكی خراپ سەیری یەكێ بكا، نابێ بە تەمای ئەوە بێ كە ئەو بە چاوێكی باش تەماشای ئەم بكات.

[٣٣٩] بە دوو كەس ئەوترێن، كە لە ماڵێكا بن و بە یەكا هەڵتەقی بن، واتە ئەمە شتێكی ناچارییە، تەنانەت بۆ دوو مەمكیش كە لە یەك باخەڵا بن.

[٣٤٠] وا دەنگ بڵاوە، كە دوو كەس، دەمەقاڵێیان بوو، ئەگەر یەكێك لەولاوە هەر دوو نینۆكی پەنجە گەورەكانی دەستی لە یەك بدا، ئەوان دەمقاڵێكەیان، ئەبێ بە جەنگێكی سەخت، ئنجا ئەم پەندە یەكێك ئەیڵێ كە حەزی لە جەنگ و ئاژاوە بێ.

[٣٤١] بە یەكێك ئەوترێ، كە خەریكی كارێك بێت، واتە پەلە و دەست و بردی تیا مەكە، با خراپ نەبێت، وە بە شێنەیی بیكە، با زۆریشی پێ بچێت.

٣٤٢)- دووربینی ئەکا[٣٤٢]

٣٤٣)- دووربینی، پەشیمانی لە دوا نییە[٣٤٣]

٣٤٤)- دوورکوژە[٣٤٤]

٣٤٥)- دوورو دۆست خۆشە[٣٤٥]

٣٤٦)- دووڕووی دوو زبان سەریان بەخوێنەوەیە[٣٤٦]

٣٤٧)- دووری و دۆستی[٣٤٧]

٣٤٨)- دووگ بە پشیلە ئەسپێرێ[٣٤٨]

٣٤٩)- دووگی خۆم خۆش بێ خانووم بۆ چییە[٣٤٩]

٣٥٠)- دووگی چەور بێ بەلا نییە[٣٥٠]

٣٥١)- دووکەڵی ماڵی خۆت لە ئاگری شوێنان گەرمترە[٣٥١]

٣٥٢)- دووی لێدا[٣٥٢]

---

[٣٤٢] واتە تەماشای دوایی کار ئەکات.

[٣٤٣] چونکە هەموو شتێك لەو دووربینیەدا، بەرچاو ئەخرێ، وە بۆ هەموو شتێك شتێك دائەنرێ.

[٣٤٤] بە شتێك ئەوترێ، کە لە دوورەوە جوان بێ.

[٣٤٥] دۆستێك بە دەستێکی ئەڵێ، کە دووهەمیان بیەوێ زۆرتر تێکەڵ بن، وە هەمیشە پێکەوە بن، واتە دۆستی لەگەڵ دووری دا باشتر ئەمێنێ، وەی لەگەڵ نزیکی دا.

[٣٤٦] واتە ڕۆژێ ئەبێ، لە سەر دوو زبانییەکەی، بکوژرێ.

[٣٤٧] دۆستێك بە دەستێکی ئەڵێ، کە دووهەمیان بیەوێ زۆرتر تێکەڵ بن، وە هەمیشە پێکەوە بن، واتە دۆستی لەگەڵ دووری دا باشتر ئەمێنێ، وەی لەگەڵ نزیکی دا.

[٣٤٨] بە یەکێك ئەوترێ کە ماڵی خۆی بداتە دەست مەردومی نائەمین.

[٣٤٩] ئەمە لە زمانی مەڕەوە وتراوە، گۆیا بە مەڕیان وتووە بۆ خانوویەك دروست ناکەیت بۆ زستان، ئەویش وای وەلام داوەتەوە.

[٣٥٠] واتە هەر کەسێك داراییەکی ببێ، چاك وایە بەشی هەژارانی لێبدات، تا تەماعی تێ نەکەن.

[٣٥١] واتە بە کەمی خۆت داکەوە، چاوت لە ماڵی کەس نەبێ.

[٣٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە بمرێ، یا زەرەرێکی وا بکا کە بە تەواوی بڕوخێ.

٣٥٣)- دۆ بێ و ، دۆکەش بە خولْق و خوو بێ[٣٥٣]

٣٥٤)- دۆ بدە بە بێ دۆ، لای وایە ماستە، پەنجەی بۆ ئەبا بزانێ راستە[٣٥٤]

٣٥٥)- دۆ و دۆشاو تێکەل ئەکا[٣٥٥]

٣٥٦)- دۆ، بۆ دەروێش، قات نییە[٣٥٦]

٣٥٧)- دۆخینی قوونێ، زاخاوی ناوێ[٣٥٧]

٣٥٨)- دۆست ئەوەیە ئەم گریەنێ دوژمن ئەوەیە ئەمکەنێنێ[٣٥٨]

٣٥٩)- دۆست بە سەرم کا بە گوێزێك، گوێزەکەش پووت بێ[٣٥٩]

٣٦٠)- دۆست پەیدا کردن چەند گرانە، دوژمن پەیدا کردن چەند ئاسانە[٣٦٠]

٣٦١)- دۆست لەسەر ئەروانێ و دوژمن لە پێ[٣٦١]

٣٦٢)- دۆست و دوژمن لە تەنگانەدا دەردەکەون[٣٦٢]

٣٦٣)- دۆست و دوژمن لە یەك جیا نەئەکرانەوە[٣٦٣]

---

[٣٥٣] ئەم پەندە لە مەعنای پەندی (نانت جۆین و خولْقت گەنمین بێ) دایە.

[٣٥٤] واتە هەر شت بدە بە هەژاری نەك بەدارا.

[٣٥٥] بە یەکێك ئەوترێ کە بە سەریا هات هەرچی بە دەما بێ بیلێ.

[٣٥٦] یەکێکی بێنەوا ئەیلێ، کە لە لایەکەوە شتێکی دەست کەوتبێ، واتە خوا پەك ناخات.

[٣٥٧] واتە بەندە خوێن نەقش و گولْ لێ کردنی ناوێ، بە شتێك ئەوترێ، کە پێویست بە جوان کردنی نەبێ.

[٣٥٨] دۆستێك ئەیلێ بە دۆستێك کە ئامۆژگاری بکات، وە نەنگەکانی بە بێ پەردە پێ بلێ، بەجۆرێك کە لووتی بچووزێتەوە.

[٣٥٩] چونکە مەبەست گوێزەکە نییە، بەلْکو بە سەرکردنەوەکەیە.

[٣٦٠] واتە ئەگەر ئازایت دۆست بۆ خۆت پەیدا بکە.

[٣٦١] کەواتە تا ئەتوانیت پێ و پێلاوت جوان بێ.

[٣٦٢] کە یەکەمیان زۆر بە دەورتا دێ و یارمەتیت ئەدا، دووهەمیشیان هیچ.

[٣٦٣] واتە دنیا هێشتا تاریك بوو، وە شەبەقی نەدا بوو.

٣٦٤)- دۆست و دوژمن لێك ناكاتەوە[٣٦٤]

٣٦٥)- دۆست و دوژمنی خۆی ناناسێ[٣٦٥]

٣٦٦)- دۆستی دۆستم دۆستمە، دوژمنی دوژمنم دۆستمە[٣٦٦]

٣٦٧)- دۆستی سەر كاسەیە[٣٦٧]

٣٦٨)- دۆشاو بۆ پاشا قات نییە[٣٦٨]

٣٦٩)- دۆشاو بۆ ریشی پاشا قات نییە[٣٦٩]

٣٧٠)- دۆشاو بە گونت لە جێی بێ ئاوا[٣٧٠]

٣٧١)- دۆعای نا بە حەق، سەر بە ساحێبێتی[٣٧١]

٣٧٢)- دۆڵەی پڕ ئاشتی ماڵە[٣٧٢]

٣٧٣)- دۆم ئەڵێ: دنیا بە قڕچێ، مشتەی منی تیا نەچێ[٣٧٣]

٣٧٤)- دۆم بۆ سەر و پێیەك، ماڵی خۆی جیا ئەكاتەوە[٣٧٤]

---

[٣٦٤] واتە زۆر هەرزەیە.

[٣٦٥] واتە زۆر هەرزەیە.

[٣٦٦] ئەگەر ئەم دەستوورە راست بێ، دۆستی دوژمن و دوژمنی دۆستیشم دوژمنە.

[٣٦٧] بە یەكێك ئەڵێن: كە هەر لە كاتی تیكە گلاندنا بتناسێ.

[٣٦٨] كە ریشی پێ دەق كا،بە دەوڵەمەندێك ئەوترێ، كە شتێكی بوێ، واتە بە ئاسانی دەستی ئەكەوێ.

[٣٦٩] كە ریشی پێ دەق كا،بە دەوڵەمەندێك ئەوترێ، كە شتێكی بوێ، واتە بە ئاسانی دەستی ئەكەوێ.

[٣٧٠] بە یەكێك ئەوترێ لە ڕووی سووكیەوە، كە قسەیەكی منالأنە بكات.

[٣٧١] واتە یەكێك بە ناڕەوا دۆعا لە یەكێك بكات، دۆعاكەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەر خۆی.

[٣٧٢] دۆڵە: مەركانەیەكی گەورەیە، نانی بەردەستی تیا هەڵئەچنرێ. ئەم پەندە لە مەعنای: (كاسەی پڕ ئاشتی ماڵە) دایە.

[٣٧٣] ئەمە ئەوپەڕی خود پەرستیە.

[٣٧٤] واتە تا بۆی هەڵكەوێ، بە سەر تووە ئەلەوەڕێ، بەلأم كە سەر و پێیەكەی شك برد، ماڵی خۆی جیا ئەكاتەوە.

٣٧٥)- دۆم بێ و کەڵاش بۆ خۆی بکا[٣٧٥]

٣٧٦)- دۆم بێ و لەرزی لێ بێ[٣٧٦]

٣٧٧)- دۆم بە دانیشتن ماڵ وێرانە[٣٧٧]

٣٧٨)- دێ پڕە لە دەنگ و باس پورێ خۆی لێ کەڕ ئەکات[٣٧٨]

٣٧٩)- دێ نەگەیی، دووکەڵ بگات[٣٧٩]

٣٨٠)- دیاری شوان، یا شنگە، یا هەڵەکۆک[٣٨٠]

٣٨١)- دیاری مێروله، قاچە کوللەیەکە[٣٨١]

٣٨٢)- دیتنی ساڵێك و سەعاتەکی یەکە[٣٨٢]

٣٨٣)- دیدەنی یاران، چ ساڵێك و چ ساتێك[٣٨٣]

٣٨٤)- دێر بێ و نێر بێ[٣٨٤]

---

[٣٧٥] واتە زۆر چاکی ئەکات.

[٣٧٦] دۆم: زۆر ترسنۆکە، ئنجا وەرە لەرزی لێبێت، ئەبێ چی بەسەر بێ؟ بە یەکێك ئەوترێ، کە تووشی شتێکی وا ببێ کە زۆری لێ بترسێ.

[٣٧٧] چونکە ئەوەی پەیدای نەکا، نیەتی بیخوات، یەکێك ئەڵێ کە پێویست بێ بە ئیشکردن.

[٣٧٨] بە یەکێك ئەوترێ بەدناوییەکی بە دواوە بێ، بشزانێ و گوێی نەداتێ.

[٣٧٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە زوو بە زوو، دەنگێکی خراپی ناشرینی لێ دەربچێ.

[٣٨٠] یەکێکی هەژار ئەیڵێ کەدیارییەکی کەم نرخ ببا بۆ یەکێك.

[٣٨١] یەکێکی هەژار ئەیڵێ کەدیارییەکی کەم نرخ ببا بۆ یەکێك.

[٣٨٢] میوانێکی خۆشەویست دەیڵێ بە خانەخوێکەی لە کاتێکا کە میوانەکەی بیەوێ بگەڕێتەوە و خانەخوێکەشی نەیەڵێ.

[٣٨٣] یەکێك ئەیڵێ کە لە دوور بێتەوە ناو کەس و کاری، وە لە دوای چەند ڕۆژێك، بیەوێ بگەڕێتەوە، وە خزمەکانی نەیەڵن، وە داوای لێبکەن، کە چەند ڕۆژێکی تر بمێنێتەوە.

[٣٨٤] واتە ئەو شتەی دەست ئەکەوێ هەر باش بێ، با درەنگیش دەست کەوێ.

٣٨٥)- دیزه به کۆڵه[٣٨٥]

٣٨٦)- دیزه بێیننەوه ئەسکوێی خۆتی لێ داگره[٣٨٦]

٣٨٧)- دیزه ڕەشەی دوو کون له بنا، دەسته چەورەکەت سوو به سەر منا[٣٨٧]

٣٨٨)- دیزه کەر، مەنای گۆزه کەر ئەکات[٣٨٨]

٣٨٩)- دیزەی ڕەشه، خۆتی لێ مەده[٣٨٩]

٣٩٠)- دێگەڵەی نەدیوه چەند ماڵه[٣٩٠]

٣٩١)- دێگونه چاره هاته ڕوو، دەنکه هەنارەیان نایه پشت کەنوو[٣٩١]

---

[٣٨٥] به دایکی کچێك ئەوترێ، که کچەکەی شوی نەکردبێ، واته چۆن دیزه به بەردێکی بچووك ئەشکێ، کچیش تا شوو ئەکات به قسەیەیك ناشرین ئەشکێ، بۆیه دایکی کچ ئەڵێ بەو کەسەی داوای کچەکەی ئەکا: من ئێستا دیزه به کۆڵ و ئەو بەرد له مشته.

[٣٨٦] خانه خوێیەك ئەیڵێ، که میوانەکەی داوای دۆی لێ بکات، واته دۆمان ئەگەر ببوایه له دیزەکەدا ئەبوو، خۆ هیچی تیا نییه، کەواته دۆمان نییه.

[٣٨٧] به ژنێکی دێز ئەوترێ، که نەنگێکی خۆی بنێ به سەر یەکێکی تردا.

[٣٨٨] یەکێك ئەیڵێ، که یەکێکی تر جڵەوگیری ئەم بکا له کارێکا که کاری ئەویش وەك ئەم وابێ. وەك مامۆستایەکی مەکتەب که جڵەوگیری مامۆستایەکی قوتابخانەی ئەهلی بکات.

[٣٨٩] به یەکێك ئەوترێ، هەر کەسێك لێی بکەوێ و ئازاری بدات، خوا تۆڵەی لێ بسێنێ.

[٣٩٠] به یەکێك ئەوترێ، به تەوسەوه که خۆی هەڵ بکا، وه وا نیشان بدا، که ئاگای لێی نییه.

[٣٩١] ئەگێڕنەوه که پیاوێك ژنێکی ئەبێ ئەمرێ، وه کچێکی زۆر جوانی لێ ئەبێ، ناوی (دەنکه هەنار) ئەبێ، له پاشا کابرا ژنێکی تر دێنێ، وه کچێکی زۆر ناشرینی لێ ئەبێ، ناوی ئەنێن (دیگونەچار) ئەم باوەژنه زۆر لەگەڵ دەنکه هەنارا خراپ ئەبێ، ڕۆژێ کوره دەوڵەمەندێك، چاوی به دەنکه هەناره ئەکەوێ، زۆری پێ جوان ئەبێ، وه حەزی لێ ئەکا، وه ئەنێرێ بۆ خوازبێنی و ئەیدەنێ، بەڵام شەوی گواستنەوەی باوەژنەکەی، کچەکەی خۆی بۆ ئەکا به بووك و بۆی ئەنێرێ، وه دەنکه هەنار ئەشارێتەوه، کوڕەکه که چاوی به دێگونەچار ئەکەوێ، سەرسام ئەبێ وه دەستی بۆ نابا، له پاشا پێ ئەزانرێ، وه دێگونەچار ئەنێرنەوه بۆ دایکی وه دەنکه هەنار ئەبەن

٣٩٢)- دیڵێ حیز، گۆڵی گورگ خنکێنی لێ نابێ[٣٩٢]

٣٩٣)- دیڵە شرێ، مەکە ترە ترێ، ئەمیشت ئەبڕێ[٣٩٣]

٣٩٤)- دێو کەم بوو لە دێوەڵان، ئەوەش هاتە سەربانی کوندەڵان[٣٩٤]

٣٩٥)- دیواخانی ترانە، قاڵی و مافوور هەرزانە[٣٩٥]

---

بۆ کوڕەکە، ئنجا بەم بۆنەیەوە، ئەم پەندە وتراوە، ئێستا بە هەموو شتێکی جوان و باش ئەوترێ، کە بگۆڕێ بە شتێکی ناشرینی خراپ.

[٣٩٢] واتە خێزانی حیز، پیاوی تیا هەڵناکەوێ.

[٣٩٣] بە ژنێکی ناکەس بەچە ئەوترێ، کە لە ماڵی باوکی نان نەبووبێ بیخوا، ئێستا لە ماڵی مێردەکەی ناشکوری بکا.

[٣٩٤] یەکێك ئەیلێ کە خۆی خێزانی زۆر بێ، وە خزمێکی لێ قەوماویشی بێتە سەر.

[٣٩٥] بە دیوەخانی یەکێك ئەوترێ کە هەر میوانێك رووی تێ بکا، هەموو جۆرە مەسرەفێکی لەسەر خۆی بێ.

# پیتی ڕێ

١)- ڕازت لای یەکێك دانێ و پرست لای هەزار[1]

٢)- ڕاست بە ڕاستی، خوار بە شکستی[2]

٣)- ڕاست بە و بە لای شێرا بڕۆ[3]

٤)- ڕاست و چەپی خۆی لێك ناکاتەوە[4]

٥)- ڕاستی ڕەفتی، چەفتی کەفتی[5]

٦)- ڕاستی وەك گۆچان وایە[6]

٧)- ڕاوی ڕێوێ، بۆ کەولێتی[7]

٨)- ڕاوی گردی ڕەش ئەکا[8]

٩)- ڕای خۆی، وا لەدەست خۆی[9]

١٠)- ڕەتی بلاوە[10]

---

[1] واتە نهێنی دڵی خۆت بە کەس مەڵێ، بەڵام بۆ هەموو کارێك تا ئەتوانیت، پرس بکە و راوێژ لەگەڵ دۆستا بکە.

[2] واتە پاداشی کردەوەی مەردوم دێتەوە رێی، چاکەی بە چاکە و خراپەی بە خراپە.

[3] واتە کە راست بوویت لە هیچ مەترسە.

[4] واتە زۆر گەلحۆ و کەرەواڵەیە.

[5] واتە کە راست بوویت ئەڕۆیت و تێ ئەپەڕیت، بەڵام کە خوار بوویت ئەکەویت.

[6] واتە راستی هەرگیز نییە.

[7] بە دەوڵەمەندێك ئەوترێ، کە بیانویەکی پێ بگیرێ، واتە مەبەس پارەکەیەتی کە لێی بسەندن.

[8] واتە ئازا و لێهاتووە، بە گژ هەموو شتێکا ئەچێ.

[9] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو شتێ بە دەست خۆی بێ.

[10] واتە ئیشی زۆرە و بیری بلاوە.

١١)- ڕەپی خۆت دەر بێنە، سیسی خۆمی بهاومێ[11]

١٢)- ڕەحم بە بەچکەی مار ناکرێ[12]

١٣)- ڕەحم کردن بە زۆردار، زوڵمە لە هەژار[13]

١٤)- ڕەحمەت لە کفن دزی پێشوو[14]

١٥)- ڕەخش بێ و ڕەخشی ڕۆستەم بێ[15]

١٦)- ڕەز، بۆ ڕەزەوان، بەز بۆ بەزەوان[16]

١٧)- ڕەش ڕاهات[17]

١٨)- ڕەش هەر، ڕەشە[18]

١٩)- ڕەش و سپی لێك ناکاتەوە[19]

٢٠)- ڕەشبە وەك تاوە، ئەتخوازن بە ناوی باوە[20]

٢١)- ڕەشەبا وتی بە کایەن: قاپی بکەرەوە کات بۆ تێ بکەم، کایەن وتی: ئەوی تیا ماوە مەیبە، هیچیشم بۆ تێ مەکە[21]

---

[11] واتە تۆ کاری خۆت مەکە با من کاری خۆم بکەم.

[12] چونکە کە گەورە بوو، پێتەوە ئەدا.

[13] چونکە تا دەستی ببێ، ستەم ئەکات لە هەژار.

[14] ئەگێڕنەوە کە لە کۆنا دەستەیەك بوون شەو کفنی مردوویان دزیوە، چەند زەلامێکی مەرد بۆیان دائەنیشن تا ئەیانگرن و تۆڵەیان ئەدەن. دوای ئەوان دەستەیەکی تر لە کفن دز پەیدا ئەبن، لەگەڵ ئەوەی کە کفنەکە ئەدزن، هەر مردوویەکیش ئافرەتێکی جوانی ڕێك و پێك بووایە، دەستی نامەردیان بۆ ئەبردن، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم پەندە وتراوە.

[15] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە زۆر پەسەند بێ لات، بە ڕەنگێك کە هەر چیش سەر بەو بێ، هەر وا لە لات پەسەند بێ.

[16] واتە هەر کارێك بە پیاوی خۆی بسپێرە.

[17] واتە ون بووە.

[18] واتە خراپ هەر خراپە.

[19] واتە زۆر نادان و کەودەنە.

[20] بە کچێکی ناشرین ئەوترێ، کە شویەکی باشی کردبێ بە هۆی دەوڵەمەندی باوکییەوە.

[21] بە یەکێك ئەوترێ کە یەکێکی فێڵباز بیەوێ هەموو ماڵەکەی بخوات، تا لەم پەندە دەرس وەرگرێ و خۆی بۆ شل نەکات.

٢٢)- رەشی، رووتی، کڵاوت نییە، ئەم جەژن بەو جەژن پڵاوت نییە[٢٢]

٢٣)- رەگی خرِنوك لە ئاوە[٢٣]

٢٤)- رەفیقی دز و شەریکی قافڵە[٢٤]

٢٥)- رەقە وەك توو، رەشە وەك موو، دەوڵەتی باوکی ئەیدا بە شوو[٢٥]

٢٦)- رەمەزانە، مەرگی ژنانە[٢٦]

٢٧)- رەنج پەیژەی سەرکەوتنە[٢٧]

٢٨)- رەنج سەرەنجامی گەنجە[٢٨]

٢٩)- رەنجی بوو بە رەنجی فەرهاد[٢٩]

٣٠)- رەنگ زەردی کێشان، مایەی بێدەسەڵاتییە[٣٠]

٣١)- رەنگی جاجمەکەی لێ نیشتووە[٣١]

٣٢)- رەنگی زەردە وەك مردیان، چارەی ناکرێ بە نوشتیان[٣٢]

٣٣)- ردێنی خۆت مەخەرە دەست منالان[٣٣]

٣٤)- رژدی، ریسوایی لە دوایە[٣٤]

---

[٢٢] هەژاری لات، بەخۆی ئەڵێ.

[٢٣] بە دارابییەك ئەوترێ کە لە بن نەیەت.

[٢٤] بە یەکێك ئەڵێن، کە لە ماڵێکا بێ، وە لە پیت و فەڕی ماڵەکەدا بەشداربێ، کەچی لەگەڵ دزی دەریشەوەدا دەستی ببێ.

[٢٥] تەماشای پەندی ٤٤ بکە.

[٢٦] چونکە ئەرکی ژن لە رەمەزانانا، گەلێ لە ئەرکی پیاو زیاترە.

[٢٧] واتە هیچ شتێك بەبێ رەنج دەست ناکەوێ.

[٢٨] واتە تا رەنج نەدەیت، گەنج دەست ناخەیت.

[٢٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر رەنجێك بدا بێسوود بێ.

[٣٠] واتە نەبوونی زۆر جار رەنگ زەردی بە سەر مەردوما ئەهێنێ.

[٣١] بە نەخۆشێك ئەوترێ، کە رەنگی مردووی لێ نیشتبێ.

[٣٢] واتە خوا بۆ هەموو نەخۆشیەك دەرمانێکی داناوە، تۆش دەرمانەکەی بدۆزەرەوە.

[٣٣] واتە جڵەوی خۆت مەدەرە دەست نادانان.

[٣٤] واتە لە هیچ شوێنێکا رژدی مەکە.

٣٥)- رزق بە پێ ناگیرێ[٣٥]

٣٦)- رزق هەر ئەوە نییە بە بەرچاوەوە بێ[٣٦]

٣٧)- رکێشە بە رەگ، گلێنە بە بنەتۆو[٣٧]

٣٨)- رم بە کەوان نا هاوێژێ[٣٨]

٣٩)- رم جێ بکەرەوە، ئنجا بی دزە[٣٩]

٤٠)- روو بە ڕوو ئەکەوێت و چاو بە چاو[٤٠]

٤١)- روو بە روو دەم چەور، پاشملە دەم تەور[٤١]

٤٢)- رووزەردی کێشان، مایەی بێ دەسەلاتییە[٤٢]

٤٣)- رووناکی مانگەشەو، سەر لە ئێوارە دیارە[٤٣]

٤٤)- رووی رۆژ بە بێژنگ ناگیرێ[٤٤]

٤٥)- رووی رەش بێ داران، کە منی خستە مەنە مەنەی منالان[٤٥]

---

[٣٥] واتە رۆر جار دوای ئەکەویت و کەچی هیچ.

[٣٦] رۆژی: پێ بژێیوێکە کە خوا بتداتێ، واتە رۆژی هەر ئەوە نییە کە ئەبینرێ، بەڵکو زۆری نابینرێ، نابینیت هی وا هەیە ئیشێکی سەد فلسی بە پەنجا فلس ئەکات.

[٣٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە خویەکی خراپا چوبێتەوە سەر خزمێکی خراپی، لە باوکەوە یا لە دایکەوە.

[٣٨] واتە کاری گەورە بە پیاوی بچووك ناکرێ.

[٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێك بدزێ و بۆی حەشار نەدرێ، واتە کە ناتوانێت حەشاری بدەیت، مەیدزە.

[٤٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێکی ناشرین بکات لەگەڵ ئاشنایەکی خۆیا. واتا کاری وامەکە، سبەینێ چاوتان بە یەکتری ئەکەوێتەوە وە رووزەردیت بۆ ئەمێنێتەوە.

[٤١] واتە لە ڕووتا دۆست و لە پاشملە دوژمنە.

[٤٢] بەڵێ زۆری رووزەردی لەبەر نەبوونییە، بەلام هی واش هەیە ئەگەر هەرچی دۆلاری ئەمریکا و پاوەندی ئسترلینی هەیە هی ئەو بێ٘ن هەر رووزەردە تا مردن.

[٤٣] واتە هەموو کارێك، لە سەرەتاوە دەرئەکەوێ کە چۆنە.

[٤٤] واتە پیاوی گەورە، بە درۆ و دەلەسە ناشارێتەوە.

[٤٥] واتە ئیمساڵ دار بەڕوو بەری نەگرت، ناچارم بووم مەنە مەنە بەڕوو قەرز بکەم، یەکێك ئەیلێ، کە کەم وکوڕییەك، رووی تێکردبێ، وە ناچار بووبێ بە داواکردن لەم و لەو.

٤٦)- رووی زەمانە رەش بێ[٤٦]

٤٧)- رووی قەڵغانی تێ کردووە[٤٧]

٤٨)- رووی کردە رەشەبا[٤٨]

٤٩)- رووی نەبوونی رەش بێ[٤٩]

٥٠)- روویێ لە زۆرێ پترە[٥٠]

٥١)- رۆژ بە پەنجە ئەژمێرێ[٥١]

٥٢)- رۆژ بووە بە ساڵ، سك بووە بە جەواڵ[٥٢]

٥٣)- رۆژ دەڕوا، قەزا ناڕوا[٥٣]

٥٤)- رۆژ دیارە پەنجەی ناوێ[٥٤]

٥٥)- رۆژ لە رۆژاوا هەڵات[٥٥]

٥٦)- رۆژ هەموو رۆژێ لە جێگەیەك هەڵنایە[٥٦]

٥٧)- رۆژان رۆژیان لە شوێنە[٥٧]

٥٨)- رۆژی پاك بۆ تەمەڵ، شەوەزەنگە[٥٨]

---

[٤٦] بەکێك ئەیڵێ، کە گلەی لە بەختی خۆی بێ.

[٤٧] واتە ئامادەی جەنگە.

[٤٨] واتە مرد، بە یەکێك ئەوترێ، لە رووی سووکییەوە، کە بمرێ.

[٤٩] هەژارێك ئەیڵێ، کە ئارەزووی شتێکی بێ، بیکا و نەی بێ.

[٥٠] واتە زۆر جار ئەوی بە تکا ئەکرێ بە زۆر ناکرێ.

[٥١] واتە زۆر چاوەڕوانی شتێکە.

[٥٢] واتە رۆژگار درێژبووە، وە مەردوم هەر بەوەدا ئەگات کە نان بخوات.

[٥٣] واتە ئەوی خوا چارەنوسی کردبێ هەرگیز بە سەرتا تێناپەڕێ.

[٥٤] بە یەکێکی گەورەی ناودار ئەوترێ، کە پێویست بە پرسیار نەبێ.

[٥٥] بە کارێك ئەوترێ کە بە پێچەوانەی ئاوات و ئومێدی تۆ بێتە دی.

[٥٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئەمڕۆ ئەو دەستی ببێ و یارمەتی تۆ نەدات واتە هەموو رۆژ وانابێ کە من پێویست بم بە تۆ.

[٥٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیمڕۆ لە خۆشییەکا بێ وە ئاگای لە پاشە رۆژ نەبێ.

[٥٨] چونکە ئیشی تیا ناکات.

٥٩)- ڕۆژی نەفسییە، کەس ئاگای لە کەس نییە[٥٩]

٦٠)- ڕۆژێك بە کەڵەشێری، نەك هەزار ڕۆژ بە مریشکی[٦٠]

٦١)- ڕۆژێك بە مل بەرزی، نەك سەدساڵ بە مل حیزی[٦١]

٦٢)- ڕۆژێك کەڵەشێری لەسەد ڕۆژ مریشکی چاکترە[٦٢]

٦٣)- ڕۆستەم نێر بوو یا مێ[٦٣]

٦٤)- ڕۆڵە لەبەر دایك هەڵ ئەگرێ[٦٤]

٦٥)- ڕۆن کە زۆر بوو، قنگی پێ چەور ئەکەن[٦٥]

٦٦)- ڕۆن لە پیاو بکڕە و گەنم لە ژن[٦٦]

٦٧)- ڕۆنی خۆم، ئەدا لە سەری خۆم[٦٧]

٦٨)- ڕۆنی ڕژاو، ئەکا بە خێری باوکی[٦٨]

٦٩)- ڕێ بێ ڕۆیشتن نابڕێ[٦٩]

---

[٥٩] بە ڕۆژی تەنگانە و چەڵەمە ئەوترێ.

[٦٠] واتە پیاوی مەرد و گەلی مەرد، ئەوەیە کە بە ئازادی و سەربەرزی بژین نەك بە ژێردەستی و سەرشۆڕی.

[٦١] واتە پیاوی مەرد و گەلی مەرد، ئەوەیە کە بە ئازادی و سەربەرزی بژین نەك بە ژێردەستی و سەرشۆڕی.

[٦٢] واتە پیاوی مەرد و گەلی مەرد، ئەوەیە کە بە ئازادی و سەربەرزی بژین نەك بە ژێردەستی و سەرشۆڕی.

[٦٣] بە یەکێك ئەوترێ کە سەعاتێك قسەی بۆ بکرێ لە بابەتێکەوە، کەچی لە پڕ قسەیەك بدرکێنێ نیشان بدات کە لە قسەکانت لە هیچی نەگەیشتووە.

[٦٤] واتە دزێکی زۆر چالاکە.

[٦٥] بە شتێك ئەوترێ، کە لەبەر زۆری سووك بووبێ لەبەر چاو.

[٦٦] ڕۆن بە ڕەنجی شانی ژن پێك دێ، هەر وەك گەنم بە ڕەنجی شانی پیاو پێك دێ، کەواتە ڕۆن لەیەکێك بکڕە کە ئازاری پێوە نەدی بێ، وە گەنمیش هەروا، تا بە هەرزان لێی بکڕیت.

[٦٧] بە یەکێکی ئەڵێیت، کە لە ڕووی پیاوەتییەوە، ماڵی خۆت دەرخوارد بدات.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە ماڵێکی لە دەست چوو بکا بە خێری باوکی.

[٦٩] واتە دەرمانی ڕێ ڕۆیشتنە.

٧٠)- رێ باریکە، شەو تاریکە[٧٠]

٧١)- رێ لە دز ناگیرێ[٧١]

٧٢)- رێبوار ئەڕوا سەگ ئەوەڕێ[٧٢]

٧٣)- رێبوار بە خەوتن لە کاروان بە جێ ئەمێنێ[٧٣]

٧٤)- ریخۆڵە بە کێشە[٧٤]

٧٥)- ریخۆڵەم ئالاوە بە پێما ناتوانم بڕۆم[٧٥]

٧٦)- ریسەکەمان بووەوە بە خوری[٧٦]

٧٧)- ریش نەبێ بە تووشەوە، کە بوو بە تووشەوە، ئەبێ شانەی بۆ هەلگریت[٧٧]

٧٨)- ریشەی دابەستراوە، بە کزە با هەڵ ناکەندرێ[٧٨]

٧٩)- ریشم لەبەر هەتاو سپی نەکردووە[٧٩]

٨٠)- ریشی ئەتاشێ و ئاوێنەشی ئەداتە دەست[٨٠]

٨١)- ریشی تەمەعکار بە قنگی مفلس[٨١]

---

[٧٠] واتە دنیا ناخۆشە، وە هەمووی گیروگرفت و ترس و بیمە.

[٧١] چونکە هەر رێیەکی لێ بگریت ئەو لە رێیەکی ترەوە بۆت دێ.

[٧٢] واتە بێئەوەی تۆ گوناهت بێ پیاوی خراپ قسەت لێ ئەکەن.

[٧٣] واتە دەخیل سەد دەخیل لە کاروانی ژیان دوا نەکەوی.

[٧٤] زۆرتر بە منالێکی نەخۆش ئەوترێ کە لە پێ نەکەوتبێ، وە هەر خۆی کێش بکات.

[٧٥] یەکێکی دەوڵەمەندی قورس ئەیلێ کە نەتوانێ ئەو شوێنەی کە تیایەتی بەجێی بێلێ.

[٧٦] یەکێك ئەیلێ، کە بە کارێکەوە خەریك بێ، وە لە ناو قەدا ئیشەکەی تێك بچێ.

[٧٧] واتە هەر ئیشێك کە بوو بە تووشەوە با حەزیشی لێ نەکەیت ناچاریت ئەبێ لەگەڵیا بڕۆیت.

[٧٨] واتە دۆستایەتی کۆن، بە زویرییەکی بچووك لاناچێ.

[٧٩] یەکێکی دنیا دیدەی شارەزا ئەیلێ کە لە هەموو ئەریتێکی رۆژگار گەیشتبێ.

[٨٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەڵەیەکت پێ بکا و لە پاشیشا پێت پێبکەنێ.

[٨١] بە یەکێك ئەوترێ، کە پارەیەکی دابێ بە یەکێکی ساختەچی درۆزن بۆ قازانج، وە کابرا نابوت بووبێ و پارەکە فەوتابێ.

٨٢)- ڕێگەی درۆ نزیکە[٨٢]

٨٣)- ڕێوی ببێتە پۆست، دوژمن نابێتە دۆست[٨٣]

٨٤)- ڕێوی بە بێ مریشك هەڵناکا[٨٤]

٨٥)- ڕێوی بە فێڵ ناوێستێ، مەگەر تەڵە پێی بەستێ[٨٥]

٨٦)- ڕێوی دەمی نە ئەگەیشتە ترێ ئەیوت ترشە[٨٦]

٨٧)- ڕێوی فێڵی خۆی ئەکا، مریشك باوکەڕۆ ئەکا[٨٧]

٨٨)- ڕێوی لە کونی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەڕ ئەبێ[٨٨]

٨٩)- ڕێوی ماڵ و شێری دەرەوەیە[٨٩]

٩٠)- ڕێوی نەئەچوو بە کونەوە، هەژگێکیشی بەستبوو بە گونەوە[٩٠]

٩١)- ڕێوی هاتووە بە پیرتەوە[٩١]

٩٢)- ڕێویەکی گەڕۆك، لە شێرێکی نوستو چاکترە[٩٢]

٩٣)- ڕێی ئەکەوێتە کونی مار[٩٣]

---

[٨٢] واتە درۆ زوو دەرئەکەوێ.

[٨٣] واتە دوژمن بە دۆست بوون نەبووە و نابێ.

[٨٤] بە یەکێك ئەوترێ کە فێری خواردنی ماڵی حەرام بووبێ، وە نەتوانێ دەستی لێ هەڵگرێ.

[٨٥] بە یەکێکی فێڵبازی زۆرزان ئەوترێ.

[٨٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە دڵ شتێکی بوێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەستی نەکەوێ، بڵێ: من خۆم نامەوێ.

[٨٧] واتە هەر یەکە هەوڵی خۆیەتی.

[٨٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە قەوم و قیلەی خۆی هەڵگەڕابێتەوە.

[٨٩] واتە لە ماڵا نەرم و هێمن و لەسەرخۆ، لە دەرەوەش ئازا و نە بەردبە.

[٩٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆی بار بێ بە سەر یەکێکەوە، کەچی کلکێکیشی بە دواوە بێ.

[٩١] واتە بەخت رووی تێکردویت.

[٩٢] چونکە یەکەم شتێکی هەر لە دەست دێ، بەڵام دووەهەم هیچی لە دەست نایەت.

[٩٣] بە مەردومی زیرەکی بزێو ئەوترێ.

# پیتی زێ

١)- زاخاوی چاوی دایەوە[1]

٢)- زارا بازرگان بێ و کەیبانوو نێرگس، کۆتەڵ با ئەیبا لە هەڵمی وردەتس[2]

٣)- زارت پڕ لە خوێن بێ، لای کەس رۆی مەکە[3]

٤)- زاڵم زەواڵت بۆ بێ[4]

٥)- زامی زبان سارێژ نابێ[5]

٦)- زامی شمشێر خۆش ئەبێتەوە، زامی قسە خۆش نابێتەوە[6]

٧)- زەبوون عەزیت دان، شێوەی نا مەردییە[7]

٨)- زەخمیش ئەکا، تیماریش ئەکا[8]

٩)- زەردە زەوی، هەڵدەکەوی[9]

١٠)- زەردە لوو، بۆ گەرو[10]

---

[1] واتە تێر تەماشای ئافرەتی نامەحرەمی کرد.

[2] کوتەڵ: کاڵای هەڵواسراوی مردووە، بۆ شیوەن لەسەر کردن.

[3] واتە نهێنی خۆت بۆ کەس مەدرکێنە.

[4] چونکە مایەی دواکەوتنی گەل و وێرانی وڵاتە.

[5] واتە برینی جەستە چاك ئەبێتەوە، بەڵام برینی زمان چاکبوونەوەی نییە.

[6] واتە برینی جەستە چاك ئەبێتەوە، بەڵام برینی زمان چاکبوونەوەی نییە.

[7] کەواتە سەگ لە نامەرد گەلێ مەردترە، چونکە تا زەلام بە پێوە بێ پێی ئەوەڕێ، کە لەگەل دانیشت ئیتر بە جێی دێڵێ.

[8] بەیەکێك ئەوترێ، کە دڵیش بشکێنێ و ئاشتیشی بکاتەوە.

[9] واتە زەوی خراپ، ڕێ ئەکەوێ، کە شتی باش بێنێ.

[10] بە یەکێك ئەوترێ، کە خواردنی زۆر مەبەس بێ.

١١)- زەر بۆ سەر خەزێنە ئەچێ[11]

١٢)- زەرم داوە، بەڵام کڕیوە[12]

١٣)- زەڕینی هانووە[13]

١٤)- زەڕینی هەیە، پەڕینی نییە[14]

١٥)- زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە هەر باشە[15]

١٦)- زەمانەیی گون درێژە و زەمانەیی کێر درێژە[16]

١٧)- زەمانی سەگ و گورگ، شیوەنی شوانە[17]

١٨)- زەمینی بووە بە زەمینی سور سورە[18]

١٩)- زبان باز، قسەی لە دڵا جێگە ناگرێ[19]

٢٠)- زبان بوەستێ سەر رەحەتە[20]

---

[11] واتە پارە پارە ئەهێنێ.

[12] بە یەکێك ئەوترێ، کە تۆ پارەی تیا خەرج بکەیت و ئەزیەتی پێوە بکێشیت، کەچی ئەو لە جیاتی قازانج ئازارت پێ بگەیەنێ.

[13] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە هۆی پارە یا پایەیەکی بەرزەوە خەریك بێ یاخی ببێ.

[14] بە یەکێك ئەوترێ، کە گوفتاری ببێ و کرداری نەبێ.

[15] دیارە پێنج سەد دینار زەرە بکەیت، لە هەزار چاکترە، بەڵام ئەمە تێگەیشتن و بیری قوڵی ئەوێ، وە هەموو کەسێك بە ئاسانی لەمە ئاگات.

[16] واتە مەردوم دەمێ لە سەرەوەیە و دەمێ لە ژێرەوەیە.

[17] واتە کە سەگ و گورگ زۆر بوو، ئاژەڵ زۆر ئەخورێ، ئەو حەلە شوان ئەبێ هەر شیوەن بکات، بە یەکێکی بێدەسەڵات ئەوترێ کە هەر ساتە نە ساتێ، زۆردار شتێکی لێ داگیر بکات.

[18] واتە هیچی بۆ لەبەر ناکرێ.

[19] واتە درۆزن قسەی ناچێتە دڵەوە.

[20] واتە هەموو چورتمێك کە تووشی مەردوم ئەبێ، لە زبانییەوەیەتی کەوابوو تا ئەتوانیت ئاگاتان لێی بێ.

٢١)- زبان بەڵای سەرە[٢١]

٢٢)- زبان بیەڵێ سەر ڕەحەتە[٢٢]

٢٣)- زبان تەڕ و پاراوە[٢٣]

٢٤)- زبان لە دەما ئێشکچی سەرە[٢٤]

٢٥)- زبان نەبڕم سەرت، ئەبڕی سەرم[٢٥]

٢٦)- زبانی خۆت ئەسپی خۆتە[٢٦]

٢٧)- زبانی سوور، سەری سەوز ئەفەوتێنێ[٢٧]

٢٨)- زبانی لەتەك سەریا بازی ئەكا[٢٨]

٢٩)- زج كەری دوای برنج كوتە[٢٩]

---

[٢١] واتە هەموو چورتمێك كە تووشی مەردوم ئەبێ، لە زبانییەوەیەتی كەوابوو تا ئەتوانیت ئاگاتان لێی بێ.

[٢٢] واتە هەموو چورتمێك كە تووشی مەردوم ئەبێ، لە زبانییەوەیەتی كەوابوو تا ئەتوانیت ئاگاتان لێی بێ.

[٢٣] واتە چۆنی با بدەیت با ئەخوات، وەچی ئارەزوو بكەیت ئەیڵێت.

[٢٤] واتە ئەگەر ئاگات لە زبانت بوو، سەرت سەلامەتە، وە ئەگەر ئاگات لێ نەبوو، بە قسەیەك سەری خۆت بە فەتارەت ئەدەیت.

[٢٥] واتە یا ئەبێ تۆ بیت یا ئەبێ من بم.

[٢٦] واتە چۆنی لنگ ئەدەیت لنگی بدە.

[٢٧] واتە هەزار جار مێزەر و كەشیدە و شاڵی سەوزت بە سەرەوە بێ وە لە پەنای ئەمانەدا دڵنیابی، هەر ئەبێ ئاگات لە زبانت بێ، ئەگینا سەرت بە فەتارەت ئەدا.

[٢٨] واتە هەموو قسەیەكی مایەی سەریەتی.

[٢٩] زج، ئەو نركە تایبەتییە كە لە هەناسەدانی برنج كوتەوە پەیدا ئەبێ، لە كاتێكا كە دەسكەكە ئەماڵێ بە برنجەكە لە ناو دەنگەكەدا، واتە فلان كەس برنج كوت نییە، بەڵكو لای برنج كوتەوە دانیشتووە (زج)ەكەی بۆ ئەكا، بە یەكێك ئەوترێ، كە خۆی ئیش كەر نەبێ، بەڵكو خۆی هەڵسوێ لە ئیش كەرێكەوە، تا وا نیشان بدا كە گۆیا ئیش كەرە، وە مەردوم بە ئیش كەری بزانن.

٣٠)- زرێ له باخه‌ڵا ئه‌كا[٣٠]

٣١)- زستانان باران بێت بڕۆ، به‌هاران هه‌ور بێت مه‌ڕۆ[٣١]

٣٢)- زستان به پینه و په‌ڕۆ، به‌هار به شۆخی بڕۆ[٣٢]

٣٣)- زستان به شڕكه و به‌هار به ڕۆنكه[٣٣]

٣٤)- زستان هات، به‌رگی فه‌قیر دڕا[٣٤]

٣٥)- زك تێشوو هه‌ڵناگرێ[٣٥]

٣٦)- زگێكی تێر له هه‌زار زگی برسی چاكتره[٣٦]

٣٧)- زلله‌ی ڕۆژگاری نه‌دیوه[٣٧]

٣٨)- زله موویه‌كی له چاوی خه‌ڵقی دا ئه‌بینێ، كاریته‌یه‌ك له چاوی خۆیا نابینێ[٣٨]

٣٩)- زۆر بده له هه‌سان، منه‌تی دۆمه ژن مه‌زان[٣٩]

---

[٣٠] به یه‌كێك ئه‌وترێ كه له كارێكا زۆر كارامه‌بێ.

[٣١] چونكه زستانان هیوای خۆش كردنه‌وه نییه له‌به‌ر ئه‌وه بشبارێ هه‌ر بڕۆ، به‌ڵام له به‌هارانا چونكه هیوای خۆشكردنه‌وه هه‌یه ئه‌گه‌ر هه‌وریش بوو مه‌ڕۆ تا ئه‌بارێ و خۆش ئه‌كا.

[٣٢] واته له زستانانا مه‌به‌س هه‌ر ئه‌وه‌یه كه سه‌رمات نه‌بێ، ئیتر خوای ئه‌كرد كالآت دڕاو ئه‌بوو، یا پینه‌كراو ئه‌بوو.

[٣٣] واته له زستانانا مه‌به‌س هه‌ر ئه‌وه‌یه كه سه‌رمات نه‌بێ، ئیتر خوای ئه‌كرد كالآت دڕاو ئه‌بوو، یا پینه‌كراو ئه‌بوو.

[٣٤] به‌رگی فه‌قیر، بێبه‌رگییه، كه له هاوینانا، پێوه‌ی ده‌رناكه‌وێ.

[٣٥] واته زیاد له سكی خۆت مه‌خۆ.

[٣٦] واته زیاد له سكی خۆت مه‌خۆ.

[٣٧] به یه‌كێك ئه‌وترێ، كه ساردی و گه‌رمی ڕۆژگاری نه‌دی بێ.

[٣٨] زله موو: تاڵێ موو.

[٣٩] وا بڵاوه كه ژنه دۆم چه‌قۆ باش تیژ ئه‌كه‌ن، واته خۆت چه‌قۆ به هه‌سان تیژ كه و زۆری بساوه، وه منه‌تی كه‌س هه‌ڵ مه‌گره.

٤٠)- زۆر بێ و بۆر بێ[٤٠]

٤١)- زۆردار ئاوی سەرەوژوور ئەڕوا[٤١]

٤٢)- زۆردار ژنیشت بگێ، ئەبێ شوکرانە بژێربی[٤٢]

٤٣)- زۆردار هەمیشە ماڵ وێرانە[٤٣]

٤٤)- زۆرنا بدەیتە دەست ناشی، فوو ئەکا بە سەرە زلەکەیا[٤٤]

٤٥)- زۆرناژەن کە برسی بوو بیری کفتەی شایی ئەکا[٤٥]

٤٦)- زۆر کاری گەورە پیاوی بچوك ئەیکا[٤٦]

٤٧)- زۆر کە هات، قەواڵە بەتاڵە[٤٧]

٤٨)- زۆر کەم، ژن ئەوەستێ بیر بکاتەوە، مەگەر لەبەر ئاوێنە[٤٨]

٤٩)- زۆر وتن، هەر قورئان خۆشە[٤٩]

٥٠)- زۆرە ملێ، ملشکانی لە دوایە[٥٠]

٥١)- زۆری پێیە و کەمی دەرئەخا[٥١]

---

[٤٠] بە یەکێك ئەوترێ بە تەوسەوە، کە زۆری شتی مەبەس بێ، نەك باشی و چاکی.

[٤١] چونکە کوتەکی ئاش ئەگێڕێ.

[٤٢] ئەم پەندە لە مەعنای پەندی (دەستێك نەتوانم بیبڕم ماچی ئەکەم)دایە.

[٤٣] چونکە هەر چی ئەکا هەر بە زۆر و ستەمە.

[٤٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە شتێکا ناشی بێ.

[٤٥] چونکە لەوە باشتری نەخواردووە، بە یەکێك ئەوترێ کە لە هێندێ کاتا یادی هێندێ خواردەمەنی بکات.

[٤٦] کەواتە ئەندامی لیژنە و حیزب ئەوەندەی پێویستە بە پیاوی گەورە و دەست دار، ئەوەندەش پێویستە بە پیاوی بچوکی ئیش کەر.

[٤٧] چونکە تا قەواڵەی خۆی ئەخوێنێتەوە پێستی ئەکەنن.

[٤٨] واتە ژن بیر لە هیچ ناکاتەوە، مەگەر لە جوان کردنی خۆی لەبەر ئاوێنە.

[٤٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر قسە بکا.

[٥٠] واتە تا ئەتوانیت زۆرە ملێ مەکە لەگەڵ کەسا.

[٥١] بە یەکێکی زیرەکی وریا ئەوترێ، کە دانیشت لە کۆڕێکا چەند قسەیەکی جوان بکا، وە ڕووی حازری بکاتە خۆی.

٥٢)- زوو باژۆ، هورد باژۆ، گاسوور ماندیی نەبێ[٥٢]

٥٣)- زیندو گێی مردوو پەرستە[٥٣]

٥٤)- زیندە بەڵا، مردە باڵا[٥٤]

٥٥)- زیرە بۆ کرمان ئەبا[٥٥]

٥٦)- زێی لە زەمانە بڕیوە[٥٦]

٥٧)- زانا لە لای لاساران، دەبنە کەری بێگانان[٥٧]

٥٨)- زانی ئەزم، نەیزانی دزم[٥٨]

٥٩)- زبان، ئامان[٥٩]

٦٠)- زبان پارێزگارتە، ئەگەر پاراستت دەتپارێزێ[٦٠]

---

[٥٢] باژۆ: واتە بڕۆ، بە یەکێك ئەوترێ کە کارێك بکا، واتە وای بکە کە زەرەر نەبێ بۆ فلان شت.

[٥٣] واتە هیچی بۆ لەبەر ناکرێ.

[٥٤] بە یەکێك ئەوترێ ، کە لە ژیانیا هەر خەم و خەفەت بووبێ بۆت، لە دوای مردنیشی هەر مایەی دەردی سەریت بووبێ.

[٥٥] کرمان: لە هەموو شوێنێك زیرەی زۆرترە، بە یەکێك ئەوترێ کە شتێك بەرێ بۆ یەکێك کە ئەو شتەی زۆر بێ.

[٥٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەموو هیوایەکی لەخۆی بڕی بێ.

[٥٧] واتە زانا لە پەروەردە کردنی لاسارانا دەستەوەستانە، وە هەر هەوڵ و تەقەلایەك بدا بێ سوودە.

[٥٨] یەکێك ئەیڵێ کە سەربەستانە لە کاتێکی تایبەتیدا خۆی بکا بە ماڵێکدا، ئنجا ئەگەر خاوەن ماڵ پێی زانی ئەوا میوانە، وە ئەگەر پێی نەزانی ئەوا دزە و شتێك ئەدزێ.

[٥٩] مەردوم خۆی بە زمانی خۆی ئەڵێ کەئاگای لە خۆی بێ و سەری خاوەنی بە فەتارەت نەدا.

[٦٠] واتە هەرچی فەلاکەت هەیە هەموو لە زمانەوەیە، ئنجا ئەگەر لغاوت کرد و نەت هێشت قسە بکات ئەوا ئەویش تۆ ئەپارێزێ.

٦١)- زبان زۆردار نییه له زەوتا، دێوی خەیبەره له ئەشکەوتا[٦١]

٦٢)- زبانی شیرین، له بەهەشتەوه هاتووه[٦٢]

٦٣)- زستانان ئاگر و ئەز، بەهاران ئەز و بەز، هاوینان ئەزو رەز[٦٣]

٦٤)- زنجیری دوژمن به یەکێتی نەبێ ناپچڕێ[٦٤]

٦٥)- زونەلفەقار بۆ هەموو عەلی ناوێ نەهاتووه[٦٥]

٦٦)- زەلام بۆ کوشتن، ژن بۆ دانیشتن[٦٦]

٦٧)- زەوی تەزێنه[٦٧]

٦٨)- زێر بوونه پولەکه، مێرد بوونه جوولەکه[٦٨]

---

[٦١] واته زبان زۆردار نییه له زەوتکردنی شت لەم و لەو، بەڵکو دێوی قەڵای خەیبەره و وا له ناو ئەشکەوتێکا خۆی ماتداوه، ناو به ناو وتەیەك خوێنت ئەکاته کاسەوه.

[٦٢] واته به زبانی شیرین، مار له کون دێته دەر.

[٦٣] واته زستانان من و ئاگر، بەهاران من و خواردنی چەوری، هاوینان من و میوەهاتی.

[٦٤]

[٦٥] بەڵکو هەر شایستەی امامی عەلی یه.

[٦٦] واته بەرخی نێر بۆ سەربڕینه نەك له بۆ دۆشین و ران.

[٦٧] بریتییه له ئادەمی تەمەڵ که له شوێنێك دانیشت تاقەتی نەبێ هەستێت.

[٦٨] ئەم پەندەی ئەیەوێ چارەی دەردێکی کوشندەمان بکات، ئەویش ئەمەیه هەر کچێك هاته سەر شوو کردن، ئەوی داوای ئەکات له زێڕ و ناوماڵ و پەلپ گرتن له ماڵی مێردەکەی تا ئەیخاته سەر ساجی عەلی و هەر چیەکی ببێ هەمووی به هیچه پێ خەرج ئەکەن. مێردی بەسزمانیش – وەك جووەکەی جاران ئەبێ هەر دەستی به سنگیەوه بێ، له پاش چەند رۆژێ کابراکه تەماشا ئەکات وا هیچی به دەستەوه نەماوه، بەڵکو قەرزدار و ماڵ وێرانیش ماوەتەوه. هەر لەبەر ئەمەیه کەوا گەنجه خوێندەوارەکانمان هەموو له دەرەوه ژن ئەهێنن، وه سەر به وڵاتەکەی خۆیانا ناکانەوه.

## ٦٩)- زیندوو کوژی مردوو پەرست[٦٩]

[٦٩] زۆر مردوی وا هەیە، دوای مردنی بە پرسە و سێ رۆژانە و خەتمی تەهلیلە و گۆڕ هەڵبەستن و قەفەزی شیش لە سەر دروستکردن و بۆیە کاری رازاندنەوەی، ئەوەندە پارەی تیا خەرج ئەکرێ، ئەگەر نیوەی ئەوەی بۆ بدرایە بە دوکتۆر و دەرمان، لەوانەبوو کە نەمردایە. کەواتە ئێمە " زیندوو کوژی مردوو پەرستین".

# پێتی ژێ

١)- ژمارەی جووجەڵە و مریشك پاییز دەرئەکەوێ[١]

٢)- ژن بێ باوەڕیشە و خۆش باوەڕیشە[٢]

٣)- ژن بە بێ کەسی هار ئەبێ، پیاو بە بێ کەسی هەژار ئەبێ[٣]

٤)- ژن بدە بە ژن مردوو، گا بدە بە گا مردوو[٤]

٥)- ژن تا جووتێ پێڵاو ئەکڕێ، هەزار جووت ئەدڕێ[٥]

٦)- ژن تا نەزێ بێگانەیە[٦]

٧)- ژن کە تووڕە بوو، ئەو گۆزەیەی کە پڕە لە نهێنی ئەیشکێنێ[٧]

٨)- ژن لە ساجێ، مێرد لە حەجێ، پێکەوە گەیشتنەجێ[٨]

٩)- ژن هەسانی مێردیە[٩]

١٠)- ژن هەیە ماڵ وێران ئەکان و ژنە هەیە ماڵ ئاوا ئەکا[١٠]

---

[١] چونکە تا پاییز ئەوی ئەمرێ ئەمرێ و ئەوی ئەمێنێ ئەمێنێ.

[٢] واتە زۆر بێباوەڕ بە پیاو، بەڵام زۆر زووش ئیخفال ئەکرێ.

[٣] واتە زۆر بێباوەڕ بە پیاو، بەڵام زۆر زووش ئیخفال ئەکرێ.

[٤] چونکە هەر دووکیان نرخیان ئەزانن.

[٥] چونکە دەرنگ رێ ئەکەوێ لە سەر رەنگی و لە سەر نرخی و لە سەر گەورە و بچوکی.

[٦] واتە تا منالْ نەکەوێتە بەینەوە، دڵنیا نابن لە یەك.

[٧] چونکە کە تووڕە بوو خراپ تووڕە ئەبێ، ئەیەوێ بە تەواوی بت روخێنێ.

[٨] بە ژنێکی تەمەڵ ئەوترێ، کە درەنگ شتی لە ژێر دەست دەرچێ.

[٩] واتە مێرد بە قسەی ئیخفال ئەبێ.

[١٠] یەکەمیان دەردی بێدەرمان و دووهەمیان مەڵحەمی گیانە.

۱۱)- ژن و تفەنگ و ماین لە کن کێ بێ هی ویە[۱۱]

۱۲)- ژن و ماڵیان وتووە[۱۲]

۱۳)- ژن وەك هەنگە، یا هەنگوینت ئەداتێ، یا پێتەوە ئەدات[۱۳]

۱٤)- ژن یا بە هەمانەیێ پارە، یا بە هەمانەیێ درۆ[۱٤]

۱٥)- ژنێ مێردە کردی سەنگی: عالەم هەڵسێ نایکا لەنگی[۱٥]

۱٦)- ژنت بە دەست خەڵقەوە بێ، ماڵت بە دەست خەڵقەوە نەبێ[۱٦]

۱۷)- ژنە حیز نەبوو، بە ڕوو حیز بوو[۱۷]

۱۸)- ژنت شەریکی بێ، ماڵت شەریکی نەبێ[۱۸]

۱۹)- ژنە کە نەتوانێ تۆڵە بسێنێ، وەك ماڵ ئەگری[۱۹]

۲۰)- ژنی بەد ژانە، گەر خۆتی لێ دەیت ماڵت وێرانە[۲۰]

۲۱)- ژنی بدە ژن مردیان، داینێ لە جێی حۆریان[۲۱]

---

[۱۱] واتە بێ وەفان.

[۱۲] واتە کە ژن بوو ئەبێ ناوماڵ ببێ.

[۱۳] واتە نیشیشی هەیە و نۆشیشی هەیە.

[۱٤] واتە ژن بە پارەی زۆر شوو ئەکا، ئنجا یا هەمانەیەك پارەی بۆ هەڵڕێژە، یا هەمانەیەك درۆ.

[۱٥] واتە ژنێك کە مێرد سەنگین و گرانی کرد لە بەر چاوان، ئیتر کەس ناتاوانێ لەنگی بکا.

[۱٦] واتە خۆ ژن شەریکی نابێ، کەواتە با ماڵیشت شەریکی نەبێ، چونکە پەشیمانی لە دوا ئەبێ.

[۱۷] واتە شەل نییە، پای شکاوە.

[۱۸] واتە خۆ ژن شەریکی نابێ، کەواتە با ماڵیشت شەریکی نەبێ، چونکە پەشیمانی لە دوا ئەبێ.

[۱۹] چونکە گریان چەکی بێدەسەڵاتە.

[۲۰]

[۲۱] چونکە پیاوی پیر نرخی ژن زۆرتر ئەزانێ.

٢٢)- ژنی پیاوی کوێر ئارایشی ناوێ[22]

٢٣)- ژنی جوان دۆستی بۆ ئەبێ[23]

٢٤)- ژنی خۆی ئەگێ و منەت بە سەر هاوسێدا ئەنێ[24]

٢٥)- ژنی میران بە، وەکی میران بە[25]

٢٦)- ژنی مێردە کرد ترۆ، عالەم هەڵسێ نایکا پەڕۆ[26]

٢٧)- ژنیان کرد بە کوێخا، ساڵی حەوت جار بزی بڕییەوە[27]

٢٨)- ژنیش هەیە، ژانیش هەیە[28]

٢٩)- ژنێکم ئەوێ ژنانە، پێستە بکا بە هەمانە[29]

٣٠)- ژنێکم ئەوێ زبان دلێر، باوان خەزور بە یەکەوە نێر[30]

٣١)- ژوو ژوو، وتوویە: ئاخۆ گیان لەبەر ببێ بێچوی لە بێچوی من نەرم و شل تربێ[31]

٣٢)- ژیانی بێ ئەرك و ئازار، سودی نییە[32]

٣٣)- ژیانی بێ ژن، وەك ماڵی بێ چەقۆ وایە[33]

---

[22] چونکە جوان و ناشرین لای کوێرە وەك یەکە.

[23]

[24] بە یەکێك ئەوترێ کە پڵاو و گۆشت بۆ خۆی بخوا و دەعیە و دەمار بە سەر مەردوما لێ بدا.

[25]

[26] واتە ژنێك کە مێرد شکانی، ئیتر بە هیچ جۆرێ پینە و پەڕۆ ناکرێ.

[27] بۆ ئەوەی بی ڕێسێ، بە یەکێك ئەوترێ کە شتێك لە ئەندازە بەدەر بە کار بێنێ.

[28] واتە هێندێ ژن مایەی ژیانی پڕ لە خۆشی و هێندێکیش مایەی ژیانی پڕ لە ژانە.

[29] واتە ئیش کەر و دەست ڕەنگین بێ.

[30] واتە ژنێکی قسە زانم ئەوێ، کە ماڵی باوکی وەك باوکی خۆم نێر بێ.

[31] واتە مەردوم نەنگی منداڵی خۆی نابینێ.

[32] چونکە خوا وای کردووە، هەرچی بە ڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوان پەیدا بکرێ خۆشتر و بە نرخترە.

[33] واتە ئافرەت مایەی خۆشی و بەختیاری ژیانە.

٣٤)- ژێر بەندە زبان، ژێر دیزە ئاگر[٣٤]

٣٥)- ژیشك ئەڵێ لە بەچکەی من نەرم و شلتر نییە[٣٥]

---

[٣٤] واتە ئاگر چۆن دیزە ئەهێنێتە کوڵ، زبانیش وایە بۆ مەردوم.

[٣٥] واتە هەموو کەسێك منالی خۆی پێ جوانە.

# پیتی سین

١)- سابوون مەدە لە ژێر پێم[١]

٢)- ساتێك بژی و شێر بی، نەك سەد ساڵ و لە ژێر بی[٢]

٣)- سارده لوو، بۆ گەلوو[٣]

٤)- ساغمان بە کۆڵی کەر ئەگەڕێ[٤]

٥)- ساڵ بە ساڵ، خۆزگە بە پار[٥]

٦)- ساڵ دوانزه مانگە بزن فنگی بە دەرەوەیە کەس قسە ناکات، جارێ مەڕ فنگی دەرکەوێ، لێی ئەکرێ بە هەرا[٦]

٧)- ساڵ سییە، سیوەیل برسییە[٧]

٨)- ساڵێ ماڵ و ساڵێ مناڵ[٨]

---

[١] واتە بە قسەی لووس هەڵم مەخەڵەتێنە، بە یەکێکی ئەڵێیت کە بییەوێ هەڵت دا بۆ ئەوەی ئیشێکت پێ بکا.

[٢] واتە ساتێك بژیت بە ئازادی خۆشترە لە ژیانی سەد ساڵ بە دیلی.

[٣] بە چێشتێك ئەوترێ، کە هەر بە ساردی بخورێ.

[٤] واتە هەموو نەخۆش و کەفتە کارین.

[٥] چونکە هەموو کەسێك لە ماوەی ئەو ساڵەدا چەند دۆست و ئاشنایەکی ئەمرن، وە چەند کەسێکی تر دێنە جێگایان کە تامی ئەوان نادەن و جێیان پڕ ناکەنەوە.

[٦] یەکێك ئەیلێ کە جارێك بە هەڵە شتێك بکات و لێی بکەن بە هەرا.

[٧] واتە دەغڵ و دانی ئیمسال زۆر بە بڕشت بوو، وە یەك و سی بڕی، کەچی لە سیوەیل نان دەست ناکەوێ، وە مەردوم هەر برسییەتی.

[٨] واتە ئەو ساڵەی ژن منالّی تیا ببێ ناپەرژێتە سەر ماڵ لەبەر بەخێو کردنی منالّەکە، ئەو ساڵەی منالّی تیا نەبێ ئەتوانێ سەرپەرشتی خۆی بکات، کەواتە باوابێ.

٩)- سالانمان خایاندووه مانگانیش ئەخایەنین[٩]

١٠)- ساڵەکەی تەڕە ساڵە[١٠]

١١)- ساڵی جارێك باز بە سەر دارەوە ئەنیشێتەوە[١١]

١٢)- ساڵێکە و دوو بەهار[١٢]

١٣)- ساڵێکی تریش هەر ئەم ڕۆژەیە[١٣]

١٤)- ساوەر ئالیکی مێردییە[١٤]

١٥)- سایەی سەران، لە مێزەران[١٥]

١٦)- سەبر تاڵە و بەری شیرینە[١٦]

١٧)- سەبر لە بێ دەسەلاتییە[١٧]

١٨)- سەپانی کردم پاڵەوەدمرم، خەمی چاڵ و کەندو کەوتۆتە بەرم[١٨]

١٩)- سەد بار گۆشت لەڕ بێ، هەر لەسەر نانە[١٩]

---

[٩] یەکێك ئەیلێ، کە زۆر چاوەڕوانی کردبێ، وە چەند مانگێکی مابێ، چاوەڕوانی ئەویش بکا.

[١٠] بە ساڵێك ئەوترێ کە بەفر و بارانی زۆر بێ.

[١١] واتە هەل زۆر کەم هەڵ ئەکەوێ، وریا بە لە دەستی نەدەیت.

[١٢] یەکێك ئەیلێ کە لە ساڵێکا دوو جار بەهرەمەند بووبێ بە بەهرەی گەورە.

[١٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە بیەوێ ئیشێك بکا لە ساڵی ئایندەدا، واتە ئەی ئێستە بۆ نایکەیت، خۆ ساڵێکی تریش هەر ئەمڕۆیە.

[١٤] واتە خواردنی پیاوی بەهێزە.

[١٥] بە پیاوی گەورە و ماقوڵ ئەوترێ کە جاران سەروپێچیان ئەبەست بە سەرەوە لە مێزەر، یا لە کەشیدە، یا لە شتی تر.

[١٦] چونکە کە سەبرت کرد، بەبەری کردەوەی خۆت ئەگەیت.

[١٧] بەلام کەسێك کە دەسەلاتی بوو، ئەگەر ستەمێکی لێکرا، خۆی تۆڵەی خۆی ئەسێنێ.

[١٨] واتە ئەوانەی کە جاران پاڵیان بۆ ئەدامەوە لە کوڕوکچ و ژن و بوك، سەپانییان بۆ کردم، وە دەست کەوتێکی باشم بوو، ئێستا کەوتوومەتە خەمی چاڵ هەڵکەندن و کەندوو پەیدا کردن بۆ ئەوەی دەغڵی تێبکەم.

[١٩] خزمێکی هەژار، بە خزمێکی دەوڵەمەندی ئەڵێ کە خۆی بە زلتر بگرێ.

٢٠)- سەد بەرتیل، قەرزێك نابژێرێتەوە[٢٠]

٢١)- سەد جار پیرە، هەر كۆنە بە گیرە[٢١]

٢٢)- سەد جەردە، لاتێك رووت ناكا[٢٢]

٢٣)- سەد حەكیم، بە قەد دەردە دارێك نازانێ[٢٣]

٢٤)- سەد رەحمەت، لە كفن دزی پێشوو[٢٤]

٢٥)- سەد ساڵ بە چۆڵی، رۆژێ بە ئاوەدانی[٢٥]

٢٦)- سەد ساڵ بكەیت بێگانە پەرستی، دوایی هەر دێنیت نشوستی[٢٦]

٢٧)- سەد سەر بە توربەێی، یەك سەر بە تور بەیی[٢٧]

---

[٢٠] واتە كە قەرزدار بوویت، بەرتیل مەدە بۆ نەدانەوەی قەرزەكە، وە ئەوی ئەیدەیت بە بەرتیلا، بیدەرەوە بە قەرزەكەدا.

[٢١] واتە كە قەرزدار بوویت، بەرتیل مەدە بۆ نەدانەوەی قەرزەكە، وە ئەوی ئەیدەیت بە بەرتیلا، بیدەرەوە بە قەرزەكەدا.

[٢٢] چونكە هیچی پێ نییە.

[٢٣] چونكە ئەویان بە زەبری كتێب ئەیزانێ، بەلام ئەمیان بە خۆی، وە لە خۆیا ئەیزانێ.

[٢٤] ئەگێڕنەوە كە كابرایەك بووە، هەر مردویەك بنێژرایە، شەو گۆڕەكەی هەڵ ئەدایەوە و كفنەكەی ئەدزی، لە پاشا كابرا ئەگرن و لە بەندیخانە توندی ئەكەن، دوای ماوەیەك، كفن دزێكی تر پەیدا ئەبێ، هەر وەك كفنەكە ئەدزێ، دەست درێژیش ئەكا بۆ هێندێ لە مردۆكان، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم پەندە وتراوە.

[٢٥] واتە شوێنێك سەد سال چۆڵ بێ لە ئازیز، هەر كە رۆژێ ئاوەدان بووەوە، هەمووی لە بیر ئەچێتەوە.

[٢٦] چونكە بێگانە هەر قازانجی خۆی و پاشكەوتنی تۆی ئەوێ.

[٢٧] توربە: توورەكەیە، واتە سەری وا هەیە بە تەنها ئەخرێتە توربەیەكەوە، بۆ كێشانە كردن لەگەڵ سەد سەری ترا كە هەموویان لە یەك توربەدان واتە تاقە مرۆڤی وا هەیە، سەد مرۆڤ ئەهێنێ.

٢٨)- سەد گۆزە دروست ئەکا و دەستە، لە یەکێکیان نانێ[٢٨]

٢٩)- سەد گوناح و یەك تەوبە[٢٩]

٣٠)- سەد فیکم بە فیکێکی[٣٠]

٣١)- سەد قەزوان بخۆیت، بە گوێزێ پێت ئەگەم[٣١]

٣٢)- سەد قەل و بەردێك[٣٢]

٣٣)- سەد کراس بدڕە بە پاکی کراسێ مەدڕە بە پیسی[٣٣]

٣٤)- سەد و سی مەساڵە، بە بێ پەڕە مریشکێك ئیشیان بەتاڵە[٣٤]

٣٥)- سەدبار گاڵ بین، زادی خواین[٣٥]

٣٦)- سەدساڵ بی پەسنی، هەر ئەچێتەوە سەر نانە وەچنی[٣٦]

---

[٢٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەست بداتە زۆر کار، وە هیچیان تەواو نەکا، وە بە نیوە و نیوەچڵ بە جێیان بێڵێ.

[٢٩] واتە خوا بەخشندەی مێهرەبانە، بۆ بیانوو ئەگەڕێ کە لە بەندەی خۆی خۆش بێ، وە بە یەك تۆبە و پەشیمانی، لە سەد گوناح خۆش ئەبێ.

[٣٠] واتە زۆر فێڵباز و زۆرزانە.

[٣١] یەکێکی دەست دار، بە یەکێکی بێ دەستی ئەڵێ، کە لە پێش دەست دارەکەدا دەستی دابێتە کارێك، واتە تۆ ساڵێك لە پێش منا ئیش بکەیت، من بە حەفتەیەك ئەتگەمێ و بەجێشت دێلم.

[٣٢] بە لەشکرێکی زۆری بێهێز ئەوترێ، کە بەرگەی هیچ نەگرێ، هەر وەك بە قسەیەکی رەقی قورس و گران ئەوترێ، کە بەرانبەر بە چەند قسە و توانجێکی هیچ و پووچ بوترێ، وەك بە تاقە بەردێك سەد قەل هەڵفڕێنیت.

[٣٣] تەماشای پەندی ( کراسێ بە پیسی، هەزار بە پاکی) بکە.

[٣٤] مەساڵە: پارچەکانی جۆلاییە کە هەموویان سەد و سێن، کە یەکێکیان مەکۆیە کە ئەگەر پەڕە مریشکێکی پیانەکرێ کاری جۆلایەکە ناکرێ. بە کارێك ئەوترێ کە هەموو کەرەسەیەکی تەواو و ئامادە بێ تاقە یەك شتی بچکۆلانەی نەبێ، کە بە بێ ئەوە نەکرێ.

[٣٥] خزمێکی هەژار، بە خزمێکی دەوڵەمەندی ئەڵێ کە خۆی بە زلتر بگرێ.

[٣٦] بی پەسنی: واتە پەسەندی بکەیت. ئەگێڕنەوە کە کوڕە گەورەیەك لە راوا چاوی بە کچە شوانێك ئەکەوێ حەزی لێ ئەکات کە ئەگەڕێتەوە بەدایکی ئەڵێ، ئەویش هەر

٣٧)- سەر ئەدا و سیر نادا[٣٧]

٣٨)- سەر بۆ سەربڕین، نەك بۆ سەر زەنشت[٣٨]

٣٩)- سەر بدە، سڕ مەدە[٣٩]

٤٠)- سەر درو بن دڕی جاوێکن[٤٠]

٤١)- سەر سووك و عەلاوە کەم[٤١]

---

چەند بە سەریا دێ، پەشیمان نابێتەوە، لە پاشا ناچار کچەکەی بۆ دێنن، وە سەروبەری لە ئاڵتون ئەگرن، کچەکە، کە ئەگوێزێتەوە، ئێواریٚ سینی بۆ ئەبەن، دوو نانی لیٚ هەڵ ئەگریٚ و ئەویکەی تری ئەگەڕێنێتەوە دواوە، سبەینیٚ هەروا نیوەڕۆ هەروا دایکی کوڕەکە، لە دەست و پێوەند و کارەکەر و پێش خزمەت ئەپرسیٚ، کە بۆچی ئەم سینییە هەروا ئەگەڕێتەوە دواوە، ئەوانیش پێی ئەڵێن کە هەموو جارێك دوو نانی وشکی لیٚ هەڵ ئەگریٚ و هیچی تر، ئەمجارە دایکی کوڕەکە خۆی لیٚ مات ئەدات، کە سینی بۆ ئەبەن وەك جاران دوو نانی لیٚ هەڵ ئەگریٚ و ئەویکەی تری ئەنێرێتە دواوە، لە پاشا نانەکان پارچە پارچە ئەکات، وە هەر پارچەیەکی ئەخاتە سوچ و قوژبنێکەوە، لە پاشا ئنجا بە سەریانەوە ئەگەڕیٚ، وە لەبەر دەمی هەر پارچە نانێکا، وەك کاتی شوانێکەی کە نانەوە چنی کردووە ئەوێستیٚ، وە ئەڵیٚ :( ماڵ ئاوا نانی شوان)، لە پاشا کە هەموو کۆ ئەکاتەوە، ئنجا دەست ئەکا بە خواردنی، دایکی کوڕەکە کە ئەمە ئەبینیٚ، ئەڵیٚ (سەد ساڵ بی پەسنی هەر ئەچێتەوە سەر نانەوە چنی) ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە یەکێکی ناوەجاخ ئەوتریٚ، کە سەدساڵ بی ئاخنیت لە کالاٚ و ناومالّی جوان، وە سەروبەری لە ئاڵتون بگریت، ڕۆژێك ئەبیٚ لە شتێکا بچێتەوە سەر نارەسەنی خۆی.

[٣٧] واتە سەری خۆی ئەکا بە قوربانی نهێنی برادەرێك، بەراستی ئەمە بەرزترین ڕەوشتی ئادەمییە.

[٣٨] واتە مەردوم بمریٚ، چاکترە لەوەی کە نەنگێك رووی تیٚ بکا.

[٣٩] چونکە زۆر سڕی وا هەیە ئەگەر بدرکیٚ زۆر سەری تیا ئەچیٚ، کە وابوو تاقە سەرێك بڕوا چاکترە لە چەند سەرێك.

[٤٠] واتە هەر دوو رووی یەکن، بە یەکێك ئەوتریٚ کە دەر و ناوی وەك یەك وابیٚ.

[٤١] واتە دەست کەوتم کەم بیٚ و سەرم سووك بیٚ، باشترە لەوەی دەستکەوت زۆربیٚ بە خەم و خەفەت و دەردی سەرییەوە.

٤٢)- سەر کزی دڵ وریایە[٤٢]

٤٣)- سەر کڵافەی ون کردووە[٤٣]

٤٤)- سەر لە بن بەردابێ، لە بن منەتا نەبێ[٤٤]

٤٥)- سەر هاتووە بۆ پێ[٤٥]

٤٦)- سەر هەڵبڕە، خوا بناسە[٤٦]

٤٧)- سەر هەڵێنە، خوا ببینە[٤٧]

٤٨)- سەر و قنگی کەڵا شکێن[٤٨]

٤٩)- سەر و ماڵم لە تۆ درێغی نییە، بزن لە چوار دەشایی کەمتر نییە[٤٩]

٥٠)- سەر، وتی، بە زبانێ، هەتا تۆم جیرانێ چ رەحەتیم نین لە گیانێ[٥٠]

٥١)- سەرێ بە دەستی خۆت نەیخورێنی، خوروی ناشکێ[٥١]

٥٢)- سەرێ تێنێ کاوجۆ، هەتا دەمری هەر بیخۆ[٥٢]

---

[٤٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە دیمەن گێلۆکە و لە دڵا وریا و تێگەیشتوو بێ.

[٤٣] واتە سەری لێ تێك چووە.

[٤٤] واتە مردن باشترە لەمنەتی نامەرد.

[٤٥] باوە لە ناو کوردەواری دا، هەر منالێك کە درەنگ پێ بگرێ ئەیخەنە ناو سەبەتەیەکەوە، وە ئەیگێڕن بە ماڵە دراوسێ دا، وە ئەڵێن : (سەر هاتووە بۆ پێ) ئەوانیش ئەڵێن : (خوا پێی بداتێ)، وە مەبەس لەم کردەوەیە هەر ئەم نزایەیە کە بۆی بکەن.

[٤٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ زۆر و ستەمێکت لێ بکات.

[٤٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ زۆر و ستەمێکت لێ بکات.

[٤٨] بە دوو کەس ئەوترێ، لە ڕووی سووکییەوە، کە لە هەموو شتێکا لە یەك بچن.

[٤٩] واتە دۆستایەتی جیایە و سەودا و موعامەلەش جیایە.

[٥٠] واتە بەشی زۆری ناخۆشی، کە دووچاری مەردوم ئەبێ، لە زبانیەوەیەتی.

[٥١] چونکە کەس وەك خۆت، شارەزای دەردی تۆ نییە، واتە هەموو کەس ئەبێ خۆی دەرمانی دەردی خۆی بکات.

[٥٢] واتە تا ئەتوانیت هەل لە دەست مەدە، چونکە زۆر جاری وا هەڵ ئەکەوێ، بەشی هەموو ژیانت دەست ئەکەوێ.

٥٣)- سەرێ لە سکی دایك دەرهات، ناچێتەوە جێی خۆی[٥٣]

٥٤)- سەربەسەر، بێ دەردیسەر[٥٤]

٥٥)- سەرت فیداکە، سڕت ئاشکرا مەکە[٥٥]

٥٦)- سەرت نایەشێ، بۆچ پەڕۆی تێوە ئەپێچیت[٥٦]

٥٧)- سەرت هەڵبڕە، شیرت دەربڕە[٥٧]

٥٨)- سەرەنجامی گا، هەر دۆڵە[٥٨]

٥٩)- سەرەواو، لە سکیا نییە[٥٩]

٦٠)- سەرخۆش پاڵیشی پێوە نەنێیت هەر ئەکەوێ[٦٠]

٦١)- سەردرەکە، ماڵ بسپارە[٦١]

٦٢)- سەرچۆپی بدەیت بە گامێش، لای کادان نادا بە کەس[٦٢]

٦٣)- سەرچۆپی بدەیتە دەست سەگ، بۆ لای سەبەتەی نانی رائەکێشێ[٦٣]

٦٤)- سەرچاوەی دڵی، تاریکە[٦٤]

---

[٥٣] تەماشای پەندی (شیر کە دۆشرا، ناچێتەوە گوان) بکە.

[٥٤] بە پیاو و ژنێك ئەوترێ، کە هاوتای یەك بن بە بێ زیاد و کەم.

[٥٥] چونکە زۆر سڕی وا هەیە ئەگەر بدرکێ زۆر سەری تیا ئەچێ، کە وابوو تاقە سەرێك بڕوا چاکترە لە چەند سەرێك.

[٥٦] واتە هەر چیت پێویست نەبوو بە کاری مەهێنە.

[٥٧] بە یەکێك ئەوترێ کە ستەمێکی لێ کرابێ، واتە بەرگری لە مافی خۆت پێویستیەکی پیرۆزە.

[٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەر باو (عادەت)ێکی خراپی خۆی، کە فێری بووە هەر درێژە بسێنێ، وە هەموو رۆژێ بۆی بچێ و دوای بکەوێ.

[٥٩] واتە هیچ خوێندەواری نییە.

[٦٠] تەماشای پەندی (لە سەر خۆش گەڕێ، بۆ خۆی ئەکەوێ) بکە.

[٦١] واتە خۆت دەرکە با ماڵەکەت بڕوا، چونکە ماڵ ئەبێتەوە.

[٦٢] بە گەورەیەکی تەماعکار ئەوترێ، کە هەر چاوی لە قازانجی خۆیەوە بێ.

[٦٣] بە گەورەیەکی تەماعکار ئەوترێ، کە هەر چاوی لە قازانجی خۆیەوە بێ.

[٦٤] واتە نە هیوای هەیە و نە هیچ شك ئەبا.

٦٥)- سەرچاوەی دڵی، رووناکە[٦٥]

٦٦)- سەرگەرمی بە بێگارییەوە، لە بێ کاری باشترە[٦٦]

٦٧)- سەرم نایەشێ، پرێسکەی لێ ببەستم[٦٧]

٦٨)- سەرما بە قەد حاڵە[٦٨]

٦٩)- سەرمای زستان، لە هەوەڵەوە دیارە[٦٩]

٧٠)- سەرنانە سەر شێت، پیاو باقی دار ئەکات[٧٠]

٧١)- سەری ئەبڕێ و ریشی بە شانە ئەکا[٧١]

٧٢)- سەری ئەتاشێ و ئاوێنەشی ئەداتە دەست[٧٢]

٧٣)- سەری بێ دەلاك ئەتاشێ[٧٣]

٧٤)- سەری بێ دەلاك مەتاشە[٧٤]

٧٥)- سەری بێ رۆژی لە ژێر خاکایە[٧٥]

٧٦)- سەری بێ سەودا ناوەستێ[٧٦]

٧٧)- سەری بێ کڵاو نییە لە دنیادا[٧٧]

---

[٦٥] واتە گورچوی پڕە.

[٦٦] واتە ئیش بکەیت بۆ مەردوم با بە بێگاریش بێ، چاکترە لە بێ ئیشی.

[٦٧] بەیەکێك ئەوترێ، کە خۆی گرێی گرێی لە ژیانا نەبێ، وە خۆی بۆ خۆی گرێ پەیدا بکا.

[٦٨] هەژارێکی رەش و رووت ئەیلێ بە دەوڵەمەندێکی پۆشتە، لە زستانا.

[٦٩] بە کارێك ئەوترێ، کە هەر لە سەرەتاوە باش نەیەت.

[٧٠] باقی دار: قەرزدارە.

[٧١] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە پەنهایی خراپە بکات لەگەڵ یەکێکا، کەچی بە دیمەنیش، رێزی بگرێ و قسەی خۆشی لەگەڵ بکا.

[٧٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە کەتنێکی کردبێ بە یەکێك و جاریشی لێ بدا.

[٧٣] واتە بێ پرس و ڕا ئیش ئەکا.

[٧٤] واتە بێ پرس و ڕا ئیش ئەکا.

[٧٥] واتە مردوم تا بە سەر زیندو بێ، خوا رۆژی خۆی بۆ ئەنێرێ.

[٧٦] بە یەکێك ئەوترێ کە بە بێئیش و کارو هەوڵ و تەقەلا دانەنیشێ.

[٧٧] واتە هەر سەرێك هاتە دنیاوە، خوا رۆژی خۆی بۆ ئەنێرێ.

٧٨)- سەری بە سوجدەوە رۆیوە[٧٨]

٧٩)- سەری بووە بە ئاش، قنگی بووە بە ماش[٧٩]

٨٠)- سەری خۆم بەستە پریاسکە[٨٠]

٨١)- سەری خۆی دا لە بەرد[٨١]

٨٢)- سەری دا لە بەرد[٨٢]

٨٣)- سەری دار و بنی دار[٨٣]

٨٤)- سەری دنیا بە پوش نەگیراوە[٨٤]

٨٥)- سەری دنیای لیّ هاتۆتەوە یەك[٨٥]

٨٦)- سەری دووو بەرانان لە مەنجەلێکا ناکولێ[٨٦]

٨٧)- سەری رەش چوو، سەری سپی لەجیّ[٨٧]

٨٨)- سەری زل دەولّەتە، پێی زل مەینەتە[٨٨]

---

[٧٨] بە تەوسەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە بە درۆ خۆی بە پیاوێکی لە خوا ترس نیشان بدا.

[٧٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە سەری لێ تێك چووبێ.

[٨٠] یەکێك ئەیڵێ کە خۆی تووشی کارێکی لابەلا کردبێ.

[٨١] واتە ناماقوڵی کرد.

[٨٢] بە یەکێك ئەوترێ لە رووی سووکییەوە کە قسەیەکی ناشیرینی دەربارە کردبێت، واتە بۆ خۆی وت.

[٨٣] کاتێك ئەوترێ کە چەند کەسێك دەمقالێیان بێ لە سەر سەرەتای بەهار یا پاییز. بەم رەنگە ئەوەیان بڵێ ئەوەندەیە و ئەمیان بڵێ ئەمەندەیە، واتە ئەم حساباتە تەواو نین، بەڵکو کە دار چرۆی کرد بەهار و کە گەڵاش هەڵ وەری پاییزە.

[٨٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە کارێکی نابەجێ بکات بە ئاشکرا، واتە لە سەر هەموو شتێك پرسینەوە هەیە.

[٨٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کارێکا سەری لێ تێك چووبێ، وە رێ نەدۆزێتەوە.

[٨٦] واتە دوو پیاوی گەورە، لە یەك شوێنا هەڵناکەن.

[٨٧] کاتێك ئەبێژرێ، کە پیاوێکی خراپ رۆیبێ و یەکێکی خراپ چووبێتە جێی.

[٨٨] واتە دوو پیاوی گەورە، لە یەك شوێنا هەڵناکەن.

٨٩)- سەری شکاندووە و ریشی بە شانە ئەکا[٨٩]

٩٠)- سەری شکاو و قنچی دڕاوی بۆ ماوەتەوە[٩٠]

٩١)- سەری گرتۆتە خەنە، ئەچێ بۆ راوەگەنە[٩١]

٩٢)- سەری گوریسەکە کورت بووە نەگەیشت بە تۆ[٩٢]

٩٣)- سەری کەر بگرە، نۆرەی سەیف الله یە[٩٣]

٩٤)- سەری کەچەڵان، ئەکەوێتە باخەڵان[٩٤]

٩٥)- سەری کرتوە کۆمە، لە خۆی گرتوە لۆمە[٩٥]

٩٦)- سەری کوێرەماری لادەست ئەکەوێ[٩٦]

٩٧)- سەری لە گوێ قەبر ئەلەرزێ[٩٧]

٩٨)- سەری لێ ئەخورێ[٩٨]

٩٩)- سەری نایەشێ، پەڕۆی تێ ئەبەستێ[٩٩]

١٠٠)- سەری نایەوە[١٠٠]

---

[٨٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە دوای دەست وەشاندن لە یەکێك، ئنجا دڵنەوایی بکات.

[٩٠] بە یەکێك ئەوترێ کە لە کارێکا تێ شکابێ، وە بە هەموو رەنگ زەرەری کردبێ.

[٩١] بە ژنێکی داوێن پیس ئەوترێ، کە بە شوێن داوێن پیسی دا بسوڕێتەوە.

[٩٢] یەکێك ئەیڵێ، کە قسەیەکی نهێنی بکات لەگەڵ یەکێکا بە چرپە، وە یەکێکی تر کەو لەو شوێنەیە بپرسێ لەو چرپەیە.

[٩٣] واتە تا یەکێك بێدەنگ ئەکەیت، یەکێکی تر هەڵ ئەداتێ.

[٩٤] بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ کە ئافرەتێکی جوانی رێك و پێك بووبێ بە هاوسەری ژیانی.

[٩٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەر کردەوەیەك لۆمە بکرێ، وە ئەم گوێی نەداتێ، وە لەسەر کردەوەکەی خۆی هەر بڕوا.

[٩٦] واتە هەرچی لای مەردوم دەست نەکەوێ، لای ئەو دەست ئەکەوێ.

[٩٧] واتە زۆر پیرە، وە کاتی مردنی هاتووە.

[٩٨] واتە ئارەزووی لەو شتەیە کە قسەی لێ ئەکەن.

[٩٩] بە یەکێك ئەوترێ کەخۆی تووشی بێگارێك بکات.

[١٠٠] واتە بە داخەوە مرد.

١٠١)- سەرێك لە ناو سەرانا نەبێ بەرشەقان کەوێ[101]

١٠٢)- سەرێك لە ناو سەرانا نەبێ، بۆ بڕی باشە[102]

١٠٣)- سەرێکی هەیە و هەزار سەودا[103]

١٠٤)- سەرێی گا ئەکرێ بە قنگی کەرەوە[104]

١٠٥)- سەگ ئەوەڕێ و کاروان ڕێ ئەکا[105]

١٠٦)- سەگ بە زەبری کلکی ئێسقان ئەشکێنێ[106]

١٠٧)- سەگ بە شۆرین گڵاوی دەرناچێ[107]

١٠٨)- سەگ بە لۆقە و خاوەن ماڵ بە ڕەوت[108]

١٠٩)- سەگ بە مانگە شەو ئەوەڕێ[109]

١١٠)- سەگ بە مەرەس، جوان شکار ناکا[110]

١١١)- سەگ بە وەڕین ماندوو نابێ[111]

---

[101] واتە ئەو کەسەی دوورەپەرێز بێ لە خزمەتی کۆمەڵە و گەل بۆ نەمان چاکە.

[102] واتە ئەو کەسەی دوورەپەرێز بێ لە خزمەتی کۆمەڵە و گەل بۆ نەمان چاکە.

[103] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر دەمەی خەریکی کارێك بێ.

[104] واتە تێکەڵ و پێکەڵە، وە کەس لە کەس ناپرسێتەوە.

[105] بە یەکێك ئەوترێ، کە ناوی پیاوێکی گەورە ببا بە سووکی، واتە وەڕینی سەگ چەند کار ئەکاتە سەر سوڕانەوەی مانگ بە ئاسمانەوە، قسەی ئەم ئەویش ئەوەندە کار ئەکاتە سەر ئەو جۆرە پیاوانە.

[106] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە پشتیوانی یەکێکەوە خراپەیەك بکا.

[107] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر پیس و گوناهبار بێ.

[108] بە یەکێك ئەوترێ، کە دوای کارێك بکەوێ بە پەلە و دەست و برد.

[109] بە یەکێك ئەوترێ کە بە خراپە ناوی پیاوێکی پاکی گەورە ببا.

[110] مەرەس: ڕستی ملی تانجییە کە لە کاتی ڕاوا ئەکرێتە ملی، واتە هەرچی مەرەسی لە ملا بێ، مەعنای وا نییە کە زۆر چاك ڕاو ئەکا. بە یەکێك ئەوترێ کە بە دیمەن زۆر ڕێك و پێك بێ.

[111] بە یەکێك ئەوترێ کە کەوتە دەمدرێژی نەیبڕێتەوە.

١١٢)- سەگ بتڕێ ئەڵێ: بدە بەشم[١١٢]

١١٣)- سەگ بتڕێ، کۆشی بۆ ئەگرێتەوە[١١٣]

١١٤)- سەگ خاوەنی خۆی ناناسێ[١١٤]

١١٥)- سەگ دەستی ئەشکێ، کلکی هەڵ ئەبەستن[١١٥]

١١٦)- سەگ دڵی خۆشە بەداری گوڵەوە بەستراوە[١١٦]

١١٧)- سەگ گوێی ببڕی وریا ئەبێ، کلکی ببڕی خێرا ئەبێ[١١٧]

١١٨)- سەگ کە نەوەڕی، بۆ کوشتن باشە[١١٨]

١١٩)- سەگ کلك و گوێی نەکەیت باش پاس ناکا[١١٩]

١٢٠)- سەگ لە سەگ بەردە، خۆت تەماشا کە[١٢٠]

١٢١)- سەگ لە سەگ رەهاکە خۆت نیگاکە[١٢١]

١٢٢)- سەگ لە قەسابخانە نەمرێ، عومری بە بادە[١٢٢]

١٢٣)- سەگ لە کولێرە ڕاناکا[١٢٣]

---

[١١٢] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر لات و کەم دەست بێ.

[١١٣] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر لات و کەم دەست بێ.

[١١٤] بە شوێنێکی زۆر چڕ و پڕ و قەڵەباڵغ ئەوترێ.

[١١٥] بە کارێك ئەوترێ، کە هیچی بە سەر هیچەوە نەبێ.

[١١٦] بە پیاوێکی خراپ ئەوترێ، کە کەوتبێتە لای پیاوێکی گەورەی باش.

[١١٧]

[١١٨] واتە هەر کەسێك پێویستی خۆی بە جێ هێنا بۆ دەر کردن باشە.

[١١٩] ئەم پەندە لە ناوچەیەکی دەرەبەگی دا وتراوە، کە نایەوێ دەست و پێوەند نینۆکیان ببێ تا سەری خۆیانی پێ بخورێنن.

[١٢٠] واتە پیاو خراپ لە پیاو خراپ بەردە، وە بەو رەنگە تۆڵەی لێ بسێنە.

[١٢١] واتە پیاو خراپ لە پیاو خراپ بەردە، وە بەو رەنگە تۆڵەی لێ بسێنە.

[١٢٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەمیشە لەو شوێنانە بێ، کە خواردنی چەور و مشەی تیا دەست کەوێ.

[١٢٣] زۆرتر ژنێك ئەڵێ، کە لەبەر خراپی مێردەکەی لێی تۆرابێ، واتە کەس لە خۆڕایی دەست لە ژیانی خۆش هەڵناگرێ.

١٢٤)- سەگ لەبەر ماڵی خاوەنیا ئازایە[١٢٤]

١٢٥)- سەگ نایەوێ کلکی بلەقێنێ، کلك سەگ ئەلەقێنێ[١٢٥]

١٢٦)- سەگ و سیروان، پێی پێ ئەکەنێ[١٢٦]

١٢٧)- سەگ و شوانی هاتەوە[١٢٧]

١٢٨)- سەگ وەڕی، بووك دەرپەڕی[١٢٨]

١٢٩)- سەگی برسی، ئەکەوێتە شوێن پیاو[١٢٩]

١٣٠)- سەگی تێر، ڕاو ناکا[١٣٠]

١٣١)- سەگی پێ سووتاوی پێ ناگا[١٣١]

١٣٢)- سەگی دز لە ماڵی، بە بۆڵە بۆڵ ئەچێتە دەرەوە[١٣٢]

١٣٣)- سەگی دوای دێڵە بەبایە و چاری ناگرێ[١٣٣]

١٣٤)- سەگی دوای سوارانە[١٣٤]

١٣٥)- سەگی ڕەش، بە بزن حساب ئەکا[١٣٥]

---

[١٢٤] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر لە مەڵبەندێکی تایبەتی دا بتوانێ ئازایی بکا.

[١٢٥] بە پیاوێکی خراپ ئەوترێ، کە بە ئیشارەی یەکێکی تر خراپەیەك بکا.

[١٢٦] لە ڕووی تیتاڵییەوە بە یەکێکی بێ نرخ ئەوترێ، کە مەردوم پێی پێ بکەنن.

[١٢٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە زەرەرێکی زۆری کردبێ، وەك یەکێکی ئاژاڵدار کە ڕانەکەی قڕ بووبێ، وە سەگ و شوانەکەی نەبێ، هیچی تری نەمابێ.

[١٢٨] بە یەکێکی جرپن ئەوترێ، لە کاتێکا پێویست بێ سەنگی و گرانی خۆی نیشان بدا، کەچی ئەو بە دەم هەموو تەقە و ڕەقەیەکەوە هەستێ و سەر کۆڵان بگرێ، وەك بووکێك کە لە پەردەدابێ، کەچی بەوەڕەی سەگێك لە پەردە دەرپەڕێ.

[١٢٩] واتە دەست و پێوەند تا برسی بن خزمەت باشتر ئەکەن.

[١٣٠] زۆرتر ئاغا ئەیلێ بۆ خزمەتکار.

[١٣١] واتە زۆر خوێرییە.

[١٣٢] واتە هەر چی خواردن بێ تیا دەست ناکەوێ.

١٣٣

[١٣٤] بە یەکێك ئە وترێ، لە ڕووی سووکیەوە کە هەمیشە بە دوای پیاوی گەورەوە بێ.

[١٣٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر حەسود بێ.

١٣٦)- سەگی سپی، بۆ بارخانەی لۆکە زەرە[١٣٦]

١٣٧)- سەگی کونە ماسییە و پاسی جرتاوا ئەکا[١٣٧]

١٣٨)- سەگی لێدراو، لە سێبەری دار ئەترسێ[١٣٨]

١٣٩)- سەگی هار، چل شەوی عومرە[١٣٩]

١٤٠)- سەگی هەڵەومر دز ئەهێنێتە سەر خاوەنی[١٤٠]

١٤١)- سەفەر سەنگی محەکە[١٤١]

١٤٢)- سەفەرە، هەر لەبەرە[١٤٢]

١٤٣)- سەلکی سیریت؟ قنچکی پیازیت[١٤٣]

١٤٤)- سەنگم پێ مەگۆڕە[١٤٤]

١٤٥)- سەی سادق تۆ ئەیکەیت بە گیسکێك خاسە ئەر ناحاجی ئەوڵا خول ئەدەم ئەیکا وەدیزەیی دانوولە[١٤٥]

---

[١٣٦] بە یەکێکی خراپ ئەوترێ، کە خراپییەکەی بووبێ بە مایەی شکستی هاورێکانی.

[١٣٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەر شتێك هەڵ بداتێ، کە هیچ دەخڵێکی بە سەریەوە نەبێ.

[١٣٨] بە پیاوێکی خراپ ئەوترێ، کە زۆر سزا و بەندیخانە و لێدانی دیبێ وە بەم بۆنەیەوە، لە خشەی مار و مێروو بترسێ.

[١٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە تەواوی یاخی بووبێ، وە بە راستە و چەپەدا، دەست درێژی بکات بۆ مەردوم.

[١٤٠] بە خوار دەستی یەکێك ئەوترێ، کە زۆر قسە بکات، وە لە هەموو قسەیەکا هەڵ بداتێ.

[١٤١] واتە بە هۆی سەفەر کردنەوە لە هاورێ ئەگەیت.

[١٤٢] واتە سەفەر کە لەبەر بوو، تا زوو بکرێ باشترە.

[١٤٣] بە یەکێك ئەوترێ، لە رووی سەرکۆنەوە، کە لە کارێکی تایبەتی تۆدا هەڵ بداتێ.

[١٤٤] یەکێك ئەیلێ بەیەکێك کە بیەوێ ئیخفالی کات.

[١٤٥] سەی سادق و حاجی ئەوڵا دوو پیرن، گوایە هەر کەسێك بچێتە سەر خوابگاهەکەیان خێرێکیان بۆ بکا، چی لە دڵابێ خوا بۆی ئەکا بەڵام یەکەمیان بە خێرێکی گران و دووهەمیان بە خێرێکی سووك و ئاسان، بە یەکێك ئەوترێ کە

١٤٦)- سەی لێ گڵاو ئەبێ[١٤٦]

١٤٧)- سەی نان دە، سەفەلەی نان مەدە[١٤٧]

١٤٨)- سەیر لەوەدایە، خاوەن تەڵەکە بێتەوە[١٤٨]

١٤٩)- سەیرە ئەو دنیا پان و بەرینە، هەر کەس کاری خۆی لە لا شیرینە[١٤٩]

١٥٠)- سەیرە لە کۆیە[١٥٠]

١٥١)- سرکە ئەفرۆشێ[١٥١]

١٥٢)- سرکە گەڕایەوە ئەبێ بە شەراب[١٥٢]

١٥٣)- سرکە لە ناو چاوی ئەبارێ[١٥٣]

١٥٤)- سری خۆم و تڕی خۆم[١٥٤]

١٥٥)- سزای گرانجان، لێ نەکڕینە[١٥٥]

---

ئیشێکت پێی ببێ، واتە ئەگەر تۆ بەم پارەیە، یا بەم دیارییە نەیکەیت، یەکێکی تر هەیە بە هەرزانتر ئەیکا.

[١٤٦] واتە لە سەگ گڵاوترە.

[١٤٧] واتە نان بدە بە سەگ و مەیدە بە سپڵەی ناکەس بەچە.

[١٤٨] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك لە دەشت تەڵەیەك ئەنێتەوە، بە ڕێکەوت ڕێوییەکی پێوە ئەبێ، لە دوای تۆزێك شێرێك بەوێدا ئەڕوا چاوی بە ڕێوییەکە ئەکەوێ کەوا پێوە بووە وە پەلە پەل ئەکات، شێرەکە ئەڵێ: بەخوا سەیرە، ڕێوییەکە ئەڵێ: سەیر لەوەدایە خاوەن تەڵەکە بێتەوە واتە ئەو حەلە سەرم ئەبڕێ و کەوڵم ئەکا و گۆشتەکەم فڕێ ئەدا و پێستەکەم ئەبات، کەواتە ئێستام پاشەییە لە چاو ئەو حەلەدا.

[١٤٩]

[١٥٠] بەشتێك ئەوترێ، کە زۆر سەیر بێ.

[١٥١] واتە زۆر تووڕەیە.

[١٥٢]

[١٥٣] واتە زۆر تووڕەیە.

[١٥٤] یەکێك ئەیڵێ کە لە تاقە هۆدەیەکی سەر بەخۆدا بێ، وە پێی بوترێ: تۆ بۆچی لەگەڵ یەکێکی ترا خانوویەکی بچکۆلانە ناگریت.

[١٥٥] بە خوا تۆڵەی چاکە، خۆزگە هەموو کەسێك ئەم تۆڵەیەی بەکار بێنایە، ئەو حەلە کەس نەی ئەوێرا یاری بە نرخی هیچ شتێك بکا، نەخوازەلا خواردەمەنی.

١٥٦)- سفرەی بەتاڵ (بسم الله)ی لێ ناکرێ[156]

١٥٧)- سك تێشوو هەڵناگرێ[157]

١٥٨)- سك هەڵ ئەگوشێ[158]

١٥٩)- سکە برسین چ ناپرسی[159]

١٦٠)- سکە رۆیە[160]

١٦١)- سکی تێرم، ئەسپی ژێرم[161]

١٦٢)- سکی سوتاوە[162]

١٦٣)- سلاوی کوردە، بێ مەلامەت نییە[163]

١٦٤)- سم سمی کەرە و چنگ چنگی یاسێ، من سەرم لەم کارە ئەماسێ[164]

---

[156] واتە بسم الله بۆ خواردن ئەکرێ، کە خواردن لە سەر سفرە نەبوو هیچ.

[157] واتە زیادە خۆری مەکە کەلکت ناگرێ.

[158] واتە زۆر برسییە.

[159] واتە یەکێك کە برسی بوو، ناپرسێتەوە لە حەلاڵ و حەرام.

[160] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەرچی دەست کەوێ بیدا بە خواردن بۆ سکی.

[161] یەکێك ئەیلێ کە سکی تێر بێ، وە بەو بۆنەیەوە بە قەد ئەسپێك بەهێز بێ لە سەر رێ رۆین.

[162] بە ژنێك ئەوترێ، کە منالی مردبێ.

[163] بە یەکێك ئەوترێ تا کارێکی پێت نەبێ، سلاوت لێ نەکا.

[164] ئەگێڕنەوە کە پیرێژنێك، بوکێکی ئەبێ، ناوی (یاسێ) ئەبێ، کە کورتەی (یاسەمەن)ە ئەوەندەی نان ناداتێ کە تێری پێ بخوات رۆژێك پیرێژن سواغی ئەو ژوورە ئەدا کە کوپەڵەی کەرەی تیا ئەبێ وە خۆی ئەچێتە دەرەوە، بوکەکەی لە برسانا سواری کەرەکەیان ئەبێ، وە بە ناو ژوورەکەدا ئەڕوا تا ئەچێتە سەر کوپەی کەرەکە، چنگێك کەرەی لێ دەردێنێ و ئەیخوا، خەسۆکەی کە دێتەوە، جێ سمی کەرەکە ئەبینێ لە ناو سواغەکەدا، کە ئەچێتە سەر کوپە کەرەکەش، جێ چنگی بوکەکەی ئەبینێ، کە لە بوکەکەی ئەپرسێ، ئەڵێ: نازانم، وە ئەبێ کەرەکە چووبێتە ژوورەکە، ئەمیش ئەڵێ (سم سمی کەرە و چنگ چنگی یاسێ، من سەرم لەم کارە ئەماسێ). ئێستا ئەم پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە دەستی لە کارێکا بێ و بەڵام بەڵگەی لە سەر نەبێ.

١٦٥)- سمی کەر بەسم تەراش ئەتاشرێ[165]

١٦٦)- سمێلی گوگرە بووە[166]

١٦٧)- سنگ شێری ماکەر پشت[167]

١٦٨)- سنگ لەقێنە[168]

١٦٩)- سنگ هەڵکێشە[169]

١٧٠)- سنعات و قنیات[170]

١٧١)- سنعەت بازنی زێڕە[171]

١٧٢)- سنعەتە و سەبەتە، مسگەری نییە و قنگ هەڵسوڕان[172]

١٧٣)- سنعەتکار دەوڵەمەند نابێ و لە برسیشانا نامرێ[173]

١٧٤)- سوار ئاگای لە پیادە نییە[174]

١٧٥)- سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار[175]

---

[165] بە یەکێکی هەرزەی بێ ژیر ئەوترێ کە شتێکی خراپی لەگەڵ کردبێت، واتە کەر چۆن سمی ئەتاشرێ کە درێژ بوو، ئەمیش ئەبێ نینۆك بکرێ.

[166] بە کوڕێك ئەوترێ، کە تازە خەتی دابێ.

[167] بە مەردومی زل و قەبە و پفەڵی بێهونەر ئەوترێ.

[168] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ناو مەردوما فتنە بەرپا بکات.

[169] واتە چەموش و نارەحەتە.

[170] واتە مەردوم لەم جیهانەدا بە دوو شت ئەژی یەکەم پیشەسازی دووهەم قەناعەت کردن.

[171] لە هەر ساتێکدا ویستت ئەتوانیت بازنەکەت بکەیت بە پارە.

[172] سنعەتکارێك ئەیلێ کە سنعەتەکەی لە برەودا بێ.

[173] ئێستاش بەشی زۆری سەنعەتکار وایە، بەڵام سنعەتی واش هەیە لە پاش چەند ساڵێك خاوەنەکەی لە دەست ئەکەوێ.

[174] واتە پیاوی گەورە، ئاگای لە دەنگ و باسی پیاوی بچوك نییە.

[175] واتە مەردوم تا هەڵە نەکا و رۆژگار بۆی راست نەکاتەوە، وە دەرسی قورس و گرانی دانەدا، قاڵ نابێ.

١٧٦)- سوار لە سەر زین ئەهێنێتە خوارێ[176]

١٧٧)- سوار و پیادە ئارەزووی دەست بۆسییان بێ، ئەو خۆی هەڵئەبڕێ و ئەم خۆی دائەنەوێنێ[177]

١٧٨)- سوار و پیادە ئەگەر حەز بکەن، دەست بۆسی ئەکەن[178]

١٧٩)- سوار و پیادە هەر ئەگەنە جێ، بەڵام درەنگ و زوو ئەکەوێ[179]

١٨٠)- سواربوون عەیبێك، دابەزنی دوو عەیب[180]

١٨١)- سواری ئەسپی خەڵق بیت، هەر پیادەیت[181]

١٨٢)- سواری سوار خۆر وا لەدواوە، رمی ناوە بە رووی شاوە[182]

١٨٣)- سواری گای هار بووە[183]

١٨٤)- سواری کەری بووە و لە کەری ئەگەڕێ[184]

١٨٥)- سواری کێری کەر لە پیادەرەوی خاسترە[185]

---

[176] واتە زۆر بێحەیا و درە.

[177] واتە دوو کەسی لە یەك زویر، ئەگەر بیانەوێ ئاشتیان بێتەوە، ئەتوانن لە یەك نزیك بکەونەوە.

[178] واتە دوو کەسی لە یەك زویر، ئەگەر بیانەوێ ئاشتیان بێتەوە، ئەتوانن لە یەك نزیك بکەونەوە

[179] هەژارێك بە دەوڵەمەندێکی ئەڵێ، کە ئەمیان بە ئاسانی کارێك بکا و ئەویان بە رەنج و کۆشش.

[180] واتە مەردوم دەست نەداتە کارێك، کە دەستی دایە تا تەواوی نەکات دەستی لێ هەڵنەگرێ.

[181] هەژارێك بە دەوڵەمەندێکی ئەڵێ، کە ئەمیان بە ئاسانی کارێك بکا و ئەویان بە رەنج و کۆشش.

[182] چونکە ئەبێ باری منەت هەڵگریت.

[183] واتە بە گژ کارێکی زۆر سەختا چووە.

[184] بە یەکێك ئەوترێ کە خۆشی نەزانێ چی ئەکات.

[185] واتە بە تەنها، ئیشی گەورە ناکرێ.

١٨٦)- سوارێك بە تەنها تۆز ناكا[186]

١٨٧)- سواڵ كیمیایە[187]

١٨٨)- سواڵكەر تورەكەی پڕ و رووی رەشە[188]

١٨٩)- سووژنێك بۆ كەری وێستاو زۆرە[189]

١٩٠)- سوورە بۆم سازداوی، ئەگەر سەر بگرێ[190]

١٩١)- سوورەی مل پانە، مووچەی تۆ هەر دوو نانە[191]

١٩٢)- سووری دوو دوو گرە[192]

١٩٣)- سووری دیوە و سەمای لە بیر چۆتەوە[193]

١٩٤)- سووك بڕۆ، سەلامەت وەرەوە[194]

١٩٥)- سووك مەژگ، باری هەوار ناچێ[195]

١٩٦)- سویجگەری تەكەی دێ[196]

---

[186] بە دەستەیەك پێشمەرگە ئەڵێن، كە لە پشت دەستەیەكی ترەوە بێ، وە لە تۆپ و فرۆكە كۆ نەكا.

[187] چونكە نە پارەی ئەوێ و نەدەست مایە.

[188] بەڵام ئەوانەی كە بە دزی و حیزی و درۆ و دەلەسە و فرِوفێڵ تورەكەی خۆیان پڕ ئەكەن، رووشیان رەشە لە هەر دوو جیهانا و جێگاشیان ئاگری دۆزەخە لە رۆژی دوایی دا.

[189] واتە ئازاری زەبوون مەدە.

[190] یەكێك ئەیلێ كە خەریك بێ ژن بێنێ.

[191] بە بەردەستی ماڵی ئەوترێ، كە زیاد لە مووچەی خۆی داوا بكات.

[192] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە جیاتی بەشێك، دووبەش هەلگرێ.

[193] بە یەكێك ئەوترێ كە لەگەڵ چەرخا بگەڕێ، وە هەرچی هاتە روو ئەم تێكەڵی ببێ.

[194] خۆزگە ئەم پەندە لە بەردەمی هەموو ئوتومەبیلچییەكا هەڵ ئەواسرا.

[195] مەژگ: مێشكە، واتە بێعەقڵ باری ناگاتە هەوار.

[196] بە یەكێكی لاواز ئەوترێ كە لۆژەی سەری بێ.

۱۹۷)- سوێند دوو سەری هەیە[197]

۱۹۸)- سۆرە باشە، سۆرەزا خراپە[198]

۱۹۹)- سۆرە، لەتێ زۆرە[199]

۲۰۰)- سۆفێلکەی بەرماڵ بەشان، بە ڕۆژ ئەگەڕێ کۆڵان بە کۆڵان، بە شەو دێتەوە ئەڵێ : (یاالله ایمان)[200]

۲۰۱)- سۆلە سۆ، گولۆلۆ لەپۆ[201]

۲۰۲)- سێ و دووی دڵی خۆی ئەکا[202]

۲۰۳)- سێ و دووی لێ مەکە[203]

۲۰٤)- سێبەری دەست کەوێ پانی ئەکاتەوە[204]

۲۰۵)- سێپەڕە لە گونانە[205]

۲۰٦)- سیر بخۆ و زوڕنا لێدە[206]

۲۰۷)- سیر مەدە لە سمێڵم[207]

---

[197] واتە بە ڕاست ئەخورێ و بە درۆ ئەخورێ، ئنجا ئەگەر تۆ ئەیخۆیت هەر بەڕاست بیخۆ نەك بە درۆ.

[198] سۆرە: خزمی مێردە لە شوبرا و دش و خەسوو، واتە ئەمانە خۆیان لە منالەکانیان باشترن.

[199] واتە لە خزمی مێرد لەتێك زۆرە بۆ ئاژاوە نانەوە لە ماڵا.

[200] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ڕۆژ خوێڕی بسوڕێتەوە، وە شەواوشەو نەبێ، خوای بیر نەکەوێتەوە.

[201] سۆ: بنەماڵە و وەچەیە. پۆ: ئەو شتەیە کە لە سەر رایەل ئەتەنرێ. یەکێك ئەیڵێ کە لە خزمی نزیکی خۆی ژن بێنێ.

[202] واتە لەو کارەدا دوو دڵە، نازانێ بی کات یان نەیکات.

[203] واتە بێ بیر کردنەوە ئیشەکە بکە.

[204] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر رقی لە یەکێك بێ، وە دوژمنی بێ.

[205] واتە بەهارێکی زۆر تەڕە.

[206] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچی لە دەست نەیەت قسە وتن نەبێ.

[207] واتە هەڵم مەدە و هەڵم مەخەڵەتێنە.

٢٠٨)- سیر و پیاز پێکەوە نایانکرێ[٢٠٨]

٢٠٩)- سیرە کۆڵەی سیروانە[٢٠٩]

٢١٠)- سیروان لە کونێکەوە پەیدا نابێ[٢١٠]

٢١١)- سیروان لێشت نەدەم هەر ئەمبەیت[٢١١]

٢١٢)- سێف سوور، بۆ دەس کوڕی خان خاسە[٢١٢]

---

[٢٠٨] بە دوو کەس یا دوو دز ئەوترێ، کە هەرگیز کۆ نەبنەوە.

[٢٠٩] سیرەکۆڵە: بەردێکی گەورەیە کە لە ناو ئاوێکی خوڕا لوس بووبێ کە پێشی ئەڵێن: هێلەساو، بە یەکێك ئەوترێ، کە رۆژگار قاڵی کردبێ.

[٢١٠] سیروان: ئاوێکی زۆرە لە رۆژئاوای کوردستانی ئێرانەوە دێتە دەرەوە، وە لە خوار بەغداوە تێکەڵی دەجلە ئەبێ، ئنجا ئەم هەموو ئاوە لە تاقە کونێکەوە پەیدا نابێ، بەڵکو لە چەن کون و لەچەند سەرچاوەیەکەوە پەیدا ئەبێ، بە یەکێك ئەوترێ، کە مەسرەفێکی زۆر و دەستکەوتێکی زۆری ببێ، واتە ئەم دەستکەوتە هەر لە لایەکەوە نییە، بەڵکو لە گەلێ لاوەیە.

[٢١١] سیروان چەمێکی زۆر گەورەیە کەسێك لێ نەدا نایبا، واتە هەموو شتێکی خراپ کە من نەیکەم ئیتر ئەنجامی خراپییەکی چۆن یەخەگیرم ئەبێ؟ بەلام داخەکەم ئەمە چەند ساڵێکە لە سیروانیش نەدەیت هەر ئەتبا واتە لە ماڵی خۆشت نەیەیتە دەرەوە، وە دەست بە کلاوی خۆشتەوە بگریت لە کونی ژوورەوە شەڕ هەر ئەتدۆزێتەوە، وە یەخە گیرت ئەبێ.

[٢١٢] یەکێك ئەیلێ، کە یەکێکی تر شتێکی لێ بسێنێ، لە تەزبیح یا هەر شتێکی تر.

# پیتی شین

۱)- شا ئەیکەوێتە گەدا، گەدا ئەیکەوێتە شا[1]

۲)- شا بە سەپانی خۆی نازانێ[2]

۳)- شا، بێ شالیار نابێ[3]

٤)- شا، دای ، شالیار نەیدا[4]

٥)- شاباشی خۆم داوە و قنج هەڵ ئەپەڕم[5]

٦)- شاخی بزنێکی پێ تیمار ناکرێ[6]

۷)- شاد مەبە، بە بوونی، شاد بە ، بە ژینی[7]

۸)- شار خەڵوەتە و گورگ هەڵمەتە[8]

۹)- شاران گەشتە، زۆر درۆزنە[9]

---

[1] واتە دنیا دەوران دەورانە.

[2] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر بێ نیاز بێ.

[3] شالیار: ئەبێ یار و ئاوەڵی شا بێ، کە وەزیرە، واتە شار بێ وەزیر نابێ، بە تەوسەوە ئەوترێ، کە هەمیشە لەگەڵ پیاوێکی گەورەدا بێ بۆ هەموو شوێنێك، وە لێی جیا نەبێتەوە.

[4] یەکێك ئەیڵێ کە پیاوێکی گەورە شتێکی بداتێ کەچی لەو بچوکتر نەیەڵێ بیداتێ.

[5] واتە پێویستی سەرشانی خۆمم بەجێ هێنا، وە هیچم بە سەرەوە نەما، ئیتر لە هیچ ناترسم.

[6] واتە دەست پاچەیە هیچی پێ ناکرێ.

[7] بە یەکێك ئەوترێ، کە کوڕێکی نۆبەرەی بووبێ، واتە هەر بوون مەبەس نییە، بەڵکو مان مەبەسە، وە بوونی بە بێ مان، چ کەڵکێکی نییە.

[8] بەوانە ئەوترێ، کە لەگەڵ مەڵێکیان بۆ هەڵکەوێ دەست بکەن بە تالان و بڕۆ.

[9] چونکە ئەیەوێ قسەی خۆش و زل بگێڕێتەوە، ئەمەش بە درۆ نەبێ دەست ناکەوێ.

۱۰)- شاران لە حسرەت بەغدا ئەگران، بەغداش وێران بوو[10]

۱۱)- شارستانی، قیر و سیایەکی لادێیی بەسە[11]

۱۲)- شاری بێحاکم وێران بێ[12]

۱۳)- شاناخسێ، بە قنگی مەروێوەیە[13]

۱٤)- شانازی بە کێلی گۆڕی باوکەوە ناکرێ[14]

۱۵)- شانم کردووە کۆمە، هەڵم گرتووە لۆمە[15]

۱٦)- شانی دادا[16]

۱۷)- شانی دایە بەر[17]

۱۸)- شانی لێ ئەخورێ[18]

۱۹)- شایی بۆ دووانە، گڕ لە هەمووانە[19]

---

[10] وا دیارە ئەم ئەم پەندە لە سەدەی حەوتەما وتراوە کە هۆلاکۆ هێرشی بردۆتە بەغدا و وێرانی کردووە و ئێستا یەکێکی گەورە ئەیلێ کە لێ کەوتبێ، وە یەکێك گاڵتەی پێ بکا.

[11] شارستانی کەشت بکرن لە لادێی، بۆ ئەوەی کە قازانجێك بکەن لادێیش زۆر فیرسیچمە و گیرە گیر کەرە، بەلام شارستانییەکە بە قازانجێکی کەم رازییە، بە رەنگێکی وا کە لادێییەکە بلێ: قیر و سیا لەم چەند فلسە واتە شارستانی ئەم قیروسیایەی بەسە.

[12] چونکە حاکم لە هەموو کەس زیاتر تەرازووی دادی بە دەستەوەیە.

[13] (شاناخسێو مەروێ) دوو دێن لە نزیك یەکەوە، ئێستا بە دوو کەس ئەڵێن کە هەمیشە پێکەوە بن.

[14] چونکە چاکی و خراپی ئەو بە تۆ چی.

[15] یەکێك ئەیلێ کە لۆمەیەك رووی تێ کردبێ، وە گوێی نەداتێ.

[16] واتە مرد، لە رووی سووکییەوە بە کار دێنرێ.

[17] واتە چووە ژێر بارێکی قورسەوە.

[18] واتە حەزی لەو کارەیە.

[19] بە کارێك ئەوترێ دوان لێی بەهرەمەند بن، کەچی کەسانی تر پێی کەیف خۆش بن.

٢٠)- شایی شایی کەران و خوروی دراوسێیان[٢٠]

٢١)- شەخس زەبری نەنوێنێ، دیزەیێ دانووله ناکەن بەخێری[٢١]

٢٢)- شەدەم بۆ دەربەند ئەویست، کە دەربەند گیرا، شەدەم بۆچییە[٢٢]

٢٣)- شەڕ بێ و خێری منی تیابێ[٢٣]

٢٤)- شەڕ بە شیر، مامەڵە بە دراو[٢٤]

٢٥)- شەڕ بە چەك، مامەڵە بە پارە[٢٥]

٢٦)- شەر بە کۆنە قینەوە ئەکرێ[٢٦]

٢٧)- شەڕ خۆش نییە، شەڕنامەی خۆشە[٢٧]

٢٨)- شەر دز دروست ئەکا ئاشتی هەڵی ئەواسێ[٢٨]

٢٩)- شەڕ لە بادینان، تۆز لە پێش ماڵی مە[٢٩]

---

[٢٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە یەکێکی تر کەوتبێتە خۆشییەکەوە کەچی ئەم هەڵپەڕێ.

[٢١] شەخس: خوابگاە (مرقد)ی پیاوێکی گەورەی ئایینییە، واتە وەختێك مەردوم خێری بۆ ئەکەن، کە شتێکی لێ ببینن. کار بەدەستێك ئەیڵێ کە زەبر و زەنگێکی نواندبێ لە ناو مەردوما.

[٢٢] ئەگێڕنەوە کە لە دەربەندی بازیان شاییەك ئەبێ، یەکێك لە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، ئەیەوێ بچێ بۆ هەڵپەرکێی ئەو شاییە بەو بۆنەیەوە، ئەنێرێ بۆ شار کە شەدەیەکی بۆ بکڕن تا لەو شاییەدا بیبەستێ بە سەریەوە، بەڕێکەوت لەشکری دوژمن دێ و دەربەند ئەگرێ، وە کابراش شەدەکەی بۆ دێتەوە، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم قسەیە ئەکا کەوا لەو ڕۆژەوە بووە بە پەند.

[٢٣]

[٢٤] واتە نە مامەڵە بکە بە بێپارە، وە نە جەنگ بکە بە بێ چەك، وە هەر چیت دەست دایە، ئەبێ خۆی بۆ ئامادە بکەیت.

[٢٥] واتە نە مامەڵە بکە بە بێپارە، وە نە جەنگ بکە بە بێ چەك، وە هەر چیت دەست دایە، ئەبێ خۆی بۆ ئامادە بکەیت.

[٢٦] واتە ئەگەر کۆنە قینە نەبێ و دەمقاڵێ نابێ بە شەڕ.

[٢٧] مەبەس لە شەڕنامە باسی زاڵ بوون و دانانی مەرجە لەسەر دوژمن.

[٢٨] ئنجا بزانە جەنگ و ئاشتی چەند لە یەك جیان.

[٢٩] یەکێك ئەیڵێ کە شەڕێکی دوور لەو بە گڕە گڕ بێ بەرماڵی پێ بگرێ.

٣٠)- شەڕ لە بەتاڵی چاكترە[٣٠]

٣١)- شەڕ لە سەر تەنگی جێگەیە[٣١]

٣٢)- شەڕ لە سەر كەمی سفرەیە[٣٢]

٣٣)- شەڕ لە شۆمی، نەك لە تۆمی[٣٣]

٣٤)- شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان[٣٤]

٣٥)- شەڕ لە نیوەی بگەڕێتەوە چاكترە[٣٥]

٣٦)- شەڕ و نیوەشەڕ، بران[٣٦]

٣٧)- شەرابی دەستی دولبەر، خۆشترە لە ئاوی كەوسەر[٣٧]

٣٨)- شەرابی مفت قازیش ئەیخوا[٣٨]

٣٩)- شەرت هۆ هۆ نییە، شەرت كۆكۆیە[٣٩]

---

[٣٠] واتە بێ كاری ئەوەندە خراپە، ئەگەر بە شەڕەوە خەریك بیت، باشترە لەوەی بێكار بیت.

[٣١] واتە هەموو جەنگێك لەسەر جۆرە كەم و كورپییەكە، ئنجا یا كەم و كورپی جێگا یا كەم و كورپی خواردن.

[٣٢] واتە هەموو جەنگێك لەسەر جۆرە كەم و كورپییەكە، ئنجا یا كەم و كورپی جێگا یا كەم و كورپی خواردن.

[٣٣] شۆم: شێفە، واتە شەڕی دوو هاوبەش، لە كشت و كاڵا، لە كاتی شێفابی كە هێشتا تۆو نەكراوە باشترە لەوەی كە دوای تۆو كردن بێ، چونكە ئەو حەلە زووتر جیا ئەبنەوە.

[٣٤] واتە لە كاتی بێ ئیشی دا شەڕ و زویری بە هەر جا، بەلآم لە كاتی ئیش و فرمانا ئەبێ هەموو شەڕ و زویرییەك بخرێتە لاوە تا ئیشەكە تەواو ئەكرێ.

[٣٥] چونكە شەڕ وەك زەهر وایە تا كەمتری بخۆیت باشترە.

[٣٦] واتە ئادەمی كە تووشی شەڕ بوو، دەستی خۆی بوەشێنێ.

[٣٧]

[٣٨] واتە شتی خۆڕایی با حەرامیش بێ، دەستی لێ هەڵناگیرێ، مەگەر لە لایەن یەكێكی لە خوا ترسەوە.

[٣٩] واتە كردار حساب نەك گوفتار.

٤٠)- شەڕە، بێرە کۆڵم[٤٠]

٤١)- شەرعی مار، بە دار[٤١]

٤٢)- شەرغم لەگەڵ مەلایە، هاوارم بۆ تۆ خوایە[٤٢]

٤٣)- شەڕکەر واز ئەهێنێ، ناوبژی کەر واز ناهێنێ[٤٣]

٤٤)- شەڕکەر، ئاشتیت لە بیر بێ[٤٤]

٤٥)- شەرمی سەران، لە مێزەران[٤٥]

٤٦)- شەڕی ئەو دۆڵە، مەهێنەرە ئەم کۆڵە[٤٦]

٤٧)- شەڕی بەیانیان لە خێری ئێواران باشترە[٤٧]

---

[٤٠] یەکێك ئەیڵێ کە شەڕێکی دوور لەو، بێت و یەخەگیری ببێ، واتە وەك خۆم داوای ئەم شەڕەم کردبێ کە بێتە کۆڵم وایە.

[٤١] ئەگێڕنەوە کە مارێك ئەچێتە ناو دەوەنێکەوە، وە یەکێك ئاگر ئەنێ بە دەوەنەکەوە، شێخ هۆمەر ناوێك دێ دار دەستەکەی ڕەت ئەکات بۆ مارەکە، بۆ ئەوەی کە رزگاری بکات، کەچی مارەکە ئەپەڕێتە ملی شێخ هۆمەر و تێوەی ئەئاڵێ، وە هەرچی ئەکات نایەتە خوارەوە، لە پاشا ئەچن بۆ لای چەند کەسێك کە شەرعیان بکەن، وە هەموو، شەرعەکە وا ئەکەن، کە مارەکە لە ملی شێخ هۆمەر بێتەوە، بەڵام مارەکە بە قسەی کەسیان ناکات، وە لە ملی نابێتەوە، لە پاشا ئەچنە لای ڕێوی بۆ شەرع کردن، ڕێوییەکە بە مارەکە ئەڵێ تا نەیەتیە خوارەوە شەرعتان ناکەم کە لەگەڵ دێتە خوارەوە خێرا بە دار سەری پان ئەکاتەوە، ئنجا ئەڵێ : (شەرعی مار، بەدار) واتە زۆرداری ستەمکار، ئەبێ وەك مار سەری پان کرێتەوە.

[٤٢] بە کارێك ئەوترێ ستەمکار خۆی فەرماندەر بێ.

[٤٣] تەماشای پەندی: (باوك کوژراو دەست هەڵ ئەگرێ، پڵاو خۆر دەست هەڵ ناگرێ) بکە.

[٤٤] واتە هەر کەس چو بە گژ یەکێکا، با بەشی پاشەڕۆژی تیا بهێڵێتەوە.

[٤٥] تەماشای پەندی (سایەی سەران، لە مێزەران) بکە.

[٤٦] واتە تا ئەتوانی، مەیەڵە شەڕ پەرە بسێنێ.

[٤٧] واتە بەیانیان کاتی ئیش و کار و هەڵسورشانە، ئەبێ بە شتێکەوە هەر خەریك بیت با شەڕیش بێ، بەڵام ئێواران وا نییە، ئەگەر دەست لە خێر و قازانجێکیش هەڵگریت قەیناکە.

٤٨)- شەڕی خۆترپێن مەکە[48]

٤٩)- شەڕی ژن و مێردان، هەتاماڵ نوستنان[49]

٥٠)- شەڕی ڕۆیگە و خێری ماگە[50]

٥١)- شەڕێك بێ و خێری منی تیا بێ[51]

٥٢)- شەریکی دز و ڕەفیقی قافڵە[52]

٥٣)- شەریکی و خەریکی[53]

٥٤)- شەشی بە تەشپییەکە، حەوتی ربەیەکە[54]

٥٥)- شەق ئەزانێ قۆناغ لە کوێیە[55]

٥٦)- شەقەی قەڵماسکی نەبیستووە[56]

٥٧)- شەل نییە، پای شکاوە[57]

٥٨)- شەلە باوان، کوێرە باوان[58]

---

[48] واتە شەرت کە کرد شەڕێك بکە کە بیبەیتەوە نەك بی دۆڕێنیت.

[49] واتە ئەو حەلە ئیتر پێکەوە ئەنون و ئاشتیان ئەبێتەوە.

[50] بە یەکێکی خراپ ئەوترێ کە تاقەتی شەڕی نەمابێ، وە لە بیری مردن و چاکە کردنا بێ.

[51] یەکێك ئەیڵێ کە لە شەڕی دوو کەسەوە بەهرەمەند ببێ.

[52] بە یەکێك ئەوترێ کە لە شوێنێك ئەمین دار بێ، وە شت لەو شوێنە بدزێ و ساغی کاتەوە بە هۆی یەکێك لە دەرەوە.

[53] یەکێك ئەیڵێ کە شەریکی یەکێکی تر بێ، وە بەهۆی ئەو شەراکەتەوە دەستی بەسترابێ، وە نەتوانێ سەربەست هەڵسوڕێ.

[54] بە قسەیەکی وا ئەوترێ، کە هیچی بە سەر هیچەوە نەبێ.

[55] بە یەکێك ئەوترێ، کە پێویستێکی سەرشانی بەجێ نەهێنابێ، وە ئێستا بە زۆر پێی کرابێ.

[56] بە یەکێك ئەوترێ کە ساردی و گەرمی ڕۆژگاری نەچەشتبێ.

[57] بە شتێکی عەیبدار ئەوترێ، کە خاوەنەکەی بە ناوێکی تر ناوی ببات.

[58] یەکێك ئەیڵێ کە لێی قەومابێ، وە بە بێجێگا و ڕێگا مابێتەوە، وە بە ناچاری چووبێتەوە ماڵی گەورەیەکی، واتە هەر کامێکمان لێمان بقەومێ هەر ئەبێ بێینەو ئەم ماڵە باوانە.

٥٩)-  شەلەم بخۆم و جەھەنەمیش بچێژم[٥٩]

٦٠)-  شەلم کوێرم، ناپارێزم[٦٠]

٦١)-  شەممە بە کەم کەس[٦١]

٦٢)-  شەممە کار و شەممە بار، ھەر بووکی تیا مەکە سوار[٦٢]

٦٣)-  شەممە لە مانگ ببڕێ[٦٣]

٦٤)-  شەممە لە ملی جوولەکەیە[٦٤]

٦٥)-  شتن ڕەنگ و ڕووە، خواردن گەند و گووە[٦٥]

٦٦)-  شەن و کەو ئەکا[٦٦]

٦٧)-  شەنە، لەمەنە، کەمتر نییە[٦٧]

٦٨)-  شەو ئەنوێ، بەجلی گایە، ڕۆژیش ئەڵێی پاشایە[٦٨]

٦٩)-  شەو دەڕوا، ڕۆژ دەڕوا، قەزا و بەڵا ناڕوا[٦٩]

---

[٥٩] یەکێك ئەیڵێ، کە لە شوێنێکی ناخۆشی خراپ بێ، وە دەست کەوتەکەشی شتێکی هیچ و پووچ بێ.

[٦٠] یەکێك ئەیڵێ کە دەست بوەشێنێ بێ ئەوەی وردبێتەوە.

[٦١] بە یەکێك ئەوترێ کە بڵێ، فیسار کەس باش هەڵگرا، واتە ئەمجۆرە هەڵگرانە دەست کەم کەس ئەکەوێ.

[٦٢] واتە هەموو کاروبارێك لە ڕۆژی شەموانا پیرۆزە، بووك گواستنەوە نەبێ، کە ئەم پیرۆزییەکە لە شەوی هەینی دایە.

[٦٣] بە شتێك ئەوترێ، کە هەرگیز نەگونجێ ببێ.

[٦٤] بە یەکێك ئەوترێ کە کارێکی بدرێ بەسەرا، واتە چۆن شەممە لەملی جوولەکەیە، ئەم کارەش لەملی تۆیە.

[٦٥] واتە کەم بخۆ و زۆر خۆت بشۆ.

[٦٦] بە یەکێك ئەوترێ کە لە ناڵیش بدا و لە بزماریش بدا.

[٦٧] واتە ئەم لەو کەمتر نییە، بە یەکێك ئەوترێ، کە بڵێ: من لە ۆت وەجاخزادەترم.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ کە لە ماڵی خۆیا شتی دڕاوی پینەکراو لەبەر بکات بەڵام لە دەرەوە شتی جوانی بە نرخ بپۆشێ.

[٦٩] واتە قەزا و بەڵا بەسەر کەسا تێ ناپەڕێ، وە هەر ئەبێ بێتەدی.

٧٠)- شەو دەروێش بە، ڕۆژ دەروێش مەبە[٧٠]

٧١)- شەو قەڵای مێردانە[٧١]

٧٢)- شەوی جەژن فەقیریش دەوڵەمەندە[٧٢]

٧٣)- شەوێك و دز هەزار[٧٣]

٧٤)- شەیتان پەلەی کرد، چاوێکی خۆی کوێر کرد[٧٤]

٧٥)- شەیتان ناوبژی کەریان بێ[٧٥]

٧٦)- شەیتانی ئینسان ئینسانە[٧٦]

٧٧)- شتی باش خۆی هاوار ئەکا[٧٧]

٧٨)- شتی چاك پارەی بۆ خۆیەتی[٧٨]

٧٩)- شتی کەم تیز بە خاوەنییەوە ئەکا[٧٩]

٨٠)- شتێ بخۆ، شتێ بدە، شتێ هەڵگرە[٨٠]

---

[٧٠] دەروێش بە شەو هەر نوێژ و خواپەرستی ئەکا، بەڵام بە ڕۆژ ئیشی هەر درۆ و دەلەسە و فڕوفێڵ و دەست بڕینە، کەواتە وەك دەروێش بە لە شەوا، نەك لە ڕۆژا.

[٧١] چونکە تاریکە، وە هەموو کەسێك ئەتوانێ، هەموو کارێکی تیا بکات.

[٧٢] واتە یەکێك ئەگەر کاسەی جەژنی بوو، بە دەوڵەمەند ناژمێرێ چونکە هەموو کەس هەر چەند هەژار بێ لەو شەوەدا خواردنێکی ئەبێ هەر ببێ.

[٧٣] بە چەند کەسێك ئەوترێ کە هەموو لە یەك شت دزی بکەن، وە هیچیان ئاگایان لەوانیکەی تر نەبێ.

[٧٤] واتە لە هیچ کارێکا پەلە مەکە.

[٧٥] بە دوو کەس، یا دوو دەستەی خراپ ئەوترێ، کە بچن بە گژ یەکا، واتە یاخوا هەمیشە هەر لە شەڕا بن.

[٧٦] واتە بەشی زۆری مەردوم، بە قسەی ، بە قسەی هاوڕێی خۆی لە خشتە ئەچێ.

[٧٧] واتە باشی و خراپی چاو و ڕاوی ناوێ، بە یەکێك ئەوترێ کە چاو ڕاو بکا بۆ شتی خۆی، واتە ئەگەر ڕاستە ئەکەیت وا باشە، ئەم چاو ڕاوەی بۆچییە.

[٧٨] چونکە قازانج ئەکات لە جیاتی زەرەر.

[٧٩] کەواتە شت نەدان بە کەس، باشترە لە شتی کەم دان.

[٨٠] واتە ئەوی دەستت ئەکەوێ بیکە بە سێ کەرتەوە، بەشێکی بخۆ، بەشێکی خەرج کە لە ڕێی قازانجی گشتی دا بەشێکیشی هەڵگرە بۆ پاشە ڕۆژت.

٨١)- شتێ بخەرە بن پێت با بگەیتە ئەو[٨١]

٨٢)- شتێ گۆشتی پێ نەگرم، بۆ گۆشتی پێ دانێم[٨٢]

٨٣)- شرە، بخۆ بێ کەسییە[٨٣]

٨٤)- شرکە بێ و رۆنکە بێ[٨٤]

٨٥)- شلّقە مەشکە و چزە تاوە[٨٥]

٨٦)- شمشێر لە گاسنێ، هەر چەند بی پەسنێ هەر ئەچێتەوە سەر ئاسنێ[٨٦]

٨٧)- شنگڵی بدە بە مالاّ، شەیتان بەرە بە چالاّ[٨٧]

٨٨)- شوان ئارەزووی لە پەنیر بێ، لە گونی بەرانا دروستی ئەکا[٨٨]

٨٩)- شوان بە شوانی عار نییە بە نانەوەچنی عارە[٨٩]

٩٠)- شوان تا دانیشێ، گەلەی دوور ئەکەوێتەوە[٩٠]

٩١)- شوانی ناپاك لە گورگ خراپترە[٩١]

---

[٨١] بە یەکێك ئەوترێ بە تەوسەوە کە زۆر هەوڵ بدات بۆ گەیشتن بە یەکێك لە شتێکا، واتە تۆ ناگەیتە ئەو مەگەر گلمتکێك بخەیتە ژێر پێتەوە.

[٨٢] یەکێك ئەیڵێ، کە داوای ئیشێکی لێ بکەن، کە دەردی سەری تیابێ.

[٨٣] واتە ئەمرۆ رۆژی کەوا بخۆرە، بەلاّم چونکە لە تۆ پۆشتەتر نییە کەواتە بخۆ.

[٨٤] بە کالاّ و پۆشاکی کۆن ئەوترێ، واتە هەر پاك و تەمیز بێ با شڕ و دراویشی بێ قەیناکا.

[٨٥] بە ژنێکی نەوسن ئەوترێ لەوانەی ئەگەر مەشکە بژەنێ، دوای ژەندنی خێرا کەرەکەی هەڵچزێنێ و بیخوا.

[٨٦] تەماشای پەندی (سەد ساڵ بی پەسنی) بکە.

[٨٧] بە یەکێکی تەمەڵ ئەوترێ، کە تاقەتی نەبێ ئیشی ناوماڵ بکات.

[٨٨] واتە هەموو کەسێك لە ئیشی خۆیا چی بوێ ئەتوانێ بیکا.

[٨٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە پیشەیەکی پێ نەنگ نەبێ، کەچی پێویستێك لە پێویستانی ئەو پیشەیەی پێ نەنگ بێ.

[٩٠] واتە ئیشی ئەمرۆ مەخەرە سبەینێ.

[٩١] چونکە گورگەکە مەڕێ ئەخوا و ئەڕوا، بەلاّم شوانی ناپاك هەموو رۆژ دەستی ناپاکی ئیش ئەکات.

٩٢)- شوست و شۆی لێ بڕی[٩٢]

٩٣)- شوکرانەی ناعەلاجی روو نەکاتە کەس[٩٣]

٩٤)- شوڵی لێ هەڵکێشاوە[٩٤]

٩٥)- شوێن کڵاوی با بردو کەوتووە[٩٥]

٩٦)- شوێن کڵاوی بابردوو مەکەوە[٩٦]

٩٧)- شوێنی خۆت بناسە[٩٧]

٩٨)- شوێنی شێرە، ڕێوی لێ ئەکەن گێرە[٩٨]

٩٩)- شیاکەی لە قنگ هەڵسو، بی کەرە گاگەل[٩٩]

١٠٠)- شیاکەی، لە قنگ هەڵسویت، ئەچێتە گاگەل[١٠٠]

١٠١)- شێت باشە، شێتەزا خراپە[١٠١]

١٠٢)- شێت بەرنە لای شێخ، شێخ بەرنە لای کێ[١٠٢]

١٠٣)- شێت بگا بە شێت، تەمەرێز هەی تەمەرێز[١٠٣]

---

[٩٢] واتە ئەوەندەی قسەی پێوت تەرزە شکێنی کرد.

[٩٣] بەم رەنگە بەلایەکی گەورەت بە سەرا بێ، وە دەست بە دەستا بدەیت و بڵێیت: خوایە شوکر.

[٩٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کارێکا پێی لێ هەڵبڕێ، وە زۆر بە جەختی بچێتە ژێری.

[٩٥] واتە دوای کارێك کەوتووە کە هەرگیز نابێ.

[٩٦] واتە دوای کارێك کەوتووە کە هەرگیز نابێ.

[٩٧] واتە لە جێیەك دامەنیشە کە هەڵت سێنن.

[٩٨] بە شوێنێك ئەوترێ، کە لەوەپێش یەکێکی گەورەی تیا بووبێ، وە ئێستا تیا نەمابێ، وە لە شوێنەکەی ئەو چەند کەسێکی هیچ و پووچ دانیشتبن.

[٩٩] واتە زۆر کەڕەواڵە و بەسزمانە.

[١٠٠] واتە زۆر کەڕەواڵە و بەسزمانە.

[١٠١] واتە لەگەڵ شێتا هەرچۆنێ بێ ئیدارە ئەکرێ، بەلام لەگەڵ ئەوەی شێتا ئیدارە ناکرێ، چونکە ئەم شێتی کوڕی شێتە.

[١٠٢] بە شێخێك، یا زانایەکی ئایینی ئەوترێ، کە لە ڕێی دین لایدابێ.

[١٠٣] واتە بەهۆی شەڕە شەقیانەوە، ئەبێ بە تەپ و تۆز، چ تەپ و تۆزێ.

١٠٤)- شێت بگا بە شێت، قنگی ئەخوری[١٠٤]

١٠٥)- شێت کە شێت بوو ئەبرێ بۆ لای شێخ، شێخ ئەگەر شێت بوو بـبرێ بـۆ کوێ[١٠٥]

١٠٦)- شێت لە عەقڵی خۆی رازییە، کەس لە بەختی خۆی رازی نییە[١٠٦]

١٠٧)- شێتە بۆ شێتیت؟ ئەڵێ: بۆم ئەلوێ[١٠٧]

١٠٨)- شێتی عاقڵ گێ[١٠٨]

١٠٩)- شێر ئەگەر بتخوا، پەنا بە لانەی رێوی مەبە[١٠٩]

١١٠)- شێر بە گوێ ئەگرێ[١١٠]

١١١)- شیر بەرە بەرە، ئەبێتە کەرە[١١١]

١١٢)- شێر بم شکێنێ، نەك رێوی بمخوا[١١٢]

١١٣)- شێر دەشکێنێ، چەقەڵ و رێوی دەیخوا[١١٣]

١١٤)- شێر کە پیر بوو، چەقەڵ، گاڵتەی پێ ئەکا[١١٤]

---

[١٠٤] واتە هەر کەسێ بە هـاولفی خـۆی دڵـی ئەکرێتـەوە، ئـەم پەنـدە بـە پیـاوی بـەڕێز ئەوترێ.

[١٠٥] ئەمە وەك ئەوە وایە بڵێیت: هەموو شت بە خۆی ئەپارێزرێ، خـۆی ئەگـەر بۆگـەن بوو، بەچی بپارێزرێ؟!

[١٠٦]

[١٠٧] بە یەکێك ئەوترێ، هەرچی داوا بکات بۆی بچێتە سەر.

[١٠٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە دیمەن ساویلکە و کەڕەواڵە و لە دڵیشا وریا و زۆرزان بێ، بە رەنگێکی وا کە بە سەد میچێکی لێ نەبەنەوە.

[١٠٩] واتە مەردوم بش کوژرێ، بە دەستی مەرد بکوژرێ، نەك بە دەستی نامەرد.

[١١٠] واتە زۆر ئازا و بەزاتە.

[١١١] واتە هەموو شتێك بە پێی خۆی دان بە خۆدا گرتنێکی ئەوێ.

[١١٢] واتە مەردوم بش کوژرێ، بە دەستی مەرد بکوژرێ، نەك بە دەستی نامەرد.

[١١٣] واتە لە سایەی پیاوێکی گەورەوە زۆر کەس ئەلەوەڕێ.

[١١٤] بە گەنجێك ئەوترێ، کە گاڵتە بە پیرێك بکا.

١١٥)- شير كه دۆشرا، ناچێتەوە گوان[115]

١١٦)- شێر نوستبێتیش مەچۆرە سەری[116]

١١٧)- شێر، كه پیر بوو، ئەبێ بە مەخسەرەی كەران[117]

١١٨)- شێر، كه پیر بوو، ڕێوی دەمی تێ ئەژەنێ[118]

١١٩)- شێر، كه لە بێشە دەرپەڕی، چ نێرێ چ مێ[119]

١٢٠)- شێر، لە دەنگی كەڵەشێر، ئەترسێ[120]

١٢١)- شێرە بەفرینە، كەس لێی ناترسێ[121]

١٢٢)- شیری حوشتر و دیداری عەرەب[122]

١٢٣)- شێری ماڵەوەیە و ڕێوی دەرەوە[123]

---

[115] واتە قسەیەك یا كردەوەیەك كە كرا، ئیتر ناگەڕێتەوە.

[116] ئەوەك خەبەری بێتەوە.

[117] بە گەنجێك ئەوترێ، كە گاڵتە بە پیرێك بكا.

[118] بە گەنجێك ئەوترێ، كە گاڵتە بە پیرێك بكا.

[119] واتە مەردوم كە ئازا بوو جیاوازی نییە لە ناوەندی نێر و مێ دا.

[120] چونكە دەنگی كەڵەشێر نیشانەی ئاوەدانییە، ئاوەدانیش واتە ئادەمی، هەر لەبەر ئەمەیە كە پێی ئەڵێن: كەڵەشێر، واتە كەڵی شێرە.

[121] شێرە بەفرینە: شتێكە لە وێنەی شێرێكی گەورە دروست ئەكرێ لە بەفر، لە ساڵێكا بەفر زۆر ببارێ، ئنجا بەو كەسانەی كە سنگ شێری ماكەر پشتن پێیان ئەوترێ: شێرە بەفرینە، واتە بێنرخن.

[122] واتە نە ئەوم ئەوێ بی خۆم و نە ئەمم ئەوێ ببینم. بە شتێك ئەوترێ كە نەتەوێ هەرگیز چاوت پێی بكەوێ، بەڵام شاعرێكی ئێرانی لە مدحی عەرەبێكی حوشترسوارا ئەڵێ:

گر این شتر و شتر سوار این عرب ست　　　من شیری شتر خواهم دیدار عرب

واتە ئەگەر حوشتر ئەمەیە و حوشتر سوار ئەم عەرەبەیە، من ئارەزووی شیری حوشتر و دیداری عەرەب ئەكەم.

[123] بە یەكێك ئەوترێ كە لە ناو پیاوانا نەوێرێ قسە بكات، بەڵام لە ناو ماڵی خۆیا هەمیشە شاتەی بێ.

١٢٤)- شیری میسر، له کیلانا ناوێستێ[١٢٤]

١٢٥)- شین و شایی، دەستەوایی[١٢٥]

١٢٦)- شیو لەشکرە، یا دێ یا دەچێ[١٢٦]

١٢٧)- شێوی خۆش، له هەڵمی ڕا دیارە[١٢٧]

١٢٨)- شێوی زۆر کابان، یا سوێرە یا بێخوێ[١٢٨]

[١٢٤] واته هەر کەسێك جەوهەرێکی بێ، بێ پەروا جەوهەرەکەی خۆی دەرئەخات.

[١٢٥] واتــه خۆشــی و ناخۆشــی دەســتیاوە، بــەم ڕەنگــه هــەر کەسـێك بــه خۆشــی و ناخۆشیمەوە بێ منیش به خۆشی و ناخۆشــی ئــەوەوە ئــەبم، وە ئەگــەر نــەبێ ئــەوان منیش نابم.

[١٢٦] واته چۆن لەشکر جارێ سەر ئەکەوێ و جارێ ژێر، شیویش وایه.

[١٢٧] به شتێك ئەوترێ، که هەر به بۆن و بەرامەیا دیار بێ که باشه.

[١٢٨] یا هەموو خوێی تێ ئەکەن، یا هیچیان تێی ناکەن.

# پیتی عەین

١)- عاشقی کاشی کەووگ بووگە[١]

٢)- عاقڵ کەر ئەبێ، کەر عاقڵ نابێ[٢]

٣)- عاقڵ، دووجار ناخەڵەتێ[٣]

٤)- عالەم بە جن پێ ئەکەنێ، جنیش بە ئاشەوان[٤]

٥)- عالەم هەڵ ئەستا خلەی ئەگا، خلەش هەڵ ئەستا بلەی ئەگا[٥]

٦)- عەباسی خۆت دەربێنە ئنجا گاڵتە بە شایی من بکە[٦]

٧)- عەرەب چە عەرەب، نەدارۆ ئەندێش[٧]

٨)- عەشرەت گلێرە، وەختی کولێرە[٨]

٩)- عەقڵ بە گەورە و بچوکی نییە[٩]

١٠)- عەقڵ نەبێ گیان لە عەزابایە[١٠]

---

[١] کەوگ: شینە. بە یەکێك ئەوترێ کە حەزی لە شتی زەرقی رەنگاوڕەنگ بێ.

[٢] واتە کەم جار مەردومی ژیر بە هۆی شتێکەوە تووڕە ئەبێ و کاری ناپەسەند ئەکات، بەڵام پیاوی کەر هەرگیزە ژیر نابێ.

[٣] چونکە جاری یەکەم کە خەڵەتا، ئەگەر عەقڵی بێ دەرس وەرئەگرێ، بۆ جارێکی تر، کە وەری نەگرت، ئەوە مەعنای وایە کە عەقڵی نییە.

[٤] بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوترێ، کە گاڵتە بە یەکێکی لە خۆی باشتر بکات، وایە هەموو کەس بە تۆ پێ‌ئەکەنێ، تۆش بە من.

[٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆی ژێر دەستی هەموو کەسێك بێ کەچی ئەویش ئازایەتی خۆی بەسەر یەکێکی بەسزمانا بنوێنێ.

[٦] واتە یەکێك گاڵتە ئەکات بە یەکێك لە شتێکا، کەخۆی لەو زیاتر بێ لەو شتەدا.

[٧] واتە عەرەب لە عەرەب ناترسێ، چونکە پشتی یەك نادەن لە زەوی.

[٨] واتە کەس وکار، لە کاتی خۆشیدا پێتەوەن.

[٩] واتە زۆر کەسی وا هەیە بە تەمەن منالە کەچی زۆر ژیرترە لە زۆر کەس لەوانەی کە بە تەمەن لەم گەورەترن.

[١٠] چونکە هەر عەقڵە لێخوری ئادەمی بۆ رێی راست.

١١)-   عەقڵی گونم و عەقڵی ژنم وەك یەك وایە[11]

١٢)-   عەقڵی لە ئەژنۆیایەتی[12]

١٣)-   عەقڵی منداڵی، تری کەنداڵی[13]

١٤)-   عەمەل سستی قسە دروست[14]

١٥)-   عەنەزەی دەوری مەرەزە[15]

١٦)-   عوزر، روو سپی ناکا[16]

١٧)-   عوزر، لە قەباحەت خراپتر[17]

١٨)-   عومری پیرە مەرێکی ماوە[18]

١٩)-   عومری درێژ، شەرمی لە کەس نییە[19]

٢٠)-   عومری گەیشتە شەستە، موروان ئەکاتە دەستە[20]

٢١)-   عیسایی بە دینی خۆی مووسایی بە دینی خۆی[21]

٢٢)-   عێل، باوانی عێلە[22]

---

[11] ئەمە قسەی هێندێ پیاوی قەبەی، کەللە بۆشی مێشك پووتە کە گونی خۆی و گێزەر لێك ناکاتەوە، ئەگەر ئەمە وایە و بۆچی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام لە کاتی تەنگ و چەڵەمەدا، راوێژی کردووە لەگەڵ خێزانی خۆیا، وە بە قسەی کردوون، وەك لە صلحی حدیبەدا.

[12] واتە زۆر بێعەقڵە.

[13] واتە وەك یەك بێنرخن.

[14] بە یەکێك ئەوترێ کە قسەی ببێ و کردەوەی نەبێ.

[15] عەنەزە:جۆرە وڵاخێکی رەسەنە، کە هەمیشە لە ناو مێرگ و دەورووبەری مەرەزەدا بێ بۆ لەوەڕین، بەیەکێك ئەوترێ کە هەمیشە لە ملّ وموۆشی خواردندا بێ.

[16] واتە شەرمەزاری لانابا.

[17] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەڵەیەك بکات و لە پاشا عوزرێکی وای بۆ بێنێتەوە لە هەڵەکە ناشرین تر بێ.

[18] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ئاخر و ئۆخری تەمەنیا بێ.

[19] واتە شتێکت کە بوو، بە هەڵە باشی مەیخۆ، وە هەڵی گرە بۆ کاتی پیریت، کە کەس نایەت بەلاتا.

[20] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە گوفتار یا بە کردار خۆی منداڵ بکاتەوە.

[21] واتە هەر کەسە لە ئایینی خۆیا سەربەستە.

[22] واتە کوڕی هۆز، هەرگیز پشتی کوڕی هۆز نادا لە زەوی.

# پیتی غەین

١)- غەزیم بوو بە بڕنووتی، هەموو فلّقێ کردیە لووتی.

٢)- غەمی نان بخۆ، خەربزە (کالّك) ئاوە.

# پیتی ڤێ

١)- فەخر، بەڕەی ناو دڕاوە[١]

٢)- فەخر، گونی شۆڕە[٢]

٣)- فەرقی گونی خۆی و گێزەر ناکا[٣]

٤)- فەرموودە و تڕکەن هیلاك نابن[٤]

٥)- فەقیانە سپی کەرێ نایکێشێ، لە ماڵیا نییە دەنکە بڕوێشێ، نییە لێفە شڕێ، قاچی تێکێشێ[٥]

٦)- فەقیانە سپی، سەڵتە با بردوو، دوو ژنت بۆچییە لە برسا مردوو[٦]

٧)- فەقیر ئەیەڵێ لە ئاش بێتەوە، دەوڵەمەند نایەڵێ لە ساج بێتەوە[٧]

٨)- فەقیر گوو ئەکا، چیلکە ئەچێ بە قنگیا[٨]

٩)- فەقیر لای باوە ئەتسێ[٩]

---

[١] واتە فەخر ئەنگێکی وایە کە داناپۆشرێ، وەك بەڕەیەك کە ناوەڕاستەکەی دڕابێ.

[٢] واتە تووشی ئازارت ئەکات.

[٣] واتە زۆر بێ عەقڵە.

[٤] فەرموودە: چەنەبازە، واتە ئەم دووانە هەرگیز هیلاك بوونیان نییە.

[٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر چێکی دەست کەوێ بیدا بە بەرگی جوان و بە خۆیا بژەنێ، لە ماڵیشا هیچ نەبێ.

[٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر چێکی دەست کەوێ بیدا بە بەرگی جوان و بە خۆیا بژەنێ، لە ماڵیشا هیچ نەبێ.

[٧] واتە هەژار لە دەوڵەمەند بە سەبرترە.

[٨] واتە بەدبەختە.

[٩] واتە زۆر بەدبەختە، ئەوی ئەشی کا خراپی ئەکا.

١٠)- فەقیری خۆشە، قۆرتی ناخۆشە[١٠]

١١)- فەقیری راست، شەریکی دەوڵەمەندە[١١]

١٢)- فەنی تۆلە شەڕە سەگت چی[١٢]

١٣)- فرۆشتن، لە خواستن چاکترە[١٣]

١٤)- فڕە فڕی ماشان لە دەنگی قورحان خۆشترە[١٤]

١٥)- فرستادە هیچی لەسەر نییە[١٥]

١٦)- فرمان لە سارا، رۆن لە بەهارا[١٦]

١٧)- فرمانکەرە بمرێ، تەدبیرکەرە نەمرێ[١٧]

١٨)- فوو لە ئاگر کەیت، سمێڵت ئەسووتێ[١٨]

١٩)- فوو لە دۆ ناکا[١٩]

---

[١٠] یەکێکی هەژاری کەم دەست ئەیڵێ، کە خۆی یا ماڵ و منداڵی تووشی نەخۆشی یا شتێکی وا بووبێ کە پێویست بە پارە خەرج کردن بێ.

[١١] لە ئیسلامەتیدا سود نییە، ئنجا ئەگەر هەژار سەر راست بێ، بەم رەنگە لەگەڵ قەرزی کرد، لە کاتی خۆیدا بیداتەوە، ئەو حەلە دەوڵەمەندیش درێغی لێ ناکات، وە بە بێ سوود قەرزەکەی ئەداتێ، وە هەژارەکە ئەبێ بە هاوبەشی دەوڵەمەندەکە لە داراییەکەیدا.

[١٢] فەنی: توتکە سەگە. بە یەکێك ئەوترێ کە چووبێ بە گژ پیاوێکی گەورەدا و ژێر کەوتبێ.

[١٣] واتە شتی ناو ماڵت بفرۆشیت و نامانگوری خۆتی بێ لابەریت چاکترە لەوەی کە شت لەم و لەو بخوازیت.

[١٤] واتە دەنگی هەڵقوڕاندنی شۆربای ماش، لە گوێچکەی برسی دا لە دەنگی قورئان خۆشترە، یەکێك ئەیڵێ کە زۆری برسی بێ، وە لە جیاتی ئەوەی نانی بۆ دانێن کەچی قورئانی بۆ بخوێنن.

[١٥] چونکە هەرچی ئەڵێ و ئەیگەیەنێ،قسەی خۆی نییە ، بەڵکو قسەی یەکێکی ترە.

[١٦] سارا: دەشتە، واتە ئیشی بەهاران و هاوینان لەدەشتا خۆشە، وەك رۆنی بەهاران.

[١٧] واتە یا خوا هەر بچوك بێ بە باڵا گەردانی گەورەی ماڵ.

[١٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئاگری دوژمنایەتی هەڵگیرسێنێ لە ناوەندی دوو کەسا.

[١٩] واتە لە حەڵاڵ و حەرام ناپرسێتەوە.

٢٠)- فێر کەران فێریان مەکە، کە فێریان ئەکەیت تێریان بکە[٢٠]

٢١)- فێری رۆین بە و بەر لەوەی راکەیت[٢١]

٢٢)- فێری رۆین بە، ئنجا دەست بکە بە راکردن[٢٢]

٢٣)- فیکە بە برای بێ لێو ئەکەن[٢٣]

٢٤)- فیکەی خۆی ئەناسێ[٢٤]

---

[٢٠] واتە هەر چاکەیەکت کرد بی بەرە سەر تا دوایی.

[٢١] واتە هەموو کارێك ئەبێ پلە پلە دەستی بدرێتێ.

[٢٢] واتە هەر چاکەیەکت کرد بی بەرە سەر تا دوایی.

[٢٣] بە یەکێك ئەوترێ کە کارێك بە یەکێك بکات کە لێی نەزانێ.

[٢٤] بە یەکێك ئەوترێ ئەگەر بە قسە پلارێکیان تێگرت، خێرا تێ بگا.

# پیتی قاف

۱)- قازانج سەری مایەی خوارد[۱]

۲)- قازانجی گاوان، ماکەر گاینە[۲]

۳)- قازانی گەردوون هەر چەند دێر تێتە جۆش، ئاخری هەر تێتە جۆش[۳]

٤)- قازانی مێردان بە حەوتساڵ دێتە جۆش[٤]

٥)- قالۆنچە بۆنی گوڵ بکا سەری دێشێ[٥]

٦)- قالاو چی کرد، تا قشقەڕە بیکا[٦]

۷)- قەبر هەڵکەن، بیزانیایە کەی ئەمرێ چاڵێکی بۆ خۆی هەڵ ئەکەند[۷]

۸)- قەتیول و بەتیول، مەردنەپەی پول[۸]

۹)- قەحبە کە پیر بوو، تەوبە ئەکا[۹]

۱۰)- قەحبە لە کێری زل ناترسێ[۱۰]

۱۱)- قەدری دان وا بە لێوەوە[۱۱]

---

[۱] واتە بۆ قازانج چووم کەچی دەست مایەکەشم دانا.

[۲] واتە پیشەی سووک، قازانجیشی هەر سووکە.

[۳] واتە هەر کەسێك لە جیهانا هەڵە بکات، تۆڵەی خۆی ئەبێ هەر بدا.

[٤] واتە پیاوی گەورە، درەنگ تووڕە ئەبێ.

[٥] بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ هێندێ شتی باشا سەر و ساختی نەبێ.

[٦] واتە گەورە چی کرد، تا بچوکیش بیکا، واتە شتی گەورە نەتوانێ بیکا، بچوك هەر ناتوانێ.

[۷] واتە کەس علمی غەیبی نییە، ئەگینا هەرچی قازانج بوایە بۆخۆی ئەبرد.

[۸] واتە گەورە و بچوك لە کراسی خۆیا بۆ پارە مردووە.

[۹] بە یەکێکی خراپ ئەوترێ، کە دوای ئەوەی پەکی کەوت ئنجا دەست لە خراپی هەڵگرێ.

[۱۰]

۱۲)- قەدری زەڕ بەلای زەڕەنگەرەوەیە[12]

۱۳)- قەدری مانگ نییە تا نەگاتە شەو[13]

۱٤)- قەرز بە قەرز دەست ئارداوی[14]

۱۵)- قەرز دوو ماڵ ئاوەدان ئەکاتەوە[15]

۱٦)- قەرز کۆن ئەبێ، نافەوتێ[16]

۱۷)- قەرز کردن و دانەوەی دوو دڵ ئاوەدان ئەکات[17]

۱۸)- قەرز کردنەکەی خۆشە، دانەوەی ناخۆشە[18]

۱۹)- قەرزار، قەرزاری نەکوشتوە[19]

۲۰)- قەرزی بێنە و نییەیە[20]

۲۱)- قەرزی کۆن و خزمی دووری بەیاد کردوە[21]

---

[11] بە یەکێك ئەوترێ، ئەو کەسەی کە مایەی حورمەتی بووبێ نەمێنێ.

[12] چونکە هەر ئەو ئەیناسێ و پەسەندی ئەکا.

[13] واتە هەموو شت لە وەختی پێویستا نرخی دەرئەکەوێ.

[14] واتە ئەم ئاردی دا بەو بە قەرز، وە ئەویش قەرزەکەی دایەوە بەم بە بێ زیاد و کەم، وە هیچ لایەکیان هیچیان دەست نەکەوت دەستی ئارداویی نەبێ.

[15] یەکەم ئەو کەسەی قەرزەکە ئەکات، دووهەم خاوەن قەرز چونکە لە وەختێکا بۆی ئەهێنێتەوە کە خۆی زۆر پێویستی بە پارەکەیە.

[16] ئەمە رەوشت و خووی جارانی کورد بوو کە زۆر موسڵمان بوون وە هەر چۆنێك بوایە قەرزەکەی ئەدایەوە، بەڵام ئێستا هەرچی قەرز بدا بە یەکێك، دوژمنێك بۆ خۆی ئەکڕێ.

[17] یەکەم دڵی قەرزدارەکە، کە پێویستە بە قەرزەکە و دەستی ئەکەوێ، دووهەم خاوەن قەرزەکە، کە قەرزەکەی دەست ئەکەوێتەوە.

[18] واتە تا ئەتوانی قەرز مەکە.

[19] قەرزارێك ئەیڵێ، کە خاوەن قەرز داوای قەرزەکەی لێ بکاتەوە وە تەنگی پێ هەڵ بچنێ.

[20] یەکێك ئەیڵێ، کە قەرزی دابێ بە یەکێك، وە هەر چەند داوای بکاتەوە، بڵێ: نییە.

٢٢)- قەزای دیزە کەوت لە گۆزە[٢٢]

٢٣)- قەزر تا بمێنێ قەڵەو ئەبێ[٢٣]

٢٤)- قەساب گۆشتی بێ ئێسقان نافرۆشێ[٢٤]

٢٥)- قەساب کاتێ ئاشنایە، گۆشتی لێ قەرز نەکەیت[٢٥]

٢٦)- قەل ئەگەر مەلێکی شەریف بووایە، گووی نەئەخوارد[٢٦]

٢٧)- قەل بە قەل ئەڵێ روو رەش[٢٧]

٢٨)- قەل بە قەل ئەڵێ رووت رەش بێ[٢٨]

٢٩)- قەل بەخێو کەیت، چاوت دەردێنێ[٢٩]

٣٠)- قەل فڕی، قشقەڕە دەرپەڕی[٣٠]

٣١)- قەیاری هاتووە[٣١]

٣٢)- قەیسەری لێ بووە بە کونە مشك[٣٢]

---

[٢١] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەژار کەوتبێ، وە بە دوو شتی رۆیوا بگەرێ کە زیندوی بکاتەوە.

[٢٢] بە بەلایەك ئەوترێ، کە بۆ یەکێك بێ و بەر یەکێکی تریکەوێ.

[٢٣] بەم رەنگە قەرزدار شەرمەزار ئەبێ.

[٢٤] واتە شتی بێ نەنگ نییە.

[٢٥] واتە ئاشنایەتی قەساب هەر ئەوەندە بڕ ئەکا کە ماددە نەیەتە پێشەوە.

[٢٦]

[٢٧] بە پیاوێکی خراپ ئەوترێ کە ناوی یەکێکی تر بە خراپ ببا.

[٢٨] بە پیاوێکی خراپ ئەوترێ کە ناوی یەکێکی تر بە خراپ ببا.

[٢٩] واتە خزمەتی نارەسەن مەکە.

[٣٠] بە دوو کەسی خراپ ئەوترێ، کە لەگەڵ یەکێکیان کارێکی کرد ئەوی تریشیان بیکا.

[٣١] قەیار: زیادەی سمی ولاخی یەك سمە، بە یەکێك ئەوترێ کە یاخی، وە زیاد لە ئەندازەی خۆی سەربەست بووبێ، واتە چۆن ئەو ئەبێ قەیار بکرێ، ئەمیش ئەبێ نینۆك بکرێ.

٣٣)- قرانێکم نییه بیدەم به شێلانه، ئامۆزاکەم ئەڵێ: ژن بێرانه[٣٣]

٣٤)- قسه ئەکەیت بەدناویت، قسەش ناکەیت پونگاویت[٣٤]

٣٥)- قسه به پاش حەوت کێو ئەگاتەوه بەخێو[٣٥]

٣٦)- قسه بی گێزه و بی بێژه و بی وێژه[٣٦]

٣٧)- قسه تا نەجوویت، قووتی نەدەیت[٣٧]

٣٨)- قسه تا نەکوڵێنیت، دەری نەهێنیت[٣٨]

٣٩)- قسه حەوت پلەی هەیه[٣٩]

٤٠)- قسه قسه ئەهێنێ[٤٠]

٤١)- قسه که بوو بەدوو، ئەبێ به گوو[٤١]

٤٢)- قسه کەوته زارێ، ئەکەوێته شارێ[٤٢]

٤٣)- قسه کردن به پاره بووایه، کەس نەی ئەکڕی[٤٣]

---

[٣٢] به یەکێك ئەوترێ که له شتێك بترسێ و خۆی لێ بشارێتەوه.

[٣٣] شێلانه: قەیسییه. به یەکێکی ئەڵێت، که پێت بڵێ: فلان کار بکه، که تۆ لەوه گەلێ سووکترت پێ نەکرێ.

[٣٤] یەکێك ئەیڵێ که قسەیەك له دڵیا بێ، نه بتوانێ بیکا نه بتوانێ نەیکا.

[٣٥] کەواته تا ئەتوانیت ناوی کەس به خراپه مەبه.

[٣٦] واته قسەیەك که هاتیته سەر کردنی، لە پێشەوه — وەك دانەوێڵه به قەڵبیری مێشکت گێژی بده و سەر کۆزەرەکەی بگره، ئنجا بێژنگی بیر بی بێژەرەوه، وه هەرچی زیوانێکی پێوەیه بی گره، ئنجا به پاکی و پوختەیی بیڵێ.

[٣٧] واته ئەو قسەیەی ئەتەوێ بیکەیت، تا بیری لێ نەکەیتەوه نەیڵێیت.

[٣٨] واته له ئەنجامی قسەکەت ورد بەرەوه، ئنجا بیکه.

[٣٩] واته حەوت جار ئەبێ ئەم دیو ئەو دیوی بکەیت، وه له هەموو لایەکەوه لێی ورد ببیتەوه، ئنجا بیکه.

[٤٠] واته قسه قسه رائەکێشێ.

[٤١] واته قسەیەك هەر تاقه جارێك ئەبێ بکرێ.

[٤٢] زار: دەمه، واته قسەکه له دەم دەرچوو، ئیتر بڵاو ئەبێتەوه بەشارا، کەواته تا ئەتوانی ئاگات له نهێنی خۆت بێ.

٤٤)- قسه له قافا خۆشه[٤٤]

٤٥)- قسه له قافیەدا خۆشه[٤٥]

٤٦)- قسه مەکه بۆ دۆستی ویت، نەوا ئەویش دۆستێکی بێت[٤٦]

٤٧)- قسه ناچێته جەواڵەوه[٤٧]

٤٨)- قسه ناچێته گیرفانەوه[٤٨]

٤٩)- قسه هاته روو، نامێنێ ئەرجوو[٤٩]

٥٠)- قسه هەتا نەکولێ دەرنایەت[٥٠]

٥١)- قسه هەزاره، دوانی بەکاره[٥١]

٥٢)- قسه هیچی تێ ناچێ[٥٢]

٥٣)- قسه یا له شێت ببیسه، یا له مناڵ[٥٣]

٥٤)- قسەکەت له دەما بە شەکر بێ[٥٤]

---

[٤٣] واته قسه قسه رائەکێشێ.

[٤٤] واته قسەی بێجێ مەکه.

[٤٥] واته قسەی بێجێ مەکه.

[٤٦] ویت: خۆت، واته قسەی نهێنی خۆت مەگێڕەوه بۆ دۆستێکی خۆت نه وەك ئەو کەسەش دۆستێکی ببێ بۆی بگێڕێتەوه.

[٤٧] به یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی نابەجێ بکات، وه تۆ قسەکەی ببەیته دواوه، واته قسه ئەوەیه بچێته مێشکەوه خۆ ناچێته جەواڵەوه یا گیرفانەوه.

[٤٨] به یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی نابەجێ بکات، وه تۆ قسەکەی ببەیته دواوه، واته قسه ئەوەیه بچێته مێشکەوه خۆ ناچێته جەواڵەوه یا گیرفانەوه.

[٤٩] واته کە قسەیەك درا له ناوەندی دوو کەسا، ئیتر ئەبێ بێ پەردە قسه بکرێ، وه جێی تکا نامێنێ.

[٥٠] تەماشای راڤەی پەندی ئۆهەم بکه له پیتی (ق).

[٥١] به یەکێك ئەوترێ کە له بابەت شتێکەوه قسەی زۆری بێ کەڵك بکات.

[٥٢] کەواته له قسەی باشا، درێغی مەکه، یاخۆ به یەکێك ئەوترێ، کە قسەی هاشە و هوشه زۆر بکات.

[٥٣] چونکه هەر دوکیان، بێ پەردە قسه ئەکەن.

٥٥)- قسەم حەقە، بۆیە ڕەقە[٥٥]

٥٦)- قسەی ئەوو، تڕی دەیایی لایەکە[٥٦]

٥٧)- قسەی تتەر، کوێستانی تەر[٥٧]

٥٨)- قسەی پاڵودار، تاڵە و نالەبار[٥٨]

٥٩)- قسەی پیاو لە سەنەد گەورەترە[٥٩]

٦٠)- قسەی پێشینان وەك نەقشی دیوار وایە[٦٠]

٦١)- قسەی پێشینانە، ماچ قەرەوڵی گانە[٦١]

٦٢)- قسەی حەق ڕەقە[٦٢]

٦٣)- قسەی حسابی زۆر زوو سەوز ئەبێ[٦٣]

٦٤)- قسەی خۆت بۆ یار مەکە یاریش یاری هەیە[٦٤]

٦٥)- قسەی خۆش کوێستانی کێرە[٦٥]

٦٦)- قسەی خۆمان، لە بیر خۆمان[٦٦]

---

[٥٤] یەکێك ئەیڵێ کە بیەوێ قسە بە یەکێکی تر بڕێ و خۆی قسە بکا.

[٥٥] بە یەکێکی ئەڵێیت کە پێت بڵێ: تۆ زۆر قسەت ڕەقە.

[٥٦] واتە هیچ نرخی نییە.

[٥٧] یەکێك ئەیڵێ کە بە هاشە و هوشە و بەڵێنی خۆش ئیخفاڵ کرابێ.

[٥٨] واتە قسەی بە توێکل ناخۆشە، وە هەرگیز توانج مەگرە کەس.

[٥٩]

[٦٠]

[٦١] قەرەوڵ: سەرەتایە، واتە کار کە گەیشتە ماچ و موچ، ئەش گاتە شتێکی ناشرین تر.

[٦٢] چونکە لە قازانجی ئەو کەسە نییە کە قسەکەی پێ ئەڵێت.

[٦٣] بە قسەیەکی ڕاست ئەوترێ، کە لەگەڵ کرا خێرا بێتە جێ، واتە قسەی ڕاست زوو دەرئەکەوێ.

[٦٤] واتە یارەکەشت بۆ یاری خۆی ئەگێڕێتەوە، ئەو حەلە بڵاو ئەبێتەوە.

[٦٥]

٦٧)- قسەی خولە، باسی بلەی لە ناو برد[٦٧]

٦٨)- قسەی دڵت بۆ من بێ[٦٨]

٦٩)- قسەی راست بەردە، راست گۆبە، درۆ بەردە[٦٩]

٧٠)- قسەی سوارە[٧٠]

٧١)- قسەی شەو، وەك خەو، کەمتر دێتە روو[٧١]

٧٢)- قسەی گوێ ئاگردانە[٧٢]

٧٣)- قسەی کورت درێژ مەکە، رێگەی نزیك دوور مەکە[٧٣]

٧٤)- قسەی نەخشی بەردە[٧٤]

٧٥)- قسەی وەك قوڕی زستان وایە[٧٥]

٧٦)- قسەیەك بکە سەر بگرێ، ربەیەك بگرە جێ بگرێ[٧٦]

٧٧)- قسەیەك بکە کەڵك بگرێ، مەنێك بپێوە سەر بگرێ[٧٧]

٧٨)- قسەیەك دەمم کەوتەرە، سەرم لوا جەتەرە[٧٨]

---

[٦٦] یەکێك ئەیڵێ بە چەند کەسێك کە بە کۆمەڵی قسە لە کارێك بکەن وە یەکێکی بێگانە بچێ بە سەریانا وە ئەوانیش قسەکە هەڵگرن بۆ وەختێکی تر.

[٦٧] بە قسەیەك ئەوترێ، کە بە سەر قسەیەکی ترا بێ، وە ئەویان ئەمیان داپۆشێ.

[٦٨] بە یەکێکی ئەڵێت کە قسەیەکی ساردت لەگەڵ بکات، واتە ئەم قسە ساردەت هەر بە سەر زارییە، وە بە دڵ هەر لەگەڵما مێهرەبانیت.

[٦٩] واتە قسەی راست وەك بەرد رەقە، راست بە و دەست لە درۆ هەڵگرە.

[٧٠] واتە قسەی لە سەرەوەیە.

[٧١] واتە قسەیەك لە شەوا بکرێ، کەمتر دێتە جێ.

[٧٢] واتە هیچ نرخێکی نییە، بە یەکێك ئەوترێ کە هاشە و هوشە بکات.

[٧٣] واتە هەموو شتێك لە کورتی ببڕێتەوە.

[٧٤] واتە کە قسەیەکی کرد ئەیباتە سەر.

[٧٥] واتە لێی ناگیرێ.

[٧٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەی زل و پف هەڵدراو بکا.

[٧٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەی زل و پف هەڵدراو بکا.

٧٩)- قسەیەکیش بۆ دز بکەین[٧٩]

٨٠)- قفڵ بۆ پیاوی بە حەیایە[٨٠]

٨١)- قفڵ بۆ حەڵاڵ زادە لێ ئەدرێ[٨١]

٨٢)- قفڵی لە دەمی خۆی داوە[٨٢]

٨٣)- قنگ بە قەڵماسك باس ناکرێ[٨٣]

٨٤)- قنگ بدەرە سەر دەرپێی خۆت[٨٤]

٨٥)- قنگ حیز بە، دەم حیز مەبە[٨٥]

٨٦)- قنگێ فێری ترین بێ، تەرکی ناکات[٨٦]

٨٧)- قنگە، برۆ بەولاوە، بۆنی گوت لێ دێ[٨٧]

٨٨)- قنگەڵاشك، لە خۆی بەشك[٨٨]

٨٩)- قنگی رەش و سپی، لە بوارا درمئەکەوێ[٨٩]

---

[٧٨] دەمم کەوتەرە: واتە لە دەمم دەرچوو. لواجەوتەرە: واتە چوو بە جەوتا، واتە لە پێناوی قسەکەدا سەرمی تیا چوو.

[٧٩] واتە تاوان بار، ئەگەر بیانوو (عوزر)یەکی بە دەستەوە بوو، پێویستە نەکرێ بە ژێر لێوەوە.

[٨٠] ئەگینا بێحەیا، یا ئەیشکێنێ وە یا بە شتێك هەڵی ئەگرێ.

[٨١] ئەگینا بێحەیا، یا ئەیشکێنێ وە یا بە شتێك هەڵی ئەگرێ.

[٨٢] واتە بە هیچ جۆرێ قسە نەکا.

[٨٣] بەڵکو بە ئازایی و رەوشت و خوو، باس ئەکرێ.

[٨٤] واتە دەست درێژی مەکە، وە ئاگات لە دەست و زبانت بێ.

[٨٥] چونکە یەکەم زەرەری هەر بۆ خۆیەتی، بەڵام دووهەم زەرەری بۆ مەردومە.

[٨٦] بە یەکێك ئەوترێ کە فێری شتێکی ناشرین بووبێ.

[٨٧] بە پیاوێك ئەوترێ، کە دەوڵەمەند ببێ، وە بە ژنە کۆنەکەی – کە رەفیقی هەژاریەتی رازی نەبێ، وە ژنی بە سەر بێنێ‌ن وە ئەم بخاتە لاوە.

[٨٨] قنگەڵاشك: بنجە درکێکی وشکەوە بووە، کە بابیباتە پەنایەکەوە لە رووی تەوسەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەك بکرێ وە ئەو بیباتە سەر خۆی.

٩٠)- قنگی کەر حەمامە[٩٠]

٩١)- قنگی کردە رەشەبا[٩١]

٩٢)- قوڕ بە سەر ئەو کەسەی فیرعەون پێی بڵێ کافر[٩٢]

٩٣)- قورئان ئەفرۆشرێ، ئەدرێ بەنان[٩٣]

٩٤)- قورئانی دا بە تەمورە[٩٤]

٩٥)- قوڕاوی دنیای بە قنگدا هەڵپڕاوە[٩٥]

٩٦)- قوڕی بۆ گیراوەتەوە[٩٦]

٩٧)- قوزە چێلە، نە بە کەڵکی سیرمەدێ، نە بە کەڵکی پێستە[٩٧]

٩٨)- قوزەکە مەترسە، قوزەکە مەلەرزە[٩٨]

٩٩)- قوزی لە قەحبان، مشتە لە دۆمان ناکرێ[٩٩]

١٠٠)- قوزی ی بەرکوانوو بێقەدرە[١٠٠]

١٠١)- قوزی ی گوێ ئاگردان قەدری نییە[١٠١]

---

[٨٩] واتە هەموو شتێك لە کاتی تاقی کردنەوەدا دەرئەکەوێ.

[٩٠] بە شتێك ئەوترێ کە نەگونجێ.

[٩١] واتە مرد، لە رووی سووکیەوە ئەوەترێ.

[٩٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە تاوان بارێك، بە تاوان بار، ناوی ببا.

[٩٣] بەیەکێك ئەوترێ، کە حورمەتی نان نەزانێ چییە.

[٩٤] واتە حەڵاڵی دا بە حەرام.

[٩٥] بەیەکێك ئەوترێ، کە هەموو جۆرە ناخۆشییەکی لە جیهانا دیبێ.

[٩٦] واتە تووشی چورتمێکی زۆر گەورە بووە.

[٩٧] بە یەکێك ئەوترێ کە بە کەڵکی هیچ نەیەت.

[٩٨] یەکێك ئەیڵی لە ناوەندی دوو کەسا، کە بیەوێ لە سەر کارێك رێکیان خات.

[٩٩] چونکە هەمیشە، خۆیان پێویستن پێیان.

[١٠٠] کوانوو: ئاگردانە، واتە چونکە لە منالیەوە لە ماڵێکا گەورە بوون وە لە گوێ ئاگردانێك دانیشتوون، بۆیە لەبەرچاوی بێ نرخە.

۱۰۲)- قوڵفی کەعبەی گرتووە[102]

۱۰۳)- قوڵفی کعبە کەچ نابیٚ[103]

۱۰٤)- قومارچی ئەگەر نەڵیٚ: بە گونمەوە شەق ئەبا[104]

۱۰٥)- قونیٚ بدە منالیٚ، دەمی مەدەریٚ[105]

۱۰٦)- قونی سەر تەندور، کەوتە سەر مافوور[106]

۱۰۷)- قوونیٚ لە دووم مەڕۆ، بۆنی گووت لیٚ دیٚ[107]

۱۰۸)- قوونیٚ، هەر کلت پیا ئەویٚ[108]

۱۰۹)- قۆندەرە بۆ کەسێکە بزانیٚ لە پێی کا، نە وەك ناکەس ئەم پیٚ و ئەو پێی کا[109]

۱۱۰)- قۆندەرەکانی جیڕەی دیٚ، سکی لە برسا قۆڕەی دیٚ[110]

۱۱۱)- قیاسی کەشکە، لە مشك[111]

۱۱۲)- قیری کەوای سپییە[112]

---

[101] کوانوو: ئاگردانە، واتە چونکە لە منالیەوە لە ماڵێکا گەورە بوون وە لە گویٚ ئاگردانێك دانیشتوون، بۆیە لەبەرچاوی بیٚ نرخە.

[102] واتە پشتی بەهێزە.

[103] یەکێك ئەیڵیٚ، کە داوای کارێك لە یەکێك بکات، ئەویش بڵیٚ: ئەم کارە ناکریٚ، ئەمیش بڵیٚ: بۆچی ناکریٚ؟ خۆ قوڵفی کەعبە کەچ نابیٚ.

[104] چونکە بە کردار ژێرکەوتووە، ئنجا ئەگەر بە گوفتاریش ژێر کەویٚ شەق ئەبات.

[105] واتە قنگت بدەیتە دەست منالّ باشترە، لەوەی قسەی خۆتی بدەیتیٚ.

[106] بەیەکێکی هەژار ئەوتریٚ، کە جاران نەی بوویٚ و ئێستا ببیٚ.

[107] بەیەکێك ئەوتریٚ کە لەگەڵ خۆشی بە فیز بیٚ.

[108] بە شتێکی وا ئەوتریٚ کە بۆت بێت وە بە هیچ کولۆجێك پێویستت پیٚ نەبیٚ.

[109]

[110] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە نەی بیٚ، کەچی کالاّ و بەرگی جوانی بەنرخ بپۆشیٚ.

[111] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە قیاسی شتێك بکا لە شتێکی تر کە زۆر لە یەکەوە دوور بن.

[112] بە یەکێك ئەوتریٚ، کە نەنگێکی ئاشکرای ببیٚ، بە رەنگێکی وا کە هەرگیز لیی نەبێتەوە.

# پیتی کاف

١)- کا بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم[١]

٢)- کا هی خۆت نەبوو، کادان هی خۆت بوو[٢]

٣)- کابان لە کەوگیری دا دیارە[٣]

٤)- کابان، یا بێ بەشە، یا روو رەشە[٤]

٥)- کابرایەك بوو نەدی و بدی، کوڕێکی بوو لە بری ناوکی کێری بڕی[٥]

٦)- کاتی سەرخەرمان یارانت جەمە، لە کاتی تەنگی یارانت کەمە[٦]

٧)- کاتی کەڵك وکار، ئەمانکەن بە یار کاتی چز و بز، ئەمانکەن بەدز[٧]

٨)- کاتێك جەنگیت، ئاشتیت لە بیر بێ[٨]

٩)- کاژێ و کێژێ، لەیەك ئەئاژێ[٩]

١٠)- کار لە کار ترازا[١٠]

---

[١] بە یەکێك ئەوترێ کە داوای شتێك بکات بۆ خۆشی و بۆ یەکێکی تریش.

[٢] بە یەکێك ئەوترێ کە لە سەر خوانی مەردوم ئەوەندە بخوات تا نەخۆش ئەکەوێ.

[٣] واتە هەر دەستدانە کەوگیرەکەی نیشان ئەدا کە کابانە.

[٤] واتە ئەو چێشتەی کەیبانو لێی ئەنێ، یا باش دەرئەچێ و بەشی خۆی نامێنێتەوە، یا خراپ دەرئەچێ و تەریق ئەبێتەوە.

[٥] بە یەکێك ئەوترێ کە نەدی وبدی بێ، وە ئەو کارەی کە ئەیکات پاش و پێش بێ.

[٦] واتە لە کاتی خێر و بێرا دۆست زۆرن، لەکاتی تەنگ و چەڵەمەدا کەمن.

[٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەکاتی ئیش و کارا بتخوێنێتەوە بەڵام لە کاتی چێشت و گۆشتا هیچ.

[٨] واتە بەشی ئاشتی تیا بێڵەرەوە.

[٩] بە دوو کەسی بێ حەیای، دەم پیس ئەوترێ، کە بەربووبنە یەکتری.

[١٠] واتە کارەکە لە دەست دەرچوو.

١١)- کارد و کفنی کردگە[١١]

١٢)- کارسازم نارد، کار بسازێنێ، نەمزانی کارساز، کار ئەترازێنێ[١٢]

١٣)- کاری خێر بە تەعجیل، کاری شەڕ بە تەحلیل[١٣]

١٤)- کاری زل بە بچوك مەسپێرە[١٤]

١٥)- کاریتە لە کفر هەڵ ناکەوێ[١٥]

١٦)- کارێکی پێ کرد، با بە دەواری شڕی نەکا[١٦]

١٧)- کاسە دراوسێتی بەران، کافروەران[١٧]

١٨)- کاسە دراوسێتی بردم، لە عەزرەتی مردم[١٨]

١٩)- کاسە دراوسێتی یا بەرشێو ئەبێ، یا دوا شێو[١٩]

٢٠)- کاسە دراوسێتی، دوو پێی هەیە[٢٠]

---

[١١] کارد: کێردە، واتە خۆی ئامادە کردووە بۆ کوشتن.

[١٢] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك ئەیەوێ ژنێك بێنێ، برادەرێکی خۆی ئەنێرێ بۆ خوازبێنی ئافرەتێك، کابراکە ئەبینێ خۆی حەزی لێ ئەکات، وە بۆ خۆی خوازبێنی ئەکات و ئەیسازێنێ، ئنجا بەم بۆنەیەوە کابراکەی تر ئەم پەندە ئەڵێ.

[١٣] واتە ئیشی باش دەست و بردی لێبکە، وە زوو بە زوو بیکە، بەڵام کاری خراپ لێی ورد بەرەوە، وە ئەم دیو ئەو دیوی بکە.

[١٤] چونکە بۆی ناکرێ.

[١٥] کاریتە: نیرگەی خانووە، کفر، دارێکی گەڵا وردە لە ناو خڕ و چەما ئەڕوێ واتە پیاوی گەورە لە خێزانی پەست و نەخوێندەوار هەڵ ناکەوێ.

[١٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە گوفتار، یا بە کردار حەشر بکات بە یەکێکی تر.

[١٧] وەران: بیخۆن. واتە یاخوا هەر بێ بڕوا بە تەمای چێشتی کاسە دراوسێتی بێ.

[١٨] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێ ببەخشێ، کەچی لەدڵا پێی ناخۆش بێ.

[١٩] یەکێك ئەیڵێ کە بە تەمای شتی یەکێکی تر بێ، واتە شتی خەڵق کە چاوەڕوانی بکرێ لەکاتی خۆیا نایەت، بەڵکو یا پێش ئەکەوێ، یا پاش ئەکەوێ.

[٢٠] واتە نانی کاسە دراوسێتی کە هات و خورا، ئەبێ تۆش بۆ ئەوەی بکەیت و بۆی بنێریتەوە.

٢١)- کاسە کە پڕ بوو ئەڕژێ[٢١]

٢٢)- کاسە کە پڕ بوو لێی ئەڕژێ[٢٢]

٢٣)- کاسە لە ئاش گەرم ترە[٢٣]

٢٤)- کاسە و ئاوسێ بەران، کافر وەران[٢٤]

٢٥)- کاسەکەی بە مل منا ئەشکێنێ[٢٥]

٢٦)- کاسەی پڕ ئاشتیماڵە[٢٦]

٢٧)- کاسەی پڕ بووە[٢٧]

٢٨)- کاسەی هاوسەر، بە یەکتر ئەدەن بەقەرز[٢٨]

٢٩)- کاغەزی سپی، ئەخوێنێتەوە[٢٩]

٣٠)- کاغەزی نەنووسراوە ئەخوێنێتەوە[٣٠]

٣١)- کاکە و برالە ئەکەن[٣١]

---

[٢١] بە یەکێك ئەوترێ کە ماوەیەکی زۆر بێ لە خەم و خەفەتا بێ، واتە چۆن کاسە کە پڕ بوو لێی ئەڕژێ، کاسەی خەمیش وایە، بۆیە پێغەمبەریش لە کاتی تەنگانەدا فەرموویەتی : " اشتدی ازمە تنفرجی" واتە ئەی تەنگانە پڕ بە تا لێت بڕژێ.

[٢٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە یاخی بووبێ.

[٢٣] ئاش: چێشتە بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ئیشی یەکێکا ئەم سەرگەرمتر بێ لە خاوەنەکەی.

[٢٤] واتە کاسە دراوسێتی هەر بۆ ئەوە باشە کە بێ بڕوا بیخوا.

[٢٥] واتە گونانەکەی بە سەر منا ئەسەپێنێ.

[٢٦] چونکە ئارەزووی هەموو لایەکیان بەجێ دێ.

[٢٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە یاخی بووبێ.

[٢٨] واتە ئەو کاسە دراوسێتییەی کە بۆیان دێ، نایخۆن، وە بە یەکێکی تری ئەدەن بە قەرز.

[٢٩] واتە زۆر زیرەك و بلیمەتە، بە رەنگێك کە قسەی نەوتراوە ئەدۆزێتەوە، وە کاغەزی نەنوسراوە ئەخوێنێتەوە.

[٣٠] واتە زۆر زیرەك و بلیمەتە، بە رەنگێك کە قسەی نەوتراوە ئەدۆزێتەوە، وە کاغەزی نەنوسراوە ئەخوێنێتەوە.

[٣١] بە دوو نێرینە ئەڵێن کە سەر بە سەرێ بکەن.

٣٢)- کاڵا کێ دڕی؟ ئەوی نەیپرسی[٣٢]

٣٣)- کاڵا لە قەد باڵا[٣٣]

٣٤)- کاڵا هەڵ ئەگرێ لە دوکانان، گەنم هەڵ ئەگرێ لە خەرمانان ئەکەوێتە دەستی نەزانان[٣٤]

٣٥)- کاڵەك بە ئەژنۆ ئەشکێنێ[٣٥]

٣٦)- کاڵەك خۆری، یا بێستان ڕن؟[٣٦]

٣٧)- کاڵەکی شیرین، ماڵی چەقەڵە[٣٧]

٣٨)- کانییەك ئاوت لێ خواردەوە، بەردی تێ فڕێ مەدە[٣٨]

٣٩)- کای تۆ نییە[٣٩]

٤٠)- کای چی و جۆی چی؟[٤٠]

---

[٣٢] واتە یەکێك کاڵا ئەدڕێ کە نەپرسێ لە جوانی و ناشرینی، بەڵام ئەوانەی کە جوانی و ناشرینی ئەخوێننەوە، کاڵایەك ئەوەندە لەبەر ناکەن کە بیدڕن.

[٣٣] بە شتێك ئەوترێ کە لەپلەی خاوەنەکەیا بێ.

[٣٤] واتە بە ڕەنجی شان و عەرەقی ناوچەوان پارە پەیدا ئەکا، وە ئەیدا بە کوتاڵ و زەخیرە و ئەیخاتە ژێر دەستی ژن و ماڵ و مناڵ کە قەدری ناگرن.

[٣٥] بە یەکێك ئەوترێ ، کە لە کارێکا زۆر پەشیمان بێ.

[٣٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئاگای لە خەرج کردنی ماڵ نەبێ، کەچی لە هێندێ شتیش بپرسێ، واتە تۆ هەر بخۆ دەخڵت بە سەر شتی ترەوە نەبێ.

[٣٧] بە زۆردارێکی ستەم کار ئەوترێ، کە هەر کەسێك شتێکی باشی ببێ، ئەو داگیری بکا.

[٣٨] واتە هەر چی شتێك کە بەهرەت لێ وەرگرت، لەقەی لێ مەدە.

[٣٩] بە یەکێك ئەوترێ ، کە قسە لە شتێك بکات کە لە پایەی ئەوا نەبێ، وە بەرزتر بێ لە ژێری ئەو.

[٤٠] ئەڵێن لە باهارانا، نێرەکەر کە چاوی بە ماکەر ئەکەوێ و لێی دا ئەهێڵێ، داوای پەڕینی لێ ئەکا، ئەویش ئەڵێ: تۆ ئێستا کەیفی خۆت ئەکەیت و ئەڕۆیت، وە من سبەینێ ئەکەومە ژێر دوو بارەوە، باری سك و باری پشت بە بێ ئاو ئالیك، نێرەکەرەکەش کە کێری ئەماڵێ بە سەر سنگیا یەك لە دوای یەك – گۆیا پێی ئەڵێ: کات لە سەر خۆم و جۆت لە سەر خۆم، وە بەم ڕەنگە ماکەرەکە ڕازی ئەکات، کە

٤١)- کای کۆن ئاگری تیَ بەر نەبیَ[41]

٤٢)- کای کۆن بە با مەکە[42]

٤٣)- کە ئاگر کەوتەوە تەڕ و وشك پیَکەوە ئەسوتیَ[43]

٤٤)- کە بوویت بە ریَوی سەر و قنگی کەلاشەکەم بکرِیَنەرەوە[44]

٤٥)- کە تازە هات کۆنە بەتالە[45]

٤٦)- کە تازە هات کۆنە خەلاتە[46]

٤٧)- کە پارەت دا مەلا لە مزگەوت دەرئەهیَنیَ[47]

٤٨)- کە پیاو زۆری وت، چاکیش ئەلیَ و خراپیش ئەلیَ[48]

٤٩)- کە پیاو لە دوای کەرەوە رِۆی، ئەبیَ بۆنی تەرسی بکا[49]

٥٠)- کە خەوت هات، سەرینت ناویَ، کە برسیت بوو پیَخۆرت ناویَ[50]

٥١)- کە خوا دای پیَغەمبەریش چنگیَکی ئەخاتە سەر[51]

---

نیَرەکەرەکە ئیشی خۆی تەواو کرد و دابەزی، کیَری سیس ئەبیَتەوە، وە بە لای راست و چەپا تەکەی دیَ گوَیپیا پیَی ئەلیَ: کای چی و جۆی چی؟ ئەم پەندە بە یەکیَك ئەوتریَ، کە تا ئیشیَکی پیَت بیَ، بەلیَن لە سەر بەلیَنت پیَ بدا کە ئیشەکەی نەما، ئیتر کای چی و جۆی چی.

[41] بە یەکیَك ئەوتریَ کە کۆنە عاشق بووبیَ و بیری بکەویَتەوە و یا دلّ بریندار بووبیَ و برینەکەی بکولیَتەوە.

[42] بە یەکیَك ئەوتریَ کە قسەیەکی کۆن زیندوو بکاتەوە.

[43] واتە تا زووتر بیکوژیَنیتەوە باشترە.

[44] بە یەکیَك ئەوتریَ لە رووی سوکیەوە کە هەرِەشەیەکت لیَ بکات، واتە هیچت لە دەست نایەت ئەوە نەبیَ کە بووی بە ریَوی سەر و قنگی کلاشەکەم بکرِیَنیتەوە.

[45] واتە کە ژنی تازەت هیَنا، ژنە کۆنەکەت لە لا ئەبیَ بە هیچ.

[46] واتە کە کالای تازەت دروست کرد، کالا کۆنەکەت بدە بە یەکیَکی تر.

[47] واتە هەموو شت بە پارە جیَبەجیَ ئەکریَ.

[48] واتە کەوابوو زۆر قسە مەکە با خراپ بە دەمتا نەیەت.

[49] یەکیَك ئەیلیَ کە لە هاورِیَیەتی یەکیَکەوە، دلّی شکابیَ.

[50] واتە نە بنوو تا خەوت نەیەت، وە نە بخۆ تا برسیت نەبیَ.

[51] واتە کە دەرگای خۆشی کرایەوە بە جاریَك ئەکریَتەوە.

٥٢)- كە خوا دای، نازرسێ کوڕی کێی[٥٢]

٥٣)- کە زۆر هات، قەواڵە بەتاڵە[٥٣]

٥٤)- کە شیرت وەشاند ئەبێ قەڵغانت پێ بێ[٥٤]

٥٥)- کە چاو چوە خەو، قنگ ئەچێتە پاشایی[٥٥]

٥٦)- کە چوویتە جێیان، جێی خۆت بناسە[٥٦]

٥٧)- کە چویتە شاری کوێران، دەست بە چاوەوە بگرە[٥٧]

٥٨)- کە گاجووت کاوێژ بکا لە حیزی جوتیارە[٥٨]

٥٩)- کە گوڵ نیت، دڕکیش مەبە[٥٩]

٦٠)- کە فێرت کرد تێری کە[٦٠]

٦١)- کە کەس نەبێ، ڕەجەب سەر پاڵەیە[٦١]

٦٢)- کە کەس نەبوو من شای کەسانم[٦٢]

٦٣)- کە کەس نەیخواست، شوو ئەکا بە من[٦٣]

---

[٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە پایەکی لە خۆی بەرزتر دەست کەوتبێ.

[٥٣] یەکێك ئەیڵێ کە نەتوانێ کارێك بکا کەچی بە زۆر پێی بکەن.

[٥٤] چونکە ئەو کەسەی کە تۆ دەستی لێ ئەوەشێنیت ئەویش دەست لە تۆ ئەوەشێنێ.

[٥٥] واتە ئەو حەلە بە بێ ترس، بەری ئەداتەوە.

[٥٦] ئەگینا هەڵت ئەستێنن لەو جێگایەی کە لێی دانیشتویت.

[٥٧] واتە هەموو کەسێك ئەبێ لەگەڵ ئەو ناوچەیەی کە تیایەتی ڕێ بکەوێ.

[٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە خوار دەستەکەی ئیش باش نەکات.

[٥٩] بە یەکێك ئەوترێ کە هیوای باشی لێ بکرێ، کەچی بە پێچەوانەوە خراپەی ببێ.

[٦٠] تەماشای پەندی (فێرکەران فێریان مەکە) بکە.

[٦١] پاڵە: کرێکارە. سەرپاڵە: سەرکرێکارە، لە کاتێکا ئەوترێ، کە پیاوی باش نەمابن، وەهەرچی و پەرچی جێی ئەوانی گرتبێتەوە.

[٦٢] یەکێك ئەیڵێ کە لە خۆی پێشتر بۆ کارێك نەبێ.

[٦٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی ببێ بە تۆی نەفرۆشێ، کە زانی کەس لێی ناکڕێ ئنجا بیەوێ پێت بفرۆشێ.

٦٤)- كە كەوچكت نییە، بۆ گو ئەخۆیت؟[٦٤]

٦٥)- كە مەڕم گورگ بیخوا، با گورگی نیشتمان بیخوا[٦٥]

٦٦)- كە مەلا لە دێ نەبوو، كەڵەشێر بڵقاسم بەگە[٦٦]

٦٧)- كە من رازی بووم بە نانی جەو، سەری خاقان بە قنگی خەسرەو[٦٧]

٦٨)- كە من كەوتمە دەریۆزە، ئەم هۆزەنا، ئەو هۆزە[٦٨]

٦٩)- كە من نەمام، با لە دوای من دنیا وێران بێ[٦٩]

٧٠)- كە نەزانی بزێیت بۆ كەڵ ئەگریت؟[٧٠]

٧١)- كە نەزانی گیرا ئاو، كە ئاو گیرا جاو[٧١]

٧٢)- كە نەنەولێسك بە خەڵاتت بێ كێكفی قۆپی بە بەراتت بێ[٧٢]

٧٣)- كە هەتیوچە سوار ئەبێ، لای لفكەكەی خوار ئەبێ، ئەگەر نەیگریت هار ئەبێ[٧٣]

---

[٦٤] بە یەكێك ئەوترێ، كە بچێتە ژێر بارێك كە دەرەقەتی نەیەت.

[٦٥] لەم رۆژەدا هەر گەلێك نەگا بەم پایەیە لە نیشتمان پەروەریی دا بە لرفەیەك قوت ئەدرێ.

[٦٦] واتە كە گەورەی بە راستی لە شوێنێك نەبوو، هەموو گەجەر و گوجەرێك خۆی ئەكا بە گەورە.

[٦٧] واتە كە من بە نانی جۆ رازی بووم، ئیتر كلكە لەقێ بۆ كەس ناكەم.

[٦٨] واتە مەردوم كە لە نیشتمانی خۆی دوور كەوتەوە و ئیتر لەهەر شوێنێ بژی بۆ ئەو چون یەكە.

[٦٩] ئەمە قسەی یەكێكی خۆ پەرستە كە لە جیهانا هەر چاوی لە خۆشی خۆیەوە بێ، ئەگینا هەزاری وەك من و تۆ ببین بە باڵا گەردانی خۆشی و خۆشبەختی كۆمەڵە و گەل.

[٧٠] بە یەكێك ئەوترێ، كە بچێتە ژێر ئیشێك و نەتوانێ بیكا.

[٧١] بە یەكێك ئەوترێ، كە بچێتە ژێر ئیشێك و نەتوانێ بیكا.

[٧٢] كەنەنە: تەشوێیەكی بچكۆلانەی دەم كەوانەییە، ناو كەوچك و ئەسكۆیی پێ هەڵ ئەكەندرێ، لێسك: تیغێكی كەوانەییە ناوی كەوچك و ئەسكۆیی پێ لوس ئەكرێ. بە یەكێك ئەوترێ، كەدیارییەكت بۆ بێنێ هیچی تێ نەچێ.

[٧٣] بە یەكێكی ناوەجاخی ناكەس بەچە ئەوترێ.

٧٤)- کە وتی، تێژ، تێژ[٧٤]

٧٥)- کەبووتەر با کەبووتەر، باز با باز[٧٥]

٧٦)- کەر ئەو کەرە، کورتانەکەی گۆڕاوە[٧٦]

٧٧)- کەر ئەو کەرەیە لەکاروان بزەڕێ[٧٧]

٧٨)- کەر ئەوەتە لە کاروانسەردا بزەڕێ[٧٨]

٧٩)- کەر بۆنی زەعفەران نازانێ[٧٩]

٨٠)- کەر بێ کورتان نابێ[٨٠]

٨١)- کەر بارەکەی تفەنگیش بێ، گورگ هەر ئەیخوا[٨١]

٨٢)- کەر بە پەیغام ئاو ناخواتەوە[٨٢]

٨٣)- کەر بە جۆ بمرێ شەهیدە[٨٣]

---

[٧٤] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی شارەزووری وتوویەتی: خوا چۆن ئەتوانێ بە جارێك ئەم هەموو دڕکی دەشت و شاخە وا تیژ بکات، وە نووکەکانیان وا دا بدات؟ یەکێکیش ئەڵێ: خوا کە وتی تێژ تێژ، ئنجا ئێستا ئەمە بە یەکێکی زۆر بە دەسەڵات ئەوترێ، کە لەگەڵ ویستی شتێك بکا بیکا.

[٧٥] کەبووتەر: بە زبانی فارسی جۆرە کۆترێکە، واتە کۆتر بەرامبەر بە کۆتر و باز بەرامبەر بە باز ئەخوێنێ.

[٧٦] بەشتێك ئەوترێ کە تۆزێ دیمەنەکەی گۆڕابێ، بەڵام شتەکە هەر وەك خۆی وابێ.

[٧٧] واتە باریش بەرێ و سەرەڕای ئەوەش بزەڕێ.

[٧٨] کەر کە لە سەفەر بگەڕێتەوە، زۆر ماندووە، وە روو ئەکاتە کاروانسەرا کە تەویلەیە ئنجا ئەگەر لەوێ زەڕی، ئەوە نیشانەی بەدەقی و بەهێزییەتی، واتە ئازا ئەوەتا لە رۆژی سەفەر بارەبەریدا دا ئازا بێ.

[٧٩] واتە مەردومی تێنەگەیشتوو لە شتی ورد ناگات.

[٨٠] واتە هەموو گیانلەبەرێك بە جل و بەرگی خۆیەوە.

[٨١] چونکە نازانێ بە کاری بێنێ، بە یەکێك یا گەلێك ئەوترێ کە جەنگاوەر نەبێ، وە نەزانێ چەکی جەنگی بەکار بێنێ.

[٨٢] واتە کەر بە بێ وتن ئاو ناخواتەوە، بە یەکێك ئەوترێ کە ئامۆژگاری کاری تێنەکات.

[٨٣] بە یەکێکی نەوسنی چلێس ئەوترێ، کە لە زۆر خواردنەوە نەخۆش کەوتبێ.

٨٤)- کەر بە حەج نابێ بە حاجی[٨٤]

٨٥)- کەر بە دەنکە جۆیەك ئەزەڕێ[٨٥]

٨٦)- کەر بە کاروان قەڵەو نابێ[٨٦]

٨٧)- کەر بە میوانداری قەڵەو نابێ[٨٧]

٨٨)- کەر بە نەقیزە نەبێ نارِوا بەرِێوە[٨٨]

٨٩)- کەر بترِێ کۆشی بۆ ئەگرێتەوە[٨٩]

٩٠)- کەر بەستە، خاوەن رەستە[٩٠]

٩١)- کەر بەستە، لە خەم رەستە[٩١]

٩٢)- کەر بکەوێ، دانی ئەشکێ[٩٢]

٩٣)- کەر تۆپیوە و شایی سەگە[٩٣]

٩٤)- کەر تا ئەتۆپێ، لە لەقە وەشاندن ناکەوێ[٩٤]

٩٥)- کەر جۆی ئەوێ و جۆش ئاو[٩٥]

---

[٨٤] چونکە چۆن ئەچێ، هەروا دێتەوە.

[٨٥] بەیەکێك ئەوترێ، کە زوو لە خۆی بگۆڕێ و یاخی ببێ.

[٨٦] بە هەژارێك ئەوترێ، کە بە ڕێکەوت لە لایەکەوە خواردنێکی دەست کەوتبێ.

[٨٧] بە هەژارێك ئەوترێ، کە بە ڕێکەوت لە لایەکەوە خواردنێکی دەست کەوتبێ.

[٨٨] بە مەردومی تێنەگەیشتوو ئەوترێ، کە بۆ هەموو شتێك ئەبێ پێی بوترێ.

[٨٩] بە یەکێکی زۆر هەژار ئەوترێ.

[٩٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە کەری خۆی بەستبێتەوە، واتە ئیشی خۆی بنج بەست کردبێ، وە بێخەم دانیشتبێ.

[٩١] بە یەکێك ئەوترێ، کە کەری خۆی بەستبێتەوە، واتە ئیشی خۆی بنج بەست کردبێ، وە بێخەم دانیشتبێ.

[٩٢] بە شوێنی بێ لەوەڕ ئەوترێ.

[٩٣] بە یەکێکی دەوڵەمەندی بێ ژیری و بیر ئەوترێ کە بمرێ، وە کەلەپورەکەی بمێنێتەوە بۆ چەند خزم و خوێشێکی خراپی.

[٩٤] بە یەکێکی خراپ ئەوترێ، کە تا مردن دەست لە ستەمکاری هەڵنەگرێ.

[٩٥] واتە هەر شتێك پێویستی بە شتێك هەیە.

٩٦)- کەر زاوە کوڕی بووە[٩٦]

٩٧)- کەر چوە بەغدا بوو بە ئێستر[٩٧]

٩٨)- کەر چیەتی لە نوقوڵ و نەبات، مشتێ جۆ و کونجی ڕەبات[٩٨]

٩٩)- کەر قەڵەویش بێ گۆشتی ناخورێ[٩٩]

١٠٠)- کەر کە بە بارەوە کەوت بە کلکی ڕاست ئەکرێتەوە[١٠٠]

١٠١)- کەر کە تۆپی قەل لە پێشا چاوی کوێر ئەکا[١٠١]

١٠٢)- کەر کە تۆپی، داڵاش زۆر ئەبێ[١٠٢]

١٠٣)- کەر کە جۆی دی کا ناخوا[١٠٣]

١٠٤)- کەر کە نۆی برد، دەش ئەبا[١٠٤]

---

[٩٦] لە ڕووی گاڵتە کردنەوە بە کوڕی یەکێك ئەوترێ.

[٩٧] واتە کەر بە کەری خۆیەوە لە گەڕان و چوونە شاران بەهرەمەند ئەبێ چ جای ئادەمی.

[٩٨] تەماشای پەندی: (کەر قەدری نوقول نازانێ) بکە.

[٩٩] بە یەکێکی دەوڵەمەندی ڕژد ئەوترێ کە بە درێژایی ساڵ پوولێکی لە دەست نەبێتەوە.

[١٠٠] واتە هەر کەسێك یا هەر گەلێك کە کەوت، کاتێك ڕاست ئەبێتەوە، بە یارمەتی یەکێکی تر، کە خۆی مایەی ڕاست بوونەوەی تیابێ.

[١٠١] چونکە چاو زەقێی نیشانەی ژیانە، وە قەل و داڵ لێی ئەترسن، جا بۆ ئەوەی لە چاوی دانەچڵەکێن، پێشەکی دەری ئەهێنن، ئنجا دەست ئەکەن بە خواردنی، هەروا بێگانەی داگیرکەریش، کە هاتە سەر گەلێکی دواکەوتوو، پێشەکی بیر و باوەڕی دینی و نیشتمانی لە ناو دڵ و دەروونیانا ئەڕوخێنێ، چونکە نیشانەی ژیانیانە، ئنجا دەمی تێ ئەژەنێ.

[١٠٢] بە پیاوێکی دەوڵەمەندی خراپ ئەوترێ کە لەگەڵ مرد، ڕەش و ڕووتی زۆری پێوەبنیشێ.

[١٠٣] بە یەکێك ئەوترێ لە ڕوی سووکیەوە کە خواردنی لەبەر دەما بوو لە خۆشەکە بخوا و لە ناخۆشەکە نەخوا.

[١٠٤] یەکێك ئەیڵێ کە خۆی باری ژیانی قورس و گران بێ، کەچی سەرەڕای ئەوە سەربارێکی تری لە سەر دانرێ.

**١٠٥)- کەر کەوتو، کوندە دڕا**[105]

**١٠٦)- کەر کول و بار سووك**[106]

**١٠٧)- کەر لە قوڕا ئەگێت**[107]

**١٠٨)- کەر لە کاروان بەجێ بمێنێ، کلك و گوێی ئەکەن**[108]

**١٠٩)- کەر لە کاروان بەجێ ما، گورگ ئەیخوا**[109]

**١١٠)- کەر لە کاروان گل ئەداتەوە**[110]

**١١١)- کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە**[111]

**١١٢)- کەر مردگ، خاوەن ناڕازی**[112]

**١١٣)- کەر هەر ئەو کەرە، کورتانەکەی گۆڕاوە**[113]

**١١٤)- کەر هشتی برد نۆش ئەبا**[114]

**١١٥)- کەر و جاشێك قلیان قاوەڵتیەتی**[115]

**١١٦)- کەر و جەواڵ و گوریسم دا، بۆ سوژنێك و تاڵێ بەن ئیشەکە تێك نادەم**[116]

---

[105] بە کارێك ئەڵێن کە لە ناوەڕاستا بپچڕێ.

[106] بە یەکێك ئەوترێ کە سەڵت و قوڵت بێ و باری سووك بێ.

[107] بە یەکێك ئەوترێ کە یەکێکی تر بگرێ بە پرسیار لێ کردنی، یا بە داوا کردنی شتێك لێی لە کاتێکی تەنگ و چەڵەمەدا.

[108] واتە هیچ کەسێك نابێ لە دەستەی خۆی دوا بکەوێ.

[109] واتە تا ئەتوانیت لە گەلی خۆت بڕ مەبە و لا مەدە.

[110] بە خاوەن قەرزی بێ ئینساف ئەوترێ.

[111] بە دوو قسە ئەوترێ کە پەیوەندیان بە یەکەوە نەبێ.

[112] یەکێك ئەیڵێ کە هیچ درێغی نەکردبێ لەو کارەی کە پێی سپێراوە کەچی خاوەن کەرەکە لێی ناڕازی بێ.

[113] بە یەکێکی هەرزە ئەوترێ، کە ماوەیەکی زۆر چووبێتە دەرەوە، بە ناوی خوێندن یا گەڕانەوە، وە هەر وەك خۆی گەڕابێتەوە.

[114] واتە یەکێ چەندە بتوانێ ئیش بکا، ئەتوانێ تۆزێکی تریش زیاتر ئیش بکا.

[115] واتە ئێجگار زۆر خۆرە.

[116]

۱۱۷)- کەر و خۆڵەمێشن[117]

۱۱۸)- کەر و ماجومیان نەوتووە[118]

۱۱۹)- کەر، دوو ریاڵ، کورتان سێ قڕان[119]

۱۲۰)- کەر، قەدری نوقوڵ نازانێ[120]

۱۲۱)- کەرێ کە بیبەیتە سەربان، ئەبێ بیشی هێنیتە خوارەوە[121]

۱۲۲)- کەرە کوڵ تڕی نانی خۆی بڕی[122]

۱۲۳)- کەرە کوڵ مەڕۆ هەورازە، چیت داوە لە ئێستری جامبازە[123]

۱۲٤)- کەرە لیاس، ئەوەندەی قسە نەکرد زبانیان بڕی[124]

۱۲۵)- کەرەکە، مەمرە بەهارە، چووزەرە کەما دیارە[125]

۱۲٦)- کەرەکە، مەمرە بەهارە، کورتانەکەت دیارە[126]

۱۲۷)- کەرەکە، مەمرە بەهارە، کورتانەکەت لە شارە[127]

۱۲۸)- کەرەکەی خۆتت لێ بووە بە رموزن[128]

---

[117] بە دوو کەسی هیچ و پووچ ئەوترێ، کە هەمیشە پێکەوە بن.

[118] بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ کارێکا خەریك بێ کە هیچی لێ نەزانێ.

[119] ریاڵ: لە ئێران دوو قران ونیوە، بە یەکێك ئەوترێ کە بەرگ و کاڵایەکی لە بەردابێ لە ئەندازەی خۆی زیاتر بێ.

[120] واتە هەموو شتێك شایستەی هەموو کەسێك نییە. بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ نەفامێکدا بدوێ بە نەرم و شلی و نەزاکەت.

[121] واتە هەر کەسێ ئیشی بێ جێ بکا، راستیشی بکاتەوە.

[122] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەڵەیەکی کردبێ لەگەڵ یەکێکا، وە بەو بۆنەیەوە خۆی بێبەش کردبێ لە یارمەتی ئەو کەسە.

[123] بە یەکێك ئەوترێ، کە چاو لە یەکێکی گەورەتر بکا لە خۆی.

[124] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر قسە بکات.

[125] بە گاڵتەوە بە یەکێك ئەوترێ کە هیوای بە شتێك نەمابێ واتە بێهیوا مەبە.

[126] بە گاڵتەوە بە یەکێك ئەوترێ کە هیوای بە شتێك نەمابێ واتە بێهیوا مەبە.

[127] بە گاڵتەوە بە یەکێك ئەوترێ کە هیوای بە شتێك نەمابێ واتە بێهیوا مەبە.

[128] رموزن: وتەیەکی گیانداری ئێسك قورسی پێ ئەشوبهێنرێ، بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی خۆی لێ گۆڕا بێ بە شتێکی تر.

١٢٩)- کەرم داو هورِم دا، خۆم بۆ گوریس بەلێدان دا[١٢٩]

١٣٠)- کەروێشك بە گا ئەگرێ[١٣٠]

١٣١)- کەروێشك بە عەرەبانە ئەگرێ[١٣١]

١٣٢)- کەروێشك بە عەرەبانە ناگیرێ[١٣٢]

١٣٣)- کەروێشك بە کڵاو ئەگرێ[١٣٣]

١٣٤)- کەروێشك لە کاتی راوا بە تانجی وت: من بۆ خۆم رائەکەم، تۆ بۆ ئاغات، خەیاڵت خاوە نامگریت[١٣٤]

١٣٥)- کەری ئەم بارە نییە[١٣٥]

١٣٦)- کەری بێ خاوان، بارکێشی گاوان[١٣٦]

١٣٧)- کەری بەتاڵ خێرا ئەڕوا[١٣٧]

١٣٨)- کەری بەقاڵ ناکەوێتە چاڵ[١٣٨]

١٣٩)- کەری تۆپیو جۆ ناخوا[١٣٩]

---

[١٢٩] بە یەکێك ئەوترێ کە دەست لە شتی گرنگ هەڵبگرێ، کەچی لەسەر شتی بێ کەڵك زۆر چەقەچەق بکا.

[١٣٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆرزان بێ، وە ئیش لە سەر پشت بکا بە بێ پەلە و دەست و برد.

[١٣١] بە مەردومی تەمەڵ ئەوترێ.

[١٣٢] چونکە عەرەبانە نایگاتێ، بە یەکێك ئەوترێ کە دوای شتێك بکەوێ بە رەنگێك کە هەرگیز نەیگاتێ.

[١٣٣] بە کارێك ئەوترێ، کە لە کردنا نەبێ.

[١٣٤]

[١٣٥] بە یەکێك ئەترێ کە دەرەقەتی ئیشێك نەیەت واتە ئەم کارە بەو ناکرێ.

[١٣٦] بە شتێکی بێخاوەن ئەوترێ، کە یەکێك بە کاری بێنێ و بەهرەی لێ وەرگرێ.

[١٣٧] لە ڕووی سووکییەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر بێ کاری ئەو کارەی کە پێی سپێراوە باشی بکات.

[١٣٨] چونکە زۆر هاتوچۆی کردووە و شارەزا بووە.

[١٣٩] لە ڕووی سووکیەوە بە یەکێك ئەوترێ کە نەتوانێ ئیشێك بکات.

١٤٠)- کەری تۆپیو، بار نابا[١٤٠]

١٤١)- کەری پیر و هەوساری نۆ، زەڕەزەڕیەتی لە دەوری جۆ[١٤١]

١٤٢)- کەری خۆت ئەبێ لە پلە رزگار بکەیت[١٤٢]

١٤٣)- کەری خۆمە و گوێی ناڵ ئەکەم[١٤٣]

١٤٤)- کەری خۆی بەستۆتەوە[١٤٤]

١٤٥)- کەری دەروێشە و هەڵەگەڕ[١٤٥]

١٤٦)- کەری دێز حەز بە تۆپینی خۆی و زەرەری خاوەنی ئەکات[١٤٦]

١٤٧)- کەری شەل لەو وەختەدا ئەگاتە بەرەوە، کە کاروان وچان ئەگرێ[١٤٧]

١٤٨)- کەری کێ تۆپیوە؟[١٤٨]

١٤٩)- کەری لێ بووە بە رموزن[١٤٩]

١٥٠)- کەری ماندوو، بە تەمای وەشەیە[١٥٠]

١٥١)- کەری مردوو جۆ ناخوا[١٥١]

---

[١٤٠] لە رووی سووکیەوە بە یەکێك ئەوترێ کە نەتوانێ ئیشێك بکات.

[١٤١] بە پیاوێکی پیر ئەوترێ، کە خۆی هەڵپاچی بێ و بەرگی تازەی لەبەر کردبێ، وە دەور و خولی ژنێکی تازەی بێ کە مارەی بکات.

[١٤٢] واتە مەردوم ئەبێ کاری خۆی بباتە سەر.

[١٤٣] یەکێك ئەیڵێ کە کارێك بکات، وە پێی بڵێن وای مەکە، واتە من بە ئارەزووی خۆمی ئەکەم.

[١٤٤] بەیەکێك ئەترێ کە ئیشی خۆی بنج بەست کردبێ و پاڵی لێدابێتەوە.

[١٤٥] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر گەڕۆك و سەر بە دەرەوە بێ.

[١٤٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە زیان بە خۆی بگەیەنێ بۆ ئەوەی زیان لە یەکێك بدات.

[١٤٧] واتە مەردوم هەر ئەوەندە لە سەر کارێك درێژەی ببێ و دەستی لێ هەڵنەگرێ، بە ئامانجی خۆی هەر ئەگا.

[١٤٨] بە یەکێك ئەوترێ کە کارێکی باشی وا بکات کە لێی نەوەشێتەوە.

[١٤٩] بە یەکێك ئەوترێ کە یەکێکی هیچ و پووچی لێ بووبێ بە پیاوێکی گەورەی بەڕێز.

[١٥٠] بە یەکێك ئەوترێ کە لە کارێکا ماندوو بووبێ.

[١٥١] ئەم پەندە وەك پەندی (کەری تۆپیو بار نابا) وایە.

١٥٢)- کەری ناو جۆگەیە، لە هەر دو لا ئەخوا[١٥٢]

١٥٣)- کەریشی پێ ئەگێ و شایەتمانیشی پێ دێنێ[١٥٣]

١٥٤)- کەرێك بە پارەی بەفر بکڕێ ئەبێ لە ئاوا بخنکێ[١٥٤]

١٥٥)- کەرێکم دا بە کەرێ سنگان لە بن گوێی دەرێ[١٥٥]

١٥٦)- کەس ئەوەیە، کە لە رۆژی تەنگانەدا، فریات ئەکەوێ[١٥٦]

١٥٧)- کەس بە دۆی خۆی نالێ ترش[١٥٧]

١٥٨)- کەس بوو بە ناکەس، ناکەس بوو بە کەس، قەدیم وەجاخان دەرچوون رەنج عەبەس[١٥٨]

١٥٩)- کەس پێی نالێ فنگت چەند جەواڵ کا ئەگرێ[١٥٩]

١٦٠)- کەس پێی نالێ کەرت بە چەند[١٦٠]

١٦١)- کەس شەیتانی بە چاوی خۆی نەدیوە[١٦١]

١٦٢)- کەس گۆشتت بخوا، ئێسقانت ناشکێنێ[١٦٢]

---

[١٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە بەنی دوو خوانا دانیشتبێ، وە لە هەر دوو لا بخوات.

[١٥٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئەمڕۆ کارێکت پێ بکا و سبەینێ کارێکی تری پێچەوانەی پێشووت پێ بکات.

[١٥٤] واتە هەر چی بە پارەی حەرام کڕا خێر ناداتەوە.

[١٥٥] یەکێك ئەیلێ کە شتێك بگۆڕێتەوە بە شتێکی تر بە بێقازانج و سودێك.

[١٥٦] نەك هەر لە کاتی خۆشی دا لەگەڵتابێ.

[١٥٧] واتە کەس قسەی خراپ ناکات دەربارەی شتی خۆی.

[١٥٨] لە شوێنێکا ئەوترێ، کە نرخی خوێندن و خوێندەواری و رەوست و خووی بەرز نەمابێ.

[١٥٩] لە رووی سووکییەوە بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی بە گەورە و سەرۆك بزانێ.

[١٦٠] واتە کەس پرسیاری لێ ناکا.

[١٦١] واتە مەردوم خۆی سەرچاوەی خراپەیە بۆ خۆی وەك قورئان ئەفەرموێ " و ما اصابك من سیئە فمن نفسك" واتە کەسێك دوو غەریزەی تیایە، یەکێکیان بانگی ئەکا بۆ چاکە و ئەویتریان بانگی ئەکا بۆ خراپە، ئنجا یەکەمیان ناوبرا بە فریشتە و دووهەمیان ناوبرا بە شەیتان، کە هەر دووکیان لە مرۆڤەکە خۆیایەتی .

[١٦٢] واتە خزم بەشی خزمایەتی هەر تیا ئەهێڵێتەوە.

١٦٣)- کەس قاچی نەچێ بە گوی فڵان کەسا[١٦٣]

١٦٤)- کەس قەبری کەس ناچێ[١٦٤]

١٦٥)- کەس کاغەزی کەس ناخوێنێتەوە[١٦٥]

١٦٦)- کەس کەس ناباتە بەهەشت[١٦٦]

١٦٧)- کەس کەسێکی خۆی نەوێ، خەوی خراپی پێوە ئەبینێ[١٦٧]

١٦٨)- کەس کوێری بۆ چاوی خۆی ناوێ[١٦٨]

١٦٩)- کەس لۆخاتری ئاشەوانێ ناچێتە ئاشێ[١٦٩]

١٧٠)- کەس لە پڕێ، نابێ بە کوڕێ[١٧٠]

١٧١)- کەس لە کەس ئاوس نییە، کەڵك لە کەڵك ئاوسە[١٧١]

١٧٢)- کەس لە کردە نائومێد نابێ[١٧٢]

١٧٣)- کەس لە لەشی ساغ نانالێنێ[١٧٣]

---

[١٦٣] واتە هەرگیز رزگاری نابێ لێی.

[١٦٤] یەکێك ئەیلێ کە یەکێکی تر سەرزەنشتی بکات لەسەر گوناهێك واتە گوناهی خۆم لە ملی خۆمە، وە تۆ نایەیتە ناو گۆڕی منەوە.

[١٦٥] واتە کەس گوێ لە قسەی کەس ناگرێ.

[١٦٦] واتە ئیشی دنیا هەمووی بە دەستیاوە، لە رۆژی دوایشا هەموو کەسێك هەر بە کردەوەی خۆی ئەچێتە بەهەشت، ئیتر بەندەگی بۆچ؟

[١٦٧] واتە چونکە کەسێتی، لە بێداریدا دەستی تێی ناچێ، بەڵام خەوی ناخۆشی پێوە ئەبینێ.

[١٦٨] یەکێك کە تووشی شتێکی ناخۆش و خراپ ببێ ئەڵێ: بڵێم چی؟ دەسەڵاتی کاری خوام نییە، کەس کوێری بۆ چاوی خۆی ئەوێ؟

[١٦٩] بەڵکو هەر کەسە بۆ ئیشی خۆی ئەچێ.

[١٧٠] واتە هەموو ئادەمییەك لە پێشەوە هیچ نازانێ، لە پاشا بەرە بەرە گەورە ئەبێ و ژیر ئەبێ تا ئەبێ بە مرۆڤێکی تەواو.

[١٧١] واتە من و تۆ تەماشای یەکتری ناکەین، بەڵکو تەماشای کەڵکی یەکتری ئەکەین، ئنجا کەڵکت گرتم، ئەوا کەڵکت ئەگرم، وە ئەگەر کەڵکت نەگرتم، کەڵکت ناگرم.

[١٧٢] واتە هەر کەس رەنج بدا، گەنجی دەست ئەکەوێ.

[١٧٣] یەکێك ئەیلێ کە نەخۆش بێ، وە نەتوانێ هەڵسوڕێ.

۱۷٤)- کەس ناتوانێ پێی بڵێ: بەری چاووت کلی پێوەیە[۱۷٤]

۱۷٥)- کەس ناتوانێ پێی بڵێ: پێت خوار دانا[۱۷٥]

۱۷٦)- کەس نازانێ بە نەفسی کێ رزگاری ئەبێ، کەسیش نازانێ بە نەفسی کێ گرفتار ئەبێ[۱۷٦]

۱۷۷)- کەس ناچێتە گۆڕی کەس[۱۷۷]

۱۷۸)- کەس ناڵێ: خاڵۆ، کەرت بە چەند[۱۷۸]

۱۷۹)- کەس نەتسێ و کەس نەترێ، میروا لە دیدا[۱۷۹]

۱۸۰)- کەسێ کەسە، ئەلفێکی بەسە[۱۸۰]

۱۸۱)- کەسی بێ کەسان خوایە[۱۸۱]

۱۸۲)- کەسی گو بە کڵاوی ناپێوێ[۱۸۲]

۱۸۳)- کەسێك بە مەویژێك نەزانێ، بە کەویژێکیش نازانێ[۱۸۳]

۱۸٤)- کەسێك لە گورگ بترسێ، ئەبێ سەگ رابگرێ[۱۸٤]

---

[۱۷٤] بە یەکێك ئەوترێ کە هیچ جۆرە ئەنگێك رووی تێ نەکردبێ.

[۱۷٥] بە یەکێك ئەوترێ کە هیچ جۆرە ئەنگێك رووی تێ نەکردبێ.

[۱۷٦] واتە زۆر جار خزمەتی یەکێك ئەکەیت، وە ئارەزوویەکی مەشروعی بەجێ دێنێ، وە ئەمە ئەبێ بەهۆی رزگار بوونت لای خوا، هەر وەك زۆر جاریش بە نەفسی یەکێك گرفتارەوە تووشی تۆڵەی خوا ئەبێ.

[۱۷۷] تەماشای پەندی (کەس قەبری کەس ناچێ) بکە.

[۱۷۸] یەکێك ئەیڵێ کە کەس پرسیاری لێ نەکا.

[۱۷۹] بە یەکێك ئەوترێ کە مورکێك لە خۆی بنێ، وە نەیەڵێ کەس بە دەنگی بەرز قسە بکا.

[۱۸۰] واتە ژیر کە قسەیەکی پێ وترا ئەیگرێتەوە گوێ، بەڵام ناژیر هەمیشە پێویستە بە نەقیزە.

[۱۸۱] یەکێك ئەیڵێ کە خۆی بە زەبوون و بێ کەس بزانێ.

[۱۸۲] واتە کەس بە هیچی نازانێ و لێی ناپرسێتەوە.

[۱۸۳] مەویژە: مێوژە، کەویژە: باتمانە. کە یەکێك بە کەم نەزانێ بە زۆریش نازانێ.

[۱۸٤] واتە هەر کەسێك لە شتێك ترسا ئەبێ دووربینی بکات، بۆ خۆ پاراستنی خۆی لەو شتە.

١٨٥)- کەشکیش برای دۆیە[١٨٥]

١٨٦)- کەچەل ئەوەندەی زەحمەتە، کڵاوی کەچەڵی داکەوێ[١٨٦]

١٨٧)- کەچەل بە بەختە[١٨٧]

١٨٨)- کەچەڵ ئەوەندەی ئەوێ سەری دەر نەکەوێ[١٨٨]

١٨٩)- کەچەڵ حەسەن، حەسەن کەچەڵ[١٨٩]

١٩٠)- کەچەڵ سەری بە کوڵۆ ماست ئەشکێ[١٩٠]

١٩١)- کەچەڵ شاییە یا چەمەرە؟ لە هەر کوێ ترشی شەمەرە[١٩١]

١٩٢)- کەچەڵ، بە چ حاڵی، وا بە فاڵی، فنگ هەڵئەماڵێ[١٩٢]

١٩٣)- کەچەڵ، دەرمانکەر بوایە، دەرمانی سەری خۆی ئەکرد[١٩٣]

١٩٤)- کەڵافەی شین کەوتۆتە بەینیانەوە[١٩٤]

---

[١٨٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە خزمی یەکێکی خراپ بێ، واتە ئەمیش وەك ئەو وایە.

[١٨٦] واتە ئەنگدار، هەر ئەوەندە ئەنگەکەی ئەشارێتەوە تا دەر ئەکەوێ کە پێی زانرا، ئیتر باکی نییە.

[١٨٧] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی باشی دەست کەوتبێ.

[١٨٨] کە لەگەڵ سەری دەرکەوت، ئیتر دەست لە هەموو شتێك هەڵ ئەگرێ و بە داپۆشینی سەریەوە خەریکە ئەبێ.

[١٨٩] بە قسەیەك ئەوترێ کە بە دو جۆر بکرێ، وە هەر دوکی وەك یەك وابێ، واتە وا بڵێت و وا بڵێت چۆن یەکن.

[١٩٠] یەکێکی زەبوون ئەیڵێ کە پێی بڵێن: بچۆ بە گژ فلاّنا کەوا ئەم ستەمەی لێ کردیت، واتە چۆن سەری کەچەل بەرگەی هیچ ناگرێ، زەبونێکی وەکو منیش بەرگەی هیچ ناگرم.

[١٩١] بە یەکێك ئەوترێ کە لە هەر کوێیەك خواردن و لێسە ببێ، ئەو لەوێ بێ.

[١٩٢] بە یەکێکی هەژاری رەش و رووت ئەوترێ ، کە کورێنی بکا لە کوڵانانا.

[١٩٣] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێکی تر کە گرێیەکی ببێ و بیەوێت ئەم بۆی بکاتەوە، واتە منیش وەك تۆ ئەو گرێیەم هەیە، وە ئەگەر بمزانیایە چارەی چییە، چارەی گرێی دڵی خۆمم ئەکرد.

[١٩٤] بە دوو کەس ئەوترێن، کە زویری کەوتبێتە بەینیانەوە.

١٩٥)- کەڵافەی گورگ کەوتۆتە بەینیانەوە[١٩٥]

١٩٦)- کەلەپەز، هەل ئەستێ، سەگ ئەچێتە جێی[١٩٦]

١٩٧)- کەڵەشێر بانگ ئەدا و گووش ئەخوا[١٩٧]

١٩٨)- کەڵەشێر لە سەرە نوێلکی خۆی ئازایە[١٩٨]

١٩٩)- کەڵەشێر لە ناوەختا بخوێنێ سەری خۆی ئەخوا[١٩٩]

٢٠٠)- کەڵەشێری برسی، خەو بە خەرمانی ئاو بردووەوە ئەبینێ[٢٠٠]

٢٠١)- کەڵەشێریش نەبێ رۆژ ئەبێتەوە[٢٠١]

٢٠٢)- کەللەی بێ عەقڵ، وەك میوەی سەرما بردوو وایە[٢٠٢]

٢٠٣)- کەم ئەخۆم و کز ئەنیشم[٢٠٣]

٢٠٤)- کەم بخۆ و کز دانیشە[٢٠٤]

٢٠٥)- کەم بخۆ و مەچۆرە لای حەکیم[٢٠٥]

٢٠٦)- کەم بڵێ و زۆر ببە[٢٠٦]

---

[١٩٥] بە دوو کەس ئەوترێن، کە زۆردارێکی ستەم کار کەوتبێتە بەینیانەوە وە لە هەر دو لایان بخوا.

[١٩٦] کەلەپەز: پاچەچییە، دیارە کە پاچەچی رۆی ئنجا تۆیەی سەگە ئەمە بە یەکێك ئەوترێ، کە بە سەر کارێکەوە بێ و بڕوا، دوای ئەو خراپێك بێتە شوێنی.

[١٩٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە چاکەش بکا و خراپەش بکا.

[١٩٨] واتە هەر کەسێك لە شوێن و مەڵبەندی خۆیا شارەزا و ئازایە.

[١٩٩] واتە مەبە بە کەڵەشێری ناوەخت با سەری خۆت نەخۆیت.

[٢٠٠] چونکە هەموو گیاندارێك بە بیری ئەو شتەوە ئەنوێ کە پێویستی بێ.

[٢٠١] یەکێك ئەیڵێ کە لە یارمەتی یەکێکی تر نائومێد بێ.

[٢٠٢] واتە هیچ کەڵکی نییە، وە بەهرەی لێ وەرناگیرێ.

[٢٠٣] واتە هەوڵ نادەم بۆ پایەی بەرز تا دوور بم لە بەڵای رۆژگار.

[٢٠٤] واتە مەردوم بەهێمن بژی با گوزەرانیشی خۆش نەبێ، باشترە لە هەڵپەکردن و خۆخستنە مەترسییەوە، لە پێناوی رابواردنێکی خۆشترا.

[٢٠٥] چونکە زۆرترینی نەخۆشی لە زیادەخۆرییەوە پەیدا ئەبێ.

[٢٠٦] چونکە لە زۆر بیستن قازانج ئەکەیت، وە لە زۆر وتن تووشی زیان ئەبیت.

٢٠٧)- کەم خۆری دایم خۆربە[٢٠٧]

٢٠٨)- کەم خواردن، لە بێ دەسەڵاتییە[٢٠٨]

٢٠٩)- کەم دەستی خۆشە، قۆرتی ناخۆشە[٢٠٩]

٢١٠)- کەم چیکلدانەیە[٢١٠]

٢١١)- کەما بۆ کەر، کەر کە تۆپی، ئیتر کەمابۆچی؟[٢١١]

٢١٢)- کەمە بۆچی ئەچیت؟ بۆ زۆر[٢١٢]

٢١٣)- کەمەرە و لوولە هارِە دێ، سك لە برسا قۆرِەی دێ[٢١٣]

٢١٤)- کەمتیار پیاوی چاکە، قولە پێی بسمێ دەنگ ناکا[٢١٤]

٢١٥)- کەمی من و کەرەمی تۆ[٢١٥]

٢١٦)- کەنیلێ لەگەڵ تۆمە، ڤەویلێ تۆ گوێت لێبێ[٢١٦]

٢١٧)- کەو ئەو کەومیە بەرانبەری کەو بخوێنێ[٢١٧]

---

[٢٠٧] ئەم دەستوورە هەر وەك بۆ خواردن زۆر باشە، بۆ هەموو شتێکی تریش لە ژیانا هەروا باشە.

[٢٠٨] بە کاربەدەستێکی بچووك ئەوترێ کە هیچی بە دەست نەبێ.

[٢٠٩] تەماشای پەندی (فەقیری خۆشە، قۆرتی ناخۆشە) بکە.

[٢١٠] واتە زۆر زوو توورِە ئەبێ.

[٢١١] بە یەکێك ئەوترێ کە هەوڵی شتێك بدا بۆ یەکێك کە ئەو یەکە نەمابێ، واتە کە ئەو یەکە نەما، ئیتر تۆ ئەم هەوڵە بۆچی ئەدەیت.

[٢١٢] یەکێك ئەیلێ کە شتێکی کەمی بە دیاری بۆ بچێ، وە ئەم دیارییەکی زۆرتر بنێرێتەوە، وە یەکێك پێی بلێ: تۆ ئەم هەموو شتە بۆ ئەنێریت؟ ئەویش ئەلێ: (کەمە بۆچی ئەچیت؟ بۆ زۆر) واتە بە کەمیان وا وت ئەویش وای وەڵام دایەوە.

[٢١٣] بە یەکێك ئەوترێ کە هەرچێکی دەست کەوێ بیدا بە شتی جوان و بیکا بە خۆیا.

[٢١٤] واتە لەگەڵ هەر کەسێکا قسە ئەکەیت بە زبانی شیرین بیدوێنە.

[٢١٥] یەکێکی هەژاری نەدارا ئەیلێ، کە دیارییەکی کەم ببا بۆ دەوڵەمەندێك بۆ ئەوەی دەست گیرۆییەکی بکا.

[٢١٦] کەنیلێ: کچەکەیەتی: ڤەویلێ: بووکەکەیەتی.

[٢١٧] بە یەکێك ئەوترێ کە لە پاشملەی یەکێك قسە بکات، واتە ئەگەر راست ئەکەیت لە رووی خۆیا قسە بکە.

٢١٨)- کەو ئەوەیە، کە بەرانبەری کەو بخوێنێ[٢١٨]

٢١٩)- کەو زمانی خۆی دوژمنێتی[٢١٩]

٢٢٠)- کەوای سپی و سابوون بە قەرز[٢٢٠]

٢٢١)- کەوتۆتە ساجی عەلی[٢٢١]

٢٢٢)- کەوتۆتە سەر سایە[٢٢٢]

٢٢٣)- کەوڵە، باوی نەماوە هەواری لێ گۆڕاوە[٢٢٣]

٢٢٤)- کتێب بۆ ئاخری ئەگیرێتەوە[٢٢٤]

٢٢٥)- کتك باڵی ببوایە تۆوی چۆلەکەی ئەبڕی[٢٢٥]

٢٢٦)- کتك چڵپاوە[٢٢٦]

---

[٢١٨] یەکێك ئەیڵی، کە لە پاش ملە بوختانێکی بۆ هەڵبەستن،واتە ئەگەر راست ئەکەن با بێنە روو قسە بکەن.

[٢١٩] ئەگەر نەخوێنێ و جاڕ لە خۆی نەدا کەس راوی ناکات.

[٢٢٠] واتە کە تۆ ناتوانیت سابون بکڕی، کەوای سپی مەکە، بەڵکو کەوایەك بکە کە چڵك هەڵگرێ.

[٢٢١] واتە هیچی بە دەستەوە نەماوە.

[٢٢٢] سایە بەرانبەر بە حینجەیە، بەم رەنگە منالّ لە پێشەوە دەرس کە ئەخوێنێ، بە حینجە ئەیخوێنێ، لە پاشا کە فێری خوێندنەوە بوو، ئنجا دەس لە حینە هەڵ ئەگرێ وە هەر بە سایە ئەیخوێنێ، بەیەکێك ئەوترێ کە چاوی کرابێتەوە، وە بە تەواوی فێری قسە کردن بووبێ.

[٢٢٣] ژنێك ئەیڵێ، بە مێرەدەکەی کە لەبەر پیری کەم کەم بچێتە سەر جێگاکەی.

[٢٢٤] واتە پاشە رۆژ هەموو شتێ دەرئەخا.

[٢٢٥] بە زۆردارێکی دڵ رەقی بێ دەست ئەوترێ، کە ئەگەر دەستی ببێ دەستی خراپ بوەشێنێ.

[٢٢٦] بەشتێك ئەوترێ کە شتێکی پیس پیسی کردبێ؛ وەك ئافرەتێکی پاك و تەمیز کە ببێ بە چارەنووسی پیاوێکی هیچ و پووچ، لە پاشا تەلاقی بدا یەکێکی تر کە بیەوێ بیهێنێ، پێی بڵێن: مەیهێنە کتك چڵپاوە، واتە کتك دەمی تێخستووە و پیسی کردووە.

٢٢٧)- كتك و مشك، بوون به خوشك[٢٢٧]

٢٢٨)- كتك، ختكى شێر ئەدا[٢٢٨]

٢٢٩)- كتك، دەمى نەئەگەيشتە دووگ، ئەيوت سوێره[٢٢٩]

٢٣٠)- كتك، لەسەر رمانە[٢٣٠]

٢٣١)- كتكا نييەن له مالۆ، مشكان تليليلى يانه[٢٣١]

٢٣٢)- كچ به بێ باوك نرخى نييه، باخ به بێ پەرژين جوانى نييه[٢٣٢]

٢٣٣)- كچ، قەلايه ناگيرێ[٢٣٣]

٢٣٤)- كچێ، دايك مدحى بكات، ئەبێ خالۆوان بيخوازێ[٢٣٤]

٢٣٥)- كچه تيمى گەلالان، بوونه كابانى مالان[٢٣٥]

٢٣٦)- كچم، لەگەلْ تۆمه، بووكێ تۆ گوێت ليْبێ[٢٣٦]

٢٣٧)- كچى بێ دايك وەك باخى بێ پەرژينه[٢٣٧]

٢٣٨)- كچى خۆت مەكه به قوربانى كورى خەلق[٢٣٨]

---

[٢٢٧] بەدوو دوژمن ئەوترێ، كه بووبن به برا بۆ خواردنى مالى يەكێك.

[٢٢٨] به يەكێكى هيچ و پووچ ئەوترێ، كه بيەوێ فێلْ له پياوێكى گەوره بكات.

[٢٢٩] تەماشاى پەندى: (رێوى دەمى نەئەگەيشتە ترێ، ئەى وت ترشه) بكه.

[٢٣٠] واته زۆر چرو قەلەبالغه، وه جێى پشيله نەماوه مەگەر به سەر نوكى رمەوه نەبێ.

[٢٣١] به رۆژێ ئەوترێ كه پياوانى گەورەى ولات نەمابن، وه ناپياوان چوبنه جێگايان.

[٢٣٢] باوك هەر وەك نرخه بۆ كچى خۆى، پەرژينيشه بۆى.

[٢٣٣] واته ئەبێ، وەك قولله و قەلا سەخت و قايم بێ.

[٢٣٤] واته كچ ئەوەيه كه خەلقى مدحى بكات نەك دايكى.

[٢٣٥] به يەكێك ئەوترێ كه هيچێكى واى نەكردبێ، كەچى جێى خۆشى گرتبێ.

[٢٣٦] يەكێك ئەيلێ كه ئامۆژگارى يەكێك بكات و مەبەسى يەكێكى تر بێ.

[٢٣٧] به راستى هەر دايكه كه كچى خۆى وەك بيبيلەى چاو نيگاى دێلێ.

[٢٣٨] واته ئەگەر كورێكى خراپ داواى كچەكەتى كرد مەيدەرێ، با كچەكەت نەبێ به قوربانى ئەو.

٢٣٩)- کراسێ بە پیسی، هەزار بە پاکی[٢٣٩]

٢٤٠)- کراسێ سورتر، گەڕەکێ دوورتر[٢٤٠]

٢٤١)- کراسی حەیرانێم چار بەرە، هەر کەس خەمی خۆی لەبەرە[٢٤١]

٢٤٢)- کراسی قورئان لەبەر بکەیت، پێت باوەڕ ناکەم[٢٤٢]

٢٤٣)- کراسی کەتان شۆڕەی دێ، سکی لە برسا قۆڕەی دێ[٢٤٣]

٢٤٤)- کرەی میری سور ئەکا[٢٤٤]

٢٤٥)- کردە پەشیمان بە نە کردە پەشیمان مەبە[٢٤٥]

٢٤٦)- کردەی ئەوە، بردەی شەیتان[٢٤٦]

٢٤٧)- کردەی ئێمە و بردەی خەڵقە[٢٤٧]

٢٤٨)- کردەی گایە و خوردەی کەر[٢٤٨]

٢٤٩)- کردەی من و بردەی شەیتان[٢٤٩]

---

[٢٣٩] واتە یەکێك کراسێك بە پیسی بدڕێ، ئیتر ناوبانگ دەرئەکات بە خراپە، دوای ئەوە هەزار کراس بدڕێ بە پاکی، کەس پێی باوەڕ ناکا، کە واتە تا ئەتوانیت، ناوبانگی پاك و تەمیزی خۆت لەکەدار مەکە.

[٢٤٠] بە ژنێك ئەوترێ کە هەر ڕۆژە شوو بکا بە یەکێك.

[٢٤١] یەکێك ئەیڵێ بە خۆی کە بە پیشەی خۆیەوە خەریك بێ، وە هیچ وچانی تیا نەدا.

[٢٤٢] واتە لەجیاتی سوێندێك بخۆیت، کراسێك لەبەر بکەیت لە قورئان باوەڕ ناکەم.

[٢٤٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە نەی بێ، کەچی پارەیەکی زۆر لە شتێکی بێنرخا خەرج بکا.

[٢٤٤] واتە بەو کارە زۆر سوپاس گوزارە، وە هەمیشە چاوە چاوی بۆ ئەکات.

[٢٤٥] واتە مەردوم ئیشێك بکات و پەشیمان ببێتەوە، باشترە لەوەی نەیکات پەشیمان ببێتەوە.

[٢٤٦] بە یەکێك ئەوترێ کە دەست کەوتەکەی بێ پیت بێ.

[٢٤٧] یەکێك ئەیڵێ، ئەوی دەستی ئەکەوێ لەم و لەوا خەرجی بکات.

[٢٤٨] بە یەکێك ئەوترێ هەرچی ئەم پەیدای بکا یەکێکی تر بیخوا.

[٢٤٩] یەکێك ئەیڵێ کەساڵ دوانزە مانگە هەوڵ بدا کەچی هیچیشی دیار نەبێ.

٢٥٠)- کردمان بە جۆلا، مەکۆکەی لێ دزین[٢٥٠]

٢٥١)- کردن و بردن و مردن، سەریان پێکەوە ناوە[٢٥١]

٢٥٢)- کردن، هەتا مردن[٢٥٢]

٢٥٣)- کردی بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانی[٢٥٣]

٢٥٤)- کردی بە گیسکەکەی هەیاسی خاس[٢٥٤]

٢٥٥)- کردی بە کەرەی نێوە زەڕ[٢٥٥]

٢٥٦)- کردی بە نەخشی دیوار[٢٥٦]

٢٥٧)- کرم رەگی داری خواردی، پیشەت ئەبێتە هەناسە ساردی[٢٥٧]

٢٥٨)- کڕین و مامەڵە، سەنگی محەکە[٢٥٨]

٢٥٩)- کرێی شت خواستن، هێنانەوەیەتی[٢٥٩]

٢٦٠)- کشە کشە پۆپنە ڕەشە، میوان شەوێ دوو شەو خۆشە[٢٦٠]

---

[٢٥٠] بە یەکێك ئەوترێ کە تۆ متمانەی پێ بکەیت، وە کاروباری خۆتی بخەیتە ژێر دەست، کەچی ئەو ناپاکیت لەگەڵ بکات.

[٢٥١] واتە ژیان لە یەکەم رۆژیەوە کردن و بردنە تا مردن، هەناسەیەك ئەم سیانە لە یەك جیانابنەوە.

[٢٥٢] واتە جیهان جێی هەوڵ و تەقەلایە تا مردن.

[٢٥٣] بە یەکێك ئەوترێ کە قسەیەك زۆر بڵێتەوە.

[٢٥٤] واتە دەمێ قسەی خۆشەوە کەرە و دەمێ قسەی تاڵە وەکەرەوەی لەگەڵ کرد.

[٢٥٥] بە یەکێك ئەوترێ کە لە کاتی قسە کردنا قسەی پێ ببڕن.

[٢٥٦] بە یەکێك ئەوترێ کە بە قسەیەك سەرسام بکرێ، بە جۆرێك کە لە عاستی خۆی وشك ببێ.

[٢٥٧] بە یەکێك ئەوترێ کە لە لایەکەوە زیانبار بووبێ و پێی نەزانیبێ.

[٢٥٨] واتە هەر کەسێك لە سەودا و معامەلەدا باش بوو، باشە، خراپ بوو، خراپە.

[٢٥٩] واتە شتێکت کە خواست لە یەکێك بۆ ماوەیەك، کرێکەی ئەوەیە کە ئیشەکەت تەواو کرد شتەکە بنێرێتەوە بۆ خاوەنێ.

[٢٦٠] ئەگێڕنەوە کە یەکێك ئەبێ بە میوانی یەکێك لە زستانا، وە زیاد لە ئەندازە ئەمێنێتەوە، خانەخوێکە وەڕس ئەبێ، وە ئەیەوێ ئەمە دەربڕێ لای میوانەکەی، رۆژێ لەبەر چاوی میوانەکە بە مریشکی حەوشەکەی خۆی ئەڵێ: (کشە کشە مریشکە

٢٦١)- كفنی له كویێیه تا گۆڕی له كوێ بێ[٢٦١]

٢٦٢)- كل له چاو ئەفڕێنێ[٢٦٢]

٢٦٣)- كلاشدم، بكەرە كونەوە، كلاشدم دەرئەكا[٢٦٣]

٢٦٤)- كلاو سوری بەر لەشكرە[٢٦٤]

٢٦٥)- كلاو هەڵ ئەخا[٢٦٥]

٢٦٦)- كلاوی بكەوێتە مزگەوت، بە گۆچان دەری ئەهێنێ[٢٦٦]

٢٦٧)- كلاوی لار داناوە[٢٦٧]

٢٦٨)- كلاوی لە حەق دڕاوە[٢٦٨]

٢٦٩)- كلاوێكی بۆ دانێن، تا ئێوارێ لەگەڵی ئەدوێ[٢٦٩]

٢٧٠)- كلكی كەر بە دەسە سڕ ئەگرێ[٢٧٠]

٢٧١)- كلكی لە سەگ كەمترە[٢٧١]

---

رەشە، میوان شەوێ دوو شەو خۆشە). كە میوانەكە ئەمە ئەبیسێت، ئەمیش بە مریشكەكە ئەڵێ : (كشە كشە پۆپنە لارێ، من میوانم تا بەهارێ).

[٢٦١] بە یەكێك ئەوترێ كە هیچی نەبێ.

[٢٦٢] واتە دزێكی زۆر چالاكە.

[٢٦٣] كلاشدم: بە دووپشك ئەڵێن كە ئەگەر بەن ببەستیت بە یەكێكیانەوە وە بی نێریتە ناو كونێكەوە كە دووپشكی تری تیا بێ یەكە یەكە ئەیان هێنێتە دەرەوە بۆ كوشتن، بە گەلێك ئەوترێ كە خۆ خۆربێ، وە یارمەتی دوژمنی خۆی بدات بۆ كوشتنی گەلەكەی خۆی.

[٢٦٤] بە مەردومی زۆر جەربەزەی چەتڵەمەز ئەوترێ.

[٢٦٥] واتە زۆر كەیف خۆشە.

[٢٦٦] واتە سەر و ساختی لەگەڵ مزگەوتا نییە.

[٢٦٧] بە یەكێك ئەوترێ كە زۆر بە خەم بێ.

[٢٦٨] واتە ئەوەندە راست گۆ و حەق بێژە، بە چەپۆك كلاوەكەیان دڕاندووە.

[٢٦٩] بە مەردومی چەنەبازی زۆربڵێ ئەوترێ.

[٢٧٠] بە تەوسەوە بە یەكێك ئەوترێ، كە زۆر پاك و تەمیزی بخوێننەوە.

[٢٧١] واتە زۆر، زۆرزانە.

٢٧٢)- کنگر دانەی بە ڕەحمەت، نەك برنج دانەی بە زەحمەت[٢٧٢]

٢٧٣)- کنگر و ماستیش بۆ وەختی خۆی[٢٧٣]

٢٧٤)- کوتەك ئەزانێ قۆناغ لە کوێیە[٢٧٤]

٢٧٥)- کوتەك لە بەهەشتەوە هاتووە[٢٧٥]

٢٧٦)- کوتەکی، ئاشی دێم ئەگێڕێ[٢٧٦]

٢٧٧)- کوڕ ئەبێ کوڕ بێ، لە ئاشان نۆرە بڕ بێ[٢٧٧]

٢٧٨)- کوڕ بووم سەر گوێی خۆم ئەئەنگاوت[٢٧٨]

٢٧٩)- کوڕ تالان گێڕەوەیە و کچ تالان بەر[٢٧٩]

٢٨٠)- کوڕ نەبووە و کڵاوی بۆ ئەدرون[٢٨٠]

٢٨١)- کوڕ هەبێ، تاریکە شەو زۆرە[٢٨١]

٢٨٢)- کوڕ، خاڵۆ وەلەدە[٢٨٢]

---

[٢٧٢] واتە دەنکە کنگری دەشتی بخۆیت بە خۆشی باشترە لە پلاوێ بە ناخۆشی.

[٢٧٣] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کەدڵی پەشاندبێ، واتە ئەمەت با بە سەرەوە بمێنێ تا ڕۆژی خۆی دێ.

[٢٧٤] بۆ هەڕەشە کردن لە یەکێك ئەوترێ.

[٢٧٥] یەکێك ئەیڵێ کە بە قسەی خۆش ئەو ئیشەی کە ئەیەوێ بۆی نەکرێ تا هێز بە کار نەهێنێ.

[٢٧٦] واتە زۆر بە زەبر و زەنگە.

[٢٧٧] واتە بە هیچ کولۆجێك نابێ بەش خوراو بێ.

[٢٧٨] واتە زۆر چوست و چالاك و تیژڕەوبوم، وەك ئەو تانجییانەی کە لە کاتی ڕاوا ئەوەندە خێرا ڕائەکەن و هەڵمەت ئەبەنە سەر نێچیر هەر دوو پاشویان ئەدەن لە گوێیان و بریندار ئەکەن.

[٢٧٩] واتە کوڕ هەرچی ئەبا بۆ خۆی ئەبا، بەڵام کچ بۆ مێردەکەیەتی.

[٢٨٠] واتە کاری ناپێویست مەکە.

[٢٨١] واتە کوڕی ئازا ئەگەر ببێ ماوە زۆرە بۆ تۆڵە سەندن.

[٢٨٢] واتە منداڵ ئەچێتەوە سەرخاڵوانی، چونکە زیاتر ڕەوشت و خوی دایکی وەرگرتووە، کە ئەویش ڕەوشتی ماڵی خۆی وەرگرتووە.

۲۸۳)- کورتان بۆ کەر ئەکرێ، کە کەر تۆپی، کورتان بۆچی[۲۸۳]

۲۸٤)- کورد کەوتە گۆڕان، ماڵی بوو وێران، گۆڕان کەوتە کورد، گۆی لە مەیدان برد[۲۸٤]

۲۸۵)- کورد هەر کوردە[۲۸۵]

۲۸٦)- کورد و گۆران، شەڕیانە، لە سەر ماڵی مسڵمانان[۲۸٦]

۲۸۷)- کورد، بدوێنە، شەرعی خۆی ئەکا[۲۸۷]

۲۸۸)- کوردە، مەیدەرێ پیازێ، دوان دوان ئەخوازێ[۲۸۸]

۲۸۹)- کوڕی ئازا، ماڵی بۆ چییە؟ کوڕی حیزیش ماڵی بۆ چییە؟[۲۸۹]

۲۹۰)- کوڕی باوکی خۆیەتی[۲۹۰]

۲۹۱)- کوڕی خۆی سوننەت ئەکا و منەت بە سەر خەڵکا ئەکا[۲۹۱]

۲۹۲)- کوڕی رەند، بۆ شەوی زەنگ[۲۹۲]

۲۹۳)- کوڕی سەگ بە گورگ بخنکێنە[۲۹۳]

---

[۲۸۳]

[۲۸٤] کورد و گۆڕان، کە بە یەکەوە ناوبران مەبەس لە کوردەکەیان نیشتەجێ و مەبەس لە گۆڕان کۆچەرییە، واتە شاری کە بچێتە ناو کۆچەرییەوە، ناتوانێ بژی، بەڵام کە کۆچەری چووە ناو شارەوە، زۆر بە هەڵپە و وریایەوە سەرکەوتووە.

[۲۸۵] واتە کەس رەوشت و خووی نەتەوایەتی خۆی ون ناکا.

[۲۸٦] بە دوو کەس ئەڵێن کە چاویان لە ماڵی یەکێکەوە بێ بیخۆن.

[۲۸۷] واتە ئەمەندە دڵپاك و حەق پەرستە، پێ لە گوناهی خۆی ئەنێ.

[۲۸۸] بە یەکێك ئەوترێ، کە بەدا بە دەم یەکێکی ترەوە، واتە خۆتی بۆ شل مەکە ئەگینا هیچت پێ ناهێڵێ.

[۲۸۹] چونکە کە ئازا بوو ماڵیشی ئەبێ خۆی پەیدای ئەکات، کە حیز بوو ماڵیشی بێ خۆی لەدەستی ئەدا.

[۲۹۰] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە چاکیدا یان خراپیدا چووبێتەوە سەر باوکی.

[۲۹۱]

[۲۹۲] واتە کوڕی ئازا بۆ شەوی تاریکە.

[۲۹۳] واتە تۆڵە لە پیاو خراپ بسێنە بە پیاوێکی خراپ.

٢٩٤)- کوڕی سەگە و، گورگ ئەخنکێنێت[٢٩٤]

٢٩٥)- کوڕی گوێ ئاگردان، کون لە جەرگیا نییە[٢٩٥]

٢٩٦)- کوڕی میرەسەنێ، لە پشتی دەبەستێ داوەبەنێ، نانی بێ خوێ ئەخوا و ترێ سوێر دەکەنێ[٢٩٦]

٢٩٧)- کوچك ئەکولێنێ[٢٩٧]

٢٩٨)- کوچك لە ئاگر گەرمترە[٢٩٨]

٢٩٩)- کوچك، تا نەجولێ، سەنگینە[٢٩٩]

٣٠٠)- کولۆ فرێدەر، پاداشی بەردە[٣٠٠]

٣٠١)- کوڵ چوارشەممەی مانگی سەفەرە، پڕ ئاشووبە و خۆتی لێ لادە[٣٠١]

٣٠٢)- کوڵە ترێ، نانی خۆی بڕی[٣٠٢]

---

[٢٩٤] بە کوڕی ستەمکارێك ئەوترێ کە پیاوێکی زۆردار کەڵەمە بکات.

[٢٩٥] بە یەکێك ئەوترێ کە لە ماڵی خۆیا دانیشتبێت، وە مەردوم بنێرێ بۆ جەنگ و کاری ترسناك.

[٢٩٦] بەو لاتە برسیە ترِ زلانە ئەوترێ کە تا ئەبرێنە سەر تاتەشۆر لە قسەی زل ناکەون.

[٢٩٧] واتە هەوڵی بێ سود ئەدا.

[٢٩٨] بە دڵسۆزێك ئەڵێن لە یارمەتی لێ قەوماوا بە جەخت تر بێ لە خۆی.

[٢٩٩] واتە هەموو کەسێك لە شوێنی خۆی بەڕێزە.

[٣٠٠] واتە کێ گلەتکێکی پیامالیت، تۆ بەردێکی پیا بماڵە.

[٣٠١] ئەم رۆژە ئەو رۆژەیە کە لە جەنگی (ئوحود) دانی پێغەمبەری تیا شکێنرا، وە پێغەمبەر بە برینداری تیا گەڕایەوە بۆ (مەدینە).جاران بە بیرەوەری من ئەو رۆژە بە شوم ئەزانرا، وە لەزۆر ماڵەوە چینی قولێیان ئەنارد بۆ لای شێخ و مەلاکان، کە دە ئایەتی قورئانیان بۆ تیا بنووسن لەو ئایەتانەی کە بە ( سلام) دەست پێ ئەکات، وەك (سلام علی نوح فی العالمین) ئنجا ئاویان ئەکردە ناو کاشێکەوە و ئەیانخواردەوە، کە خوا ئەو ساڵە بپارێزێ لە بەلاّ و ئاشوبی رۆژگار.

[٣٠٢] بە یەکێکی زۆربلێ ئەوترێ، کە قسەیەکی ناشرینی کردبێ و خۆی نەنگدار کردبێ و لای یەکێك، یا کۆمەڵێك.

٣٠٣)- کوڵه تری، نانی خۆی بڕی[٣٠٣]

٣٠٤)- کون به سەهۆڵ ناگیرێ[٣٠٤]

٣٠٥)- کون بەسەهۆڵ بگیرێ هەر ئەکرێتەوە[٣٠٥]

٣٠٦)- کون لەجەرگیا نییە[٣٠٦]

٣٠٧)- کونە مشکی لێ بووە بەقەیسەری[٣٠٧]

٣٠٨)- کونی قنگی قیرینە ناوچەوانی شیرینە[٣٠٨]

٣٠٩)- کووزەڵە بە نان ئەکا[٣٠٩]

٣١٠)- کوێر تا ئەمرێ بە تەمای چاوە[٣١٠]

٣١١)- کوێر کوێر نابا بەرێوە[٣١١]

٣١٢)- کوێرە چیت ئەوێ، دوو چاوی ساغ[٣١٢]

٣١٣)- کوێرە، باوان، شەلە، باوان[٣١٣]

٣١٤)- کۆتەرەی پەنا کەندوان هەڵگرە بۆ هەرمێ پشکوان[٣١٤]

---

[٣٠٣] بە یەکێك ئەوترێ کە بە گوفتار یا کردار هەڵەیەکی زلی کردبێ، وە جێی خۆی سلۆق کردبێ.

[٣٠٤] بە یەکێك ئەوترێ کە چارەی شتێك بکا بە شتێکی هیچ و پووچ، واتە ئەم چارەیە تا سەر نییە.

[٣٠٥] بە یەکێك ئەوترێ کە چارەی شتێك بکا بە شتێکی هیچ و پووچ، واتە ئەم چارەیە تا سەر نییە.

[٣٠٦] واتە زۆر بە جەرگە.

[٣٠٧] بە یەکێك ئەوترێ کە لە ترسانا نەزانێ چی بکا، وە چۆن خۆی بشارێتەوە.

[٣٠٨] بە ژنێکی ناشرین ئەوترێ، کە بەختی یاربێ و شویەکی باشی کردبێ.

[٣٠٩] بەیەکێك ئەوترێ کە زۆر هەژار بێ.

[٣١٠] بەیەکێك ئەوترێ کە هەمیشە بە تەمای شتێك بێ و دەستی نەکەوێ.

[٣١١] واتە مەردومی نەشارەزا ناتوانێ ببێت بە ڕێ نیشاندەر لە هیچ کارێکا.

[٣١٢] واتە هەر کەسێك ئاواتی خۆی داوا ئەکات.

[٣١٣] یەکێك ئەیڵێ بە گەورەیەکی خۆی، کە لێی قەومابێ، وە پەنای پێ بردبێ.

[٣١٤] واتە لە جیهانا زۆر قایم کار بە.

٣١٥)- کۆتر لە دەماخی ئەفڕێ[٣١٥]

٣١٦)- کۆزرو بە بای عومری نا[٣١٦]

٣١٧)- کۆزی کاران ببینە و قەپوچك لە ماست داگرە[٣١٧]

٣١٨)- کۆسە، بەندێکی دی و پەندێکی گرت[٣١٨]

٣١٩)- کۆستی کەوتووە[٣١٩]

٣٢٠)- کۆکۆ لە هۆهۆ ئەبێ[٣٢٠]

٣٢١)- کۆنە ئەفرۆشێ بە نرخی تازە[٣٢١]

٣٢٢)- کۆنە چەکمە رەقە[٣٢٢]

٣٢٣)- کۆنەیار، ماینی بەزینە[٣٢٣]

٣٢٤)- کێ لە کێیە، شێخە دێیە[٣٢٤]

٣٢٥)- کیژ، ماڵی خەڵقینە، کوڕ کوڕی زێڕینە[٣٢٥]

٣٢٦)- کیژی بە دایك مەنجەڵی بە سەرپۆشە[٣٢٦]

٣٢٧)- کێ گوڕ بۆ گۆڕ هەڵکەن ئەکەنێ[٣٢٧]

---

[٣١٥] واتە لووتی ئەوەندە بەرزە، کۆتر هێلانەی تیا ئەکا.

[٣١٦] واتە زۆری لێ دا.

[٣١٧] یەکێك ئەیڵێ کە داوای شتێکی لێ بکرێ کە نەیبێت، وەك لە لادێ داوای ماست بکەیت لە ماڵێك کە کۆزەکەی کار و بەرخی تیا نەبێ، واتە کە کار و بەرخ نەبێ بمژێ شیر لە کوێ ئەبێ تا ماست ببێ.

[٣١٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هەموو روداوێك، دەرسێ وەرگرێ.

[٣١٩] واتە باوانی شێواوە.

[٣٢٠] واتە تا لە دوای جووتەوە (هۆ هۆ) نەکەیت، دەغڵ و دان کۆ ناکەیتەوە.

[٣٢١] واتە فێڵباز و دەم لووسە.

[٣٢٢] بە یەکێکی بێ ناونیشان ئەوترێ، کە بە ناو ئاغا و وەکی تریش هیچی نەبێ.

[٣٢٣] واتە هەر حەڵی بیەوێ ئەتوانێ پێی بگات.

[٣٢٤] بە شوێنێك ئەوترێ، کە هیچی بە سەر هیچەوە نەبێ.

[٣٢٥] ئەمڕۆ لە ماڵی باوکێتی و سبەینێ بە ئێجگاری لە ماڵی مێردێتی.

[٣٢٦] واتە هەر نەنگێکی ببێ بۆی دائەپۆشێ.

[٣٢٧] واتە هەموو زۆردارێك تۆڵەی خۆی وەرئەگرێ.

٣٢٨)- کێ گوو بە کڵاو ئەپێوێ[٣٢٨]

٣٢٩)- کێ کردی، کێ بردی[٣٢٩]

٣٣٠)- کێر بە پاتە ئەستوور نابێ[٣٣٠]

٣٣١)- کێر بە روودا ئەچێ[٣٣١]

٣٣٢)- کێر لە قەحبە ناخوازرێ[٣٣٢]

٣٣٣)- کێرێ لە دەرپێی خۆتا نەبێ، خوا بیبڕێ[٣٣٣]

٣٣٤)- کێرەکە مەلەرزە (.......)ەکە مەترسە[٣٣٤]

٣٣٥)- کێری ئەمڕۆ بە قنگی سبەینێ[٣٣٥]

٣٣٦)- کێری ئەمڕۆ بە قوونی سبەینێ[٣٣٦]

٣٣٧)- کیسەڵ بگریتە کۆڵ میزت پیا ئەکات[٣٣٧]

٣٣٨)- کیسەڵ ئەڵێ من بە جامی سەپان ئاو ناخۆمەوە[٣٣٨]

---

[٣٢٨] واتە هەر چی نرخ بێ نیەتی.

[٣٢٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، دارایی کۆ بکاتەوە، لەپاشا دەست یەکێکی تر بکەوێ.

[٣٣٠] پاتە: پەڕۆیە. بە یەکێك ئەوترێ کە بیەوێ بە شتی هیچ و چووچ خۆی گەورە بکا.

[٣٣١] بۆیە هەموو کەسێك کە ژن بێنێ، بە دووی جوانا ئەگەڕێ.

[٣٣٢] چونکە خۆی هەمیشە پێویستێتی.

[٣٣٣] واتە بە منالّی کچەوە مەنازە.

[٣٣٤] یەکێك ئەیلێ بە یەکێك کە هەڕەشەی زۆری لێ کردبێ واتە ئیتر ئەوە ناهێنێ کە من ئەوەندە بترسم وە بلێم (کێرەکە مەلەرزە(.......)ەکە مەترسە، وە بڕۆ چیت لە دەست دێ بیکە.

[٣٣٥] واتە پشت بە دنیا نابەسترێ، لەبەر ئەوە دەست لە خۆشی ئەمڕۆ هەڵناگیرێ بۆ سبەینێ، چونکە ئەگونجێ سبەینێ بگۆڕێ.

[٣٣٦] یەکێك ئەیلێ کە هەر چاوی لە ئەمڕۆوە بێ، وە چاوی لەسبەینێوە نەبێ واتە حازر مەدە بە قەرز.

[٣٣٧] واتە ئەگەر خزمەتی ناوەجاخ بکەیت لە جیاتی قازانج زیانت پێ ئەگەیەنێ.

[٣٣٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە خۆی لە یەکێکی تر بەرزتر بزانێ.

٣٣٩)- کیسەی بۆ هەڵدروە[٣٣٩]

٣٤٠)- کێشکە، خۆی چییە و چەلاوی چییە[٣٤٠]

٣٤١)- کێشکەی سەرسوانان قسان دەگێڕێتەوە[٣٤١]

٣٤٢)- کێچ بە گا ئەفرۆشێ[٣٤٢]

٣٤٣)- کێچ گاز ئەگرێ، ئەسپێ تووش ئەبێ[٣٤٣]

٣٤٤)- کێچ کەوتە کەوڵی[٣٤٤]

٣٤٥)- کێچی هەڵهێناوە[٣٤٥]

٣٤٦)- کیمیای ناگاتێ[٣٤٦]

٣٤٧)- کێو بە کێو ناگا، ئادەمی بە ئادەمی ئەگات[٣٤٧]

٣٤٨)- کێوێك ئەڕوخێنێ کەندەڵانێك پڕ ئەبێتەوە[٣٤٨]

---

[٣٣٩] واتە لە سەداسەد بە تەمای ئەو شتەیە.

[٣٤٠] کێشکە: چۆلەکەیە، ئەم پەندە وەك پەندی (چۆلەکە خۆت چیت و گۆشتاوت چییە) وایە.

[٣٤١] واتە تا ئەتوانیت قسە بە ئاهێستە بکە، کە کەس گوێی لێ نەبێ.

[٣٤٢] بە یەکێك ئەوترێ کە شتی خۆی زۆر بە گرنگ بداتە قەڵەم.

[٣٤٣] بە یەکێکی جەربەزە ئەوترێ، کە ئاژاوەیەك بنێتەوە، خۆی دەرباز ببێ وەیەکێکی تر تێوە بگلێ.

[٣٤٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێکی بە دەستەوە بێ، وە تا تەواوی نەکات دەستی لێ هەڵ ناگرێ.

[٣٤٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر دانیشتبێ، وە لە دانیشتن وەڕس بووبێ.

[٣٤٦] بە کارێك ئەوترێ، کە قازانجی ئێجگار زۆر نەبێ.

[٣٤٧] واتە هەر کێو بە کێو ناگات، ئەگینا ئەگونجێ ئادەمی بە ئادەمی بگات.

[٣٤٨] بە دەوڵەمەندێکە ئەوترێ کە بمرێ، وە داراییەکەی دابەش ببێ بە سەر چەند خزمێکی هەژاریا.

# پیتی گاف

۱)- گا بە تەنیا گێرە ناکا[١]

۲)- گا بە جڵ و جۆڕ، ژن بە سەر و پۆڕ[٢]

۳)- گا بە دەنگی ناڕوا[٣]

٤)- گا بە گونا ئەناسێ[٤]

٥)- گا بە گونتاری[٥]

٦)- گا بدە بە گامردە، ژن بدە بە ژن مردە[٦]

۷)- گا رەنگی گا ناگرێ، خووی ئەگرێ[٧]

۸)- گا زمانی نییە و بەندە ئیمانی نییە[٨]

۹)- گا گورواوە، کلکی ماوە[٩]

۱۰)- گا گووی کرد، دنیای پیس کرد[١٠]

۱۱)- گا گێرە بکا، میزی تێ ئەکا[١١]

---

[١] واتە یەکێك بەتەنیا، وە بە بێ یارمەتی دەرێك باش ئیشی پێ ناکرێ.

[٢] واتە هەر شتە، بە شتی خۆیەوە جوانە.

[٣] واتە کەس بە قسەی ناکا.

[٤] واتە زۆر نادانە.

[٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی ناپەسەند بکا.

[٦] واتە چونکە نرخیان ئەزانن.

[٧] واتە هاودەمی پیاوی خراپ مەکە، چونکە ئەگەر رەنگیشی نەگریت، خووی ئەگریت.

[٨] ئەگینا بە تێلا لێی نەئەدا لە سەر جووت نەکردن، چونکە ئەگونجێ ژانی کردبێ، بەلام زمانی نییە تا هاوار بکا بلێ: نەخۆشم. بە زاڵمێك ئەوترێ، کە بەزەی بەهەژارا نەیەتەوە.

[٩] بە کارێك ئەوترێ، کە بەشی زۆری کرابێ.

[١٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەیەکی ناپەسەند بکات.

[١١] واتە ئەمە شتێکی ناچارییە.

١٢)- گا کاوێژ بکات لە حیزی جوتیارەوەیە[١٢]

١٣)- گا کردی و کەر خواردی[١٣]

١٤)- گا لە گاگەل بەجێ بمێنێ، شاخی خۆی ئەشکێنێ[١٤]

١٥)- گا هەر گایە و دۆڵ هەر دۆڵە[١٥]

١٦)- گا هیلاك بوو، گێرد هەرزان بوو[١٦]

١٧)- گا، لەو گایە گۆشت لەو گۆشتە[١٧]

١٨)- گا، وێڵ ئەکا، گوێرەکە بەخێو ئەکا[١٨]

١٩)- گازیشی هەیە و نازیشی هەیە[١٩]

٢٠)- گاسنێ لە چاوی خۆیا نابینێ، سووژنێ لە چاوی خەڵقا ئەبینێ[٢٠]

٢١)- گاسوور تۆ بنوە و من ئەنوم بزانم کاممان قەرزار ئەبیا[٢١]

---

[١٢] واتە ئەگەر جوتیار ئازا و وریا بێ، نایەڵێ گا لە کاتی جوت و گێرەدا، کاوێژ بکات. بە یەکێك ئەوترێ، کە دەسەڵاتی بەسەر بەردەستەکانیا نەبێ.

[١٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە کردەی ئەم بێ و بردەی یەکێکی تر.

[١٤] واتە هیچ کەسێك نابێ لە گەلی خۆی هەڵگەڕێتەوە.

[١٥] واتە چۆن گاکەی خۆم و دۆڵەکەی ئاوایی خۆم ئەناسمەوە، فلان کەسیش بە خۆی و جێگا و ڕێگاکەیەوە ئاوا ئەناسمەوە.

[١٦] واتە گاکە ناتوانێ بڕوا بەڕێدا، کێرد حازرە بۆ سەربڕینی، واتە هەر گرێیەك کە نەتوانی بیکەیتەوە، بیبڕە لە بنا.

[١٧] بەیەکێك ئەوترێ، کە لە تەنگانەیەکا بچێ بە دەنگ خزمێکی دوورییەوە، تا ڕزگاری بکا.

[١٨] واتە ئادەمی ئەبێ باشتر وابێ، وە هیچ دایك و باوکێك نابێ منالی خۆی پێ نەگەیەنێ.

[١٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەستیشت لێ بوەشێنێ و دڵ نەوایشت بکا.

[٢٠] واتە نەنگی خۆی نابینێ، کەچی نەنگی بچوکی مەردوم ئەبینێ.

[٢١] ئەگێڕنەوە کابرایەك بەهۆی بێ بارانییەوە، ساڵێك هیچی نابێ ناچار دەست ئەکا بە قەرز و قۆڵە، ساڵی ئایندە ئەیەوێ جووت و تووێکی زۆر بکا، تا قەرزەکانی پێ بداتەوە، لە جووتە گاکەی یەکێکیان سوریکی خەفۆك ئەبێ، هەر چەند ئەکا جووتی بۆ ناکا، ئەمیش ئەڵێ: من و تۆ ئەگەر بنوین، سبەینێ کە قەرزار هات، هەر تۆ ئەبەن ئەتفرۆشن بە قەساب و کەوڵت ئەکەن، ئەمە ئێستا بە یەکێکی ئەڵێت کە ئەرکی بەسەرتەوە بێ و

٢٢)- گاگا، به خەروار، گاگا، به مستاڵ[٢٢]

٢٣)- گاگەل به گردەوه ڕۆی، پیرێژن له گۆلکه سوری ئەپێچایەوه[٢٣]

٢٤)- گاڵ نەبوو له خۆتەنی، به ڕۆش بوو به ئامێتەنی[٢٤]

٢٥)- گاله کلاو ڕۆژنه سەر ئەخا[٢٥]

٢٦)- گاڵت وه گوێزه[٢٦]

٢٧)- گاڵیش زادی خوایه[٢٧]

٢٨)- گام نییه له گاگەلان، پێم له بەفرێدا سووتان[٢٨]

٢٩)- گام وا به بارەوه، دۆینەم وا به دارەوه، مەلا درەنگه کوڕەکەم بکه به مەلا[٢٩]

---

ئیشت لەگەڵ نەکا، واته هەر تۆ زەرەر ئەکەیت چونکه من لەسەر بەردی ڕەق ئەژیم، بەڵام تۆ نانت دەست ناکەوێ بی خۆیت.

[٢٢] به شتێك ئەوترێ که هێندێ جار زۆر و هێندێ جار کەم بێ.

[٢٣] واته گاگەلەکه هەمووی جەرده بردی، کەچی پیرێژن خەریکی پێچانەوەی گوێرەکەکەی بوو. به یەکێك ئەوتری که له کاتی زیانێکی گەورەدا خۆی به شتی هیچ و پووچەوه خەریك بکات.

[٢٤] له خۆتەنی: واته له خۆیا، ئامێتەنی: واته له ئامێته کردنی به یەکێك ئەوترێ، که خۆی لەخۆیا باش نەبێ، کەچی سەرباریشی بۆ پەیدا ببێ.

[٢٥] واته دزێکی زۆر چوست و چالاکه.

[٢٦] ئەگێڕنەوه که جارێکیان جاف له کاتی چوونیان بۆ کوێستان، ڕان ئەکەنە ناو پەڵه گاڵێك له شارەزوور، خاوەن گاڵ هاوار ئەکاته خاوەن ڕان که ئاژەڵەکەی دەرکات له ناو گاڵەکەدا، ئەویش ئەڵێ: من ئاژاڵی خۆم دەرناکەم، تۆ ئەگەر ڕازی نیت پەڵه گاڵەکەت به سەوزی لێره هەلگره بۆ شوێنێکی تر، ئنجا ئێستا به یەکێك ئەوترێ بۆ لابردنی شتێك که له کردنا نەبێ.

[٢٧] یەکێك ئەیڵێ به یەکێك، که به چاوی سووك تەماشای خزمێکی هەژاری خۆی بکات.

[٢٨] به یەکێك ئەوترێ که به خۆڕایی خۆی ماندوو بکات له کاری ئەم و ئەوا.

[٢٩] ئەگێڕنەوه که کابرایەکی جاف له ڕێگای گەرمیان و کوێستانا لا ئەداته لای مەلای دێیەك، وه کوڕەکەی لەگەڵ خۆیا ئەبا، داوا له مەلا ئەکا که کوڕەکەی بۆ بکا به مەلای خوێندەوار، وه قسەکەی سەرەوەی پێ ئەڵێ: کەوا ئێستا بووه به پەند، وه ئەوترێ به

٣٠)- گان به قەرز ناكرێ[٣٠]

٣١)- گاندانیش به بەختە[٣١]

٣٢)- گانی دەوڵەمەند جلێ لەبانی، گانی بێوەڵەت عالەم پێی زانی[٣٢]

٣٣)- گاور به تەمای سەفەرالی بێ، کەرپشتە رێشە و جەواڵ خاڵی بێ[٣٣]

٣٤)- گای بێ گاوانە[٣٤]

٣٥)- گای بخوزە، لە سەر پێستی شەقی کەیت ناجووڵێ[٣٥]

٣٦)- گای بێگارییە و جلی ماڵە گەورەی لێکراوە[٣٦]

٣٧)- گای تەنها لەوەڕاوە[٣٧]

---

هەموو کەسێك کە کارێکی دوور و درێژی ببێ وە بیەوێ زوو بە زوو لە چەند دەمێکا بۆی بکرێ.
[٣٠]

[٣١] واتە لە هەموو شتێکا بەدبەختی و بەختیاری هەیە.

[٣٢] واتە دەوڵەمەند هەرچی بکا کەس قسەی لێ ناکا، کەچی هەژار هەر چی بکا قسەی لێ ئەکەن.

[٣٣] مەبەس لە گاور، پیاوی بێ دەسەڵاتە، چونکە جاران لە وڵاتی ئیسلاما گاور هەمیشە کەمایەتی (اقلیات) بوون، وە خۆیان بە زەبوون زانیوە، هەر چەند ئیسلام چاودێری خۆیان و مافیانی کردووە، وەك مسڵمانەکان، مەبەس لە سەفەرالیش، پیاوی بێ‌ئینسافە، وا دەرئەکەوێ کە یەکەم جار گاورێك قەرز بە سەر سەفەرالی ناوێکی قەرز کوێرەوە بووە، وە ئەوەندە هاتوچۆی کردووە تا کەرەکەی ناوکە ڕێژ بووە، بێ‌ئەوەی تەنەکەیەك جۆی دەست بکەوێ، بە یەکێکی زەبوون ئەوترێ، کە پارەی لای یەکێکی قەرز کوێر بێ، واتە ئەوەندە دێت و ئەچێ، تا کەرەکەی ناوکەڕێژ ئەبێ، وە هیچیشی دەست ناکەوێ.

[٣٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە کەسی نەبێ سەرپەرشتی بکا.

[٣٥] بە یەکێکی قین ئەستوور ئەوترێ.

[٣٦] گای بێگاری: گایەکە لەلایەن زۆردارێکەوە داگیر کرابێ، وە لەبەر چەوسانەوە لەڕ و لاواز بووبێ، جلی ماڵە گەورە: جلێکی تازە و نوێیە، بە یەکێك ئەوترێ، کە بەرگێکی تازەی دەڵبی لەبەرا بێ.

[٣٧] بە کەسێك ئەوترێ کە لەگەڵ کەسا هەڵ نەکا، وە نەتوانێ بژی.

٣٨)- گای خۆم دی بە دۆڵۆ، نیم بە تەنگ هەمانە بە کۆڵۆ[٣٨]

٣٩)- گای لە گاگەلدا نییە و پێی بەفر بردویەتی[٣٩]

٤٠)- گای ناو گوێرەکەیە[٤٠]

٤١)- گای یەك ئاخورە[٤١]

٤٢)- گایەك بدە و گوێزێك بخۆ بەیانیان، گایەك بدە و گوێزێك مەخۆ بە شەوان[٤٢]

٤٣)- گایەك بکەوێتە گاگەلەوە، ئەگەر رەنگی ئەوانە نەگرێ خووی ئەوان ئەگرێ[٤٣]

٤٤)- گایەکی ریخن، سەدی پاکی پێوە ریخن ئەبێ[٤٤]

٤٥)- گەر لە بێشە شێر نەما، گورگ و مام رێوی ئەکەونە سەما[٤٥]

٤٦)- گەرما ئاوی سارد ئەخاتە برەو[٤٦]

٤٧)- گەڕی بارە ترێیە[٤٧]

٤٨)- گەز ئەرز ئەناسی[٤٨]

---

[٣٨] مەبەس لە هەمانە بە کۆل کەسێکە کە گای ون بووبێ، وە توێشووی بەستبێتە پشت تا بە دوویا بگەڕێ، بە یەکێك ئەوترێ کە هەر خۆی مەبەست بێ، وە دەربەستی کەس نەبێ.

[٣٩] بە یەکێك ئەوترێ، خۆی جۆرە ئیش و کارێکی نەبێ، وە لە هیچە خۆی لە کاروباری ئەم و ئەوا هەڵقورتێنێ.

[٤٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ مناڵانا یاری بکا.

[٤١] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ هەر بە تەنیا بژی، وە لەگەڵ کەسا نەبێ.

[٤٢] واتە بەیانیان بە دڵی ناشتا ئەوەندە گوێز خواردن باشە، وە شەوان ئەوەندە خراپە.

[٤٣] واتە مەردوم خووی ئاوەڵی خۆی ئەگرێ، کەوابوو تۆش ئاوەڵی پیاوی خراپ مەکە.

[٤٤] واتە یەکێکی خراپ، ئەتوانێ چەند کەسێکی باش خراپ بکا.

[٤٥] ئەمە دەستورێکی راست و دروستە خوا نیشانی هیچ گەلێکی نەدا چونکە ئەمە سەرەتای مردنیەتی.

[٤٦] واتە هەموو شتێك تا کاتی خۆی نەیەت نرخی دەرناکەوێ.

[٤٧] بە یەکێك ئەوترێ کە دوای بڕانەوەی کارێك ئنجا گەڕ بکات.

[٤٨] واتە هەموو شتێك بە پێوانە دەرئەکەوێ.

٤٩)- گەز گەز بالآ ئەکا[٤٩]

٥٠)- گەزی چی و جاوی چی؟![٥٠]

---

[٤٩] واتە زۆر کەیف خۆشە.

[٥٠] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی جوتیار لە پێش مانگی رەمەزانا لە کاتی جووت کردنا گاسنەکەی لە کووپەڵەیەك گیر ئەبێ، کە ئەیباتەوە بۆماڵەوە بە ژنەکەی ئەڵێ: ئافرەت ئەمە هی رەمەزانە هەڵیگرە، کابرا مەبەسی مانگی رەمەزان ئەبێ، ژنەکەشی وا تێ ئەگات کە سپاردە (امانت)ی یەکێکە کە ناوی رەمەزانە. رۆژێ لە رۆژان دوو سوالکەر یەکێکیان ناوی رەمەزان ئەبێ ئەچنە ماڵی کابرا بۆ سواڵ. ژنەکەی کە ئەزانێ یەکێکیان ناوی رەمەزانە، خێرا کووپەڵە زێڕەکەی بۆ ئەهێنێ و ئەیداتە دەستی، وە پێی ئەڵێ ئەمە سپاردەکەی خۆتە، کابراش کە ئەزانێ ئەمە هەڵەیە کراوە خێرا پێی پێوە ئەنێ و خۆی ون ئەکات، کابرای جووتیار کە ئێواریێ دێتەوە ژنەکەی بۆی ئەگێڕێتەوە، زۆر تووڕە ئەبێ، وە سێ بە سێ تەلاق ئەخوات کە بڕوا و نەیەتەوە بە ماڵەکەیا تا لە ژنەکەی خۆی کەرتری چاو پێ نەکەوێ، کابرا ئەڕواتا ئەگاتە کانی و ئاوێك لە برسانا لێی ئەکەوێ ژنە لادێییەك– کە ناوی خاتە ئەبێ– دێ بۆ سەر ئاوەکە، کە چاوی بە کابرا ئەکەوێ وا ماندوو مردوو لێی کەوتووە، ئەپرسێ: برا لە کوێوەو دێیت؟ کابراش لە داخی دڵی خۆی ئەڵێ : لە گۆڕ و جەهەننەمەوە دێم، خێرا ژنەکە لێی ئەپرسێ ئەڵێ، بە قوربانت بم (تەپل)ی برام ناناسیت لە جەهەننەم؟ ئاخۆ ئەحواڵی چۆن بێ؟ کابراش ئەڵێ: بەڵێ ئەیناسم، هاوڕێمە وە زۆر لە سزادایە، چونکە زۆر قەرزارە، خێرا ژنە کابرا ئەباتەوە ماڵەوە، وە خزمەتێکی زۆر باشی ئەکات، لە پاشا هەر چی چەکێکی زیوی ئەبێ هەمووی بۆ ئەهێنێ کە بۆی بەرێ تا بیداتەوە بە قەرزی براکەیا کابرا لە خۆشیانا ئەگەشێتەوە، وە خێرا تێی ئەقاچێنێ لە ڕێ تووشی ماڵە جۆلایەك ئەبێ، لا ئەدات و خۆی لەوێ حەشار ئەدات، ئێواریێ مێردەکەی خاتە کە دێتەوە، داستانەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە، کابرا خێرا دەست ئەداتە تفەنگەکەی و سواری ئەسپەکەی ئەبێ و ئەڕوا بە دووی کابرادا، کە نزیکی ماڵی جۆلا ئەکەوێتەوە، کابرا خشل بەر لە دوورەوە کە سوارەکە بەدی ئەکات، خێرا دڵی خەبەر ئەدا وەچە جۆلاکە ئەڵێ: ئەم سوارە کە وا هات کاربەدەستی گەز و جاوە لە لایەن دەوڵەتەوە، هەر کەسێك گەزی کورت، یا جاوی پیس بێ ئەی گرێ، هەست خۆت بشارەوە، لە پاشا سوارەکە کە ئەگاتە پێشەوە دائەبەزێ و تفەنگەکەی ئەکات بە قەڵپوزی زینەکەدا و لە کابرا ئەپرسێ: کەسی نەناسیاو نەهاتۆتە ئێرە؟ ئەمیش دەست ڕائەکێشێ بۆ کابرای جۆلا، ئەویش هەڵ ئەکوتێتە سەری بە لێدان و تێهەڵدان، کابرای

٥١)- گەزیزە پیر بوو لە نزاران، هەر ئێمە ماینەوە لە کۆنە هەواران[٥١]

٥٢)- گەلاویژ کەوتە شەوێ، دەست بەرە بۆ باخەڵی مێوێ[٥٢]

٥٣)- گەلەمان نەدی بی، گەلە رێمان دیوە[٥٣]

٥٤)- گەنجێ بە باربێ، بە زەهرە مار بێ[٥٤]

٥٥)- گەنجان گەنجانە، مانگا یەکێکە و کەڵەگا پەنجانە[٥٥]

٥٦)- گەنم گرد و جۆ بڵاو[٥٦]

---

جۆلاش هاوار ئەکات: بۆ لێم ئەدەیت بە خوا گەزم تەواو جاوم پاکە: ئەمیش ئەڵێ سەگباب (گەزی چی و جاوی چی!) لەم مشت و مڕەدا کابرای خشڵ بەر سواری ئەسپی کابرا ئەبێ و تفەنگەکەی ئەکاتە شانی و تێی ئەقاچێنێ! کابرای جۆلا و خشڵ براویش هیچیان لە قسەی یەکتری ناگەن لە پاشا کابرای خشڵ براو بە نائومێدی دێتە دەرەوە تەماشا ئەکات وا تفەنگ و ولاخەکەشی براوە، ناچار لۆژە لۆژ ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ژنەکەی کە پرسیاری تفەنگ و ئەسپەکەی لێ ئەکات ئەڵێ: بە خوا ئافرەت چووم بۆ جەهەننەم بۆ لای تەپلی برا، دەست و پێی لە زنجیر و کۆتا بوو لە سەر قەرزداری، منیش لەبەر ئەوەی کە پارەم پێ نەبوو تفەنگ و ئەسپەکەم بۆ دانا تا رزگارم کرد، کابرای جوتیاریش تفەنگ و ئەسپ و خشڵەکان لەگەڵ خۆی ئەباتەوە بۆ ماڵەوە، وە بە ژنەکەی ئەڵێ: ئافرەت لەتۆ کەرترم دۆزییەوە تەلاقەکەم نەکەوتووە.

[٥١] گەزیزە: گوڵێکی حەوت رەنگی جوانە، لەئاخر و ئۆخری بەهارا پیر ئەبێ، واتە بەهار بڕایەوە و ئێمە هەر لە کۆنەوە هەواری زستانانین، یەکێك ئەیڵێ بە چەند کەسێك کە ئەوان لە کوێستانی ژیان بن و ئەمیش لە ناخۆشی دابێ.

[٥٢] واتە ئنجا شیرین ئەبێ، وە ترشی تیا نامێنێ.

[٥٣] گەلە: رانە. گەلەرێ: رێیەکە کە باران پیا بڕوا، واتە ئەگەر رانیشمان نەدی بێ، رێیەکمان دییوە کە رانی پیارۆییبێ. یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك کە ئەو بە نەشارەزا بزانێ لە کارێکا.

[٥٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەوڵەمەند بێ و خێر لە دەوڵەتەکەی خۆی نەبینێ.

[٥٥] بە چەند کوڕێك ئەوترێ، کە بە تەمای کچێك بن.

[٥٦] بە چەند دۆستێکی هاودەم ئەوترێ، کە کوتوپڕ کۆ ببنەوە و کوتوپڕ بڵاوەی لێ بکەن.

٥٧)- گەنم هەریّ، جۆ هەریّ، هەرزنە تسنەی قنگیّ کەریّ، تۆش هەریّ؟![٥٧]

٥٨)- گەوج نەچێتە بازاڕ، بازاڕ ئەگەنیّ[٥٨]

٥٩)- گەورە ئاو ئەڕێژیّ و بچوك پێی تیّ ئەخا[٥٩]

٦٠)- گەورە دەڵێن لە خانان، گچکە دەگێڕنەوە لە بانان[٦٠]

٦١)- گەورە قەدری خۆی بە خۆیەوەیە[٦١]

٦٢)- گەورەکچ بە ماچێك حیز نابیّ[٦٢]

٦٣)- گەوهەر لە ناو قوڕا ون نابیّ[٦٣]

٦٤)- گەوهەری خۆت مەدۆڕێنە[٦٤]

٦٥)- گەیگە چانییە و دیزە فرۆشتن[٦٥]

٦٦)- گرەو لە شەیتان ئەباتەوە[٦٦]

---

[٥٧] هەریّ: ئەریّ، واتە ئەی گەنم تۆ بە هەر جا، ئەی جۆ تۆ بە هەر جا، بەڵام هەرزنە تسنە تۆ بۆچی؟! بە یەکێکی هیچ و پووچ ئەوتریّ لە ناو چەند کەسێکا، کە شتێك لەوان قوبولّ کرابیّ، وە ئەم یەکەش بییەویّ لەویش قوبولّ بکریّ، واتە ئەوا بە هەر جا، ئەی کابرای هیچ و پووچ تۆ بۆچی؟!

[٥٨] واتە هەر بە گەوج بازاڕ گەرم ئەبیّ، چونکە شتێکی پێویست نییە و کەچی ئەیکڕیّ، کە ئەشی کڕیّ نازانیّ سەودا بکا و تیّ ئەشکیّ.

[٥٩] واتە کەوابوو ئەی گەورە، ئاوی باش برێژە بۆ بچوك وە هەمیشە سەر مەشقی چاك بە بۆی.

[٦٠] کەواتە هەرگیز قسەی نهێنی مەکە لە شوێنێك کە منالّی لیّ بیّ.

[٦١] واتە ئەبیّ بزانی حورمەتی خۆی رابگریّ.

[٦٢] بە یەکێك ئەوتریّ، کە لە هەموو ژیانیا جارێك هەڵەیەك بکات.

[٦٣] واتە خوێندەواری بە نرخ هەر دەرئەکەویّ، ئەگەر ئەم رۆش پەشەند نەکریّ رۆژیّ هەر ئەبیّ پەسەند بکریّ.

[٦٤] واتە قسەی خۆت لە بەرد مەدە.

[٦٥] گەیگە چان: ناوی دێیەکە، دانیشتوەکانی دیزەی چاك دروست ئەکەن، بەیەکێك ئەوتریّ کە شتێك باش دروست بکا، وە هەر ئەوە بفرۆشیّ.

[٦٦] واتە زۆر فێڵبازە.

٦٧)- گرد و کەژێ، لێك ئەهەژێ[٦٧]

٦٨)- گردەی تۆو بردەی بابێ[٦٨]

٦٩)- گرناقاچ! خۆش گرناقاچ، دوانزە کوێخا و چوار کرمانج[٦٩]

٧٠)- گریانیش دڵی خۆشی ئەوێ[٧٠]

٧١)- گرێی بەختی کرایەوە[٧١]

٧٢)- گرێی دەست، مەخەرە دان[٧٢]

٧٣)- گزگل بکەین بە گوێزە بانە[٧٣]

٧٤)- گزوفتی بۆ ئەدا[٧٤]

٧٥)- گشت شتێ فەرزە، شایی و شیوەن قەرزە[٧٥]

٧٦)- گشت گیانم بکەن بە دەرزی ئاژن، هەر پێم بڵێن کوێخاژن[٧٦]

٧٧)- گشت گیانی ملۆچە ئەکا[٧٧]

٧٨)- گڤەی داوێنی دێ[٧٨]

---

[٦٧] بە دوو کەس ئەوترێ، کە لە هەموو شتێکا یەك کەوتبن.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە ستەمێکی لێ کردبیت، وە ماڵێکی بە ناڕەوا بردبیت، واتە یاخوا هەر تۆ گردی کەیتەوە و بای رۆژگار بە بای بدا.

[٦٩] گرناقاچ: دێیەکە لە ناوچەی شێخ بزەینی لە قەڵەم ڕەوی کەرکوك هەموو ئاواییەکەی شانزە پیاوی تیا بووە، واتە لەم شانزە کەسە دوانزەیان کوێخا بوون، بە چەند کەسێك ئەوترێ، کە هەموو بیانەوێ گەورە و سەرۆك بن.

[٧٠] واتە هیچ بە بێ حەز لێ کردن ناکرێ.

[٧١] زۆرتر بە کچێك ئەوترێ، کە لە پاش ماوەیەکی زۆر شوویەکی باشی دەست کەوتبێ.

[٧٢] واتە ئیش زوو راپەڕێنە، تا گرێ کوێرەی تێ نەکەوتووە.

[٧٣] لە وەڵامی مژدەیەکا ئەوترێ، کە بە لاتەوە گرنگ نەبێ.

[٧٤] واتە زۆر بە جەختی ئارەزووی ئەکات.

[٧٥] واتە ئەگەر بە شایی و شیوەنی خەڵقەوە نەبیت، خەڵقیش بە هی تووە نابێ.

[٧٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە حەزی لە ناوی گەورە بێ.

[٧٧] واتە زۆر کەیف خۆشە.

[٧٨] واتە زۆر بە گوڕە لە ڕێ رۆینا.

٧٩)- گلۆلەیەك موبرێسە و خۆت لە بێ حەیا لادە[٧٩]

٨٠)- گڵ مەیل بڕە[٨٠]

٨١)- گڵی دوور دەرمانە[٨١]

٨٢)- گڵی ژن و مێرد لە گلنجانێك هەڵ ئەکەندرێ[٨٢]

٨٣)- گندۆرە بە رەنگ نییە[٨٣]

٨٤)- گوێ عەزیز بوو، گوارەش عەزیزە[٨٤]

٨٥)- گور چووی پڕە[٨٥]

٨٦)- گورەی داوێنی دێ[٨٦]

٨٧)- گورگ ئەڵێ: ئەمشەو هەورە، دەمم چەورە[٨٧]

٨٨)- گورگ ئەڵێ: قوربانت بم مەڕ، دەخۆم دونگی تەڕ، نابیت لە لەوەڕ[٨٨]

---

[٧٩] واتە کە بێ حەیا رووی تێ کردیت، خۆت بە شتێکەوە خەریك کە وە هەرگیز دەم مەنێرە دەمی.

[٨٠] خۆشەویستێکت ئەمرێ و ئەکرێ بە ژێر گڵەوە، دوای ئەوە بەرە بەرە ئەو مەیل و خۆشەویستیە کەم ئەبێتەوە تا نامێنێ. بە یەکێك ئەوترێ کە عەزیزێکی مردبێ، وە زۆر بۆی پەرێشان بێ.

[٨١] چونکە لە دوورەوە هاتووە ، بە یەکێك ئەوترێ کە لە دوورەوە بێتە شارێك و لە پیاوە گەورەکانی ئەو شارە بەرێزتر بێ، بێ ئەوەی لەوان زیاتر بێ.

[٨٢] واتە ئەبێ هەر دووکیان هاوبیر و هاوسروشت بن.

[٨٣] واتە بە دیمەن هەڵ مەخەڵەتێ.

[٨٤] هەر وەك چاو کە عەزیز بوو چاویلکەش عەزیزە.

[٨٥] واتە ئەوەندەی هەیە دڵنیا بووە، پشتێنی لێ کردۆتەوە.

[٨٦] واتە گڤەی داوێنی دێ.

[٨٧] واتە لە شەوی هەورا، شوان لە ترسی باران زۆر ئاگای لە خۆی نییە، لەبەر ئەوە منیش دەستم وەشاندووە و دەمم چەورە، بە یەکێك ئەوترێ کە لە ئاژاوەیەکدا دەستێکی وەشاندبێ و تیکەیەکی چەوری گلاندبێ.

[٨٨] بە یەکێك ئەوترێ کە تەماعت تێ بکات، وە بییەوێ بە قسە هەڵت فریوێنێ.

٨٩)- گورگ گورگێنێ ئەکا، ڕۆژی تەنگانە قنگ لە یەك ئەکا[89]

٩٠)- گورگ کە پیر بوو ئەبێ بە مەخسەرەی سەگەل[90]

٩١)- گورگ نایە هەزارە، وەی لەوە، یەکێ دارە[91]

٩٢)- گورگ و شوانی؟؟[92]

٩٣)- گورگ و مەڕ، پێکەوە، ئاو ئەخۆنەوە[93]

٩٤)- گورگە و لە پێستی مەڕایە[94]

٩٥)- گورگی باران دیدەیە[95]

٩٦)- گورگی ڕاو دیدە، بەر ڕمت ناکەوێ[96]

٩٧)- گورگیان کرد بە وەکیلی مەڕ[97]

---

[89] بە چەند کەسێك ئەڵێن کە لە خۆشی دا پێکەوە بن و لە تەنگانەدا لە یەك جیا ببنەوە، وەك گورگ کە لە زستانا بەفر کەوت و برسی بوو، زۆرجار بە گەلە ڕوو ئەکەنە ئاوەدانی بۆ مل و مووش، کە لەگەڵ یەکێکیان لێ بریندار کرا، لەجیاتی ئەوە ی بە هەموویان پەلاماری دووژمنەکەیان بدەن– کە کابرای تفەنگ بە دەستە– کەچی پڕ بەهاوڕێ بریندارەکەی خۆیانا ئەکەن و ئەیخۆن.

[90] پیرێك ئەیلێ کە چەند گەنجێك گاڵتەی پێ بکەن.

[91] واتە گورگ کە کەوتە رانێکی هەزار سەرییەوە، قوڕ بە سەر ئەو کەسانەی کە تاقە سەرێکیان هەیە لەو ڕانەدا، بە کەسێك ئەوترێ لەگەڵ دەردێك، یا بەڵایە کی تێکڕایی داکەوت، تاقە کوڕێك یا دەست مایەیەکی کەمیان هەبێ، کە لەگەڵ ئەما هیچی نامێنێ.

[92] واتە چۆن شتی وا ئەبێ.

[93] واتە دنیا زۆر ئەمینە.

[94] بە یەکێك ئەوترێ ، کە لە دڵا وەك دڕندە وابێ، بە دیمەنیش خۆی بە پیاوی باش بداتە قەڵەم.

[95] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە سەد ئاو بدا قولی تەڕ نەبێ.

[96] چونکە شارەزایە، ئەزانێ چۆن خۆی ئەشارێتەوە.

[97] بە یەکێکی دەست پیس ئەوترێ، کە بکرێ بە ئەمین داری شتێك.

٩٨)- گوڕی بەر ئاگر و تاوییەکانە[98]

٩٩)- گوریس کە پچڕا ئەبێ بە چوار بەشەوە[99]

١٠٠)- گوریس لە کوێ پسا، لەوێ گرێی بدەرەوە[100]

١٠١)- گوریسی راخستووە، دنیای تێ خستووە[101]

١٠٢)- گوریش بە یەك لۆنە نەئەهاتەوە ئنجا نۆرەی دوو لۆنەیە[102]

١٠٣)- گوزرێ لە هاوسێم کەوێ وا ئەزانم لە رەشکەی کا کەوتووە[103]

١٠٤)- گول لە گولی مەڕوانە، لە هەڵ و گوڕی بڕوانە[104]

١٠٥)- گولۆڵەم کەوتە لێژی کەس چاکم پێ نایەژی[105]

١٠٦)- گوڵ بێ قنچك نابێ[106]

١٠٧)- گوڵ بە باوەشێن ناگەشێتەوە[107]

---

[98] واتە گوڕ بەستنەوەی ئەوانەی کە لە ماڵی خۆیان دانیشتوون لەبەرئاگر بۆ جەنگ و فداکاری، وەك هەڵمەت و تاودانییەکانە بەهێزە. بە یەکێك ئەوترێ کە لە شەڕا نەبێ و قسەی زل بکا.

[99] گوریسێك دوو سەری هەیە، کە پچڕا ئەبێ بە چوار سەرەوە. بە بەرەی یەکێك ئەوترێ کە بیانەوێ جیا ببنەوە، واتە جیابوونەوە کەمتر بێ، تەفرەقە کەمتر ئەبێ.

[100] واتە تووشی هەر مەسرەفێك بوویت بە قەد پێویست پارە خەرج کە نەکەیت زیاتر لەوە خەرج بکەیت.

[101] واتە زۆر تەماعکارە.

[102] یەکێك ئەیڵێ کە گوزەرانێکی کەم و کوڕی ببێ، وە زۆر بە تەنگی بژی، کەچی لە لابەلایەکەوە مەسرەفێکی تری بێتە سەر.

[103] واتە ئادەمی ئەوەندەی بە ئێش و ئازاری خۆی دەربەستە، ئەوەندە بە ئێش و ئازاری یەکێکی تر دەربەست نییە.

[104] بە یەکێکی گولەکەی ریوەڵە ئەوترێ، کە زۆر بە زەبر و زەنگ بێ.

[105] کەواتە تا ئەتوانیت هەوڵ بدە بۆ ئەوەی گولۆڵەت نەکەوێتە لێژی.

[106] هەر وەك گۆشتی بە بێ ئێسقان نابێ.

[107] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە قسەی پف هەڵدراو و بەڵێن دان هیچی نەهێشتبێتەوە، بە کردەوەش هیچ.

١٠٨)- گوڵە ژاڵە، بەڵێ ئاڵە، بەڵام تاڵە[١٠٨]

١٠٩)- گولله و بارووتی هەمزاغایە و بە کەندەڵا نیوەی ئەنێ[١٠٩]

١١٠)- گونی بۆ ئەدا لە خوم[١١٠]

١١١)- گونی خۆی و گێزەر لێك ناکاتەوە[١١١]

١١٢)- گونی گۆیژە ئەکێڵێ[١١٢]

١١٣)- گونی گوندار دەردێنێ[١١٣]

١١٤)- گونێن و منێن، گونی بارگیرێتی[١١٤]

١١٥)- گوو ناکات تا برسی نەبێت[١١٥]

١١٦)- گوولە سەرە نوێلك ئەکا، بەشکو پێی بڵێن قنگت داوەشێ[١١٦]

١١٧)- گووی گەرمی لە ژێر خۆیدا دیوە[١١٧]

١١٨)- گووی کردە برنجی میری[١١٨]

---

[١٠٨] بە یەکێك ئەوترێ، لە لایەکەوە بەهرەیەکی جوانی ببێ، بەڵام لە لایەکی ترەوە خویەکی ئەوەندە ناشرینی ببێ بەهرەکەی ون بکات.

[١٠٩] بە یەکێك ئەوترێ کە لەسەر حسابی یەکێکی تر پارە خەرج بکا بە زۆری.

[١١٠] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێك رویدابێ، وە مەردوم وابزانن کە ئەو کەسە بەو شتە خەمبارە، یەکێکی تریش بڵێ: کوڕە بەڵێ، گونی بۆ ئەدا لە خوم، واتە لە جیاتی جل و بەرگی شین بکا، مەگەر گونی بۆ لە خوم بدا.

[١١١] واتە زۆر بێ ژیری وبیرە.

[١١٢] گۆیژە: شاخێکە لە رۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە، واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

[١١٣] واتە زۆر بە دەسەڵات و دەست رۆیوە.

[١١٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە قسەی کەس وەرنەگرێ.

[١١٥] واتە زۆر پیسکە و چروکە.

[١١٦] بە یەکێك ئەڵێن، کە حەزی لە ناو و شۆرەت بێ، بابە خراپی، وە لەگەڵ جنێودا نیشابێ.

[١١٧]

[١١٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە دڵی ئاشنایەکی زویر کردبێ بە جۆرێك کە ئیتر بە تەمای خێری نەمابێ.

١١٩)- گووی وشك به قنگی كەسەوە نانوسێ[119]

١٢٠)- گوێرەكە بە رۆژگار ئەبێ بە گا[120]

١٢١)- گوێرەكەی خۆماڵی بە گا نابێ[121]

١٢٢)- گوێرەكەی دەرماڵ، بە گا نابێ[122]

١٢٣)- گوێرەكەی دەوڵەمەند هی فەقیری بەستەوە[123]

١٢٤)- گوێرەكەی زیانكار، ئابرووی گاگەل ئەبا[124]

١٢٥)- گوێرەكەی مەردوم گوێرە و سار ئەبررێ[125]

١٢٦)- گوێری باری، بە مناڵی[126]

١٢٧)- گوێز بە تڕ ئەشكێنێ[127]

١٢٨)- گوێز بە ژمارە، مایەی خاوەنی دیارە[128]

١٢٩)- گوێز بە گومەزا هەڵ ئەخا[129]

١٣٠)- گوێز لە باری خۆی ئەژمێرێ[130]

---

[119] واتە یەكێك پاك بێ، سەد بوختانی بۆ بكەیت هیچی پێوە نانوسێ.

[120] واتە هەموو شتێك بەرە بەرە گەورە ئەبێ.

[121] چونكە بێ رێزە لەبەر ئەوەی كە هەمیشە لەبەرچاوە، واتە كەس قەدری شتی خۆی لە لا نییە.

[122] چونكە بێ رێزە لەبەر ئەوەی كە هەمیشە لەبەرچاوە، واتە كەس قەدری شتی خۆی لە لا نییە.

[123] واتە دەوڵەمەند گوێرەكەكەشی، گوێرەكەی فەقیر ئەبەزێنێ.

[124] واتە هەموو كەسێكی خراپ، كە لە ناو دەستەیەكا پەیدا بوو، ئابڕوی ئەو دەستەیە ئەبات.

[125] ئەم پەندە وەك پەندی (كۆلكی بێگانە پەت ئەپسێنێ) وایە.

[126] واتە زیرەكی و هەڵكەوتوویی هەر لە مناڵییەوە دیارە.

[127] واتە زۆر بە دەعیەیە.

[128] بەڵام بە كۆترە، نەمایە دیارە و نە قازانج.

[129] بە یەكێك ئەوترێ، كە ئامۆژگاری یەكێك بكا كە ئامۆژگاری وەر نەگرێ.

[130] بە یەكێك ئەوترێ، كە ئاگای لە حاڵی یەكێكی تر نەبێ لە شتێكا كە ئەو لەم كەمتر بێ.

١٣١)- گوێز لە سەر سکی بشکێنە[131]

١٣٢)- گوێزێ بێ و سەرم کەیتەوە[132]

١٣٣)- گوێزی بە ژمارە، مایەی ساحێبی دیارە[133]

١٣٤)- گوێزی کوێر سمۆرە پێی فێرە[134]

١٣٥)- گوێی لێ خەفاندووە[135]

١٣٦)- گۆڕ هەڵتەکێنە[136]

١٣٧)- گۆڕی هێناوەتە گۆڕخانە[137]

١٣٨)- گۆزە هەموو جارێ بە ساغی ناگەڕێتەوە لە کانی[138]

١٣٩)- گۆزەش برای دیزەیە[139]

١٤٠)- گۆزەی تازە، دوو ڕۆژ ئاوی خۆشە[140]

١٤١)- گۆزەی نوێ ئاوی ساردە[141]

---

[131] بە یەکێك ئەوترێ کە سکی زۆر توند بێ.

[132] یەکێك ئەیڵێ بە پیاوێکی گەورە، واتە تۆ هەر من بە سەر بکەرەوە با بە گوێزێکی پوتیش بێ.

[133] واتە هەر چی بە ژمارە بوو، بە تەواوی دەرئەکەوێ.

[134] بە یەکێك ئەوترێ کە شارەزای پەیدا کردنی شتی وابێ کە بە هەموو کەسێك پەیدا نەکرێ.

[135] بە یەکێك ئەوترێ کە گوێ نەداتە شتێك.

[136] بە مردویەك ئەوترێ، کە لەدوای مردنی ئەو، شتێکی وا ڕوو بدا کە ئەو لە کاتی خۆیا نەیهێشتبێ ئەو شتە ببێ، واتە وەرەوە دنیا جارێکی تر بۆ ڕێك خستنی ئەو کارە.

[137] بە یەکێك ئەوترێ، کە یەکێکی گەمارۆدابێ، وە بە هەموو ڕەنگێك ئازاری بدا و تەنگی پێ هەڵ بچنێ.

[138] واتە مەردوم هەمیشە هەر قازانج ناکات بەڵکو ناو بە ناو زەرەریش ئەکات.

[139] بە دوو برا یا دوو خوشك ئەوترێ، کە یەکێك بڵێ ئەویان لەمیان باشترە، تۆش ئەڵێیت: جیاوازییان نییە (گۆزەش، برای دیزەیە.)

[140] واتە هەموو شت کۆن ئەبێ و لەبەر چاو ئەکەوێ، ئەمیش وەك پەندی دوای خۆی وایە لە بە کارهێنانا.

[141] بە پیاوێك ئەوترێ کە ژنی تازەی هێنابێ.

١٤٢)- گۆشت بده بە قەساب با لێی بدزێ[142]

١٤٣)- گۆشت بگەنێ خوێی ئەکەن، خوێ بگەنێ چی ئەکەن؟[143]

١٤٤)- گۆشت هەر چەند لەڕ بێ لە بانی نانە[144]

١٤٥)- گۆشت هەر لایقی بازە[145]

١٤٦)- گۆشتی ئەخوا و گۆشتاوی ناخوا[146]

١٤٧)- گۆشتی ئەخورێ[147]

١٤٨)- گۆشتی بۆ تۆ و ئێسقانی بۆ من[148]

١٤٩)- گۆشتی سەر چەپەرە[149]

١٥٠)- گۆشتی گونی خۆت بخۆ و منەتی قەساب هەڵ مەگرە[150]

١٥١)- گۆشتی قیمەت ناکا[151]

١٥٢)- گۆشتی لارانم ئەخۆم، منەتی قەساب هەڵناگرم[152]

---

[142] واتە هەموو کارێك بدەن بە خاوەنی خۆی.

[143] بە مامۆستایەکی ئاینی، یا پەروەردەیی (تربیە و تعلیم) ئەوترێ کە لە ڕێی خۆیان لابدەن، وە خراپ بن، واتە مەردومی خراپ بە هۆی ئامۆژگاری ئەوانەوە باش ئەبێ، ئەی ئەگەر– خوا نەخواستە– ئەوانە خراپ بوون کێ بییان هێنێتەوە سەر ڕێ.

[144] واتە لە نان خۆشتر و بە نرختره.

[145] بە یەکێك ئەوترێ، کە شایستەی ئیشێك بێ.

[146] بە یەکێك ئەوترێ کە لە شتێك بخوات و لە شتێکی تر نەخوات لە بەر حەرامی، لەگەڵ ئەمیشە کە هیچ جیاوازییەکیان نەبێ.

[147] واتە زۆر بەسزمان و کەڕەواڵەیە.

[148] بە مامۆستا، یا لەلەیەك ئەوترێ، کە منالێکی بدرێتە دەست بۆ ئەوەی پێی بخوێنێ، یا فێری هەستان و دانیشتنی بکات واتە لە پێناوی فێرکردنیا هەر ئازارێکی بدەیت قەیناکات.

[149] واتە بێ نرخە.

[150] واتە تا ئەتوانی چاوت لە دەستی کەسەوە نەبێ و منەتی کەس هەڵ مەگرە.

[151] بە ئافرەتێکی ناشرین ئەوترێ، کە کەس داوای نەکات.

[152] واتە تا ئەتوانی چاوت لە دەستی کەسەوە نەبێ و منەتی کەس هەڵ مەگرە.

١٥٣)- گۆشتی مەڕی گێژ، گانی ژنی درێژ زۆر خۆشە[١٥٣]

١٥٤)- گۆشتی ناخوا حەرامە، گۆشتاومی ئەخوا بەتامە[١٥٤]

١٥٥)- گۆشتی یەك بخۆن، پێشەی یەك ناشێکینن[١٥٥]

١٥٦)- گۆلکی بێگانە پەت ئەپسێنێ[١٥٦]

١٥٧)- گۆم تا قوڵ بێ مەلەی خۆشە[١٥٧]

١٥٨)- گیا ئەوەیە بە دەمی مەڕ خۆش بێ[١٥٨]

١٥٩)- گیا بە جێی سەختەوە ئەمێنێ[١٥٩]

١٦٠)- گیا رەشە، بە دەمی مەڕ خۆشە[١٦٠]

١٦١)- گیا لە سەر بنجی خۆی شین ئەبێ[١٦١]

١٦٢)- گیان بە ترپین دەرناچێ[١٦٢]

١٦٣)- گیانی بە گوێ جویی وە[١٦٣]

١٦٤)- گیانی تۆ لە گیانی من شیرین تر نییە[١٦٤]

---

١٥٣

١٥٤

١٥٥ بە دووکەس ئەوترێ کە زۆر پەیوەستییان لەگەڵ یەك ببێ، بە رەنگێکی وا کە دەستیان نەچێتە یەك.

١٥٦ بە یەکێك ئەوترێ ، کە خۆی منالی نەبێ، وە منالێکی بێگانە بکات بە منالی خۆی، واتە رۆژێك ئەبێ پەت بپچڕێ و بڕوا.

١٥٧ واتە مەردوم لە شوێنی بچوکا ناتوانێ باش هەڵسوڕێ، بەلام کە شوێنەکەی گەورە بوو، ئەو حەلە وەك نەهەنگ بە هەموو لایەکا هەڵ ئەسوڕێ.

١٥٨ ئەم پەندە بە مەعنای پەندی ( گیا رەشە، بە دەمی مەڕ خۆشە)یە.

١٥٩ واتە پارە لای پیاوی سەر رەقی دەست قووچاو ئەمێنێ.

١٦٠ بە ژنێکی ناشرین ئەوترێ کە لە لای مێردەکەی خۆشەویست بێ.

١٦١ واتە هەموو کەسێك ئەچێتەوە سەر تیرە و رەگەزی خۆی.

١٦٢ واتە شەرمەزار بوون مەرگ ناهێنێ.

١٦٣ واتە زۆر بێ عەقڵە.

١٦٤ یەکێك ئەیڵێ، کە رێگایەکی ترسناکی بخەنە بەر، ئەمیش نەچێ.

١٦٥)- گیانی خۆم لەو دەشتە نەدۆزیوەتەوە[١٦٥]

١٦٦)- گیانی خۆی لە قەرەج سەندەوە[١٦٦]

١٦٧)- گیای تۆ نییە[١٦٧]

١٦٨)- گیرۆدەی هەوەڵ مامەڵە بێ[١٦٨]

١٦٩)- گیرفانی بۆ هەڵدروە[١٦٩]

١٧٠)- گیرفانی قووڵە[١٧٠]

١٧١)- گیسکێ نەخواردم، کاورێ جرنگاندم[١٧١]

١٧٢)- گیسکە قوت سەد ساڵ لێی دەی بە مێکوت، ئەو قسەیەی ئەیوت هەر ئەیوت[١٧٢]

١٧٣)- گیسکی بەهار لە دایکی خۆی هەڵدێ[١٧٣]

---

[١٦٥] یەکێك ئەیڵێ، کە رێگایەکی ترسناکی بخەنە بەر، ئەمیش ئەچێ.

[١٦٦] واتە خۆی لە بەڵایەکی زۆر قورس رزگار کرد.

[١٦٧] واتە ئەم باسە تۆ تێی ناگەیت.

[١٦٨] واتە لە هەوەڵ مامەڵەدا ئەخەڵەتێ.

[١٦٩] واتە بە تەمایەتی، وە کیسەی بۆ هەڵدروە.

[١٧٠] واتە زۆر چروکە، وە هەر چەند ئەکات دەستی ناگاتە بنکی گیرفانی.

[١٧١] یەکێك ئەیڵێ کە بۆ قازانجێك بچێ بۆ شوێنێك، کەچی بە زیانێکەوە بگەڕێتەوە.

[١٧٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەسەر قسەیەکی خۆی بمێنێتەوە، وە لێی لانەدات.

[١٧٣] چونکە تێر و تەسەلە، واتە گەنجی دەوڵەمەندی تێر و تەسەل بە هیچ شتێکەوە ناوێستێ.

# پیتی لام

١)- لات پاڵەوانی خوایە[١]

٢)- لاتانە ئەفرۆشێ[٢]

٣)- لادێیی رۆن بێنێ و ئاو بەرێ هەر ئەو قازانج ئەکا[٣]

٤)- لاف لە غەریبی و گوز لە بیابان[٤]

٥)- لافاو، لە تکە تکە پەیدا ئەبێ[٥]

٦)- لام خۆشە لە دۆزەخا بم بە سەربەست، نەك لە بەهەشتا بم بە ژێر دەست[٦]

٧)- لاو لاوی بێ داڵدە بەرز نابێتەوە[٧]

٨)- لای دادا[٨]

٩)- لای دیزەی رەشەوە دانیشتیت، رەش ئەبیت[٩]

---

[١] واتە لە هیچ ناترسێ، چونکە هیچی نییە.

[٢] بە لاتێك ئەوترێ، کە بیانویەکت پێ بگرێ بۆ ئەوەی شتێکی بدەیتێ.

[٣] چونکە ئەرکی زۆرە.

[٤] گوز: بە فارسی ترە، واتە لە غەریبی دا چونکە کەس ناتناسێ هەر درۆیەك بکەیت کەس پێ نازانێ تا بە درۆت بخەنەوە، لە چۆڵ و بیابانیشا هەر ترێ بکەنیت کەسی گوێی لێ نییە.

[٥] واتە هەموو شتێکی زۆر لە پێشەوە کەم کەم کۆ ئەبێتەوە.

[٦] بە ڕاستی سەربەستی لە هەر شوێنێك بێ ئەو شوێنە بەهەشتە وە ژێر دەستی لە هەر لایەك بێ ئەولایە دۆزەخە.

[٧] بە منداڵێکی بێکەسی بێ پشتیوان ئەوترێ.

[٨] واتە مرد، لە رووی سووکیەوە ئەوترێ.

[٩] واتە هاوڕێیی خراپ بکەیت خراپ ئەبیت، کەواتە تا ئەتوانیت هاوڕێیی باش بکە، وەك قورئان ئەفەرموێ " و كونوا مع الصالحين" واتە لەگەڵ چاکانا بن.

١٠)- لای چاوە ساغەکەوە ئەیدا و لای چاوە کوێرەکەوە ئەیدزێتەوە[10]

١١)- لای کوورەوە بیت پریشکت لێ ئەپەڕێ[11]

١٢)- لای کوورەی ئاسنگەرەوە دانیشتیت، پرشنگت بەرئەکەوێ[12]

١٣)- لای لایەش ئەکا و ئەش گری[13]

١٤)- لە ئاش دوا کەوتووە و لە ڕێ را ئەکا[14]

١٥)- لە ئاو بدە بتبا مەچۆ بە سەر پردی نامەردا[15]

١٦)- لە ئاو شەو وسڵ ئەکا[16]

١٧)- لە ئاوی خوڕ مەترسە، لە ئاوی مەنگ بترسە[17]

١٨)- لە ئاوی شەو پارێز ئەکا[18]

١٩)- لە ئاوی شەو وەرع ئەکا[19]

٢٠)- لە ئاوی مەند و لە پیاوی مۆن بترسە[20]

---

[10] بە یەکێك ئەوترێ، لە لایەکەوە شتێکت بداتێ و لە لایەکی ترەوە لێت بسێنێتەوە.

[11] کەواتە تا ئەتوانیت نزیکی کورەی ئاژاوە مەکەوە.

[12] واتە هاوڕێیی خراپ بکەیت خراپ ئەبیت، کەواتە تا ئەتوانیت هاوڕێیی باش بکە، وەك قورئان ئەفەرموێ " و کونوا مع الصالحین" واتە لەگەڵ چاکانا بن.

[13] بە یەکێك ئەوتری، بە سەر مەردومیشا بێ و خۆشی ئەو کارە بکا کە مەردومی تیا ئامۆژگاری ئەکا.

[14] بە یەکێك ئەوترێ کە لە سەرەتای کارێکا سستی کردبێ و لە دواییدا کەوتبێتە پەلەپەل.

[15] تەماشای پەندی (ئاو بت با، لە پردی نامەرد مەپەڕەرەوە) بکە.

[16] واتە لە حەڵاڵ و حەرام ئەپرسێتەوە.

[17] بە یەکێك ئەوترێ کە مەنگ بێ، وە بە درێژایی ساڵ لەگەڵیا بیت و تێی نەگەیت کە چییە.

[18] واتە لە حەڵاڵ و حەرام ئەپرسێتەوە.

[19] چونکە نازانێت چی لە دەروونایە.

[20] چونکە نازانێت چی لە دەروونایە.

٢١)- له ئەسپ دائەبەزێ سواری کەر ئەبێ[٢١]

٢٢)- له ئەسپی نەبوو ئاخوڕ ئەبەستێ[٢٢]

٢٣)- له ئێستریان پرسی باوکت کێیە؟ وتی خاڵم ئەسپە[٢٣]

٢٤)- له ئێوارێوە تا بەیانی ئەستێرە ئەژمێرێ[٢٤]

٢٥)- له بۆ نەوسێ خۆیدا هەرسێ[٢٥]

٢٦)- له بێ ئیشیدا سەری ئەیەشێ[٢٦]

٢٧)- له بێ خەبەران کەشکەك سلاّوات[٢٧]

٢٨)- له بێ ژن وایە، ژندار نان و قوز ئەخوا[٢٨]

٢٩)- له بێ کەسی، ئەتۆم بەسی[٢٩]

٣٠)- له بێ ماڵ وایە بێژنگ و حاجەت و هێلّەکە[٣٠]

٣١)- له باوان هیچ نییە، له خەزوران تلیلیلی بە[٣١]

٣٢)- له بەختانمە ئەبێ وا بلّێ[٣٢]

---

[٢١] زۆرتر بە یەکێك ئەوترێ، کە ژنەکەی تەلاّق بدات و ژنێکی خراپتر بێنێ.

[٢٢] بە کارێك ئەوترێ کە له پێش وەختا بکرێ.

[٢٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە ناوی باوکی خۆی نەبات لە بەر هەژاری، وە شانازی بە خزمێکی دەوڵەمەندییەوە بکات.

[٢٤] واتە شەو بێدارە.

[٢٥] هەرس: ورچە. بە یەکێك ئەوترێ کە بۆ شتێکی هیچ و پووچ خۆی بخاتە چورتمێکی گەورەوە.

[٢٦] بە یەکێك ئەوترێ کە لە بەر بێ ئیشی وەك گوێرەکەی گێژ بسوڕێتەوە.

[٢٧] لە ڕووی تیتاڵییەوە بە یەکێك ئەوترێ کە ئاگای لە کارێك نەبێ.

[٢٨] بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی نەبێ، وە زۆری حەز لێ بێ.

[٢٩] یەکێکی بێکەس بە هاوڕێیەکی هیچ و پووچی خۆی ئەڵێ.

[٣٠] چونکە هیچی بە خۆیەوە نەدیوە.

[٣١] واتە ماڵی خاوەن کچ ئاگایان لە هیچ نییە، کەچی لە ماڵی ئەو کوڕەی کە بە تەمای کچەکەیە شاییە، کە گوایە کچەکە دراوە.

[٣٢] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە قسەیەکی ساردی کردبێ دەربارەی ئەم.

٣٣)- له بەختەکەی خۆم وارا ئەبینم، بچمە سەر سیروان هیچ ئاو نابینم[٣٣]

٣٤)- له بەر باجی، لە پشت، قەیچی[٣٤]

٣٥)- لە بەر خاتری خاتران، چومەتە سەر دینی گاوران[٣٥]

٣٦)- لە بەر گەروی کێوی ئاگرینا سەر چۆپی ئەکێشێ[٣٦]

٣٧)- لە بەرم نییە، لە پشتم نییە، بۆرە سوار ئەڕوا بە گونمەوە[٣٧]

٣٨)- لە براز مویەك بکرێتەوە، وەڵیفەتە[٣٨]

٣٩)- لە برسانا ئاو ئەکوڵێنێ[٣٩]

٤٠)- لە بن سێبەری شێرا بنوو، با شێرەکە بتخوا[٤٠]

٤١)- له بوکێ زمان نەبوو، لە خەسوویێ ئیمان نەبوو[٤١]

---

[٣٣] یەکێك ئەیلێ بە یەکێك، کە قسەیەکی ساردی کردبێ دەربارەی ئەم

[٣٤] قەیچی: مەقەستە. واتە روو بەڕوو بە باجی باجی قسەت لەگەڵ ئەکا، کەچی لە پشتەوە دەمی وەك مقەست لێت ئەخاتە کار.

[٣٥] یەکێك ئەیلێ کە لەبەر تکای یەکێك لایدا بێ لە ڕێی راست.

[٣٦] کێوی ئاگرین: کێوێکە کە بیری ئاگر فرێدەری تیابێ. سەر چۆپی کێشان: هەڵپەڕنە لە پەڕی هەڵپەڕکێوە بە جۆرێك کە زەلامەکان بگێرێ بە گردی. بە یەکێك ئەوترێ کە لە شوێنێکی مۆلەکە دانیشتبێ بە بێ خەم.

[٣٧] یەکێك ئەیلێ بە یەکێکی بێگانە کە بکوژرێ، وە ئەم هیچ مەبەستی نەبێ، واتە ئەم لاوچاکە نەکچەزامە، نە کوڕە زامە، ئەکوژرێ قیر و سیا بەلام ئەمە خۆپەرستییە و پەسەند نییە.

[٣٨] واتە لە دوژمن زەرەرێك بدەیت با کەمیش بێ هەر باشە.

[٣٩] بە یەکێکی زۆر هەژاری نەدارا ئەوترێ، کە خواردن لەماڵیا نەبێ.

[٤٠] واتە لەگەڵ مەرد بێ و تووشی زەرەر بێت، چاکترە لەوەی لەگەڵ نامەرد بی و تووشی قازانج بیت.

[٤١] دوژمنایەتی بووك و خەسوو لە کۆنەوە هەیە، بووك مناڵ و دنیا نەدیدە و بێدەم و پل، خەسوش دنیا دیدە و بێ ڕەحم و لە خوا نەترس، ئنجا وەرە ئەم ئاگر و ئاوە چۆن بە یەکەوە ئیدارە ئەکەن.

٤٢)- له بیستی، هەر تۆم پێویستی[٤٢]

٤٣)- له پارەوە دوو ساڵه[٤٣]

٤٤)- له پاش تەنگانه خۆشییه[٤٤]

٤٥)- له پاش تەنگانه فەرحانییه[٤٥]

٤٦)- له پاش ترێ خەمشەی برێ[٤٦]

٤٧)- له پاش ترکەندن قنگ قووچاندن کەڵکی نییه[٤٧]

٤٨)- له پاش رەشی رەنگی تر نییه[٤٨]

٤٩)- له پاش رووت کردنەوە، تەشیت تەلا بنێ به سەرتەوە[٤٩]

٥٠)- له پاش چووە، مەچۆ[٥٠]

٥١)- له پاش مردن رەحمەت چاکه[٥١]

---

[٤٢] یەکێك به هاورێیەکی زۆر لـه باری خـۆی ئـەڵێ کـه زۆر رێك بـن، وه دڵـی یـەکتری رابگرن.

[٤٣] له رووی تیتاڵییەوه به یەکێك ئەوترێ که ئاگای له کارێك نەبێ.

[٤٤] وەك قورئان ئەفەرموێ: (فان مع العسر يسرا ان مع العسر يسرا)واته لەگـەڵ هـەموو تەنگانەیەکا فەرەحییه.

[٤٥] وەك قورئان ئەفەرموێ: (فان مع العسر يسرا ان مع العسر يسرا)واته لەگـەڵ هـەموو تەنگانەیەکا فەرەحییه.

[٤٦] به یەکێك ئەوترێ که ئیشێکی قەوماندبێ ئنجا پەشیمان بووبێتەوه.

[٤٧] به یەکێك ئەوترێ که له دوای هەڵەیەکی زل ئنجا خۆی کـۆ بکاتـەوه واتـه ئـەم کـۆ کردنەوەیه ئەبوایه له پێش هەڵەکەدا بوایه.

[٤٨] واته له پاش روورەشی ئیتر چی؟

[٤٩] به یەکێك ئەوترێ که له دوای قەومانی کارێك ئنجا مەترسی لێ بکات.

[٥٠] واته دوای شتی رابوردوو مەکەوه.

[٥١] ئەمه بۆ مردوویەکه که چاکەی له خراپەی زیاتر بێ، یا ئەگەر خراپەی زۆری کردبێ له رووی نادانییەوه بووبێ یا خراپەکانی هەموی هەر له بەنی خۆی و خوادا بێ، بـەڵام ئەگەر یەکێك خراپ بووبێ لەگـەڵ هاونیشـتمانیا، وه مایـەی دوو بـەرەکی و ئـاژاوه و وێرانی و دواکەوتنی وڵات بووبێ، بۆ ئەوانه دوای مردنیـان نـەفرین (لعنـت) چـاکه، تـا هەموو خراپێك تێ بگات که دوای مـردن بەشـی نەفرینـه لـه هـەموو کەسێکەوه. سـا

٥٢)- له پاش مردووا درۆ ئەکرێ[٥٢]

٥٣)- له پاش میران، سەران ئەبڕێ[٥٣]

٥٤)- له پاشمله سەری شا ئەبڕێ[٥٤]

٥٥)- له پەشیمانی دا شاخی لێ ڕواوه[٥٥]

٥٦)- له پەنای کەرا راوه چێرگ ئەکا[٥٦]

٥٧)- له پەنجەی ساغ کرم دەردێنێ[٥٧]

٥٨)- له پڕێ، نابێ به کوڕێ[٥٨]

٥٩)- له پشت کەرەوه بڕۆی ئەبێ بۆنی تەرسی بکەیت[٥٩]

٦٠)- له پیران تەوێ ، له زستان شەوێ[٦٠]

---

بەڵکو بسڵەمێتەوه له خراپییەکەی خوا له قورئانا نەفرینی کردووه لـه گـەلی (عـاد و سـەمود و لـوت و فرعـون) دوای مردنیـان بـه هـەزاران سـاڵ وه ئەفـەرموێ: (والـزین ینقچون عهدالله من بعد میپاقه. و یقگعون مـام الله بـه ان یوصـل و یفسـدون ف الارچـن اولئك لهم اللعنه و لهم سـولدار) واتـه ئەوانـەی ریشـتەی یەکێتییـەك ئەپچڕن کـه خـوا فەرمانی داوه به بەستنی وه ئاژاوه ئەنێنەوه له وڵاتا، ئەوانه نەفرینیان بـۆ هەیـه، وه جێی سزا بەشیانه له دۆزەخا.

[٥٢] واته ئەگەر مردوو پیاوی گەوره بێ، گەلێ درۆی به دەمەوه ئەکرێ.

[٥٣] به یەکێك ئەوترێ، له ڕوودا قسـه نـەکات، بـەڵکو هـەر لـه پاشملـه هاشـه و هوشـه بکات.

[٥٤] به یەکێك ئەوترێ، که هەر له پاشمله ئازابێ.

[٥٥] واته زۆر پەشیمانه.

[٥٦] وا بڵاوه که چێرگ سڵ له کەر ناکات، لەبەر ئەوه راوچـی لـه پـەنا کـەرا ئەچـێ بـۆ راوه چێرگ، ئەم پەنده به زۆر زانێك ئەوترێ که لـه پـەنا پیـاوێکی بـەڕێزی گێلۆکـەدا هێندێ شت لەم و لەو بکێشێتەوه.

[٥٧] واته ئەمەنده دانایه له هەموو شت رەخنه ئەگرێ.

[٥٨] واته هەموو شتێك بەرەبەره پێ ئەگات.

[٥٩] یەکێك ئەیڵێ به هاوڕێیەکی که له قسەیەکی دلگیر بووبێ.

[٦٠] واته پیر بەنچەتایەك ئەمرێ، زستانیش هەر شەوێ گۆڕی دەستی خۆی ئەوەشێنێ.

٦١)- له پێستی مەڕا گورگی ئەکا[٦١]

٦٢)- له پێشەوه ئەڵێ: جانەجانە، له پشتەوه کونان دەکا له مەرجانە[٦٢]

٦٣)- له تاو بێوەژن ئەچمە سەرداری، پلارم تێ ئەگرن ئەم خەنە خواری[٦٣]

٦٤)- له تاو پلاو، ترش ئەکاتە ئاو[٦٤]

٦٥)- له تاو نەوس، کەوتە حەز[٦٥]

٦٦)- له تەڕ ئەخوا و له وشك ئەنوێ[٦٦]

٦٧)- لەتەك خرسا ئەچێتە جەواڵەوه[٦٧]

٦٨)- لەتەك کوێرا که نانت خوارد، خوا له ناوا ببینە[٦٨]

٦٩)- له تەمەڵیدا باری بۆ هەوار ناچێ[٦٩]

٧٠)- له ترێ لۆتی مەشهورترە[٧٠]

٧١)- له تڕه نەرێ، چووه تسەنەرێ[٧١]

٧٢)- له تڕەنگەری رۆی بۆ تسەنگەرێ[٧٢]

٧٣)- له ترسی ئاگر، پاڵ ئەدا بە ئاوەوه[٧٣]

---

[٦١] واته به ناوی باشییەوه خراپی ئەکات.

[٦٢] به یەکێکی دووڕوو ئەوترێ که له ڕووو جۆرێ قسه بکا و له پاشملەش جۆرێك.

[٦٣] یەکێك ئەیلێ که هەر بەشی لێ بێوەژنا بێ.

[٦٤] بەهەژارێك ئەوترێ که له تاو شتێك که حەزی لێ ئەکات شتێکی تر بخوات.

[٦٥] به یەکێك ئەوترێ، که زۆر نەوسن و چلێس بێ.

[٦٦] به یەکێك ئەوترێ، که گوزەرانێکی باشی ببێ، وه خۆش رابوێرێ.

[٦٧] خرس:ورچە، به یەکێك ئەوترێ، که بتوانێ هاودەمی هەموو خراپێك بکات.

[٦٨] واته له ترسی خوا گزی لێ مەکە.

[٦٩]

[٧٠] به شتێك ئەوترێ، که دەنگی دابێتەوه و بڵاو بووبێتەوه.

[٧١] ترەنەرێ، جێگای تر، ئەسڵەکەی تر ئەندرێیە. تسەندرێ جێگای تس، واتە له جێگایەکەوه که ناوبانگێکی ببێ، چووه جێگایەك که هەر چی ناوبانگ بێ نییەتی.

[٧٢] به یەکێك ئەوترێ که له شوێنێکی خراپەوه بچێ بۆ شوێنێکی خراپتر.

[٧٣] به یەکێك ئەوترێ، که له دەست بەڵایەك راکا بۆ بەڵایەکی تر.

٧٤)- له ترسی مار پاڵ به ئاگرەوە ئەدات[٧٤]

٧٥)- له تفەنگی خاڵی دوو کەس ئەترسێ[٧٥]

٧٦)- له جێ وێرانه گەنج دەرئەکەوێ[٧٦]

٧٧)- له جێی بەرزی بنیشه قسەی قەوی بوێشه[٧٧]

٧٨)- له جێی سنگان قوزەڵقورته[٧٨]

٧٩)- له جێی شابازان، گۆر گۆره وازان[٧٩]

٨٠)- له جێی شێران، سەگان ئەکەن گێران[٨٠]

٨١)- له جێی چۆلا فیکه مەکه، نانی گەرم به تیکه مەکه[٨١]

٨٢)- له جێیەك نانوێ، ئاو بچێته ژێری[٨٢]

٨٣)- له چۆڵ و بیابانا بی لەگەڵ زۆردارا، لەوە باشتره که رۆژ بکەیتەوە له کۆشکا لەگەڵ نەزانا[٨٣]

---

[٧٤] به یەکێك ئەوترێ، که له ناو ناخۆشییەك خۆی بخاته ناو ناخۆشیەکی ترەوە.

[٧٥] یەکەم ئەو کەسەی که رووی لوولەکەی تێ ئەکرێ، دووهەم ئەو کەسەی که ئەی ترووکێنێ.

[٧٦] واته له زۆر ماڵی هەژارکوڕ و کچی زۆر ژیر و رێك و پێکی لێ دەرئەچێ، هەروەك له زۆر کەلاوه کوپەڵه پاره ئەدۆزرێتەوە.

[٧٧] بویشه: له بوێژەوه وەرگیراوه، واته پیاوی گەوره ئەتوانێ چەند ئارەزوو ئەکا، قسەی زل بکا.

[٧٨] واته پاداشی خراپه خراپەیه.

[٧٩] کۆر کۆره: باڵندەیەکی بۆرەقنەی بێهۆش و بیره. به یەکێکی ناوەجاخی خراپ ئەوترێ که له جێی پیاوێکی گەوره دانیشتبێ.

[٨٠] کۆر کۆره: باڵندەیەکی بۆرەقنەی بێهۆش و بیره. به یەکێکی ناوەجاخی خراپ ئەوترێ که له جێی پیاوێکی گەوره دانیشتبێ.

[٨١] له جێی چۆلا فیکه مەکه، نه وەك پیاو خراپێکت لێ راپەڕێ، نانی گەرم به تیکه مەکه، نه وەك دەمت بسوتێنێ.

[٨٢] واته زۆر دووربین و پارێزگاره.

[٨٣] واته زۆر دووربین و پارێزگاره.

٨٤)- له چەمان له پێشەوه بڕۆ، له لمێ له دواوه[٨٤]

٨٥)- له حەمامی زر و زەنگ، نه من دەنگ نه تۆ دەنگ[٨٥]

٨٦)- له حەوت ئاسمانا ئەستێرەیەکی نییه[٨٦]

٨٧)- له حەوت ئاسیاو مشتێ ئاردی نییه[٨٧]

٨٨)- له حەوت ئاوی داوه، قولی تەڕ نەبووه[٨٨]

٨٩)- له حیز وایه هەموو کەس حیزه[٨٩]

٩٠)- له حیزی جوتیار، گا کاوێژ ئەکا[٩٠]

---

[٨٤] چونکه له ئاوا که له پێشەوه بوویت، ئەگەر کەوتیته خنکان، چونکه چاویان تێتەوەیه رزگارت ئەکەن، له لما که له دواوه بوویت، ئەگەر رۆش بچێت قەیناکه چونکه هەر رزگارت ئەبێ.

[٨٥] ئەگێڕنەوه که کابرایەکی زۆرداری ستەمکار، زۆر ستەم ئەکات له پیاوێکی هەژار، کابرای هەژار، بیر ئەکاتەوه چۆن تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوه، دێ پێستی بەرانێکی گەورەی تیسکن پەیدا ئەکات، وه هەر تیسکەی زەنگۆڵەیەکی پێوه ئەکات، وەخۆی ئەشارێتەوه لەو حەمامەی که هەموو جارێ تەرخان (قورغ) ئەکرێ بۆ ئەو کابرایه، شەو کابرای ستەمکار که ئەچێ بۆ حەمام له ناوەڕاستی خۆشتنا کابرای هەژار پێستەکه لەبەر ئەکا، وه به چوار چنکۆڵه بۆی ئەچێته ژوورەوه، وه لەبەر دەمیا خۆی بۆ رائەوەشێنێ، کابرا له ترسا بێهۆش ئەکەوێ، ئیتر هەر چێکی تری لێ ئەکا ئەیکا، وه ئەچێته دەرێ پێستەکه دائەکەنێ و دەرباز ئەبێ، له پاشا کابرا هۆشی به خۆیا دێتەوه تۆزێ ئاو ئەکا به خۆیا و دێته دەرەوه، خۆی پۆشته ئەکاتەوه، وه به دەم لەرزەوه ئەگەڕێتەوه بۆ ماڵەوه چل شەو ئەکەوێ، له پاشا که چاك ئەبێتەو خەڵق و خوا ئەچن بۆ لای، وه له سەرەی ئەوانا کابرای هەژاریش ئەچێ بۆلای، وه به دزییەوه پێی ئەڵێ (له حەمامی زر و زەنگ، نه تۆ دەنگ نه من دەنگ).

[٨٦] واته ئەستێرەی بەختی ئاوا بووه.

[٨٧] ئاسیاو: ئاشه، واته حەوت ئاش ئەگەڕێ کەچی مشتێ مزه شك نابا، به یەکێکی دەست بڵاو ئەوترێ.

[٨٨] واته زۆر دنیا دیدەیه.

[٨٩] چونکه له چاوی خۆیەوه تەماشای هەموو کەسێك ئەکات.

[٩٠] به یەکێك ئەوترێ، که دەست و پێوەندی باش نەبن.

٩١)- له خاك هێمن تره[٩١]

٩٢)- له خۆشیانا پێی ناکەوێتە زەوی[٩٢]

٩٣)- له خۆشیانا هار بووه[٩٣]

٩٤)- نه خۆشیدا بەرخی بازی ئەکات[٩٤]

٩٥)- له خشەی مار و مێروو ئەترسێ[٩٥]

٩٦)- له داوێنی ئەبڕێ و ئەیداتە ناو شانی[٩٦]

٩٧)- له دەرماڵی قەرەتاجی بتڕێ، نان و دۆی ئەبڕێ[٩٧]

٩٨)- له دز وایه هەموو کەس دزه[٩٨]

٩٩)- له دوای باران کەپەنەك؟[٩٩]

١٠٠)- له دووی چوان مەچۆ[١٠٠]

١٠١)- له رۆن نیسکێ، له موو تیسکێ[١٠١]

---

[٩١] به یەکێ: ئەوترێ، که زۆر هێواش و لەسەرخۆ بێ.

[٩٢] واته وەك باڵی گرتبێ وایه.

[٩٣] واته یاخی بووه.

[٩٤] به یەکێك ئەوترێ که زۆر کەیف خۆش بێ.

[٩٥] واته زۆر ترسنۆکه.

[٩٦] زۆرتر به ژنێك ئەوترێ، که له مەسرەف کردنا راست بێ لەگەڵ مێردەکەیا.

[٩٧] قەرەتاجی: پیاوێکی گەورەی نان بده بووه لـه سەلجوقیەکان، واتـه ئـەم کابرایـه ئەوەندە شوومه، ئەگەر له بەر ماڵی نان بدەیەکی وەك قـەرەتاجی بـتڕێ، نـان و دۆی ئەویش ئەبڕێ.

[٩٨] چونکه له چاو خۆیەوه تەماشای مەردووم ئەکات.

[٩٩] کەپەنەك: فەرەنجییه. به یەکێك ئەوترێ که لەدوای قەومانی کارێك ئنجا خـۆی بـۆ ئامادە بکا.

[١٠٠] واته شت که له دەست چوو دوای مەکەوه.

[١٠١] یەکێك ئەیلێ له رووی ئامۆژگارییەوه به کەیبانووی ماڵێك که دەست بڵاو بێ، واتـه له ژیانا مەردوم ئەبێ پاشەکەوتی بکا، بەم رەنگه لـه هـەموو کەوچـکه رۆنـێ بـه قـەد نیسکێك، وه له هەموو دەست پێچکه موویەك تیسکێکی لێ گل بداتەوه.

١٠٢)- لە راستی رەحمەت ئەباریَ[102]

١٠٣)- لە راستیدا ئاو ئەویستیَ[103]

١٠٤)- لە رەشی ئەکوژیَ[104]

١٠٥)- لە رقی دراوسیَ قنگی منالّی خۆی ئەدڕیَ[105]

١٠٦)- لە ریشم هەلّ ئەگرم ئەیخەمە سەر سمیلّم[106]

١٠٧)- لە ریّوی بە پیّچ ترە[107]

١٠٨)- لە ریّوی دایك مردوو ئەکا[108]

١٠٩)- لە ڕیّوییان پرسی کویَ خۆشە، وتی ئاو رەز، ئەگەر نەبوو، بەرانبەری بویّستە[109]

١١٠)- لە زۆرزانی، پف ئەکا لە ماستی[110]

١١١)- لە زستان بە ئەرکترە[111]

١١٢)- لە زستان شەویَ، لە پیران تەویَ، لە بۆرە سواران هەویَ[112]

---

[102] واتە هەرگیز لەراستی تووشی زیان نابیَ.

[103] ئاو لە شویّنی زۆر تەختا ناڕوا و ئەویّستیَ، واتە هەموو شتیّك لە راستیدا وایە.

[104] بە یەکیّك ئەوتریَ کە لە سەر شتی هیچ و پووچ ملی مەردوم بشکیّنیَ وەك یەکیّك کە هەر تارماییەکی بەدی کرد و تفەنگیّکی پیّوە بنیَ.

[105] بە یەکیّك ئەوتریَ کە لە رقی ئەم و ئەو زەرەر لە خۆی بدات.

[106] یەکیّك ئەیلّیَ کە لە گوزەرانی مالّیدا پینە و پەڕۆ بکا و بەم رەنگە لەم هەلگریَ بیخاتە سەر ئەو، وە لەو هەلگریَ بیخاتە سەر ئەم.

[107] واتە زۆر فیّلّبازە.

[108] بە گیانداری لەڕ و لاواز و تیَ قوپاو ئەوتریَ.

[109]

[110]

[111] بە یەکیّك ئەوتریَ کە ئەرکی ئیّجگار زۆربیَ.

[112] واتە پشت بە خۆشی زستان و بە ساغی پیر و بە قنج و قیتی بۆرە سوار مەبەستە، چونکە ئەویان کە لە شەویّکا گۆڕی حەقی بەرودوا ئەکاتەوە، ئەمیشیان پەنجە تایەك راست نابیّتەوە و ئەویتریشیان بە هوویەك ئەکەویّتە خوارەوە.

١١٣)- لە زێی دا و پێی تەڕ نەبوو[113]

١١٤)- لە ژێر ئەم کاسەیەدا نیو کاسەیەك هەیە[114]

١١٥)- لە ژێر لێفەی باوکیا نەترپیوە[115]

١١٦)- لە سایەی گوڵە گەنمێکەوە هەزار گوڵە مرۆر ئاو ئەخواتەوە[116]

١١٧)- لە سەر باسکێك دابنیشە، هەر دوو دیوت لێ دیار بێ[117]

١١٨)- لە سەر ڕێگا بنویت، خەوی هاشەو پاشە ئەبینیت[118]

١١٩)- لە سەر ڕێگا لابدەیت، دڕك ئەچێ بە پێتا[119]

١٢٠)- لە سەر شکستە ڕۆین پەشیمانی ئەهێنێ[120]

١٢١)- لە سەر فرسەتان باز مەبە[121]

١٢٢)- لە سەر قوڕێ، تۆزێ دەکات[122]

١٢٣)- لە سەرماڵم، بدە لە باڵم[123]

---

[113] ئەم پەندە وەك پەندی (لە هەزار ئاوی داوە قولەێی تەڕ نەبووە) وایە.

[114] بە گوفتار یا کردارێك ئەوترێ کە مەبەستێکی نادیاری ببێ.

[115] واتە بێ ڕەوشت و خو گەورە بووە.

[116] بە پیاوێکی گەورە و بەڕێز ئەوترێ کە بە هۆی ئەوەوە زۆر کەس بەهرەمەند ببێ.

[117] واتە بیر لە بەر و دوای ئیش و کارت بکەرەوە، وە چاوت لە بەر و دوای ڕۆژگارت بێ.

[118] چونکە هەمیشە مەردوم بە سەرتا ئەڕۆنو پێت پیا ئەنێن، واتە ئەگەر ئەتەوێ بحەسێیتەوە، لە قەڵەباڵغ دوور بکەرەوە.

[119] واتە لە دەستوور و باوی وڵات لامەدە.

[120] واتە شتێك کە لە ماڵا شکا لە سەری مەڕۆ، چونکە پەشیمان ئەبیتەوە.

[121] واتە بە سەر هەلەوە مەڕۆ.

[122] واتە لە هەموو شوێنێك ئاژاوە ئەنێتەوە.

[123] یەکێك ئەیلێ بە یەکێك کە بە ماڵی خۆی دەست گیرۆیی کردبێ، کەچی سەرەڕای ئەوەش پیاو خراپی بکات، واتە دەستیشم گرتویت و پیاو خراپیشم ئەکەیت؟

١٢٤)- له سەرت زیاتر، وچان بدە بە دەستت[١٢٤]

١٢٥)- له سەرەوە شۆخ له ژێرەوە پەڕۆ[١٢٥]

١٢٦)- له سەرەوە هەی ئەکا و له ژێرەوە دەی ئەکا[١٢٦]

١٢٧)- له سەگ سواڵ ئەکا[١٢٧]

١٢٨)- له سەگی دڕ له حاکمی کوڕ، له ئافرەتی دەم شڕ بترسە[١٢٨]

١٢٩)- له سووژن بێکەس ترە[١٢٩]

١٣٠)- له سێبەری خۆی ئەسڵەمێتەوە[١٣٠]

١٣١)- له سیروان پێ مەلە ئەکا، له پیربازۆك خەلە ئەکا[١٣١]

١٣٢)- له شارێکا که پیاو نەما به کەڵەشێر ئەڵێن بلقاسم بەگ[١٣٢]

١٣٣)- له شەڕا بەشی ئاشتی، له ئاشتیدا بەشی شەڕ بێڵەرەوە[١٣٣]

---

[١٢٤] واته ئەوەندە مێشکت پێویسته بە حەسانەوە، دەستت زۆرتر پێویستە چونکه ئەرکی زۆرترە.

[١٢٥] بە یەکێك ئەوترێ له سەرەوە کاڵای جوان و له ژێرەوە کاڵای دڕاوی له بەرابێ، یا بە دیمەن له پێستی مەڕ و بە دڵیش گورگ بێ.

[١٢٦] بە یەکێك ئەوترێ که بە دیمەن خۆی بکا بە کۆتری ئاشتی و له ژێریشەوە ئاژاوە بنێتەوە ئاگر خۆش بکا.

[١٢٧] واته زۆر نەدارا و ڕەجاڵە.

[١٢٨] واته زۆر ترسنۆکە.

[١٢٩] بە یەکێك ئەوترێ که کەسی نەبێ.

[١٣٠] واته زۆر ترسنۆکە.

[١٣١] بە مەردومی بەهەڵپەی ڕەت بڵاو ئەوترێ.

[١٣٢] له کاتێکا ئەوترێ، کە پیاوێکی چاك لە پیشەیەکا نەمابێ، وە یەکێکی هیچ و پووچ چووبێتە جێگاکەی.

[١٣٣] واته له شەڕدا ئەوەندەی تیا بێڵەرەوە ئەگەر ئاشتان بووەوە، ڕووت بێ قسە لەگەڵ ئاشناکەتا بکەیت، هەروا لە ئاشتیشا ئەوەندە ئاشت مەبن کە هەموو نهێنیەکتان ئاشکرا ببێ لای ئاشناکەتان بە ڕەنگێکی وا ئەگەر شەڕتان بوو زەفەرت پێ‌ببات.

۱۳٤)- لە شەڕا شەریکم، لە خێرا تەریکم[134]

۱۳٥)- لە شەڕا هەر ناوبژی کەر تیا ئەچێ[135]

۱۳٦)- لە شەمشەمە کوێرەیان پرسی بۆ هەر بە شەو ئەگەڕێیت؟ وتی نامەوێ چارەی قورسی رۆژ ببینم[136]

۱۳۷)- لە شومی دا بایەقوشی ناگاتێ[137]

۱۳۸)- لە شێر ترسان عەیب نییە[138]

۱۳۹)- لە شیرازە دەرچووە[139]

۱٤۰)- لە شیری بەری دایکی حەڵاڵترە[140]

۱٤۱)- لە عەباداران مەترسە، لە شەدە لاران بترسە[141]

۱٤۲)- لە عەرش تا قورش، کەس بە دۆی خۆی نالێ ترش[142]

۱٤۳)- لە عەزرەت نانی تیری کاغەز ئەجاوێ[143]

۱٤٤)- لە عیسایان ئەدا مووسا ئەچوو بە تاسەوە[144]

۱٤٥)- لە قۆڕەی سکی ئەسڵەمێتەوە[145]

---

[134] چونکە پەڵی هەر دوو لای بەر ئەکەوێ.

[135] چونکە پەڵی هەر دوو لای بەر ئەکەوێ.

[136] بەیەکێکی چەوت و چەوێڵ ئەوترێ کە یارای ئەوەی نەبێ بچێتە رووی پیاوێکی گەورەی راست پەرست.

[137]

[138] یەکێك ئەیلێ کە لە پیاوێکی گەورە یا لەیەکێکی دڕ بترسێ.

[139] بە یەکێك ئەوترێ کە هەموو سنورێکی شکاندبێ و هیچی تیا نەهێشتبێتەوە.

[140] بە شتێك ئەوترێ، کە زۆر حەڵاڵ بێ.

[141] واتە لە پیاوی بەساڵاچو مەترسە، بەڵکو لە گەنجی بەخۆناز بترسە.

[142] واتە کەس نەنگی خۆی نالێ.

[143] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر حەزی لە خواردنێك بێ و دەستی نەکەوێ، وە بە خواردنێکی تر خۆی ئیخفال بکا.

[144] بەیەکێك ئەوترێ، کە ئەگەر لە یەکێکی تر بدەن ئەم بترسێ.

[145] واتە زۆر ترسنۆکە.

١٤٦)- له قامكی ساغ كرم دەردێنێ[146]

١٤٧)- له قەلانیش بوو له كۆترانیش[147]

١٤٨)- له قەنگەوه لغاوی ئەكا[148]

١٤٩)- له قل هۆ الله ساتمه ئەكا[149]

١٥٠)- له قلّپەی گۆزە ئەترسێ[150]

١٥١)- له قنگەلاّشێكیان پرسی ماڵت له كوێیه؟ وتی با ئەیزانێ[151]

١٥٢)- له قورِ تۆز هەڵئاسێ[152]

١٥٣)- له قینی دراوسێ قنگی منالّی خۆی ئەدرِێ[153]

١٥٤)- له كۆپانی خۆی ئەخوا[154]

١٥٥)- له كەر وایه كەس بیر ناكاتەوه[155]

١٥٦)- له كەرێ جل و جۆر له بووكێ سەر و پۆر[156]

١٥٧)- له كەری تۆپیو ئەگەرِێ نالّی بكێشێتەوه[157]

١٥٨)- له كەشكیش بوو، له مەشكیش بوو[158]

---

[146] تەماشای پەندی (له پەنجەی ساغ كرم دەردێنێ) بكه.

[147] واته له هەر دوولا نائومێد بوو.

[148] واته كارەكەی پاش و پێشه.

[149] واته هیچ خوێندەواری نییه.

[150]

[151] یەكێك ئەیلّێ كه ئیشی خۆی به دەست خۆی نەبێ.

[152] به یەكێكی رژدی چروك ئەوترێ، كه هیچی له دەست نەبێتەوه.

[153] به یەكێك ئەوترێ كه رقی له یەكێك هەستا به كەسێكی خۆی برِێژێ.

[154] واته لەبەر بێ قازانجی له سەرمایەی خۆی ئەخوا.

[155] چونكه له چاوی خۆیەوه تەماشای هەموو كەسێك ئەكا.

[156] واته كەر به زەنگۆلّه و گێز و گولّەنگ و بوكیش به سەروپێچەوه جوانه.

[157] واته زۆر رجالّ و نەدارایه.

[158] به یەكێك ئەوترێ، ئەوی هەیەتی بەسەر و بەرەوه برِوا.

١٥٩)- له كفرى فيرعەون مەشهورترە[١٥٩]

١٦٠)- له كلى شەيتان وەرە خوارەوە[١٦٠]

١٦١)- له كوێ پسا: لەوێ گرێی بدەرەوە[١٦١]

١٦٢)- له كولَه چوارشەمە سورترە[١٦٢]

١٦٣)- له كێويان پرسی بۆوا بەرزی؟ وتی له سايی دۆڵەكەی بەردەمەوە[١٦٣]

١٦٤)- له گايەك چی بدەم بە برايەك له مەلێك هەر يەكە پەلێك[١٦٤]

---

[١٥٩] فيرعەون پاشای ميسر بووە لـە كـاتی مووسـا پێغەمبـەرا، خـۆی بـە خـوای ميسـر زانيوە، هەر چەند مووسا لەگـەڵيا خـەريك بـووە كـە بـڕوا بێنـێ بـە خـوای ئاسمـان و زەوی، وە بە پێغەمبەرێتی مووسا، بـڕوای نـەهێناوە، تـا لـە دواييـدا لـەدەريای سـورا خنكا، ئنجا قورئان له شوێن باسی بێ بڕوايی فيرعەون ئەكا، وە لەدوای شەيتان هيچ پياو خراپێك بە قەد فيرعـەون نـاو نـەبراوە لـە قورئانـا بـە خراپـە، وە هەرچـی نـاوی مووسای پێ گەيشتبێ، ناوی بێ بڕوايی فيرعەونيشی پێ گەيشتووە.

[١٦٠] بە يەكێك ئەوترێ، كـە لەسـەر كـارێكی چـەوت و چـەوێل قـينی گرتبـێ و بـە هـيچ جۆرێك نەيەتەوە سەررێی راست.

[١٦١] واتە لەگەڵ هەر دۆست و ئاشنايەكدا پەيوەستيت پچڕا خێرا بی بەستەرەوە.

[١٦٢] كولَەچوراشەمە: دواترين چوراشەممەی مـانگی سـەفەرە، كـە دانێكـی پێغەمبـەری تيا شكێنرا لە جەنگی ئوحودا، وە گـەلێ هـاوڕێی پێغەمبـەری تيـا كـوژرا. بـە يـەكێك ئەوترێ كە زۆر سوور بێ لە سەر شەڕ.

[١٦٣] لـە زبـان دەوڵەمەندێكـەوە ئـەوترێ كـە لـە نـاو كۆمـەڵێكی هـەژارا بـژی و هـەڵيان سورێنێ لە كاروباری خۆيا، وە لە سەر حسابی ئەوان دەوڵەمەند ببێ.

[١٦٤] ئەگێڕنەوە كە كابرايەك گايـەك و مريشـكێكی ئـەبێ، گاكـەی جـووتی بـۆ ئـەكات و مريشكەكەی هێلكەی بۆ ئەكات، ئەم كابرايە برايەكی زۆر هەژار و رەجاڵی ئەبێ، رۆژێ داوای لێ ئەكات كە بەشێكی بداتێ لە گاكەی ئەميش ئەڵێ: (لە گايـەك چـی بـدەم بـە برايەك، لە مەلێك هەر يەكـە پـەلێك) واتـە گايـەك بەشـی دابـەش كـردن ناكـات، بـەڵام مريشكێك بەشی ئەكات، بەم رەنگە هەر يەكە پەلێك، ئنجا بـە يـەكێك ئـەوترێ كـە لـە شتێكی باشا بەشت نەدا، وە لە شتێكی هيچ و پووچا بەشت بدات.

١٦٥)- له گەورە گەورەی پشدەرێ، هۆمان کەوتە ڤون ڤرە هاجەرێ[١٦٥]

١٦٦)- له گوریسی جوو درێژترە[١٦٦]

١٦٧)- له گوریسی رەش و سپی ئەسڵەمێتەوە[١٦٧]

١٦٨)- له گوریسی ناو هەمانە بە پێچ ترە[١٦٨]

١٦٩)- له گوڵ پاکتر[١٦٩]

١٧٠)- له گوڵێ کاڵتری پێ ناڵێم[١٧٠]

١٧١)- له گوڵیان پرسی زۆر گەشی، وتی باخەوانەکەم مەردە[١٧١]

١٧٢)- له گونی بەرانا پەنیر ئەکا[١٧٢]

١٧٣)- له گونی گا رووت ترە[١٧٣]

١٧٤)- له گوێی گادا نوستوە[١٧٤]

١٧٥)- له لێفەی باوکیا نەترپیوە[١٧٥]

---

[١٦٥] یەکێك ئەیڵێ کە جاران ئاشنای زۆری بووبێ و پیاوی گەورەی زۆری ناسی بێ، وە بەو هۆیەوە هەموو ئیشێکی بۆ کرابێ، بەڵام ئێستا ئەوانەی نەمابن، وە هۆی کەوتبێتە یەکێکی هیچ و پووچی بێ نرخەوە.

[١٦٦] گوریسی جوو: تەمەعکارییەتی، واتە لە جوو بە تەماعترە، وە ئاواتی لەو زیاترە.

[١٦٧] کە لە مار ئەچێ، چونکە لەوەپێش مار پێوەی داوە، بە یەکێك ئەوترێ کە دەستێکی لێ وەشێنرابێ.

[١٦٨] واتە ئێجگار چەوت و چەوێڵ و بەفرِ و فێڵە.

[١٦٩] واتە هەر چی ئەنگ بێ نییەتی.

[١٧٠] واتە قسەیەکی وای پێ ناڵێم کە دڵی گەرد بگرێ.

[١٧١] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی لە ژێر دەستابێ، وە شتەکەی زۆر پاك و تەمیز و رێك و پێك بێ.

[١٧٢] واتە شوان لە دزی بێ، مەڕی دۆشینی ئەدۆشێ و شیرەکەی ئەکا بە پەنیر، با لە گونی بەرانیشا بێ. بە یەکێك ئەوترێ کە شتێکی لە ژێر دەستابێ، وە بە هەموو جۆرێ بتوانێ دەست کاری بکا.

[١٧٣] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر رەش و رووت بێ.

[١٧٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر بێئاگا بێ لە شتێك.

[١٧٥] واتە هەر لە ماڵان و کۆڵانانا گەورە بووە.

۱۷٦)- له ماسی نێر شەرم ئەکا[176]

۱۷۷)- له ماڵ درەنگی پێ چووە و له کەژ پەلەیەتی[177]

۱۷۸)- له ماڵ لێیانداوە و له گیای کەژی ئەتۆرێ[178]

۱۷۹)- له ماڵەوە برێشکە ئەخوا، له دەرەوە به سابون دەست ئەشوا[179]

۱۸۰)- له ماڵی باوان نەتخوارد نان دۆ، له ماڵی خەزوران عاجبایت مەبۆ[180]

۱۸۱)- له ماڵی جوو بخۆ و له ماڵی گەوور بنو[181]

۱۸۲)- له ماڵی زاوا باسێ نییە، له ماڵی وەویی تلیلییە[182]

۱۸۳)- له ماڵیا نییە دەنگە برویشێ، قۆزی بێ زواد چۆپی ئەکێشێ[183]

۱۸٤)- له ماین دابەزیم، سواری کەر بووم[184]

۱۸۵)- له ماینی نەبوو، ئاخوڕ هەڵ ئەبەستێ[185]

۱۸٦)- له مەڕ دۆشان بێینە کەر دۆشان[186]

---

[176] به تەوسەوە به ژنێك ئەوترێ، کە به دیمەن لە پیاوی نامەحرەم شەرم بکا، وەکی تریش وانەبێ.

[177] بەیەکێك ئەوترێ، کە لە لایەك دواکەوتبێ و لە لایەکی تر پەلە پەل بکات.

[178] واتە بە کەر ناوێرێ بە کورتان شێرە.

[179] بۆ ئەوەی نیشان بدا کە چێشت و گۆشتی خواردووە، بە یەکێکی هەمەت بەرز ئەوترێ، کە خۆی بە تێر و پڕ نیشان بدا.

[180] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ماڵی باوانیا هیچی نەدی بێ، وە ئێستا کەوتبێتە شوێنێکی گەورە و ئاوەدانەوە.

[181] چونکە یەکەمیان پاك و تەمیز ترە لە دووهەم، بەڵام دووهەم ئەمین ترە لە یەکەم.

[182] تەماشای پەندی (لە باوان هیچ نییە) بکە.

[183] بە یەکێکی قنج و قیت ئەوترێ، کە نانی نەبێ و دەست لە کورێنیش هەڵ نەگرێ.

[184] یەکێك ئەیڵێ، کە ژنێکی باشی بووبێ و نەمابێ، ئێستا ژنێکی هیچ و پووچی بە تووشەوە بووبێ.

[185] بە یەکێك ئەوترێ کە هێشتا ئەو شتەی دوای کەوتووە دەستی نەکەوتبێ، کەچی خۆی بۆ ئامادە بکا.

[186] یەکێك ئەیڵێ کە لە خێر و بێرێکی باشەوە هاتبێتە سەر شتێکی هیچ و پووچ.

۱۸۷)- لە مەنجەڵێکا ناکوڵێن[187]

۱۸۸)- لە من کردە و لە شەماڵ بردە[188]

۱۸۹)- لە من نەدەن لە تۆ بدەن وا ئەزانم لە رەشکەی کا ئەدەن[189]

۱۹۰)- لە نۆ دەستمان، کۆڵێ بەستمان[190]

۱۹۱)- لە ناعەلاجی دا بە جوولەکە ئەڵێ: بە ڕیشی مەردانەت قەسەم[191]

۱۹۲)- لە ناعلاجی، بە دوژمن ئەڵێ باجی[192]

۱۹۳)- لە ناڵیش ئەدا و لە بزماریش ئەدا[193]

۱۹٤)- لە ناو بێوەژن ئەچمە کونەوە، چرا هەڵ ئەکەن ئەم دۆزنەوە[194]

۱۹٥)- لە ناو گولا کوێر باشقەیە[195]

۱۹٦)- لە ناو گووژاڵکدا بۆ دەنکی تاڵ ئەگەڕێ[196]

۱۹۷)- لە ناو کوێرانا مشمۆر باشقەیە[197]

---

[187] بە دوو کەس ئەوترێ کە بە سروشت لە یەکەوە دووربن.

[188] یەکێك ئەیلێ کە بە درێژایی ساڵ کسب و کار بکا و پارە پەیدا بکا کەچی هەر ڕۆژە خوا شتێکی وای بۆ بنێرێ کە تووشی پارە خەرجکردنی بکا.

[189] یەکێك وا ئەڵێ کە خۆپەرست بێ، وە هەر خۆی مەبەست بێ.

[190] واتە کۆڵێکمان بەست لە نۆبەرەی دەستمان، بە یەکێك ئەوترێ کە لە نۆبەرەی خۆی سفتاح بکات.

[191] جاران لە جوولەکە نامەردتر نەبوو، بەڵام ئێستا لە جوولەکە نامەردتر ئێجگار زۆرە.

[192] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ناچاری مەرایی یەکێك بکات.

[193] واتە باشیش ئەڵێ و خراپیش ئەڵێ.

[194] یەکێك ئەیلێ کە هەر بەشی لێ بێوەژنا بێ.

[195] واتە لە هەر نەنگێك، نەنگێکی ناشرین تر هەیە.

[196] لە کاتێکدا کە دەنکەکان هەموو تاڵن، بە یەکێك ئەوترێ کە لە ناو شتێکدا کە هیچی تری تیا نەبێ ئەو شتە نەبێ، بۆ ئەو شتە بگەڕێ.

[197]

١٩٨)- له نێرەکەریان پرسی کوێ خۆشە؟ وتی سەرخەرمان، وتیان ئەگەر نەبوو، وتی قەراغ و بیجاری[١٩٨]

١٩٩)- له هۆمەریان پرسی خەڵقی کوێیت؟ وتی هێشتا ژنم نەهێناوە[١٩٩]

٢٠٠)- له هەر لا ئاشە، کتك فەراشە[٢٠٠]

٢٠١)- له هەریش بوو، له مەریش بوو[٢٠١]

٢٠٢)- له هەزار ئاش ئەکا، ئاشێ ناماڵێتەوە[٢٠٢]

٢٠٣)- له هەزار ئاوی داوە قولەپێی تەڕ نەبووە[٢٠٣]

٢٠٤)- له هەموو جێیێ حوقە چوار ئیزرەمە[٢٠٤]

٢٠٥)- له هەموو دیزەیەکا ئەسکوێیە[٢٠٥]

٢٠٦)- له هەموو هەورێك باران نابارێ[٢٠٦]

٢٠٧)- له هەولێر کۆنتر[٢٠٧]

٢٠٨)- له هوو موو ئەکاتەوە[٢٠٨]

---

[١٩٨] به یەکێك ئەوترێ، که هەر چاوی له قازانج و سودی خۆیەوە بێ.

[١٩٩] واته پیاو ژنی له کوێ هێنا ئەبێ بە خەڵقی ئەو شوێنە. ئەمە وا ئەکەیەنێ کە کورد له بنیاتەوە ژنی خۆی لە لاخۆشەویست و بەڕێز بووە، به رەنگێك کە دەستی له کەس و کاری خۆی هەڵگرتووە بۆ کەس و کاری ژنەکەی.

[٢٠٠] به یەکێك ئەوترێ، که له هەر کوێیەك خواردن و رابواردنێکی خۆش ببێ ئەو لەوێ بێ.

[٢٠١] به یەکێك ئەوترێ که له هەموو سەرێکەوە بێ بێزا بووبێ له کارێك.

[٢٠٢] به یەکێك ئەوترێ، که هیچ قسەیەکی تەواو نەکا، وە نەیباتە سەر یەك.

[٢٠٣] واته زۆر پوختە و دنیا دیدەیە.

[٢٠٤] واته حەق له هەموو شوێنێك هەر حەقە.

[٢٠٥] به یەکێك ئەوترێ، کە خۆی تێکەڵی هەموو کارێك بکا.

[٢٠٦] واته هەر چی تۆ هیوات پێ بوو، وە نەبێ بەهرەی لێ وەربگریت.

[٢٠٧] واته ئێجگار کۆنە.

[٢٠٨] واته له (هـ) کە دوو چاوی هەیە _ چاوێکیان کە وەك (م ) وایە لێی ئەکاتەوە، واته مەردومێکی پاشەکەوتییە، وە له هەموو شتێك شتێك گل ئەداتەوە.

٢٠٩)- له هێلكەی سپی مریشكی رەش و له مریشكی رەش هێلكەی سپی پەیدا ئەبێ[٢٠٩]

٢١٠)- له وەختی راوا گوی دێ[٢١٠]

٢١١)- له ولاخی نەبوو ئاخوڕ ئەبەستێ[٢١١]

٢١٢)- لەر بێ و ماڵی خۆم بێ[٢١٢]

٢١٣)- لەڕ كوژە[٢١٣]

٢١٤)- لەڕی خۆت، له چاخی خەڵق چاكترە[٢١٤]

٢١٥)- لەسەر خۆش گەڕێ، بۆ خۆی ئەكەوێ[٢١٥]

٢١٦)- لەش بەبارە[٢١٦]

٢١٧)- لەش بەدۆشاوە[٢١٧]

٢١٨)- لەشی ساغ پاشایەتییە[٢١٨]

---

[٢٠٩] واته ئەمە نیشانەی گەورەیی خوایە.

[٢١٠] ئەگێڕنەوە كه ئەحمەدی ساغا تانجییەكی بووە هەموو جارێك له وەختی راوا گوی هاتووە تا نێچیرەكە له دەست دەرچووە، ئێستا بە هەموو كەسێك ئەوترێ، كه لە كاتی هەلێكا بە شتێكی هیچ و پووچەوە خەریك بێ تا هەلەكەی لەدەست دەرئەچێ.

[٢١١] بە كارێك ئەوترێ، كه پێش وەخت بكرێ.

[٢١٢] واته ماڵ، كەم بێ و بۆ خۆم بێ، باشترە لەوەی زۆر بێ و ستەمكار تەمەعی تێ بكا.

[٢١٣] بە نەخۆشییەك ئەوترێ، كه زۆرتر لەڕ و لاواز بكوژێ.

[٢١٤] چونكه بێ منته.

[٢١٥] بە یەكێك ئەوترێ، كه دەستی دابێتە كارێكی خراپ، وە دەستی لێ هەڵ نەگرێ، واته پیاوی وا وەك سەرخۆش وایە، رۆژێك ئەبێ كه خۆی بكەوێ.

[٢١٦] بە یەكێك ئەوترێ، بەبایەك ساغ و بە بایەك نەخۆش بێ.

[٢١٧] بە یەكێك ئەوترێ، بەبایەك ساغ و بە بایەك نەخۆش بێ.

[٢١٨] چونكه كه لەشت ساغ بوو، هەموو شتێكت لەلا خۆشە، بەلام كه لەش بە بار بوویت هەموو شتێكت لەلا تاڵە.

٢١٩)- لەچەکان، هاتۆتە سەر حەیزەران[219]

٢٢٠)- لەگەڵ ئەسلان هەموو فەسلان، لەگەڵ نائەسلان مەچۆرە کایە، رەنجی چەند ساڵەت ئەچێ بە زایە[220]

٢٢١)- لەگەڵ ئەسلان، هەموو فەسلان لەگەڵ نائەسلان بەهیچ فەسلان[221]

٢٢٢)- لەگەڵ بەرخ بنوو لەگەڵ چۆلەکە هەستە[222]

٢٢٣)- لەگەڵ بڕوا، گورگان خواردوو ئەبێ[223]

٢٢٤)- لەگەڵ تڕی خۆیا شەڕ ئەکا[224]

٢٢٥)- لەگەڵ سێبەری خۆیا شەڕ ئەکا[225]

٢٢٦)- لەگەڵ گورگ شایی ئەکات، لەگەڵ مەڕ شین ئەکا[226]

٢٢٧)- لەگەڵ گورگێ دۆنگی دەخوا، لەگەڵ مەڕێ شیوەن ئەکا[227]

٢٢٨)- لەگەڵ گورگا گۆشت ئەخوا، لەگەڵ مەڕا شین ئەکا[228]

٢٢٩)- لەگەڵ عاقڵان هەرۆ سەربانێ، لەگەڵ بێ عەقڵان هەرۆ ناوخانێ[229]

٢٣٠)- لەگەڵ لاوان لە لەشکریت، لەگەڵ کیژان لە گازریت[230]

---

[219] واتە لە ناو هەموو جۆرە چەکێکا هەر دارێکی حەیزەران شك ئەبات، بە یەکێك ئەوترێ کە هیچی بە دەستەوە نەمابێ شتێکی هیچ و پووچ نەبێ.

[220] چونکە پەشیمان بوونەوەی لە دوایە.

[221] چونکە پەشیمان بوونەوەی لە دوایە.

[222] واتە ئێواران زوو بنوو، وە بەیانیان زوو هەستە.

[223] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە کۆمەڵە و گەلی خۆی بڕبێ.

[224] واتە زۆر توورە و تڕۆیە.

[225] واتە زۆر توورە و تڕۆیە.

[226] بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ تۆش بێ و لەگەڵ دوژمنەکەشت بێ.

[227] بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ تۆش بێ و لەگەڵ دوژمنەکەشت بێ.

[228] بە یەکێك ئەوترێ کە لەگەڵ تۆش بێ و لەگەڵ دوژمنەکەشت بێ.

[229] واتە لەگەڵ مەردومی ژیرا هەموو قسەیەك بکە بە ئاشکرا، بەڵام لەگەڵ ناژیرا لە ژێر پەردەوە قسە بکە.

[230] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ دوو دەستە بێ، وە هیچیان بە هیچیان نەزانن.

٢٣١)- لەگەڵ ناکەسدا مەچۆرە جەواڵ، با نەڕوا عومرت حەتاڵ و بەتاڵ[٢٣١]

٢٣٢)- لەعەزرەت پلاو ترش ئەکاتە ئاو[٢٣٢]

٢٣٣)- لەکاکلانیش بوو لە توێکلانیش[٢٣٣]

٢٣٤)- لەم ئەرزە چەوەندەرێك هەڵکەنە[٢٣٤]

٢٣٥)- لەم قوڕە هەر ئەوەندە تۆز هەڵئەستێ[٢٣٥]

٢٣٦)- لەم لا چیچی، لەولاچیچی، ئەڵێی حیزی مایە پوچی[٢٣٦]

٢٣٧)- لەم لایان بردم، لەولایان بردم، خەبەر داریان کردم[٢٣٧]

٢٣٨)- لەم ناو مشتە موویەك دەربێنە[٢٣٨]

٢٣٩)- لەهەر لایەکەوە با بێ ئەو شەن ئەکا[٢٣٩]

٢٤٠)- لەو جێیە ئاو هەیە زەوی نییە، لەو جێیە زەوی هەیە ئاو نییە[٢٤٠]

٢٤١)- لەو محەمەدانە نییە کە سلاواتی لێ بدرێ[٢٤١]

---

[٢٣١] واتە هاوڕێی ناکەس کەمە.

[٢٣٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر حەزی لە خواردنێك بێ و دەستی نەکەوێ، وە بە خواردنێکی تر خۆی ئیخفال بکا.

[٢٣٣] بە یەکێك ئەیڵێ کە لە شتێك بێبەش بووبێ بە کاکڵە و توێکڵییەوە.

[٢٣٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ بە بێ هەوڵ و تەقەلا شتێکی دەست کەوێ واتە چۆن چەوەندەرێك لە خۆیەوە سەوز نابێ لە زەوی هیچ شتێکیش لە خۆیەوە دەست ناکەوێ.

[٢٣٥] بە یەکێکی رژدی چروك ئەوترێ، کە پیاوەتییەکی کەمی لە دەست دەرچووبێ.

[٢٣٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێك نەکا، وە هەر بە سوڕانەوە و دانیشتن لەم لاو لەولا خەریك بێ.

[٢٣٧] واتە پیاو ئەبێ لە گەڕان و هاتوچۆ پەند وەرگرێ.

[٢٣٨] تەماشای پەندی (لەم ئەرزە، چەوەندەرێك هەڵکەنە) بکە.

[٢٣٩] واتە با لە هەر لایەکەوە بێ ئەو نایدا بە خەسار، وە بەهرەی خۆی لێ ئەبینێ بەم رەنگە شەن و کەوی خۆی ئەکات بە یەکێك ئەوترێ کە بە پێی رۆژ هەڵسوڕێ، وە لەگەڵ هەموو کەسێکا رێ بکەوێ و بڕوا بە رێدا.

[٢٤٠] واتە هەرگیز دنیا بە کامی کەس نابێ.

[٢٤١] بە محەمەد ناوێکی خراپ ئەوترێ.

٢٤٢)- لەوە بترسە لە خوا ناترسێ[٢٤٢]

٢٤٣)- لەوەپێش کاوڕ بازی بوو، ئێستا بەران بازییە[٢٤٣]

٢٤٤)- لباس رەنگ و رووە، خواردن گەنگ و گووە[٢٤٤]

٢٤٥)- لنگە کەوشێکی لە دیوانا هەیە[٢٤٥]

٢٤٦)- لنگی جووت کرد[٢٤٦]

٢٤٧)- لووت با بمێنێ لە بەینی چاوا[٢٤٧]

٢٤٨)- لووت لووتی خۆتە هەر چەند چڵمن بێ[٢٤٨]

٢٤٩)- لووت نەبێ لە بەینا چاو چاو ئەخوا[٢٤٩]

٢٥٠)- لووتی بگری گیانی دەر ئەچێ[٢٥٠]

٢٥١)- لووتی لە ئاسمانە[٢٥١]

٢٥٢)- لووتی لە کورە کاژاوە[٢٥٢]

٢٥٣)- لووتی لێ ئەخورێ[٢٥٣]

٢٥٤)- نۆ خۆمان نابێتە نان، لۆ خەڵقی ئەبێتە ناسکە نان[٢٥٤]

---

[٢٤٢] چونکە کە لە خوا نەترسا، هەموو شتێك ئەکا.

[٢٤٣] واتە جاران ئیشەکەی بچووك بوو، بەڵام ئێستا زلتر و گەورەترە.

[٢٤٤] واتە تا ئەتوانیت کاڵات پاك و تەمیز بێ، وەك قورئان ئەفەرموێ " و لباسك فگهر" واتە کاڵات پاك بێ.

[٢٤٥] بە یەکێك ئەوترێ کە خزمێکی لای ئاغا یا کار بەدەستێکی گەورە بێ.

[٢٤٦] ئەم پەندە بە مەعنا پەندی دەهەمە.

[٢٤٧] چونکە ئەگەر لووت نەبێ چاو چاو ئەخوا.

[٢٤٨] بە یەکێك ئەوترێ کە نەنگ لە خزمێکی خۆی بگرێ.

[٢٤٩] بە گەورەیەك ئەوترێ لە شوێنێکا کە شەرمی لێ بکرێ.

[٢٥٠] واتە زۆر لاواز و زەبوون و تێ قوپاوە.

[٢٥١] واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

[٢٥٢] کورە کاژوە: شاخێکی زۆر بەرزە لە شارباژێر، واتە زۆر بە دەعیە و دەمارە.

[٢٥٣] واتە ئارەزووی ئەکات.

[٢٥٤] بە خزمێك ئەوترێ کە رێزی بێگانە زۆرتر بگرێ لە کەس و کاری خۆی.

٢٥٥)- لۆژەی سەری دێ[٢٥٥]

٢٥٦)- لۆمەی عەبدان لە گۆرە و شار گرانترە[٢٥٦]

٢٥٧)- لێخورە دەشتە[٢٥٧]

٢٥٨)- لێرەش بچوکە[٢٥٨]

٢٥٩)- لێفەی سواڵ سەرما ناگێرێتەوە[٢٥٩]

٢٦٠)- لێم بووە  بە مووی لوت[٢٦٠]

٢٦١)-  لێم بووە بە مارەکەی شێخ هۆمەر[٢٦١]

٢٦٢)- لێم بوویت بە ئەستێرەی سیوەیل، هەر دەرناکەویت[٢٦٢]

٢٦٣)- لێم چۆتە داری، نایەتە خوار[٢٦٣]

٢٦٤)- لێو بە دان نازانێ[٢٦٤]

٢٦٥)- لێوێکی با دێنێ و لێوێکی بۆران[٢٦٥]

---

[٢٥٥] واتە بێ تاقەتە.

[٢٥٦] واتە مەردوم ئەبێ لە زبانی ئەم و ئەو بترسێ، چونکە لۆمە و تەشەری مەردوم زۆر ناخۆشە.

[٢٥٧] بە کارێك ئەوترێ، کە گیر و گرفتی لە رێدا نەبێ.

[٢٥٨] بە شتێك ئەوترێ، کە بە دیمەن بچوك و وەکی تریش زۆر بە کەڵك بێ.

[٢٥٩] چونکە تا دڕاو و کونکون نەبێ ناتدەنێ، کەواتە تۆش تا ئەتوانی سواڵ مەکە.

[٢٦٠] بە یەکێك ئەوترێ، بە هیچ جۆر لێت دوور نەکەوێتەوە.

[٢٦١] واتە بە هیچ جۆرێك لێم نابێتەوە.

[٢٦٢]

[٢٦٣] بە یەکێك ئەوترێ کە هەرگیز پەشیمان نەبێتەوە لەو قسەیەی کە کردویەتی.

[٢٦٤] واتە زۆر بە نهێنییە.

[٢٦٥] بە مەردومی توورە و ترۆ ئەوترێ.

**٢٦٦)- لێی بووه به کورده ناموسی**[٢٦٦]

**٢٦٧)- لێی دەن له ماڵی گەوره، یاپراخ و دووگی چەوره**[٢٦٧]

[٢٦٦] به یەکێك ئەوترێ که کارێك بکات نەك لەبەر ئەوەی که پێی باشه بەڵکو لەبەر ئەنگەی خەڵق.

[٢٦٧] واته داوای نامانگوری خۆت له پیاوی گەوره بکە، چونکه بەرچاو فراوانه.

# پیتی میم

١)- ما پیاوی ماڵێ، ئەما زیانی ساڵێ[1]

٢)- مار ئەکوژێ، و تولەمار بەخێو ئەکا[2]

٣)- مار بە قسەی خۆش لە کون دێتە دەر[3]

٤)- مار تا راست نەبێتەوە، ناچێ بە کونا[4]

٥)- مار پێوەی داوە و لە گوریس سڵ ئەکات[5]

٦)- مار حەزی لە سیر نەبوو، سیریش دەچوو لە بەر دەرکی کونی ئەو شین ئەبوو[6]

٧)- مار حەزی لە مارەگیرە نەبوو، لەبەر کونەکەیا سەوز ئەبوو[7]

٨)- مار کاژ فڕێ ئەدا، خوو فڕێ نادا[8]

٩)- مار کە مردنی نزیکبووەوە ئەچێتە سەر رێگا[9]

---

[1] بە یەکێك ئەوترێ کە لە سەر مان و نەمان بێ، واتە ماما، نەش ما خۆمان خۆش.

[2] بە یەکێك ئەوترێ، کە پیاوی زۆرداری ستەمکار لـە نـاو ببـا کەچـی نـەوە و وەچـەی بەخێو بکات.

[3]

[4] واتە هەموو کەسێك بۆ هەموو کارێك ئەبێ بە پێی ئەو کارە بجوڵێتەوە.

[5] بە یەکێك ئەوترێ، زۆر و ستەم ترساندبێتێ.

[6] واتە هەموو شت بە ئارەزوی مەردوم نابێ، وە زۆر جار ئەوی تۆ حەزت لێی نییە بـە لوتتەوە ئەبێ.

[7] مارەگیرە: گیایەکی دڕکاوییە، مار ناوێرێ خۆی لێ بدا بە یەکێك ئەیڵێ کـە رقـی لـە یەکێك بێ، کەچی هەمیشە لەبەر چاوی بێ.

[8] بە یەکێکی بەدکردار ئەوترێ، کە وا نیشان بدا کە بەرگی بەدکرداری فڕێداوە، واتـە ئەوانە هەرگیز سروشتیان ناگۆڕێ.

[9]

١٠)- مار لە کوێ پەپکە ئەخوات، پونگە لەوێ شین ئەبێ[١٠]

١١)- مار هاتۆتە سەر ڕێگات[١١]

١٢)- ماران گەستە، گوریس ببینێ وا ئەزانێ مارە[١٢]

١٣)- مارانگاز لە گوریسی ڕەش و سپی ئەسڵەمێتەوە[١٣]

١٤)- مارانگاز لەخشەی گوریس ئەترسێ[١٤]

١٥)- مارانگاز لەخشەی مار و مێروو ئەترسێ[١٥]

١٦)- ماری ئاوی کە پیر بوو، قورباق ئەکا بە قنگییەوە[١٦]

١٧)- ماری بێ ئیجازەیە[١٧]

١٨)- ماری ڕەش بۆی یەق ئەکاتەوە[١٨]

١٩)- ماری سکی خۆت ئەتخوا[١٩]

٢٠)- ماری کلك بڕاو، کلکی لە بیر ناچێتەوە[٢٠]

---

[١٠] تەماشای پەدی ژمارە بکە.

[١١] واتە بەختەوەریت.

[١٢]

[١٣] واتە یەکێك کە زللەی ڕۆژگاری خوارد، ئیترژیر ئەبێ و بەپارێزەوە دەست ئەداتە هەموو شتێك.

[١٤] واتە یەکێك کە زللەی ڕۆژگاری خوارد، ئیترژیر ئەبێ و بەپارێزەوە دەست ئەداتە هەموو شتێك.

[١٥] واتە یەکێك کە زللەی ڕۆژگاری خوارد، ئیترژیر ئەبێ و بەپارێزەوە دەست ئەداتە هەموو شتێك.

[١٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەست دار بووبێ و بێدەست کەوتبێ، وە کەس شەرمی لێ نەکا.

[١٧] واتە ئەمانی نییە.

[١٨] واتە زۆر ڕەجال و گەدا و داوەشاوە.

[١٩] بە یەکێکی دەروون پیسلاقێن ئەستوری بوغز لە سك ئەوترێ.

[٢٠] واتە هەر کەسێ ستەمێکی لێکرا هەرگیز فەرامۆشی ناکا.

٢١)- ماری مار خۆریشی هەیە[٢١]

٢٢)- ماست تا نەیژەنی، کەرە نادات[٢٢]

٢٣)- ماست نییە بە لێوتەوە دیار بێ[٢٣]

٢٤)- ماستاو سارد ئەکاتەوە[٢٤]

٢٥)- ماستاوی بۆ ئەکا[٢٥]

٢٦)- ماستی مەیو هەوێنی ناوێ[٢٦]

٢٧)- ماسی بێ کێردە[٢٧]

٢٨)- ماسی گەورە لە تاڤگەدا ناگیرێ[٢٨]

٢٩)- ماسی لە ئاو بڕا ئەخنکێ[٢٩]

٣٠)- ماسی لە ئاوا تەڕ نابێ[٣٠]

٣١)- ماسی لە بووارا ئەگیرێ[٣١]

٣٢)- ماسی لە دەریادا ئەبەخشێ[٣٢]

٣٣)- ماسی لە دەریادا سەودا ناکرێ[٣٣]

---

[٢١] بە زۆردارێك ئەوترێ، کە دەستی باڵای دەستی زۆردارێکی تر بێ.

[٢٢] واتە تا رەنج نەدەیت، گەنجت دەست ناکەوێ.

[٢٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە حاشا لە چاکەی یەکێك بکات.

[٢٤] واتە کلکە لەقێ روپامایی بۆ ئەکات.

[٢٥] واتە کلکە لەقێ روپامایی بۆ ئەکات.

[٢٦] واتە هەموو کارێك کە تەواو بوو ئیتر هیچی تری ناوێ.

[٢٧] واتە هیچ ئەرك و بێگارێکی بە سەرەوە نییە.

[٢٨] واتە پایەی گەورە لە شوێنی بچوکا دەست ناکەوێ.

[٢٩] بە یەکێك ئەوترێ کە خۆشەویستەکەی لێی دوور کەوێتەوە.

[٣٠] چونکە بێ ئاوی بە خۆیەوە نەدیوە، تا وشك بووبێ و ئنجا چووبێتەوە ناو ئاوەوە و تەڕ بووبێ.

[٣١]

[٣٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە خاوەنی شتێك نەبێ و بیبەخشێ.

[٣٣] واتە شت لە گۆترە ناکڕێ.

٣٤)- ماسی له سه‌ریه‌وه بۆن ئه‌کا[٣٤]

٣٥)- ماڵ ئه‌چێ و خاوه‌ن ماڵ ئیمانی ئه‌چێ[٣٥]

٣٦)- ماڵ ئه‌وه‌یه به نسیبی خاوه‌نی بێ[٣٦]

٣٧)- ماڵ بۆ ماڵخۆ نه‌چێ حه‌رامه[٣٧]

٣٨)- ماڵ به خاوه‌ن ماڵ حه‌رامه[٣٨]

٣٩)- ماڵ سوتاو له هه‌موو که‌س به چنگ تره[٣٩]

٤٠)- ماڵ سووتاو به ماڵ ئه‌بێ، سکه‌ڕۆ به ماڵ نابێ[٤٠]

٤١)- ماڵ چووه ماڵان، چوو به تالان[٤١]

٤٢)- ماڵ که له خاوه‌نی نه‌کا حه‌رامه[٤٢]

٤٣)- ماڵ لۆ که‌یفیه یا لۆ حه‌یفیه[٤٣]

٤٤)- ماڵ لۆ مێردانه، عه‌زاب لۆ ژنانه[٤٤]

---

[٣٤] واته هه‌موو کۆمه‌ڵه و گه‌لێك که بۆگه‌نی تێ ئه‌که‌وێ له پیاوه گه‌وره‌کانییه‌وه ده‌ست پێ ئه‌کات.

[٣٥] چونکه بۆ دۆزینه‌وه‌ی ماڵه دزراوه‌که‌ی زۆر که‌سی پاك ئه‌دا به ده‌مه‌وه، وه تووشی ئازاریان ئه‌کات.

[٣٦] ئه‌گینا سه‌د ساڵ به ناو ماڵی تۆبێ که له دوایدا به نسیبت نه‌بێ ماڵی چی.

[٣٧] واته شتی هه‌زار ئه‌بێ وه‌ك خۆی هه‌ژارانه بێ.

[٣٨] یه‌کێك ئه‌یڵێ، که ماڵێکی داگیر کرابێ، به جۆرێك که خۆی نه‌توانێ به‌هره‌ی لێ ببینێ.

[٣٩] واته لێ قه‌وماو له کاتی ته‌نگانه‌دا باشتر به ته‌نگ ماڵی خۆیه‌وه‌یه‌تی.

[٤٠] چونکه ئه‌و پاشه‌که‌وت ئه‌کات، به‌ڵام ئه‌م هه‌رچێکی ده‌ست که‌وێ ئه‌ی هێنێ به لچیا.

[٤١] واته که ماڵی یه‌کێك دابه‌ش کرا به سه‌ر ماڵانا بۆ ئه‌وه‌ی بۆت هه‌ڵگرن هیچت ده‌ست ناکه‌وێته‌وه، مه‌گه‌ر به ده‌گمه‌ن.

[٤٢] به ته‌وسه‌وه به ماڵێکی خراپ ئه‌وترێ، که خاوه‌نه‌که‌شی یه‌کێکی خراپ بێ.

[٤٣] واته ماڵ بۆ خۆشیه، نه‌ك بۆ ناخۆشی.

[٤٤] واته ژن ئازاری ماڵداری ئه‌کێشێ بۆ مێرده‌که‌ی.

٤٥)- ماڵ لە خۆیا نەبوو، میوانیش رووی تێ کرد[٤٥]

٤٦)- ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە؟![٤٦]

٤٧)- ماڵ لە کیس یا لە منەت[٤٧]

٤٨)- ماڵ لە ماڵخۆ حەرامە؟![٤٨]

٤٩)- ماڵ لە ماڵخوا حەرام ناکرێ[٤٩]

٥٠)- ماڵ لە هەواران، قنگ لە کۆچەکان[٥٠]

٥١)- ماڵ ماڵی منە و ماڵ ئاوی خەڵق[٥١]

٥٢)- ماڵت ماڵ نەبێ و بازاڕت بازاڕ بێ[٥٢]

٥٣)- ماڵتان ئەڵێی هەلاج گەسکی داوە[٥٣]

٥٤)- ماڵەکەی تۆ ئەخۆم بە بەلاش، هینەکەی خۆم ئەخەمە پاش[٥٤]

٥٥)- ماڵمان پشتا و پشتە، شیری کاکم لە پشتە[٥٥]

٥٦)- ماڵمان ماڵی، کیسەمان خاڵی[٥٦]

---

[٤٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچی نەبێ کەچی میوانیش رووی تێ بکا.

[٤٦] واتە نە لێی قەدەغە نییە.

[٤٧] واتە ماڵ دەرمنەت، یا دەرکیسە.

[٤٨] ئەم دوو پەندە وەك پەندی (ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە؟) وایە.

[٤٩] ئەم دوو پەندە وەك پەندی (ماڵ لە خاوەن ماڵ حەرامە؟) وایە.

[٥٠] بە یەکێك ئەوتری کە خۆی لێرە بێ و ناوماڵیشی لە شوێنێکی تر.

[٥١] یەکێك ئەیلێ، کە یەکێکی تر لە ماڵەکەیا خاوەن ماڵی بکات.

[٥٢] واتە ماڵت ئەگەر لە ماڵ نەچێ قەیناکات، بەلام بازاڕت ئەبێ لە بازاڕ بچێ ئەگینا ناژیت.

[٥٣] واتە هیچی تیا نییە.

[٥٤] بە یەکێك ئەوترێ کە ماڵی تۆ بخوا و ماڵی خۆی هەڵگرێ.

[٥٥] یەکێك ئەیلێ کە پشت ماڵەکەی خزمێکی گەورەی خۆی بێ.

[٥٦] ماڵمان ماڵی: واتە گسکمان لێدا بە دوو برای دەست بلاو ئەوترێ کە هیچیان لە ماڵا نەهێشتبێ.

٥٧)-ماڵی با، بە با ئەچێ[٥٧]

٥٨)- ماڵی بووکێ گەرمن، ماڵی زاوا نەرمن[٥٨]

٥٩)- ماڵی پڕ لە ژنان، چ ئاونینە لە کونان[٥٩]

٦٠)- ماڵی پڕە لە رازیانە و بە دڵ یەشە ئەمرێ[٦٠]

٦١)- ماڵی حەڵاڵ لە دەست ناچێ[٦١]

٦٢)- ماڵی خۆ نەخۆر، بۆ چەکمە بۆر[٦٢]

٦٣)- ماڵی خۆت توند بگرە، سەگی ئاوایی بە دز مەگرە[٦٣]

٦٤)- ماڵی خۆیم بە پێش چاوی خۆمەوە بێ[٦٤]

٦٥)- ماڵی خەڵکی، لەگەڵ خەڵکا ئەخورێ[٦٥]

٦٦)- ماڵی خەلیل، ماڵاوای جەلیل[٦٦]

٦٧)- ماڵی دزیەتی مەگەر شەو بکرێ بە خۆدا[٦٧]

---

[٥٧] واتە ماڵی بە هەوانتە دەست ئەکەوێ ئەبێ بە هەوانتەش لە دەست دەرچێ.

[٥٨] ئنجا گەرمی بووکێ و نەرمی ماڵی زاوا یەکیان گرت بە چوونە باخەڵی یەك، بزانە چ خۆشیەك پەیدا ئەبێ.

[٥٩] چونکە ئیشکەر کە زۆر بوون ئەمیان ئەڵێ: ئەویان ئەیکا و ئەویان ئەڵێ: ئەمیان ئەیکات، لەو ناوەدا کوندەکان بە وشکی ئەمێننەوە.

[٦٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە چارەی دەردی خۆی لە لای خۆی بێ و نەیکا.

[٦١] چونکە چاو لە دوو نییە.

[٦٢] بە چروکێك ئەوترێ، کە یەکێکی تر ماڵەکەی خواردبێ.

[٦٣] واتە کە ئاگاداری خۆتت نەکرد و دزرا، خۆت لە دزەکە گوناهبارتریت.

[٦٤] ئەگێڕنەوە کە باڵوولی دانا بەشی دەمێ بنێشتی ئەبێ، ئەینێ بە پشتی چاویەوە، لێی ئەپرسن: بۆ وا ئەکەیت؟ ئەڵێ: ماڵی خۆم با بە پێش چاوی خۆمەوە بێ، واتە ئەمانەت نەماوە.

[٦٥] واتە ماڵی خۆت ئەتوانی هەر خۆت بیخۆیت، بەڵام ماڵێك کە لەم و لەوێ بسێنیت، بە تەنیا بۆت ناخورێ، بەڵکو ئەبێ بەشی خەڵکی لێ بدەیت.

[٦٦] یەکێك ئەیڵێ، کە یەکێکی تر لە ماڵەکەیا خاوەن ماڵی بکا.

[٦٧] چونکە بە رۆژ ئەبینرێ و ئەناسرێتەوە.

٦٨)- ماڵی زیاد، سەر ناشکێنێ[٦٨]

٦٩)- ماڵی سپی بۆ رۆژی رەش[٦٩]

٧٠)- ماڵی چاو لە دوو خێر ناداتەوە[٧٠]

٧١)- ماڵی چووە سەر بەشی ماڵان[٧١]

٧٢)- ماڵی گەش، بۆ رۆژی رەش[٧٢]

٧٣)- ماڵی فرەکوزان، ئاوی نییە لە گۆزان[٧٣]

٧٤)- ماڵی قەڵب سەر و بەری ساحێبی ئەگرێتەوە[٧٤]

٧٥)- ماڵی مە، بەرەو بایە، هەمیشە دەرگەی پێوەدرایە[٧٥]

٧٦)- ماڵی مەردوم، لە دەوری گردن[٧٦]

٧٧)- ماڵی مرێ، لە خۆیەوە ئەکرێ[٧٧]

٧٨)- ماڵی مفت قازی مەراغاش ئەیخوا[٧٨]

٧٩)- ماڵی ها بە کۆڵیوە[٧٩]

---

[٦٨] واتە ئەگەر قازانجی نەبێ زەرەری نابێ.

[٦٩] واتە لە رۆژی سپی دا ماڵی سپی پاشەکەوت بکە بۆ رۆژێك کە لێت بقەومێ .

[٧٠] چونکە بە چاوێکی پیس و دڵێکی پیسەوە هەر چاویان تێوەیەتی.

[٧١] بە یەکێك ئەوترێ کە ماڵەکەی دابەش بکرێ بە سەر ماڵانا.

[٧٢] تەماشای چوار پەندی لەمەوپێش بکە.

[٧٣] واتـە ماڵێـك کـە ژنـی زۆری تیـا بـێ، گۆزەکانیـان هەمیشـە بـێ ئـاوە چـونکە هـەر یەکێکیان بە تەمای ئەویتریانە.

[٧٤] واتە ئەدرێتەوە بە سەریا.

[٧٥] بەماڵێك ئەوترێ کە ژنەکەی سەر بە دەرەوە بێ.

[٧٦] بە دەوڵەمەندێك ئەوترێ کە بمرێ و بەشدار تێی بوروکێ.

[٧٧] بە هەژارێك ئەوترێ، کە ماڵەکەی چوار دیوا و چوار دار بێ.

[٧٨] ماڵی مفت: ماڵێکە کە منەتی تیا نەبێ، یا خاوەنی نـەبێ وەك کوپەڵەیـەك کـە لـەو دەشـتە بدۆزرێتـەوە بـەڵام مـاڵێ: کـە منـەتی تیابـێ زۆر هـەژاری مـەرد بێـزی نایـەت بیخوات چ جای قازی مەراغا.

[٧٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە جێگا و رێگایەکی نەبێ، وە هەر شەوە لە شوێنێك بێ.

٨٠)- ماڵی وا بە کۆڵیەوە[٨٠]

٨١)- ماڵیان کرد بە ماڵێك، خەلەیان کردە چاڵێك[٨١]

٨٢)- ماڵێکی ئاوەدان، لە سەد ماڵی وێران باشترە[٨٢]

٨٣)- مامان کە زۆر بوو سەری منال گیر ئەخوا[٨٣]

٨٤)- مامەی ترۆزی، ئەمڕۆ ناسۆزی[٨٤]

٨٥)- ماندوو حەسانەوەی سەپان، دەستکەنەی نۆکە[٨٥]

٨٦)- ماندوو مردوو، کوڕان لێ بووردوو[٨٦]

٨٧)- مانگ تا نەگاتە شەوێ، قەدری نییە[٨٧]

٨٨)- مانگ دیارە حەوەجەی بە پەنجە نییە[٨٨]

٨٩)- مانگ لە من ڕۆن بێ، ئەستێران چێوە بە قوون بێ[٨٩]

٩٠)- مانگا بە دزییەوە کەڵ ئەگرێ و بە ئاشکرا ئەزێ[٩٠]

٩١)- مانگا دۆشین و قەزوان تەقاندنیان نەوتوە[٩١]

---

[٨٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە جێگا و ڕێگایەکی نەبێ، وە هەر شەوە لە شوێنێك بێ.

[٨١] بە دوو کەس ئەڵێن کە ببن بە یەك ماڵ.

[٨٢] چونکە لەو بەهرە وەرئەگیرێ، بەڵام لە مان بەهرە وەرناگیرێ.

[٨٣] چونکە ئەبێ بە فرە کوێخا.

[٨٤] واتە ئەگەر ئەمڕۆ بارە ترۆزییەکەت بەم نرخە نەدەیت سبەینێ سیس ئەبێ و پارە ناکا.

[٨٥] واتە مەردومی ئیشکەر حەسانەوەی بۆ نییە.

[٨٦]

[٨٧] واتە هەموو شتێك تا پێویست نەبێ، نرخ پەیدا ناکات.

[٨٨] بە یەکێکی گەورەی ناودار ئەوترێ، کە یەکێك ناونیشانی هەڵدا، واتە پێویست بە ناونیشانی نییە.

[٨٩] واتە کە گەورە لە من ڕازی بوو، بچوك با هەر بۆ خۆی بڵێ.

[٩٠] واتە تاوان بە دزیشەوە بکرێ، لە ئەنجاما هەر دەرئەکەوێ.

[٩١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەگەڵ کارێکی زۆر گرنگا بە شتێکی ترەوە خەریك بێ.

٩٢)- مانگا قنگی دڕا بوو، بەڵمە برنجیان تێ ئەئاخنی[٩٢]

٩٣)- مانگا مرد شیرا ئەبێ، ژنە مرد خێرا ئەبێ[٩٣]

٩٤)- مانگا مردو دۆ بڕا[٩٤]

٩٥)- مانگا نییە بمژێ، مێردە نییە بکوژێ[٩٥]

٩٦)- مانگا و ماکەر، ماڵ ئاوا کەر[٩٦]

٩٧)- مانگە شەو لە ئێوارەوە دیارە[٩٧]

٩٨)- مانگی شەرمێیەتی[٩٨]

٩٩)- ماوە پیر قەل و برازا[٩٩]

١٠٠)- مایەی بوو بە مایەی پیاز فرۆش[١٠٠]

١٠١)- مایەی سەفەر سەلامەتییە[١٠١]

---

[٩٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئەنگێکی بڵاو بووبێتەوە بە ناو مەردوما کەچی بییەوێ دایپۆشێ.

[٩٣] بە تەوسەوە بەوانە ئەوترێ، کە لەدوای مردنی یەکێکی خراپ باسی چاکەیان ئەکەن بە درۆ.

[٩٤] بە یەکێك ئەوترێ کە گەورەیەکی بە کەڵکی لە دەست چووبێ.

[٩٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە نە ئیشێکی ببێ پێوەی خەریك بێ، وە نە گەورەیەکی ببێ لێی بترسێ.

[٩٦] بۆ لادێیی لەم دوانە بە کەڵك تر نییە.

[٩٧] واتە هەموو شتێك کە لە سەرەتاوە دەرئەکەوێ، باشی و خراپی.

[٩٨] واتە یەکەم مانگی شو کردنیەتی.

[٩٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە عومرێکی ئێجگار زۆری ببێ، وە لەو ماڵە یا لەو دێیەدا لەو پیرتر و بە عومرتر نەمابێ.

[١٠٠] واتە وەك پیاز فرۆشێك پیازەکەی هەمووی بگەنێ یا پوت ببێتەوە ئەمیش مایەکەی هیچی نەما.

[١٠١] زۆرتر بە نەخۆشێك ئەوترێ، کە چاك بووبێتەوە.

١٠٢)- مەتی تەشی ڕێس بێ، بە کێری کەریش ئەیرێسێ[١٠٢]

١٠٣)- مەتی تەمای نەبوو شوو بکا کەچی داوای مارەیی و هەشت یەکی ئەکا[١٠٣]

١٠٤)- مەتی نەئەترِی بە زۆر ئەیان تراند[١٠٤]

١٠٥)- مەتیلێ ناویان نەئەبرد، ئەچو لەسەر ڕێگا گوی ئەکرد[١٠٥]

١٠٦)- مەچۆرە ژێر داری شکستە[١٠٦]

١٠٧)- مەحکەمە ماڵی باوکی کەس نییە[١٠٧]

١٠٨)- مەخۆ شتێ تۆ بخوا مەکە کارێ لە پات بخا[١٠٨]

١٠٩)- مەڕ بە پێی خۆی و بزن بە پێی خۆی هەڵ ئەواسرێ[١٠٩]

١١٠)- مەڕ بە ڕێگای خۆیا ئەڕوا و گورگ بە ڕێگای خۆیا[١١٠]

١١١)- مەڕ پێ لەبەرخی خۆی نانێ[١١١]

---

[١٠٢] مەتی: پوورە، واتە هەر کەسێك لە کارێکا شارەزا بوو، کارەکەی خۆی هەر تەواو ئەکات.

[١٠٣] بە یەکێك ئەوترێ کە لە پێشەوە نەیەوەێ تێکەڵی کارێك ببێ، کەچی لە دواییدا لە پێش هەموو کەسێکەوە داوای بەشی خۆی بکا.

[١٠٤] واتە ئەو ئیشەی پێ ناکرێ و بە زۆر پێی ئەکەن.

[١٠٥] تا ناوی بەرن، بە یەکێك ئەوترێ کە هەر بییەوێ خۆی بخاتە ناو ناوانەوە.

[١٠٦] واتە ئیشێك کە زانیت پیت ناکرێ دەستی مەدەرێ.

[١٠٧] واتە بە یەك چاو تەماشای هەموو کەسێك ئەکا، وە ترازووی دەستی هەرگیز سەر ناکا.

[١٠٨] واتە شتێ وەرمەگرە کە ببێ بە مایەی دیلیت.

[١٠٩] واتە هەر کەسە بەپێی گوناهی خۆی سزا ئەدرێ.

[١١٠] واتە چاك و خراپ هەر یەکە ڕێی تایبەتی خۆی هەیە.

[١١١] واتە تۆش ئاگات لەکەس و کارت بێ.

١١٢)- مەر دەیش مەترۆ؟[١١٢]

١١٣)- مەڕ لەگەڵ دوور بکەوێتەوە گورگ ئەیخوا[١١٣]

١١٤)- مەڕ و بزن رۆن ئەکەن و ژن خۆی رائەوەشێنێ[١١٤]

١١٥)- مەڕ و گورگ پێکەوە ئاو ئەخۆنەوە[١١٥]

١١٦)- مەرەزە دێمی، پاراو کەماولۆ[١١٦]

١١٧)- مەرحەبای ئاغا شەرابە[١١٧]

١١٨)- مەرد بەکێشانە نییە[١١٨]

١١٩)- مەرد، بنو لەسەر بەرد[١١٩]

١٢٠)- مەردی بەر ئاگر، کونی لە جەرگا نییە[١٢٠]

---

[١١٢] واتە بۆچ مردووش ئەترێ؟ یەکێکی دەوڵەمەند ئەیلێ بە یەکێکی هەژار کە دەستێکی لێ وەشاندبێ، یا قسەیەکی ناشرینی دەربارە کردبێ، وەك بلێت (پەلۆلەش دەم ئەسوتێنێ).

[١١٣] واتە مەردوم لە کۆمەڵە و گەلی خۆی نابێ جیا ببێتەوە.

[١١٤] بە یەکێك ئەوترێ کە بە بەرهەم و بەروبومی رەنجی خەڵقەوە خۆی هەڵکێشێ، وە بیداتە پاڵ خۆی.

[١١٥] واتە دنیا زۆر ئەمینە.

[١١٦] مەرەزە بە ئاوی زۆر و (کەما و لۆ) بە دێم ئەبێ، وە پێچەوانەکەی هەرگیز نەبووە و نابێ، ئنجا ئەم پەندە بە کارێکی پاش و پێش ئەوترێ وەك ئەوەی مەرەزە بە دێم و کەماو لۆ بەئاو بێ.

[١١٧] واتە ئاغا کە مەرحەبات لێ بکات بۆ ئەوەیە بەو مەرحەبایە سەرخۆشت بکا و بێگارت پێ بکا.

[١١٨] بەڵکو بە پیاوەتی و مەردایەتیە.

[١١٩] واتە یەکێ مەرد بێ چاوی لە رابواردنی خۆیەوە نییە، بەڵکو هەر چاوی لە خزمەتی کۆمەڵە و گەلەوەیە.

[١٢٠] واتە ئەوی لەسەرمای زستانا لەبەر ئاگر دانیشتبێ، ئاگای لەوانە نییە کە لەبەر سەرما ئیش ئەکەن.

١٢١)- مەردی هۆشیار، دەست بە کونێکا ناکا دووجار[١٢١]

١٢٢)- مەرگ لەگەڵ ئاوەڵان جەژنە[١٢٢]

١٢٣)- مەڕوانە سەری تاسی، بڕوانە بەختی خاسی[١٢٣]

١٢٤)- مەڕی بێ شوان گورگ ئەیخوا[١٢٤]

١٢٥)- مەڕی لەڕ، خزمەتی بۆ گۆشتی چەورە[١٢٥]

١٢٦)- مەزەب چارن، تۆپز هی پێنجێیە[١٢٦]

١٢٧)- مەزەب یەکە و کوتەك دوو[١٢٧]

١٢٨)- مەشکەی مانگا ساڵێ لە دارە و ساڵێ لە خوارە[١٢٨]

١٢٩)- مەقاش کە بوو، دەستی خۆت مەسوتێنە[١٢٩]

١٣٠)- مەکەوەرە سەر سەمتی کێرت جلە شڕێ بخەرە ژێرت[١٣٠]

١٣١)- مەکر لە ژنان، خەتەرە لە شەیتان[١٣١]

---

[١٢١] چونکە کە جاری یەکەم شتێکی پیوەدا لە کونەکەدا، ئەبێ پەند وەرگرێ بۆ جارێکی تر کە دەستی پیانەکاتەوە.

[١٢٢] واتە بەڵا بە تێکڕایی زۆر ناخۆش نییە.

[١٢٣] بە ئافرەتێکی کەچەڵ یا ناشرین ئەوترێ، کە شویەکی باشی کردبێ.

[١٢٤] واتە هەموو شتێك پێویستە خاوەندارێتی بکرێ.

[١٢٥] واتە رەنج لەگەڵ هەر شتێکا بدەیت بۆ قازانجی ئەدەیت.

[١٢٦] شافعی و حەنەفی و مالکی و حەنبەلی، لەم چوارە بەدەر پووچە، مەگەر بە زۆری کوتەك.

[١٢٧] واتە ماف زەبر و زەنگ و هێزی لەگەڵا نەبێ دەستگیر نابێ.

[١٢٨] چونکە مانگا ساڵێ ئەزێ و ساڵێ نازێ.

[١٢٩] بە یەکێك ئەوترێ کە بیبەوێ کارێکی ناشرین بکا بە دەستی خۆی لە کاتێکا کە یەکێکی تر ببێ ئەو کارەی بۆ بکا، واتە تا یەکێك ببێ ئەو کارەت بۆبکا خۆت مەیکە.

[١٣٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە نانی نەبێ و کەوتبێتە کەڵکەڵەی ژن هێنان.

[١٣١] واتە ئەوەندەی بیری خراپ لە شەیتانەوە بەدڵا دێ، ئەوەندەش فڕوفێڵ لە ژنانەوە ڕوو ئەدا، ئنجا ژن تا خوێندەوار تر بێ فڕوفێڵی گەورەتر و قوڵترە، یەکێ تۆزێ ئاگای لە داستانی هێندێ لە ژنانی ئەوروپایی و ئەمریکایی بێ کە چ جۆرە

١٣٢)- مەگەر خاك لێم ببیەت[١٣٢]

١٣٣)- مەل بە باڵێك نافڕێ[١٣٣]

١٣٤)- مەل نەماوە كۆر كۆرە بووە، بە شای مەلان[١٣٤]

١٣٥)- مەل هەیە گۆشتی ئەخورێ، مەل هەیە گۆشتی ئەدڕێتێ[١٣٥]

١٣٦)- مەلا ئەمە ئاردە؟[١٣٦]

١٣٧)- مەلا بەزێنە[١٣٧]

١٣٨)- مەلا مووساش رازی نەبوو[١٣٨]

١٣٩)- مەلا، مەلایت بنێ بە تاقۆ، بنیشە وەلای گەمە و مەزاقۆ[١٣٩]

١٤٠)- مەلای ماوەرانیش نایباتە دواوە[١٤٠]

---

پیلانێ ئەخەنە كار لەگەڵ مێردا یا لەگەڵ هەر كەسێك كە خۆیان بیبیانەوێ بڕوا بەم قسەیە ئەكا.

[١٣٢] بە یەكێك ئەوترێ، بۆ كەسی ناگێڕمەوە تا ئەمرم و ئەبمەوە بەخاك، ئەوسا مەگەر خاك لەخاكی جەستەمی ببیەت.

[١٣٣] بەڵكو بەدوو باڵ ئەفڕێ.

[١٣٤] تەماشای پەندی (لەجێی شابازان، كۆر كۆرە وازان) بكە.

[١٣٥] واتە پیاوی وا هەیە ئەبێ خزمەت بكا، پیاوی واش هەیە ئەبێ خزمەت بكرێ.

[١٣٦] بە یەكێك ئەوترێ كە كارێكی ناپەسەندی كردبێ.

[١٣٧] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە قسەی خۆی هەرگیز پەشیمان نەبێتەوە با هەڵەش بێ.

[١٣٨] بە یەكێك ئەوترێ كە كارێك بكرێ و ئەو رازی نەبێ، وە بشڵێ: من بەمە رازی نیم.

[١٣٩] واتە مەردوم هەر چەند خوێندەوار و خواپەرست بێ ئەبێ ناو بە ناو بۆ پێكەنین و كرانەوەی دڵ گاڵتە و گەمەی ببێ، بەڵام بە ڕەنگێك كە لە پەردەی ئەدەب نەچێتە دەرەوە.

[١٤٠] ماوەران: دێیەكە لە قەڵەمڕەوی هەولێر: لە زانایانی حیدری، حیدری كوڕی ئەحمەدی كوڕی حیدری یەكەم لەوێ مدرس بووە. زۆر زانا و دانا، وە تاقانە هەڵكەوتوویەك بووە لە چەرخی خۆیا، مەدرەسەكەی هەمیشە پڕ بووە لە فەقێ و مەلای زیرەك و خوێندەواری بەرز، كە بە درێژایی ساڵ، لە خەرمانی زانین و زانیاری ئەو، گوڵەوە چنییان كردووە زۆر لە فەقێكانی، لەئێران و خلخال و خراسان و

١٤١)- مەلایەتی چ ئاسانە، ژیر بوون چ گرانە[١٤١]

١٤٢)- مەلە كردنی چۆلەكە، نیشانەی باران بارینە[١٤٢]

١٤٣)- مەلكە دۆمیان كرد بە حاكم لە پێش هەموو شتێكا سەری دایكی خۆی تاشی[١٤٣]

١٤٤)- مەلكە مەنای من ئەكا، خۆشی وشە رن ئەكا[١٤٤]

١٤٥)- مەلیچك پەنا ئەباتە بەر بنچك[١٤٥]

١٤٦)- مەمرە و مژی، بۆ خۆی ئەژی[١٤٦]

---

داغستانەوە هاتوون، هەر مەسەلەیەكی زۆر قورس و گران رووی بدایە پرسیار لەو ئەكرا، وە فتوا لەو وەرئەگیرا، لە دەوروبەری ساڵی هـ لە دایك بووە، وە لە ساڵی هـ كۆچی دوایی كردووە، وە سێ كوڕی زۆر زانا و بزانی بووە، كە ناویان ئەحمەد و عەبدوڵا و ئیبراهیمە، هەروەها ئیبراهیمیان دوو كوڕی زۆر زانا و بلیمەتی بووە كە ناویان ئیسماعیل و صبغەالله یە، كە ئەم صبغەاللەیە مەشهورە بە صبغەاللەی گەورە، كە مامۆستای بێتوشی، وە هەموو زانایانی كوردستان بووە، ئەمانە هەموو لە ماوەران تدریسیان كردووە، وە بە هەزاران زانایان و دانایانیان پێ گەیاندووە، كە هەر یەكێكیان تا ماون وەك ئەستێرەی بەری بەیان بە ئاسمانی كوردستانەوە ورشە و پرشەی هاتووە وە لە دوای خۆشیان ئنجا ناوی پیرۆزیان لەسەر رووپەرەی مێژووی كورد و عەرەب وەك گوڵەباخێك كە بە دەم بای بەری بەیانەوە بگەشێتەوە بۆنی خۆش بڵاو ئەكەنەوە.

[١٤١] واتە خوێندەواری ئاسانە و ژیر بوون گرانە.

[١٤٢] بەم رەنگە نیشانەی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیە، كە گەرمیش لە بەهاراندا نیشانەی بارانە.

[١٤٣] واتە ناوەجاخ لەگەڵ دایك و باوكی خۆشیا هەر ناوەجاخە.

[١٤٤] مەلكە: ناوی ژنە، مەنا: واتە منعی من ئەكات. وشكە رن: مەبەس كلكە لەقێ و روپامایی یە.

[١٤٥] واتە مەلی بچكۆلانە پەنا ئەباتە بەر شتی بچووك، مەلی گەورەش پەنا ئەباتە بەر شتی گەورە.

[١٤٦] مەمرە و مژی: بە گوزەرانێكی وا كەم و كوڕ ئەوترێ، كە نە ژیان بێ و نە مردن، بە یەكێك ئەوترێ كە بە كولەمەرگی هەر بۆ خۆی بژی.

١٤٧)- مەمشۆ بە گواوێ، خاسێتی دوایم ناوێ[147]

١٤٨)- مەمکە لە کەڵەشێری زەماوەند[148]

١٤٩)- مەن کە پڕ بوو ئەڕژێ[149]

١٥٠)- مەنە، مەنای منی ئەکرد، خۆشی وشکەرنی ئەکرد[150]

١٥١)- مەنجەڵ بوو بە مەنجەڵۆکە، ئاغاژن بوو بە جنۆکە[151]

١٥٢)- مەنجەڵ خل بووەوە، سەرقاپی خۆی دۆزیەوە[152]

١٥٣)- مەنجەڵی مەردان بە چل ساڵ دێتە جۆش[153]

١٥٤)- مەنزڵ پاك ئەی برێ[154]

١٥٥)- مەی لە مەیخانە و کەباب لە کەبابخانە[155]

١٥٦)- مەیدان مشك نەیخواردووە[156]

١٥٧)- مەیکوتە جەوتە[157]

---

[147] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە ئاشکرا ناوت بەرێ بە خراپە، وەکی تریش دەست گیرۆیت بکات.

[148] واتە بە کوشتم مەدە.

[149] واتە مەردوم کە زۆر قینی خواردەوە ئاخرێکەی دەری ئەبڕێ.

[150] تەماشای راڤەی پەندی () بکە.

[151] بە ماڵ و ژنێك ئەوترێ، کە بووە بووبێ و لێی قەومابێ.

[152] بە یەکێك ئەوترێ کە هاوبیرێکی خۆی بدۆزێتەوە، وە لەگەڵیا ببێ بە هاوڕێ.

[153] واتە پیاوی مەرد زۆر درەنگ تووڕە ئەبێ.

[154] واتە هەر مەردومی پاك قۆناغی ژیان ئەبڕێ بە بێ زیان، بەڵام ناپاك رۆژێ ئەبێ کە پەردەی بدڕێ.

[155] واتە هەموو شتێك لە شوێنی تایبەتی خۆیا خۆشە.

[156] بە یەکێك ئەوترێ کە بە کارێك بڵێ: ئەمە چییە، منیش ئەتوانم بیکەم.

[157] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی برسی چاوی بە زەلامێك و بارێك ئەکەوێ واشەزانێ کە بارەکەی ئاردە، ئەویش دوای ئەکەوێ بە هیوا ئەوەی کە لە قۆناغ خاوەنەکەی ئەگەر چەند کولێرەیەکی لێ کرد ئەمیش کولێرەیەکی بەربکەوێ، کابرای خاوەن بار، تێ ئەگات، وە پێی ئەڵێ (مەیکوتە جەوتە) واتە خۆت ماندوو مەکە، چونکە ئارد نییە

١٥٨)- مەیمون خۆی جوان بوو، ئاوڵەشی دەردا[١٥٨]

١٥٩)- مەیمون کە قنگی سوتا، بەچکەی خۆی ئەنێتە ژێری[١٥٩]

١٦٠)- مەیمون هەر مەیمونە با قەیفەیشی لە بەرابێ[١٦٠]

١٦١)- مەیمون و گوڵە سور کردیان دەست بازی، هێشتا مەیمونیش بە گوڵ ناڕازی[١٦١]

١٦٢)- مرۆڤ بە قسە، مەنجەڵ بە ئاگر[١٦٢]

١٦٣)- مرد و شەیتان دەستی لێ هەڵ ئەگرێ، زیندوو دەستی لێ هەڵناگرێ[١٦٣]

١٦٤)- مردە شۆر بە حەقی خۆی گەیشت مردوو گۆڕ بە گۆڕ بێ[١٦٤]

١٦٥)- مردن بۆ ژیانە، نەك ژیان بۆ مردن[١٦٥]

١٦٦)- مردن کەری دەجاڵە، لە هەموو ماڵە[١٦٦]

١٦٧)- مردن لەگەڵ ئاوەڵان جەژنە[١٦٧]

---

جەوتە، ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە هەموو کەسێك ئەوترێ، کە بە هیوایەك دوای شتێك بکەوێ وە هیواکەی لە شوێنی خۆی نەبێ.

[١٥٨] بە یەکێك ئەوترێ کە نەنگێکی ببێ، وە نەنگێکی تری لێ روودابێ.

[١٥٩] بە یەکێکی خۆپەرست ئەوترێ، کە ئەگەر هاتوو تووشی رۆژێکی رەش بوو، بۆ رزگار کردنی خۆی خۆشەویست ترین کەسی بکا بە قوربانی.

[١٦٠] واتە شتی ناشرین بە کاڵای جوان جوان نابێ.

[١٦١] بە ژن و مێردێك ئەڵێن کە ژنەکەی جوان بێو مێردەکە ناشرین. کەچی هێشتا پیاوەکە بە ژنەکە نارازی بێ.

[١٦٢] واتە پیاو بە قسەی ناخۆش ئاگر ئەسێنێ و مەنجەڵ بە ئاگر.

[١٦٣] تەماشای پەندی (لە پاش مردن رەحمەت چاکە) بکە.

[١٦٤] واتە هەموو کەسێك چاوی لەحەقی خۆیەتی، دوای ئەوەی وەری گرت ئیتر هەرچی ئەبێ با ببێ.

[١٦٥] واتە مەردوم مردن قبوڵ ئەکات بۆ خاتری ژیان، نەك بە پێچەوانەوە.

[١٦٦] واتە کەس دڵی لە خۆی نەمێنێ، مردن ئەچێتە ماڵی و ئەبێ بە میوانی.

[١٦٧] تەماشای پەندی: (مەرگ لەگەڵ ئەوەلان، جەژنە) بکە.

١٦٨)- مردن مردنه لنگ بزاوتن چییه؟[١٦٨]

١٦٩)- مردن مردنه لنگه فرتێ چییه؟[١٦٩]

١٧٠)- مردن هەر جارێکه[١٧٠]

١٧١)- مردنی پێ نیشانده تا بە لەرز و تا رازی بێ[١٧١]

١٧٢)- مردنی میری، چاکترە لە ژینی ئەسیری[١٧٢]

١٧٣)- مردوت نەمرێ، پێت لە شیوەنگا نەبڕێ[١٧٣]

١٧٤)- مردوو بە پەلە قاژە زیندوو نابێتەوە[١٧٤]

١٧٥)- مردوو بە شیوەن زیندوو نابێتەوە[١٧٥]

١٧٦)- مردوو کە مرد شەیتان دەستی لێ هەڵ ئەگرێ[١٧٦]

١٧٧)- مردوو کوشتن نیشانەی نا پیاوییه[١٧٧]

١٧٨)- مردوو لەمە پاکتر ناشۆرێ[١٧٨]

---

[١٦٨] یەکێك ئەیلێ، کە پێشەکی لە شتێك بترسێ، لە پاشا گوێی نەداتێ وە تێ هەڵچێ.

[١٦٩] یەکێك ئەیلێ کە پێشەکی لە شتێك بترسێ، لە پاشا گوێی نەداتێ وە تێ هەڵچێ.

[١٧٠] ئەم پەندە وەك پەندی (پیاو هەر جارێك ئەمرێ) وایە.

[١٧١] واتە چۆن مردن کە یەخە گیری یەکێك بوو ئەو کەسە بە لەرزوتا رازی ئەبێ، تۆش لە هەموو کارێکا وا بکە، واتە باری قورس بدە بە سەر یەکێکا تا بە بارێکی سوکتر رازی ببێ.

[١٧٢] واتە لە دەوڵەتی خۆتا بمریت باشترە لەوەی بە دیلی بژیت لە دەوڵەتێکی بێگانەدا.

[١٧٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەمیشە لە ئیش و کاری مەردوما بێ.

[١٧٤]

[١٧٥]

[١٧٦] واتە ئەی تۆ بۆ دەستی لێ هەڵناگرێ.

[١٧٧] بە یەکێك ئەوترێ کە بچێ بە گژ زەبوونێکا.

[١٧٨] بە هەلێك ئەوترێ، کە هەڵ کەوتبێ، واتە هەلی چاکە و لە دەستی مەدە.

١٧٩)- مردوو لەوێ کەوتووە، بۆرە بۆری بە زیندوو خستووە[١٧٩]

١٨٠)- مردوو مردوو وەسیەتی با بردی[١٨٠]

١٨١)- مردوو و زیندوو بە ئاو پاك ئەبێتەوە[١٨١]

١٨٢)- مردوو، بێ کفن لە ماڵ دەرناچێ[١٨٢]

١٨٣)- مردووی ئیسفەهان، نابرێتە کاشان[١٨٣]

١٨٤)- مردووی پار هاوینێ ئەمسال ئەیکا شینێ[١٨٤]

١٨٥)- مردووی خەڵق باراشی ئاشە[١٨٥]

١٨٦)- مردووی ناوەجاخ گو ئەکاتە کفن[١٨٦]

١٨٧)- مردووی، بەشی زیندوو خۆرە[١٨٧]

١٨٨)- مردوویەك و زیندویەك پێکەوە ئەنێتە قەبرێك[١٨٨]

١٨٩)- مروچە خۆی چەس، تا گازی چەبێ[١٨٩]

---

[١٧٩] بە یەکێك ئەوترێ کە دەستی لە ئیشێکی پێویست هەڵگرتبێ، وە خۆی بە ئیشێکی هیچ و پووچەوە خەریك کردبێ.

[١٨٠] بە مردوویەك ئەوترێ و کە لە دوای خۆی وەسێتەکەی بە جێ نەهێنرێ.

[١٨١] واتە هەموو شتێك بە شۆرین و بە ئاو پاك ئەبێتەوە.

[١٨٢] زۆرتر نێك ئەیڵێ کە مێردەکەی تەلاقی دابێ،وە بە بێ هیچە دەری کردبێ.

[١٨٣] واتە هەر وەك مردووی شوێنێك نابرێ بۆ شوێنێکی تر، خێرێکیشی کە بۆ بکرێ هەر ئەبێ لەو شوێنە بۆی بکرێ کە لێی مردووە، نابێ بنێرێ بۆ شوێنێکی تر.

[١٨٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە زیانێکی کۆنی بیر کەوتبێتەوە وە خۆی بۆ پەست و زویر کردبێ.

[١٨٥] واتە شت لای خاوەنی خۆی سەنگینە، بە یەکێك ئەوترێ کە بە سوکی دەست بداتە شتێکی خۆشەویستی مەردوم.

[١٨٦] بە کەسێکی نزیك ئەوترێ، لە جیاتی قازانج زیانی ببێ.

[١٨٧] بە مەردومی بێ کەڵك ئەوترێ.

[١٨٨] واتە زۆر دڵ رەق و بێ رەحمە.

[١٨٩] بە دوژمنێکی بێ نرخ ئەوترێ، کە هەڕەشەت لێ بکا.

۱۹۰)- مریشك ئاو بخواتەوە، سەربەرز ئەکاتەوە[۱۹۰]

۱۹۱)- مریشك ئەڵێ یاخوا هەموو رۆژێ لە ماڵی خاوەنەکەم یەکێك بمرێ تا تێر برنجی پرسە بخۆم، سەگ ئەڵێ یاخوا هەموو رۆژێ لە ماڵی خاوەنەکەم شایی بێ، تا تێر گرتگی زەماوەند بخۆم[۱۹۱]

۱۹۲)- مریشك باری خست نیشانەی میوان هاتنە[۱۹۲]

۱۹۳)- مریشك تەنگاو بێ، هێلکە لە سەر بەرد ئەکات[۱۹۳]

۱۹٤)- مریشك خۆی خۆڵ ئەکا بە سەر خۆیا کەس ناتوانێ خۆڵی بە سەرا بکا[۱۹٤]

۱۹٥)- مریشك خەو بە چاڵە گەنمەوە ئەبینێ[۱۹٥]

۱۹٦)- مریشك لاسایی قاز بکاتەوە قنگی ئەدرێ[۱۹٦]

۱۹۷)- مریشك لە دانەوێڵە سڵ ناکات[۱۹۷]

۱۹۸)- مریشك هێلکەش ئەکا و ریقنەش ئەکا[۱۹۸]

۱۹۹)- مریشکی برسی ئاشی ئاو بردو لە خەوا ئەبینێ[۱۹۹]

---

[۱۹۰] واتە هەر کارێکت کرد، پشووی تیا بدە.

[۱۹۱] واتە هەر کەسێك بە پێی نەفسیيەتی خۆی ئەدوێ، سپڵە بە پێی خۆی و بەوەفا بە پێی خۆی.

[۱۹۲] باری خست: واتە لەسەر تەنشت کەوت.

[۱۹۳] واتە هەمیشە جێی نەرم و شلت دەست ناکەوێ.

[۱۹٤] واتە مەردوم ئەگەر خۆی باش بێ کەس ناتوانێ خراپی بڵێ.

[۱۹٥] تەماشای سێ پەند دوای ئەم پەندە بکە.

[۱۹٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پارە خەرج کردنا لاسایی لە خۆی دەوڵەمەندتر بکاتەوە.

[۱۹۷] واتە کەس بە خۆڕایی دەست لە ژیانی خۆش هەڵناگرێ.

[۱۹۸] بە یەکێك ئەوترێ کە ئیشی باشیش و خراپیش بکات، یا دوو منالی ببێ یەکێکیان باش و یەکێکیان خراپ.

[۱۹۹] چونکە هەموو گیان لەبەرێك بە بیری ئەو شتەوە ئەنوێ کە پێویستی بێ.

۲۰۰)- مریشكی رەش، هێلكەی سپی ئەكا[۲۰۰]

۲۰۱)- مریشكێكی هێلكەكەر، لە گایەكی جووت نەكەر باشترە[۲۰۱]

۲۰۲)- مزگەوت بێ مەلا نابێ[۲۰۲]

۲۰۳)- مزگەوت روخاوە، محرابی ماوە[۲۰۳]

۲۰٤)- مزگەوتی كەر، خۆڵە كەوەیە[۲۰٤]

۲۰۵)- مزگێنی هێلكە پەموانەیە[۲۰۵]

۲۰٦)- مژدەی شیرینی لە بنی دانایە[۲۰٦]

۲۰۷)- مژدەی هێلكەیەك، دەنكە پەموانەیەكە[۲۰۷]

۲۰۸)- مژمۆر لە ناو كوێرانا، چاو ساغە[۲۰۸]

۲۰۹)- مستە خۆڵەك لەمستە زێڕەكی باشترە[۲۰۹]

---

[۲۰۰] بە یەكێكی خراپ ئەوترێ، كە ئیشێكی باش بكا، یا منالێكی باشی لێ كەوتبێتەوە.

[۲۰۱] چونكە یەكەمیان كەڵكێكی هەیە، بەڵام دووهەم نا.

[۲۰۲] واتە هیچ شوێنێك بێ گەورە نابێ.

[۲۰۳] بە یەكێكی گەورە، یا شوێنێكی گرنگ ئەوترێ، كە خۆیان نەمابن بەڵام بەڵگە و نیشانە و ناوبانگیان مابێ.

[۲۰٤] واتە چۆن مسڵمان لە مزگەوت خۆی پاك ئەكاتەوە، بە دەست نوێژ شتن و مەلە كردن، كەریش كە گەیشتە خۆڵەمێش و سەرە نوێلكێك، تیا ئەگەوزێ، بە یەكێك ئەوترێ كە زۆر هاتوچۆی شوێنێكی خراپ بكات.

[۲۰۵] واتە مزگێنی هەموو شتێك بە پێی ئەو شتەیە، گەورە گەورە و بچوك و بچوك.

[۲۰٦] واتە وەك قسەی ناخۆش نییە بشارێتەوە و بەڵكو ئەم باس ئەكرێ.

[۲۰۷] تەماشای پەندی بكە.

[۲۰۸] مژمۆر: كەسێكە كە بە عاستەم چاوی ببینێ، ئنجا ئەم مژمۆرانە لە ناو كوێرانا بە چاوساغ دائەنرێن هەر وەك لە ناو چاو ساغانا بە كوێر دائەنرێن.

[۲۰۹] مەبەس لە مستە خۆڵ: پارچەیەكە لە زەوی، چونكە مستە زێڕەكە ئەبڕێتەوە، بەڵام بەروبومی پارچە زەوییەكە نابڕێتەوە.

٢١٠)- مستەکۆڵە لەدرەوش ئەگەڕێتەوە[210]

٢١١)- مسقاڵێك گۆشت لە سەد شاهد چاکترە[211]

٢١٢)- مشت لە درێشە ئەگەڕێتەوە[212]

٢١٣)- مشتەری ئێواران یا دزە یا حیزە[213]

٢١٤)- مشتەری ئێواران، یا دزە یا حیزە[214]

٢١٥)- مشتەی ناو هەمانەکە کوشتومی[215]

٢١٦)- مشتەی ناوەتە، ناو هەمانەوە[216]

٢١٧)- مشتی داوە بە درەوشا[217]

---

[210] واتە هێز لە هێز ئەگەڕێتەوە.

[211] واتە مەردوم هەر چەند جوان بێ بەڵام کە لەڕ و لاواز بوو جوانییەکەی دەرناکەوێ و ئەو حەلە تۆزێ قەڵەوی بۆ دەرخستنی ئەو جوانییە لە سەد شاهد باشترە، کە گەواهی بدەن لە سەر جوانییەکەی.

[212] درێشە: درەوشە، واتە دەست لە هێز و دەسەڵات ئەگەڕێتەوە.

[213] واتە یا بۆ دزی دێ چونکە بازاڕ بلە ئێوارانا چۆڵە، وە یا بۆ پاشماوەی دێ کە بە هەرزان بیکڕێ.

[214] چونکە خاوەن دوکان پەلە پەلێتی کە دوکان هەڵگرێ.

[215] ئەگێڕنەوە: کە کابرایەکی دۆم رقی لە ژنەکەی هەڵ ئەستێ، وە مشتەی دۆمیکەی بۆ ئەخاتە ناو هەمانەیەکەوە، وە بەو هەمانەیە دەست ئەکات بە لێدانی، ژنەکە دەست ئەکات بە هاوار هاوار، ژنانی دراوسێ لێی کۆ ئەبنەوە، کە ئەزانن بە هەمانە لێی ئەدا دەستی ناگرن، وە پێی ئەڵێن: ئافرەت ئەم هاوار هاوارەت لە چییە؟ هەمانەی فش و فۆڵ چ ئازارێکی هەیە تا تۆ ئەمەی بۆ بکەیت، ئەویش ئەڵێ: مشتەی ناو هەمانەکە کوشتومی. ئنجا ئێستا بە قسەیەك یا کردەوەیەك ئەوترێ، کە بە دیمەن قورس نەبێ بەڵام ناواخنی ببێ، وە لە دڵی بەرانبەرەکەیا زۆر کاریگەر بێ.

[216] بە یەکێك ئەوترێ کە قسەی بە توێکڵ بکات، وە قسەی بە دیمەن قورس و گران نەبێ، بەڵام وەکی تر کاریگەر بێ.

[217] بە یەکێك ئەوترێ، کە چوبێ بە گژ ئیشێکی گەورەدا، وە زیانی لێوە توش بووبێ.

٢١٨)- مشتێك نمونەی خەروارێکە[٢١٨]

٢١٩)- مشك لە ماڵیا سەفرا داوێتییە سەری[٢١٩]

٢٢٠)- مشك لە ماڵیا کلکی چەور نابێ[٢٢٠]

٢٢١)- مشك لە هەمانە زەرەری پێ ناگا، هەمانە لە مشك زەرەری پێ ئەگا[٢٢١]

٢٢٢)- مشکێ لەبەردەمی دەرەوە وانێکەوە بێ هەر چاکە[٢٢٢]

٢٢٣)- مشکی کوێر لە ماڵیا نان ناقرتێنێ[٢٢٣]

٢٢٤)- مل لە چەقۆ ئەسوێ[٢٢٤]

٢٢٥)- ملك گورگ نەخۆری دز نەبەرە[٢٢٥]

٢٢٦)- ملی بە نۆ تەور نابڕێتەوە[٢٢٦]

٢٢٧)- ملێچك، خۆی ئەداتە پاڵ بنچك[٢٢٧]

٢٢٨)- من ئاغا و تۆ ئاغا، کێ جێمان بۆ ڕاخا[٢٢٨]

٢٢٩)- من ئەڵێم سیر، ئەو ئەڵێ پیاز[٢٢٩]

٢٣٠)- من ئەڵێم نێرە، ئەو ئەڵێ بیدۆشە[٢٣٠]

---

[٢١٨] بە شتێکی کەم ئەوترێ لە شتێکی زۆر.

[٢١٩] واتە زۆر ڕژد و چروکە، وە هەرچی خواردن بێ لە ماڵیا نییە.

[٢٢٠] واتە زۆر ڕژد و چروکە، وە هەرچی خواردن بێ لە ماڵیا نییە.

[٢٢١] واتە مەردوم ئەبێ ئاگادار بێ، وە هەرگیز لە پیاو خراپ نزیك نەکەوێتەوە.

[٢٢٢] چونکە ئاوەدانیە بۆی.

[٢٢٣] تەماشای پەندی ژمارە  بکە.

[٢٢٤] بە لاتێك ئەوتری کە شەڕ بفرۆشێ، بۆ ئەوەی شتێکی دەست کەوێ.

[٢٢٥] واتە ملك نە ئاژاڵە گورگ بیخوا، نە پارە و ناو ماڵە بدزرێ.

[٢٢٦] واتە زۆر مل ئەستوورە.

[٢٢٧] بە بچوکێك ئەوترێ، کە خۆی بداتە پاڵ گەورەیەك.

[٢٢٨] دوو کەس بە یەکێ ئەڵێن کە هیچیان خزمەتی ئەویتریان نەکا.

[٢٢٩] بە دوو کەس ئەوترێ، کە دانویان پێکەوە نەکوڵێ.

[٢٣٠] بە یەکێك ئەوترێ کە تۆ قسەیەکی بۆ بکەیت و ئەو وەری نەگرێ وە هەر لە سەر قسەکەی خۆی بمێنێتەوە.

٢٣١)- من بۆ تۆ مردوو، تۆ من بەهیچ نەگرتوو[٢٣١]

٢٣٢)- من بۆ تۆمە، تۆ بۆ کێتە؟[٢٣٢]

٢٣٣)- من بۆم دانا ناو، ئەوبۆی دانام داو[٢٣٣]

٢٣٤)- من بەرزت ئەکەمەوە، خوا بت باتەوە[٢٣٤]

٢٣٥)- من بووم بە تۆ، تۆ بووی بە من، من بووم بە جن، تۆ بووی بە ژن[٢٣٥]

٢٣٦)- من بێژنگ نەبوومایە، منداڵەکانم لە تینوانا نەئەخنکان[٢٣٦]

٢٣٧)- من چی ئەڵێم و تەمورە چی ئەڵێ؟[٢٣٧]

٢٣٨)- من زوو لە فیکەی خۆم گەیشتم[٢٣٨]

٢٣٩)- من کە بە ئاگری یەکێ گەش نەبمەوە، بە دوکەڵی بۆچی رەش ببمەوە[٢٣٩]

٢٤٠)- من کە رازی بووم بە نانی جەو، سەری خاقان بەقنگی کەیخوسرەو[٢٤٠]

---

[٢٣١] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە ئەو بۆ ئەم دڵسۆزبێ، وە ئەم پێی نەزانێ.

[٢٣٢] یەکێك ئەیڵێ کە ئامۆژگاری یەکێك بکات و ئەویش لێی وەرنەگرێ و گیرە گیری لەگەڵ بکات، واتە من مەبەسم قازانجی تۆیە، تۆ لەم گیرە گیرە مەبەست چییە؟

[٢٣٣] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە ئەم لەخێری ئەوا قسەی کردبێ و ئەو لە شەڕی ئەما دوابێ.

[٢٣٤] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە لێی دڵگیر بووبێ، واتە من ئەتدەمە دەست خوا، کە بت باتەوە بۆلای خۆی.

[٢٣٥] ژنێك ئەیڵێ، کە ژنێکی ناکەس بەچە بچێ بە گژیا.

[٢٣٦] واتە من دەست شڕ نەبوومایە ئەمڕۆ مناڵەکانم پێویست بە نان و ئاو نەئەبوون.

[٢٣٧] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە دوای قسە بۆ کردنی تۆ، ئەو قسەیەکی وا بکا نیشان بدا کە لە قسەکانی تۆ نەگەیشتووە.

[٢٣٨] یەکێك ئەیڵێ کە لە چۆنێتییەك بگات کە دەخڵی بەوەوە بێ.

[٢٣٩] واتە من کە لە قازانجت بەشدار نەبم، لە زەرەرت بۆچی بەشداربم.

[٢٤٠] واتە من کە قانع بم بە بەشی خوا،ئیتر نە کلکە لەقێ ئەکەم بۆ کەس و نە ماکەرمەلە.

٢٤١)- من كردم به كزه كز، ئەو بردی به زەبری كوز[٢٤١]

٢٤٢)- من له ئاش دێمەوە ئەو ئەڵێ نۆرەت نییه[٢٤٢]

٢٤٣)- من مردوو تۆ زیندوو[٢٤٣]

٢٤٤)- من منم تۆ كێیت؟[٢٤٤]

٢٤٥)- مناڵ له مناڵیەوە دیاره[٢٤٥]

٢٤٦)- مناڵی به دەرمانان، ناچێته سەربانان[٢٤٦]

٢٤٧)- مو ئەقەڵێشێ[٢٤٧]

٢٤٨)- مو به بەینانا ناچێ[٢٤٨]

٢٤٩)- مو، ماست لێك ئەكاتەوە[٢٤٩]

٢٥٠)- مورووی كوندار پەكی ناكەوێ[٢٥٠]

٢٥١)- مورووی ماڵ ئاوسێ مەگەر به شەو بكرێته مل[٢٥١]

---

[٢٤١] ژنێك ئەیڵێ كه به هەژاری و چنگله چزێ لەگەڵ مێردەكەیا ژیابێ تا دەوڵەمەند بووبێ. ئنجا ژنێكی بەسەر هێنابێ، وه ئەو ماڵەی كه ئەم كۆی كردۆتەوە، بیداته دەست ئەو.

[٢٤٢] به یەكێكی بێ ئاگا له دەنگ و باسی جیهان ئەوترێ، كه قسەی وا بكا كه وەختی به سەر چووبێ.

[٢٤٣] یەكێك ئەیڵێ، كه خەبەرێك بدا له پاشه رۆژەوە، واته ئەگەر من مردم تۆ مایت بزانه كه ئەمه وا ئەبێ.

[٢٤٤] یەكێكی یاخی لوت بەرز ئەیڵێ به یەكێكی تر.

[٢٤٥] واته نیشانەی زیرەكی یا كەودەنی له مناڵیەوە دەرئەكەوێ.

[٢٤٦] به مناڵێكی خۆشەویست ئەوترێ، كه باوك و دایكی چاوی تێ بڕن وه هەمیشه دەرمان بكەن به دەمیا.

[٢٤٧] به یەكێكی زۆر دانا ئەوترێ كه هەموو شتێك له یەك جیا بكاتەوە.

[٢٤٨] به دوو كەس ئەوترێ، كه زۆر تێكەڵ بن، واته هیچ شتێك له یەكیان ناكات.

[٢٤٩] به یەكێك ئەوترێ، كه زۆر وردبێ، وه هەموو شت ببینێ.

[٢٥٠] واته هەموو ئافرەتێك شوو ئەكا، وه هیچی به بێ مێرد نامێنێتەوە.

[٢٥١] تەماشای پەندی بكە.

٢٥٢)- mووروی دزیەتی، مەگەر بە شەو بکرێتە مل[٢٥٢]

٢٥٣)- مووچەکەمان بکە بەدارووجان[٢٥٣]

٢٥٤)- موی سپی قەڵغانی روو رەشی پیرە[٢٥٤]

٢٥٥)- مویەك لە بەراز بکرێتەوە هەر باشە[٢٥٥]

٢٥٦)- مویەك لەم ناو مستە هەڵکەنە[٢٥٦]

٢٥٧)- مۆرەی بە سەر چووە[٢٥٧]

٢٥٨)- مۆم ئەڵێ بسوتێم، نەك بتوێمەوە[٢٥٨]

٢٥٩)- مۆم دائەگیرسێ ناسوتێ[٢٥٩]

٢٦٠)- مێخ زنجیر با ئەیبا و کورۆکە کەمای ئەدەنە بەر[٢٦٠]

٢٦١)- مێخ سنگان با ئەیبا پێچە کولوی ئەدەنە بەر[٢٦١]

---

[٢٥٢] بە شتێکی دزراو ئەوترێ، کە لە ترسی خاوەنەکەی نەوێریت بە رۆژ بە کاری بێنیت.

[٢٥٣] بە یەکێك ئەوترێ کە هەرە هەرت بەسەرا بکات.

[٢٥٤] واتە پیر ئەبێ شەرم بکا لە موی سپی خۆی، وە دەست بگرێتەوە لە کاری خراپ، وە ئەو موە سپییە بۆی ببێ بە قەڵغان لە خراپە.

[٢٥٥] بە چروکێکی پیسکەی رەزیل ئەوترێ کە شتێکی لێ بسەندرێ.

[٢٥٦] بە شتێك ئەوترێ کە دەست نەکەوێ و پەیدا نەبێ.

[٢٥٧] بە یەکێك ئەوترێ کە باوی نەمابێ.

[٢٥٨] چونکە بۆ سوتان دروست کراوە نەك بۆ توانەوە، واتە هەموو شتێك ئەبێ چاوی لە پێویستی خۆیەوە بێ.

[٢٥٩] چونکە بۆ داگیرسان دروست کراوە نەك بۆ سوتان.

[٢٦٠] بە یەکێکی گەورە و بە دەسەڵات ئەوترێ کە تووشی رۆژێکی رەش بووبێ، وە لە قین و روخانابێ، کەچی کەس و کاری بێن بە هێندێ شتی هیچ و پووچ بیانەوێ رای بگرن.

[٢٦١] بە یەکێکی گەورە و بە دەسەڵات ئەوترێ کە تووشی رۆژێکی رەش بووبێ، وە لە قین و روخانابێ، کەچی کەس و کاری بێن بە هێندێ شتی هیچ و پووچ بیانەوێ رای بگرن.

٢٦٢)- مێخی دوو حاجه، ناچێ به زەوییدا[262]

٢٦٣)- میراتی کەر بۆ کەمتیاره[263]

٢٦٤)- مێرد که سوار بوو یاره، که دابەزی ماره[264]

٢٦٥)- میرییان دا به دۆم له پێشا دایکی خۆی گا[265]

٢٦٦)- میزی کەف ناگرێ[266]

٢٦٧)- مێش ئەقەپێنێتەوه[267]

٢٦٨)- مێش پیس نییه، دڵ تێك ئەدا[268]

٢٦٩)- مێش له دەمی خۆی دەرناکا[269]

٢٧٠)- مێشکی نەزان، ئەشکەوتی شەیتانه[270]

٢٧١)- مێشوله کۆمەڵه بێ، فیل یخ ئەدا[271]

---

[262] واته مێخی دووپەل داناکوترێ، به تکایەك ئەوترێ که دوو سێ پەلی لێ بووبێتەوه، وه هەر پەلەی تکایەکی تایبەتی بێ.

[263] له رووی سوکییەوه بەیەکێك ئەوترێ، که کەلەپورەکەی بەجێ مابێ بۆ یەکێکی وەك خۆی هیچ و پووچ.

[264] واته هەموو کەسێك تا ئیشی پێته به دەوروپشتا دێ، که ئیشەکەی نەما هیچ.

[265] به یەکێك ئەوترێ، که لەگەڵ رۆژێ دەستی بوو له پێش هەموو کەسێکا بچێ به گژ خزم و خوێشی خۆیا له جیاتی ئەوەی خزمەتیان بکا.

[266] واته ئەو کاریه که به تەمایت به زویی بۆت ناکا.

[267] به یەکێك ئەوترێ، که بێ ئیش دانیشتبێ.

[268] به قسەیەك ئەوترێ که بەدیمەن قورس نەبێ، وەکی تر پێی دڵتەنگ بیت.

[269] واته بەبێزمان و بێدەسەڵاته.

[270] هەمیشه هیلانه و هێلکەی تیا ئەکات.

[271] واته یەکێتی و یەك کەوتن پێویسته بۆ هەموو خێزان و تیره و نەتەوه و گەلێك، چونکه به بێ یەکێتی زەبوونن، وه لەگەڵ یەکێتی دا بەهێزن، تەماشاکەن گەلی خواپێداو هەموو وەك یەك کەس وانه، گەلی بەدبەختی خۆ خۆریش وەك ئاردی ناو دڕکان وایه، هیچی به هیچەوه نانووسێ.

٢٧٢)- مێشێك میوانی نابێ[٢٧٢]

٢٧٣)- میوان ئازیزه[٢٧٣]

٢٧٤)- میوان ئاوازۆ، خاوەن ماڵ كڵاو هەڵوازۆ[٢٧٤]

٢٧٥)- میوان بە خوڵقی خانە خوێوە بەندە[٢٧٥]

٢٧٦)- میوان بە دیارییەوە دیارە[٢٧٦]

٢٧٧)- میوان جەژنی خانە خوێیە[٢٧٧]

٢٧٨)- میوان دیاری خوایە[٢٧٨]

٢٧٩)- میوان سەگی هاهایە، هەویر شلە و لێی نایە[٢٧٩]

٢٨٠)- میوان كەری خانە خوێیە[٢٨٠]

٢٨١)- میوان لە میوانی خۆش ناوێ، خانەخوێ لە هەر دوو لایێ[٢٨١]

---

[٢٧٢] بە یەكێك ئەوترێ، كە ئامۆژگاری، یا بەسەرهاتێكی گرنگ كاری تێ نەكا، ئەبێژرێ ئەم هەموو ئامۆژگارییەی ئەكەم كەچی مێشێك میوانی نابێ، واتە یەكێك مێشێك ببێ بە میوانی چەندەی موبالات پێ ئەكات ئەم واش نییە.

[٢٧٣] چونكە دیاری خوایە.

[٢٧٤] واتە كە میوان دەنگی هات، خاوەن ماڵ خێرا ئەچێ بە پیرییەوە.

[٢٧٥] واتە رووی خۆش بوو دائەنیشێ و رووی گرژ بوو ئەڕوا.

[٢٧٦] با دیارییەكەشی كەم بێ.

[٢٧٧] چونكە ئەویش بە بۆنەی میوانەكەوە نانی ئەكەوێتە رۆنەوە.

[٢٧٨] كە رووی تێ كردی نابێ پێت ناخۆش بێ.

[٢٧٩] بە میوانێك ئەوترێ كە لەگەڵ یەكێك دەمەقاڵێی بوو لەگەڵ خانەخوێكەیا ئەم بێ ئەوەی تێ بگات هەر لەخۆیەوە تێ هەڵكات وە پشتیوانی خانەخوێكەی بكات، ئنجا چونكە نازانێ مەسەلە چییە، نازانێ بڵێ چی، وە قسەكانی لە گوێی كابرادا هیچ مەعنایەكی نییە هەر ئەوە نەبێ كە دەنگە دەنگ و حەوە حەوە.

[٢٨٠] چونكە ئەبێ بە فەرمانی ئەو هەستێ و دانیشێ.

[٢٨١] چونكە خۆی بارە بە سەر خانەخوێكەوە، ئنجا وەرە بارێكی تریشی بێتە سەر.

۲۸۲)- میوان نان ئەخۆیت؟[282]

۲۸۳)- میوان هات خاوەن ماڵی دەرکرد[283]

۲۸٤)- میوان و خانەخوێ کە بوو بە شەڕیان، چارەی میوان هەر ڕۆینە[284]

۲۸٥)- میوانی بێ دیاری، کافر بێ بە حاڵی[285]

۲۸٦)- میوانی جاروبارا، شیرین و شیرین کردارا[286]

۲۸۷)- میوانی درەنگ وەخت گلەیی لەسەر خۆیەتی[287]

۲۸۸)- میوانی ساتێ، جاسوسی ساڵێ[288]

۲۸۹)- مێوژە ڕەشە، هەر چەند ڕەشە، بەڵام خۆشە[289]

۲۹۰)- میوەی نەگەیو تاڵە[290]

۲۹۱)- میوەیەك کە گەیی ئەگەر نەیکەیتەوە ئەگەنێ[291]

---

[282] ئەم پرسیارە لە کوردەواریی دا زۆر نەنگە، لەبەر ئەوەی لە ڕووی تەوسەوە کراوە بە پەند، واتە چۆن پرسیاری وا نەکرێ، وە چۆن شتی وا نەوترێ.

[283] بە میوانێك ئەوترێ، کە لە ماڵی خانەخوێکەیا خاوەن ماڵی بکات.

[284] چونکە خاوەن ماڵ خۆی دەست لە ماڵی خۆی هەڵناگرێ.

[285]

[286]

[287] واتە ئەگەر نانێکی ڕێك و پێك ئامادە نەکرا.

[288] بە میوانێك ئەوترێ، کە هەر بۆ قسە وەرگرتن بێ بۆلات.

[289] یەکێك ئەیلێ بە شتێکی ناشرین کە خۆی حەزی لێ بکات.

[290] بە کچێك ئەوترێ، کە منداڵ بێ و وەختی شووی نەهاتبێ، وە بە کوڕێکی منداڵ ئەوترێ، کە وەختی ژن هێنانی نەهاتبێ.

[291] بە خاوەن کچێك ئەوترێ، کە کچەکەی وەختی شووی هاتبێ و نەیدا بە شوو.

# پیتی نون

١)-　نا تورێنێ بە گیای بەهارا[١]

٢)-　نا عەلاجی سەر بەماڵی دوژمنا ئەکا[٢]

٣)-　نابێ هەرچی گا بیکا، هەموی بخوا[٣]

٤)-　ناپاك گیرفانی پڕ و رووی رەشە[٤]

٥)-　ناپیاو ئەگەر ماڵی بوو بە کەعبە سەری پیا مەکە[٥]

٦)-　ناخۆشی پیر، وە سەرەشی قیر[٦]

٧)-　ناخۆشی جوان، وە سەتکەی یان[٧]

٨)-　نادر شلی کوتەکە[٨]

---

[١] بە یەکێك ئەوترێ، کە نەخۆش بێ بە ڕەنگێکی وا کە هیوای مانی لێ نەکرێ.

[٢] بەم رەنگە یەکێك لە برسانا هاتە سەر مردن، وە هیچ نەبوو بیخوات گۆشتی سەگ و بەراز نەبێ، دروستە ئەوەندەیان لێ بخوات کە نەمرێ، وەك قورئان ئەفەرموێ: (انما حرم علیکم المیته و الدم و لحم الخنزیر و ما اهل به لغیر الله، فمن اچگر غیرباغ و لاعاد فلا اپم علیه ان الله غفور و رحیم) واتە ئەوەی کە قەدەغە کراوە لێتان هەر مردارەوە بووە و خوێن و گۆشتی بەراز و ئەوەی کە سەر براب‌ێ بە ناوی غیری خواوە، ئنجا هەر کەسێك ناچار بوو (بەخواردنی یەکێك لەمانە) بە بێ یاخی بوون و دەرچوون لە سنور، ئەوە گوناهی لە سەر نییە، بێگومان خوالێخۆشبو مێهرەبانە.

[٣] واتە هەموو کەسێك چی دەست کەوت، ئەبێ بەشێکی هەڵگرێ بۆ پاشەرۆژ.

[٤] چونکە بۆ پەیدا کردنی ماڵی دنیا هیچی پێ عەیب نییە، وە هەر چی نامەردی هەیە ئەیکات.

[٥] چونکە نامەردە، نامەردیش ئەوەیە کە پێی وتراوە.

[٦] واتە هەرگیز لێی نابێتەوە تا مردن.

[٧] واتە هەر لە خۆیەوە ئەڕوا.

[٨] یەکێك ئەیلێ کە نەوێرێ گوفتار یا کردارێك بکات لە ترسی یەکێکی تر.

٩)- ناز بە سەر یەکێکا بکە، نازت بکێشێ[٩]

١٠)- ناز بدە بە پیاز، دێتە گازە گاز[١٠]

١١)- ناز لە ئەندازە دەرچوو، ئەبێ بە جەنگ[١١]

١٢)- نازانێ گو بخوا و کەوچك هەڵ ئەگرێ[١٢]

١٣)- نازانێ کەر بگێ و لە ئاخوڕی ئەکا[١٣]

١٤)- نازانێ هەڵپەڕێ، ئەڵێ حەوشەکەی خوارە[١٤]

١٥)- نازانم، رەحەتی گیانم[١٥]

١٦)- نازت بەقەد جیازت[١٦]

١٧)- نازی دیگەران بە سەر زمانە، هینی جگەران بە دیدە و گیانە[١٧]

١٨)- نازیان دا بە پیاز، دەستی کرد بە گازە گاز[١٨]

١٩)- ناعەلاجی حەرام حەلاڵ ئەکا[١٩]

---

[٩]

[١٠] واتە خزمەتی نامەرد بکەیت، پەشیمان ئەبیتەوە چونکە قاچت ئەگرێ.

[١١] چونکە هەڵناگیرێ، ئەو حەلە جەنگ پەیدا ئەبێ.

[١٢] بەیەکێك ئەوترێ، لەرووی سوکییەو کە قسەیەك بکا، بەڵام نەزانێ چۆنی بکا، وە لێی تێك بچێ.

[١٣] بە یەکێکی ناشی ئەوترێ، کە یەکێك لە ئیش بکا بە بێ سوود.

[١٤] بە یەکێك ئەوترێ کە بیانویەکی هیچ و پووچ بێنێتەوە بۆ شتێك.

[١٥] واتە وەڵامێك کە زەرەری تیا بوو مەیدەرەوە، وە بڵێ نازانم.

[١٦] واتە هەموو کەسێك بەقەد کەڵکی بۆ مەردوم نازی لێ قبوڵ ئەکرێ.

[١٧] جگەران: مناڵانی جگەرگۆشەی خۆت، دیگەران: وتەیەکی فارسییە واتە غەیری مناڵان و جگەرگۆشان.

[١٨] تەماشای پەندی ()بکە.

[١٩] بەم رەنگە یەکێك لە برسانا هاتە سەر مردن، وە هیچ نەبوو بیخوات گۆشتی سەگ و بەراز نەبێ، دروستە ئەوەندەیان لێ بخوات کە نەمرێ، وەك قورئان ئەفەرموێ: (انما حرم علیکم المیته و الدم و لحم الخنزیر و ما اهل به لغیر الله، فمن اچگر غیرباغ و لاعاد فلا اپم علیه ان الله غفور و رحیم) واتە ئەوەی کە قەدەغە کراوە لێتان هەر

٢٠)- ناڵ بیّ بزمار نابیّ[٢٠]

٢١)- نان ئەو نانە، ئەمڕۆ لە خوانە[٢١]

٢٢)- نان بۆ خۆم و جۆ بۆ کەرەکەم[٢٢]

٢٣)- نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب[٢٣]

٢٤)- نان بە سەگ بدە لەبەر خاوەنی[٢٤]

٢٥)- نان بدە بە سەگ مەیدە بە سپڵە[٢٥]

٢٦)- نان بدە بە نانەوا، با نیوەی بۆ خۆی ببا[٢٦]

٢٧)- نان خۆری سفرە دڕە[٢٧]

٢٨)- نان خوردە و خانە بێزار[٢٨]

٢٩)- نان دیرەم، چ غەم دیرەم[٢٩]

---

مردارەوە بووە و خوێن و گۆشتی بەراز و ئەوەی کە سەر براببیّ بە ناوی غیری خواوە، ئنجا هەر کەسێك ناچار بوو (بەخواردنی یەکێك لەمانە) بە بیّ یاخی بوون و دەرچوون لە سنور، ئەوە گوناهی لە سەر نییە، بیّگومان خوالێخۆشبو میهرەبانە.

[٢٠]

[٢١] بە یەکێك ئەوتریّ، کە ئەمڕۆ بە هۆی داراییەوە لە ڕوبیّ.

[٢٢] بە یەکێك ئەوتریّ، کە داوای شتێکی لیّ کردی و داتیّ ئنجا داوای شتێکی تـرت لـیّ بکا بە ناوێکی ترەوە.

[٢٣] واتە هەر کارێك ئەبیّ بە خاوەنی خۆی بسپێری.

[٢٤] واتە خزمەتی ناکەسێك بکە لەبەر خاتری کەسێکی باشی.

[٢٥] چونکە سەگ بە وەفایە، وە سپڵە پیّ نەزانە.

[٢٦] چونکە نانێکی جوانت بۆ ئەکا، وە هیچی خەسار ناکا.

[٢٧] بە مەردومی سپڵەی پیّ نەزان ئەوتریّ.

[٢٨] بە یەکێك ئەوتریّ، کە ئیشـی خـۆی بـە یـەکێك جێبـەجیّ بکـا و دوای ئـەوە ، ئـیتر خۆی تیّ نەگەیەنیّ.

[٢٩] دیرەم: لە دارەمی فارسییەوە وەرگیراوە، واتە من نانم هەیە، ئیتر چ غەمێکم هەیە.

٣٠)- نان گیرا ئاو، ئاو گیرا جاو[٣٠]

٣١)- نان که بووه کەرتك، خۆی ناگرێتەوه[٣١]

٣٢)- نان که لەت بوو به یەکەوه نانوسێ[٣٢]

٣٣)- نان و تف ئەخوا[٣٣]

٣٤)- نان و پیازیش بێ، به قاتو نیازیش بێ[٣٤]

٣٥)- نان و نمەکیان پێکەوه خواردووه[٣٥]

٣٦)- نان، نانی گەنم و دین دینی محەمەد[٣٦]

٣٧)- نانت جۆیت و خولْقت گەنمین بێ[٣٧]

٣٨)- نانت جۆین بێ و بێوەیی مالّی خۆت بیت[٣٨]

٣٩)- نانت له خوانه، خزمت له دەورانه[٣٩]

---

[٣٠] واته خواردن که له بین گیرا به ئاو ئەچێته خوارەوه، بەلاّم که ئاو لەبین گیرا ئەوه نیشانەی مردن و له کفن هەلّدرونه.

[٣١] به هەلّەیەك ئەوترێ که پینه نەکرێ.

[٣٢] به هەلّەیەك ئەوترێ که پینه نەکرێ.

[٣٣] واته زۆر هەژار و لاته.

[٣٤] یەکێك ئەیلێ که هیچی نەبێ داینێ لەبەر دەمی میوانەکەیا شتێکی هیچ و پوچ و کەم و کور نەبێ، واته ببوره.

[٣٥] واته حەقیان به سەریەکەوه هەیه.

[٣٦] به خواردنێك ئەوترێ: که لەبەر دەمتا دای بنێن، وه زۆر به لاتەوه پەسەند بێ.

[٣٧] واته ئەگەر سینی و خوانیشت نەبوو بۆ میوان، روت خۆش بێ و زبانت شیرین بێ، چونکه میوان ئەمەی پێ خۆشتره لەوەی سەد جۆر خواردەمەنی بۆ دانێیت و مۆن بیت لەگەلّیا.

[٣٨] واته نابێ جۆ بخۆیت و بێوەی بیت گەلی خۆشتر و باشتره لەوەی دوو ژەمە پلاو گۆشت بخۆیت به خەم و خەفەتەوه.

[٣٩] واته که نان بده بوویت و نانت له سەر خوان بوو، خزم و کەس و کاریشت هەمیشه له دەوروبەرت ئەبن.

٤٠)- نانت نەبیَ لە تەشتیَ خۆ، کورت نەبیَ لە کۆشیَ خۆ، تەمات نەبیَ بە برایێ خۆ[٤٠]

٤١)- نانەکەش ئەخوا و سفرەکەش ئەدڕیَ[٤١]

٤٢)- نانی بیَ خویَ ئەخوا و تڕی سوێر ئەکەنیَ[٤٢]

٤٣)- نانی بە ئاو ناگات[٤٣]

٤٤)- نانی پاڵەوان هەر کەس بیخوا ئەبیَ زۆران بگریَ[٤٤]

٤٥)- نانی جۆ ئەخوا و بە سابون دەست ئەشوا[٤٥]

٤٦)- نانی جۆ ئەخوات و تڕی پاقلاوە لیَ ئەدا[٤٦]

٤٧)- نانی جۆ دۆی ترش، ئەخۆی بخۆ، ناخۆی چش[٤٧]

٤٨)- نانی جۆ، بیَ زەحمەت دەس ناکەویَ[٤٨]

٤٩)- نانی جولەکە بخۆ و ، لە ماڵی گاور بنوو[٤٩]

٥٠)- نانی خۆی لە سەر سفرەی خەڵك ئەخوا[٥٠]

---

[٤٠]

[٤١] تەماشای پەندی () بکە.

[٤٢] بە یەکێك ئەوتریَ، کە زۆر لات بیَ بەڵام قسەی زل بیَ.

[٤٣] واتە تا نان پەیدا ئەکات ئاوی نییە، وە تا ئاو پەیدا ئەکات نان نییە.

[٤٤] بە یەکێك ئەوتریَ کە هەر نانی مەردوم بخوات بیَ ئەوەی نانێك بە یەکێك بداتەوە.

[٤٥] واتە زۆر پاك و تەمیزە.

[٤٦]

[٤٧] یەکێك ئەیڵیَ بە گاڵتە و پێکەنینەوە، کە میوانێکی بیَ، وە هیچ شك نەبا بۆی دابنیَ، شتێکی بیَنرخ نەبیَ.

[٤٨] واتە هەموو شتێك جۆرە رەنج و ئیشێکی ئەویَ.

[٤٩] چونکە خواردەمەنی جولەکە لە هی گاور پاکترە، وە ماڵی گاور لە ماڵی جولەکە ئەمین ترە.

[٥٠] بە یەکێك ئەوتریَ، کە نانی خۆی بکات بە پیاوەتی خەڵك.

٥١)- نانی دڕاو پینه ئەکا[٥١]

٥٢)- نانی ڕۆم ئەخوا و خەرج بە عەجەم ئەدا[٥٢]

٥٣)- نانی شوانی چ لە هوری، چ لە توری[٥٣]

٥٤)- نانی گاورت خوارد، ئەبێ سڵاوات لە دیداری گاور بدەیت[٥٤]

٥٥)- نانی کەوتۆتە ڕۆنەوە[٥٥]

٥٦)- نانی کونە ماسی ئەخوا و پاسی جرتاوا ئەکا[٥٦]

٥٧)- نانی مەرد لە سکی نامەردا نامێنێ[٥٧]

٥٨)- نانی من و کوزەڵەی کانی، میوانی هەی میوانی[٥٨]

٥٩)- نانی مێرا، بێ منەتە، خەوی شەوا، بێ عیللەتە[٥٩]

٦٠)- نانی مێردان لە مێردان قەرزە[٦٠]

٦١)- نانی نانییە[٦١]

---

[٥١] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر وریا و دانابێ بە جۆرێك کە بتوانێ هەموو شتێك پینە بکات و دای پۆشێ.

[٥٢] بەیەکێك ئەوترێ کە بە نان و خوانی یەکێك بژی و کەچی سوودی بۆ یەکێکی تر بێ.

[٥٣] مەبەس لە هور سکە. مەبەس لە تور نانە بەرەیە، واتە نانی شوان چ لە سکیابێ، چ لە نانە بەرەکەیابێ، بە شتێك ئەوترێ کە هەر دوولای وەك یەك وابێ.

[٥٤] واتە لە هەر کەسێك بەهرەمەند بوویت ئەبێ ناوی بە باش بەریت.

[٥٥] واتە کەوتۆتە شوێنێکی باشی بە خۆراك.

[٥٦] تەماشای پەندی بکە.

[٥٧] واتە پیاوی نامەرد هیچی لە بەر چاو نییە.

[٥٨] یەکێکی هەژار ئەیڵێ بە میوانێك، کە ئەرکی زۆری نەبێ واتە کە تۆ بە نان و کوزەڵەی ماڵی من رازی بیت یاخوا بەخێر بێیت.

[٥٩] بە یەکێکی نان بدە ئەوترێ، کە نان و خوانی بێ منەت بێ.

[٦٠] واتە پیاو ئەبێ زوو پاداشی پیاوەتی بداتەوە.

[٦١] بە یەکێك ئەوترێ کە نان بە نان بدات.

٦٢)- نانی نییه و به ئاو کۆلاوه[٦٢]

٦٣)- نانی نییه و چاو ئەڕێژێ[٦٣]

٦٤)- نانی هاری گرتووه به دەمەوە[٦٤]

٦٥)- نانێکم خوارد بەو رۆنەوە، ئەڕۆمەوە بەو شوێنەوە[٦٥]

٦٦)- نانێکی خواردووه به رۆنەوە، هەموو رۆژێ دەچێ به شوێنیەوە[٦٦]

٦٧)- ناوبژی کەر، دڵی فراوانه[٦٧]

٦٨)- ناوکی خست[٦٨]

٦٩)- ناوکی گرتەوه[٦٩]

٧٠)- ناونیشانی پەڵە هەورە کەس[٧٠]

٧١)- ناوی به کۆرەگەی ئاشا چێ[٧١]

---

[٦٢] واته له جیاتی نانیش ئاو ئەخواتەوە.

[٦٣] واته له جیاتی نان خواردنیش هەر چاو ئەڕێژێ.

[٦٤] واته چاوی سور بووه و یاخی بووه.

[٦٥] به یەکێك ئەوترێ که له شوێنێك قازانجێکی دەست کەوتبێ، وه به تەمای ئەو قازانجه بێ، وه بۆی بچێتەوە.

[٦٦] به یەکێك ئەوترێ که سفتاحێکی کردبێ، له شوێنێك وه هەموو جارێك بەو شوێنیەوە بچێ.

[٦٧] چونکه دڵی به هیچ لایەکیان ناسوتێ.

[٦٨] واته دایچڵەکاند.

[٦٩] واته زەرەرێکی قورسی لێدا.

[٧٠] ئەگێڕنەوە که کابرایەکی شێتۆکه بووه هەر چەند پارەیەکی کۆ کردبێتەوە، بردویەتی له دەشت، له عاستی پەڵە هەورێك کردویەتی به ژێر گڵەوە، وه وایزانیوە که ئەو پەڵە هەورە له شوێنی خۆی هەر ئەمێنێ، ئنجا ئەم پەندە به یەکێك ئەوترێ که ناونیشانێکی وەك ئەو پەڵە هەورە هەڵدا بۆ شتێك.

[٧١] کۆرەگە: نێی ئاشه، به یەکێك ئەوترێ که حەزت لێی نەبێ، وه نەتەوێ ناویشی ببەیت.

۷۲)- ناوی خۆی بیستۆتەوە[۷۲]

۷۳)- ناوی سەگ برا چێوە بگرە بە دەستەوە[۷۳]

۷٤)- ناوی شات هێنا قالّی راخە[۷٤]

۷۵)- ناوی گەورە و دێی وێران[۷۵]

۷٦)- ناوی گورگیان برد، گورگ حازر[۷٦]

۷۷)- ناوی هەیە، ناوکی نییە[۷۷]

۷۸)- نە ئاگری بی، نە هاواری گۆران[۷۸]

۷۹)- نە ئاگر و نە دوو، هیچی نابێ بە شوو[۷۹]

۸۰)- نە ئەرز قوتی دام، نە ئاسمان هەڵیکێشام[۸۰]

---

[۷۲] بە یەکێك ئەوترێ، کە ناوبانگی بێ حەیایی یا هەرشتێکی تری خۆی بیستبێتەوە، وە کەمێ لوتی بەرز کردبێتەوە.

[۷۳] بە پیاوێکی خراپی لە خوا نەترسی ستەمکار ئەوترێ، کە ناو ببرێ.

[۷٤] واتە شاتان خۆش بوێ، چونکە گەورەی هەموانە، وە مایەی یەکێتی گەل و کۆمەڵە و نیشتمانە.

[۷۵] بە یەکێك ئەوترێ، کە ناوێکی گەورەی ببێ، کەچی وەکی تریش هیچی نەبێ.

[۷٦] بە یەکێك ئەوترێ کە لە کاتی ناوبردنی لە شوێنێك کوتوپڕ حازر بێ.

[۷۷] واتە ناوی هەیە و کرداری نییە.

[۷۸] واتە باوەڕ بە هیچیان مەکە، چونکە ئەویان گڕ و کفێکە، ئەمیان هەر دەنگە دەنگێکە.

[۷۹] ئەگێڕنەوە کە خوشك وبرایەك بە رێگایەکا ئەڕۆن بارانێکی زۆریان لێ ئەدات، لە پاشانا ئاگرێك ئەکەنەوە کە خۆیانی پێ وشك کەنەوە کچەکە تومەز دەرپێکەشی تەڕ بووە، وە لەبەر براکەی رووی نایەت وشکی کاتەوە، وە لەبەر خۆیەوە ئەڵێ: ( نەئاگر و نە دوو، هیچی نابێ بە شوو) براکەی ئەیەوێ لەسەر ئەم قسەیە بیکوژێ: کچەکە پێی ئەڵێ: برا گیان داوای شوو ناکەم، بەڵام مەبەستم ئەوەبوو، ئەگەر لە جیاتی تۆ مێرد بووایە رووم ئەهات بە تەواوی خۆم وشك کەمەوە، ئەگینا برا گیان بە خوا (خۆشە ئاگر خۆشە دوو، برا خاسە نەوەك شوو).

[۸۰] یەکێك ئەیڵێ کە لە ناو چەند کەسێکا تەریق ببێتەوە، بە جۆرێك کە حەز بکات لەو دەمەدا بچێ بە ناخی زەویدا.

٨١)- نە ئەم هێلکە و رۆنە، نە ئەم زەبرە بە قونە[٨١]

٨٢)- نە ئەوەندە تاڵ بە، فڕێت بدەن، نە ئەوەندەش شیرین بە، قوتت بدەن[٨٢]

٨٣)- نە ئەوەندە وشك بە، بشكێت، نە ئەوەندەش تەڕ بە، بگوشرێت[٨٣]

٨٤)- نە بۆ كوێر هەڵپەڕە، نە بۆ كەڕ گۆرانی بڵێ[٨٤]

٨٥)- نە بازاڕی چۆڵ، نە شایی بێ دەهۆڵ[٨٥]

٨٦)- نە بای دیوە و نە باران[٨٦]

٨٧)- نە بە بەرخی تێر شیرم خواردنە بە كاوڕی تێر گیا[٨٧]

٨٨)- نە بە پێكەنینی زاڵم باوەڕ بكە، نە بە خۆشی زستان[٨٨]

٨٩)- نە بەرگ بۆ كوێر، نە خواردن بۆ تێر[٨٩]

٩٠)- نە بخۆیت نە بكەیت، تەماشای سای گەردنی بكەیت[٩٠]

---

[٨١] ئەگێڕنەوە كە یەكێك ئەبێ بە میوانی ماڵێك، بۆ قاوەڵتی هێلكە و رۆنی بۆ ئەكەن، بەڵام ئەوەندەی ئیش پێ ئەكەن، كابرا ئێواری ناتوانێ لەسەر قنگ دانشێ، وە ئەڵێ ( نە ئەم هێلكە و رۆنە، نە ئەم زەبرە بە قونە) ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە یەكێك ئەوترێ كە خزمەتێكت بكا و بێگارێكی قورست پیا بدا.

[٨٢] واتە لە هەموو شتێكا مام ناوەندی بە.

[٨٣] واتە لە هەموو شتێكا مام ناوەندی بە.

[٨٤] چونكە بێكەڵكە، وە كەسیان بەهرەی لێ وەرناگرن.

[٨٥] واتە هەموو شتێك بە شتی خۆیەوە خۆشە، بەم رەنگە بازاڕ بە خەڵقەوە شایی بە دەهۆڵەوە و قوتابخانە بە قوتابییەوە.

[٨٦] بە مەردومی بێعار ئەوترێ.

[٨٧] واتە نە بە منداڵی لە بەروبومی باوك و دایك بەهرەمەند بووم ، نە بە گەورەیی لە ماڵ و مێرد.

[٨٨] چونكە هەر دوكیان لە ساتێكا ئەگۆڕێن.

[٨٩] چونكە ئەویان چاوی نییە تا جوان و ناشیرین لێك بكاتەوە ئەمیشیان تێرە ئارەزووی خواردنی نییە.

[٩٠] بە ئافرەتێكی زۆر سپی و جوان و ناسك و نازدار ئەوترێ.

٩١)- نه بمشۆ به گوواوێ، نه بمخەره سەر چاوێ[٩١]

٩٢)- نه بێژه عەرەبا مەرحەبا دەریته سەرعەبا[٩٢]

٩٣)- نه بێژه عەرەبا مەرحەبا، هەم ئەخوات و هەم ئەبا[٩٣]

٩٤)- نه پێت هەڵکەوێ لەمێخ نه بچۆ بۆ لای شێخ[٩٤]

٩٥)- نه پێڵاوی تەنگ، نه خانەی بەجەنگ[٩٥]

٩٦)- نه تەنراوه و نەهۆنراوه، به لەشی ساغی بدڕێت[٩٦]

٩٧)- نه تڕه دەنگی بێ، نەتسه بۆنی بێ[٩٧]

٩٨)- نه تووتنی جێ میز، نه کچی دایك حیز[٩٨]

٩٩)- نه خانەی سەرشیو، نەئاغا ژنی کچەتیو[٩٩]

١٠٠)- نه خسووم هەیه بکوژێ، نه گۆلکم هەیه بمژێ[١٠٠]

١٠١)- نه دەرزییه بشکێ، نه دەزوه بپچڕێ[١٠١]

---

[٩١] به یەکێك ئەوترێ که هێندێ جار ڕێزت بگرێ و هێندێ جاریش قسەی سوکت پێ بڵێ.

[٩٢] چونکه ڕویان زۆر قایمه، ئەوی خواردی خواردی، ئەویشی مایەوه ئەیەوێ لەگەڵ خۆیا بیبا.

[٩٣] چونکه ڕویان زۆر قایمه، ئەوی خواردی خواردی، ئەویشی مایەوه ئەیەوێ لەگەڵ خۆیا بیبا.

[٩٤] واته نه به شەو بچۆ بۆ دزی تا له مێخی دەوار هەڵەنگویت، نه بشچۆ بۆ لای شێخ بۆ تۆبه کردن.

[٩٥] چونکه ئەویان قاچت بریندار ئەکا و ئەمیان دڵت.

[٩٦] به یەکێك ئەوترێ، که باسی لەبەر کردنی کاڵایەك یا خشڵێك بکات که هێشتا دروست نەکرابێ.

[٩٧] به یەکێك ئەوترێ که له هیچ ڕوویەکەوه کەڵکی نەبێ.

[٩٨] واته هیچیان باش نین.

[٩٩] واته هیچیانت نەوێ.

[١٠٠] به یەکێك ئەوترێ که مناڵ و دەست گر و پێ گری نەبێ.

[١٠١] واته زۆر لەڕ و لاواز و ڕەق و تەقه.

۱۰۲)- نه رەنج بۆ ناكەس، نە شین بۆ مردوو[۱۰۲]

۱۰۳)- نە ڕێسراوە نەچنراوە، تەقەتەقی دێ لە دواوە[۱۰۳]

۱۰٤)- نە ژنی نزیك باوان نە گوێرەكەی نزیك ئاوەدان[۱۰٤]

۱۰٥)- نە سێ ماین لە دۆڵێك، نە سێ ژن لە سەر كە مۆڵێك[۱۰٥]

۱۰٦)- نە ساڵی دوو بەهار، نە ژنی دووچكدار، نە پیاوی گوێ بە گوار[۱۰٦]

۱۰۷)- نە ساڵی لە سەرەتاوە خۆش و نە بووكی لە سەرەتاوە خێرا[۱۰۷]

۱۰۸)- نە سەربانی لێژ، نە بانگوشی گێژ[۱۰۸]

۱۰۹)- نە سەری بێ ماڵ، نە ماڵی بێ سەر[۱۰۹]

۱۱۰)- نە سەلكی سیریت، نە قنچكی پیازیت[۱۱۰]

۱۱۱)- نە سێبەری بەردان، نە بەقای مێردان[۱۱۱]

۱۱۲)- نە سیر و نە پیاز، نە ئینسانی وەسواس[۱۱۲]

---

[۱۰۲] واتە هەردووكیان بێ كەڵكە.

[۱۰۳] بە شتێك ئەوترێ كە هیچی لێ نەكرابێ كەچی خۆی بۆ ئامادە بكەن.

[۱۰٤] واتە ئەویان هەمیشە ئەچێتەوە ماڵی دایكی و ئەمیان هەر ساتە نە ساتێك ئەچێتە ناو دێ.

[۱۰٥] واتە پێكەوە هەرگیز هەڵناكەن.

[۱۰٦] دوچكە: كلكە، واتە ژنێ كە لە مێردكەی پێشووی منالی ببێ كەڵكی نییە.

[۱۰۷] چونكە زۆرتر یەكەمیان لەدوایی دا، زۆر ناخۆشی كردووە، وە دووهەمیان لەدواییدا، زۆر تەمەڵ دەرچووە.

[۱۰۸] واتە هەر دوكیان یەكە یەكە خراپن، ئنجا وەرە یەك بكەون.

[۱۰۹] واتە هیچیان بە تەنها نرخی نییە.

[۱۱۰] ئەم پەندە وەك پەندی (سەلكی سیریت؟ قنچكی پیازیت) وایە.

[۱۱۱] واتە سێبەری بەردێك كە لە بنیا دانیشیت چەندە پشتی پێ ئەبەسترێ وەفای مێردیش بۆ ژنی هەر ئەوەندە پشتی پێ ئەبەسترێ. بەڵام ئەمە بەتێكرایی وا نییە، بەڵكو بۆ هێندێكە بە دەگمەن.

[۱۱۲]

١١٣)- نه شارەزا كوێره[١١٣]

١١٤)- نه شارەزا وەك كوێر وايه[١١٤]

١١٥)- نه شەيتان بينه، نه (اعوزبالله) بكه[١١٥]

١١٦)- نه شێت بگێ و نه شێت بت گێ[١١٦]

١١٧)- نه شيش بسوتێ و نه كەباب[١١٧]

١١٨)- نه شيعەم و نه سوننى، بابايەكم كرنى[١١٨]

١١٩)- نه شين بۆ بێ كەس، نه رەنج بۆ ناكەس[١١٩]

١٢٠)- نه قازەنى، نه بازەنى، ئينه بلبلى خۆش ئاوازەنى[١٢٠]

١٢١)- نه كۆنەكانى به باخ كه، نه لەدواى چون ئاخ كه، نه هەتيوچه چراخ كه[١٢١]

١٢٢)- نه كەر بگێ و نه كەر بتگێ[١٢٢]

---

[١١٣] چونكه هەر دووكيان نازانن چى بكەن.

[١١٤] چونكه هەر دووكيان نازانن چى بكەن.

[١١٥]

[١١٦] واته لەگەڵ مەردومى بێ عەقلا هەرگيز تێكەڵى مەكه.

[١١٧] بەدو لا ئەوترێ كه كارێكى خێريان به دەستەوه بێ، واته هيچ لايەكتان پەلپ لەويتريان مەگرن. به رەنگێكى وا كه تووشى زەرەر ببێ.

[١١٨] كرن: ناوى شارێكه له ئێران.

[١١٩] بەدو لا ئەوترێ كه كارێكى خێريان به دەستەوه بێ، واته هيچ لايەكتان پەلپ لەويتريان مەگرن. به رەنگێكى وا كه تووشى زەرەر ببێ.

[١٢٠] ئەگێڕنەوه كه سێ هەورامى له قەراغ چەمێك چاويان ئەكەوێ به كيسەڵێك، يەكێكيان ئەڵێ: ئەمه قازه، يەكێكى تريان ئەڵێ: نەخێر بازه ئەويكەى تريان كه خۆى لەوان به ژيرتر ئەزانێ ئەڵێ: ( نه قازەنى، نه بازەنى، ئينه بلبلى خۆش ئاوازەنى). ئنجا ئيستا ئەم پەنده به يەكێك ئەوترێ كه قسەيەكى وا هەڵه بكات له بابەت شتێكەوه.

[١٢١] تەماشاى پەندى بكه.

[١٢٢] تەماشاى پەندى بكه.

١٢٣)- نه كەوڵ ئەبێ بە پۆست، نه دوژمن ئەبێ بە دۆست[١٢٣]

١٢٤)- نه كردی و نه خواردی لە سمێڵان مەیی[١٢٤]

١٢٥)- نه كوتەك لەگەڵ ئاغایان نه شەرع لەگەڵ مەلایان[١٢٥]

١٢٦)- نه كوندەی نزیكە ئاوان، نه ژنی نزیكە پاوان[١٢٦]

١٢٧)- نه گورگ خۆرە و نه دز بەرە[١٢٧]

١٢٨)- نه گوللەی هەیە و نه بارووت، ماڵێكی هەیە رەق و رووت[١٢٨]

١٢٩)- نه گوڵی گەنمی دیوە و نه چەقچەقەی ئاش[١٢٩]

١٣٠)- نه ماڵت لەسەر شیو بێ، نه ژنت كچە تیو بێ[١٣٠]

١٣١)- نه ماڵی هەیە رەحمان بیبا، نه دینی هەیە شەیتان بیبا[١٣١]

١٣٢)- نه هاواری گۆران، نه سۆفیەتی ژنان[١٣٢]

١٣٣)- نه هەرشتەی ماش، نه پلاوی باش[١٣٣]

---

[١٢٣] واتە چۆن بەرگ و كاڵا نابێ بە پێستی ئەندام، دوژمنیش نابێ بە دۆست.

[١٢٤] واتە هیچی نەكردووە و هیچی نەخواردووە بە سمێڵیەوە مەیوە، بە یەكێك ئەوترێ كە لە كارێكا نەبێ كەچی نیشانەی ئەو كاریە پێوەبێ، وەك یەكێك ئاردی نەدزی بێ و كەچی شانی ئارداوی بێ.

[١٢٥] واتە نە بە كوتەك دەرەقەتی ئاغا دێت نە بە شەرع دەرەقەتی مەلا دێت.

[١٢٦] چونكە یەكەمیان هەمیشە وشك و برنگ و بێ ئاوە، لەبەر ئەوەی كە نزیكە لە ئاوەوە، هەموو كەس ئەڵێ: ئاوی تێكراوە، دووهەمیان هەمیشە لە ماڵە باوانێتی، مەگەر بە دەگمەن مێرد بیبینێ.

[١٢٧] بە شتێكی بێ نرخ ئەوترێ.

[١٢٨]

[١٢٩] بە یەكێك ئەوترێ بە تەوسەوە، كە لە شتێكا خۆیت لێ گێل و هەڵە بكات.

[١٣٠] چونكە ئەم دوانە هەمیشە بۆگەن ئەدەنەوە.

[١٣١] بە یەكێك ئەوترێ نە دینی ببێ و نەدنیا.

[١٣٢] چونكە یەكەمیان زۆر دەم بە هاوار و دووهەمیان هیچ ئیعتبارێكی پێ نییە.

[١٣٣] وادیارە ئەم كابرایەی كە ئەم پەندەی وتووە، میوانی یەكێك بووە كە چێشتی هەرشتەی بۆ ردوە بە ماش، لەجیاتی ئەوەی كە بە نیسك بۆی بكات، ئەمیش ئەبێ

۱۳٤)- نه هێنده تاڵ به فرێت بدەن، نه هێنده شیرین به قوتت بدەن[۱۳٤]

۱۳۵)- نه هێنده وشك به بشكێت، نه هێنده تەڕ به بگوشرێت[۱۳۵]

۱۳٦)- نەبونی، شورەیی نییه[۱۳٦]

۱۳۷)- نەخۆش، میوانی خوایه[۱۳۷]

۱۳۸)- نەخۆشه، شەكر و شیری پێ خۆشه[۱۳۸]

۱۳۹)- نەخشی روی ئاو زو تێك ئەچێ[۱۳۹]

۱٤۰)- نەدار دەبێته ماشه، نه كەر ئەبێته پاشا[۱٤۰]

۱٤۱)- نەداربێ و نه پەردو لەعنەت بێ له هەر دو[۱٤۱]

۱٤۲)- نەدی وبدی، كورێكیان بوو كێر و گونیان بڕی[۱٤۲]

۱٤۳)- نەرمۆكەی بن كایێ، ئاگرت بەردا دنیایێ[۱٤۳]

---

وتبێتی كه تا ئێستا شتی وای نەدیوە، كابرای خانەخوێش ئەبێ عوزری بۆ هێنابێتەوە. كه نەیتوانیوە پلاوێكی باشی به دایك و باوكی بۆ بكا، كابرای میوانیش ئەڵێ: كه پلاوی باشت بۆ نەكرا، با شتێكی مام ناوەندی بوایه له بەینی ئەم دوانەدا، واته نه وەك ئەویان باش، نەوەك ئەمیان خراپ.

[۱۳٤] واته له هەموو شتێكا مام ناوەندی به.

[۱۳۵] واته له هەموو شتێكا مام ناوەندی به.

[۱۳٦] بەڵام گەلێ بوون به شووره‌ییه.

[۱۳۷] واته زۆری لێ مەكه بۆ خواردن.

[۱۳۸] به یەكێك ئەوترێ كه ناز و نووز بكات بۆ شتێكی باش.

[۱۳۹] به كارێك ئەوترێ، كه بناغەی نەبێ، وه هەر قسه بێ.

[۱٤۰] ماشه: مەقاشه.

[۱٤۱] به دوو كەسی خراپ ئەوترێ، كه یەكێك بڵێ فلانیان له فلانیان باشتره.

[۱٤۲] به یەكێك ئەوترێ، شتێكی وای دەست كەوتبێ كه به خۆیەوه نەدیبێ، وه هەر بیگرێ به دەستەوه و نەزانێ چی لێ بكا.

[۱٤۳] به یەكێكی بێ دەنگ ئەوترێ، كه به بێ دەنگی ئاژاوەیەكی نابێتەوه.

١٤٤)- نەزان بەپێیەك زانا بە دوو پێ تێ ئەكەوێ[١٤٤]

١٤٥)- نەزمێ دەزانێ، ئەویش سێ پێیە[١٤٥]

١٤٦)- نەچیتە ناو ئاوی، مەلە فێر نابێ[١٤٦]

١٤٧)- نەفس ئەگەر بگریت مشتێكە، بەری دەیت دەشتێكە[١٤٧]

١٤٨)- نەقلێ كفر، كفر نییە[١٤٨]

١٤٩)- نەقیزە ئەزانێ كەر بە كوێدا ئەڕوا[١٤٩]

١٥٠)- نەكردە كارێ، چۆن ئەبا بارێ[١٥٠]

---

[١٤٤] بە یەكێكی ساویلكەی كەڕەواڵە ئەوترێ، كە بە ساویلكەیی خۆی لە هێندێ شت رزگار ببێ. ئەگێڕنەوە كە كابرایەكی كەڕەواڵە، لەبەرهەژاری ژنی بۆ نایەت، لەگەڵ حاكمی ئەو شوێنەدا سەر وساختی ئەبێ، حاكمەكە رۆژێ لێی ئەپرسێ تۆ بۆ ژن ناهێنیت؟ ئەویش ئەڵێ پارەم نییە حاكمیش ئەڵێ من سەد قرانت ئەدەمێ ژنێكی پێ بێنە، بەڵام بەو مەرجەی كە هێنات لە پێشەوە بۆ شەو و رۆژێك بی هێنیت بۆ ماڵی ئێمە چاوم پێ بكەوێ بزانم چۆنە، ئەمیش ئەڵێ: باشە، لە پاشا پارەكەی لێ وەرئەگرێ، وە ژنێكی جوانكیلەی پێ ئەهێنێ لە پاش چەند رۆژێك ئەچێ بۆ لای حاكم لێی ئەپرسێ ژنەكەت گواستەوە؟ ئەڵێ بەڵێ، ئەڵێ: ئەی بۆ نەت هێنا بۆ ماڵی ئێمە تا ببینم، ئەمیش ئەڵێ بە خوا پێم وت نەهات، وە وتی: من ناچم چونكە نازانم منی بۆچییە؟ حاكمەكەش ئەڵێ: من هیچی لێ ناكەم هەر ترێكی پیا ئەكەنم، كابراكەش بە هەموو سادەییەكەوە ئەڵێ: ئنجا قوربان تۆ ترەكە بكەنە بە (....) ی منا، منیش ئەچم پیا ئەماڵم، بەم رەنگە كابرا رزگاری ئەبێ، وە ژنێكیشی دەست ئەكەوێ، وە حاكمیش بە نائومێدی ئەمێنێتەوە .

[١٤٥] بە یەكێك ئەوترێ كە خوویەكی ناشرینی ببێ، وە هەر چەند پێی بڵێیت دەستی لێ هەڵ نەگرێ.

[١٤٦] واتە فێربوونی هەموو شتێك جۆرە هەوڵ و تەقەلایەكی ئەوێ.

[١٤٧] واتە ئارەزووی ئادەمی بێپایانە، ئنجا ئەگەر لغاوی بگریت ئەوا لە شوێنی خۆی ئەوێستێ، وە ئەگەر لغاوی بەر بدەیت ئەوا بۆت ناگێڕێتەوە.

[١٤٨]

[١٤٩] تەماشای پەندی ( كوتەك ئەزانێ قۆناغ لە كوێیە) بكە.

[١٥٠] بە یەكێكی نەشارەزا ئەوترێ، كە ئیشێكی وای پێ سپێرا بێ كە هیچی لێ نەزانێ.

١٥١)- نەگبەتی باشە، قۆرتی خراپە[151]

١٥٢)- نەڵێیت کواماڵت، ناڵێم کوا قەبرت[152]

١٥٣)- نەم دیایە باوکت، ئەمردم لە عەزرەت دایکت[153]

١٥٤)- نەمریٚ و نەچیٚ، لەخۆی ئەچیٚ[154]

١٥٥)- نەهاتی خۆشە، قۆرتی ناخۆشە[155]

١٥٦)- نەوشیروان حاکم بیٚ و بەختەك وەزیر بیٚ سەد کەلاوە بە پارەیەك[156]

١٥٧)- نرخێکە و شاعەباس برِیویێتی[157]

١٥٨)- نزیکە لە خۆشیانا شادە مەرگ ببیٚ[158]

---

[151]

[152] واتە یەکێك هەواڵم نەپرسیٚ، هەواڵی ناپرسم.

[153] لە رووی سووکیەوە بە یەکێك ئەوتریٚ کە لە خۆی گۆرِابیٚ.

[154] واتە ئەم منالە نەمریٚ و بمێنیٚ، لەباوکی ئەچیٚ، یا لە دایکی .

[155] بە یەکێکی هەژاری دەست کورت ئەوتریٚ، کە تووشی قۆرتێکی تر بووبیٚ لە نەخۆشی یا مردوو مردن.

[156] ئەگێرِنەوە کە نەوشیروان لە سەرەتاوە زۆردار و ستەمکار بووە، وەزیرێکی بووە ناوی (بەختەك) بووە، هەر چەند ئەکات بەختەك نازانیٚ چۆن ئامۆژگاری نەوشیروان بکا، رۆژێك نەوشیروان و بەختەك بە ناو شاری (مداین) دا ئەگەرِێن، لە کەلاوەیەکدا دوو کوندەبەبوو ئەبینن بەسەر دارێکەوە. یەك لەدوای یەك ئەخوێنن، واش دەنگ بلاو بووە لە ناو خەڵقا کە گویا بەختەك زبانی باڵندە و گیان لەبەران ئەزانیٚ. بەم بۆنەیەوە نەوشیروان لە بەختەك ئەپرسیٚ: ئەم دوو کوندەبەبووە چی ئەڵێن؟ ئەمیش ئەڵیٚ پاشام یەکێکیان خوازبێنی کچی ئەوتریان ئەکا بۆ کورِی خۆی ئەویشیان پەڵپی مارەییەکی زۆر سەیر لیٚ ئەگریٚ، ئەڵیٚ ئەبیٚ کچەکەم لە سەر سەد کەلاوە مارە بکریٚ، نەوشیروانیش ئەڵیٚ: ئەی ئەم ئەڵیٚ چی؟ بە خوا پاشام ئەمیش ئەڵیٚ: نەوشیروان حاکم بیٚ و بەختەك وەزیر بیٚ سەد کەلاوە بەپارەیەك لەسەر ئەم قسەیە نەوشیروان تەوبە ئەکات، وە دەست لە زۆر و ستەم هەڵ ئەگریٚ، ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە یەکێکی ستەمکار ئەوتریٚ کە لە جیاتی ولات ئاوا بکاتەوە وێرانی بکات.

[157] واتە ئەم شتە لەو نرخە کەمتر نییە.

[158] بە یەکێك ئەوتریٚ ، کە زۆر کەیف خۆش بیٚ.

١٥٩)- نمەك ئەخوا و نمەكدان ئەدڕێنێ[159]

١٦٠)- نمەكی سوێرە[160]

١٦١)- نوێ هاتن، كونە خەڵاتن[161]

١٦٢)- نوێژ لە سەر داوێنی بكە[162]

١٦٣)- نوێژكەریت نورینیت، فرمانكەریت شیرینیت[163]

١٦٤)- نۆ بكە بە سێ[164]

١٦٥)- نۆ عەربە خۆی لە سكیا گیر ئەبێ، دوو قسە لە زگیا گیر نابێ[165]

١٦٦)- نۆكەری بێجیرە و موچە، تاجی سەری ئاغاس[166]

١٦٧)- نۆكێك بە نۆ پارو ئەخوا[167]

١٦٨)- نێر بێ و مێ بێ بۆ دۆی ئەوێ[168]

١٦٩)- نێرە بیدۆشە[169]

١٧٠)- نێرە قیتێ، هەرچی ئەبینێ دڵی ئەچێتێ[170]

---

[159] واتە سپڵە و پێ نەزانە.

[160] بە یەكێكی دەست داری خزمەت گوزار ئەوترێ كە خزمەتی هەر كەسێك بكا، لێی هەڵگەڕێتەوە وە خراپەی بڵێ.

[161] واتە كە نوێ هات، كۆنە ئەبێ بەخەڵات.

[162] واتە زۆر موسڵمان و لەخوا ترسە.

[163] بە بەردەست ئەوترێ، كە لە ماڵا كە پیشەیان ئیش كردنە، واتە ئەگەر ئەتەوێ شیرین بی ئیشكەربە. وە ئەگەر ئەتەوێ نورانی بیت نوێژكەر بە.

[164] واتە نۆ مانگی خۆشیانی ساڵ هەوڵ بدە بۆ سێ مانگ زستان.

[165] عەربە: چوار ربەی سلێمانییە، بە یەكێك ئەوترێ كە نەتوانێ قسەیەكی نهێنی هەڵگرێ.

[166] بە یەكێك ئەوترێ كە بە بێپارە و موچە ئیش بكا بۆ یەكێك.

[167] واتە زۆر رژد و چروكە.

[168] بە یەكێك ئەوترێ، كە هەر چێكی دەست كەوێ بیخوات.

[169] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە سەر قسەیەكی نارەوایخۆی لانەچێ و هەر بمێنێتەوە.

[170] بە یەكێك ئەوترێ چاوی بە هەرشتێك بكەوێ حەزی لێ بكات.

١٧١)- نێرەکەر بە بارە تەنگزەوە ئەگێ[١٧١]

١٧٢)- نێرەکەریان کرد بە سەر پشك، کێری گەورەی بۆ خۆی هەلگرت[١٧٢]

١٧٣)- نیرگە، لە تویسی هەل نەکە فتگە[١٧٣]

١٧٤)- نێزە لە پێشا ئەبێ جێی بکەیتەوە ئنجا بیدزیت[١٧٤]

١٧٥)- نیشانەی رۆژ لە بنە رۆژەوە دیارە[١٧٥]

١٧٦)- نیشانەی شت لە یەکەم رۆژەوە دیارە[١٧٦]

١٧٧)- نێچیری خۆت لە دەست دەر مەکە[١٧٧]

١٧٨)- نینۆك درێژ بوو شەیتان نوێژی لە سەر ئەکا[١٧٨]

١٧٩)- نینۆك و گۆشت لێك نابن[١٧٩]

١٨٠)- نیوەی هەزار پێنج سەدە[١٨٠]

---

[١٧١] تەنگز: دڕکە، بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر حەشەری بێ، وە بە هیچەوە نەوێستێ.

[١٧٢] بە گەورەیەك ئەوترێ، کە بەشی زۆری بۆ خۆی هەلگرێ.

[١٧٣] توێسی: گیایەکی دڕکاوییە جەوی دەرنەکات، واتە پیاوی گەورە لە خێزانی نزم و نەخوێندەوار هەڵ ناکەوێ.

[١٧٤] واتە تا نەزانیت شتێکت بۆ ئەچێتە سەرمەیکە.

[١٧٥] واتە هەموو کارێك لە سەرەتاوە دیارە کە چۆن ئەبێ.

[١٧٦]

[١٧٧] واتە ئەو هەلەی بۆت هەڵ ئەکەوێ لە دەستی مەدە.

[١٧٨] واتە هەرگیز نینۆکت درێژ مەکە، چونکە چڵك و پیسی لە ژێریا کۆ ئەبێتەوە، نەخوازەلا لە کاتی تارەت گرتنا.

[١٧٩] واتە پێویست بە یەکن.

[١٨٠] بە یەکێك ئەوترێ کە درێژە بە قسەیەك بدا، واتە بیبڕەوە چونکە قسەکە ئاشکرا بوو لە هەموو لایەکەوە.

# پیتی واو

١)- وا دەکەم داکم ئەمرێ، وا دەکەم بابم ئەمرێ[١]

٢)- وا نەدڕاوە، پینە بکرێ[٢]

٣)- واتە تانەی بێژی، نەی وێژی[٣]

٤)- وامزانی ئەم گومەزە شەخسی تیایە[٤]

٥)- وای لە قوونێ، وای لە دۆشاوێ[٥]

٦)- وە بیرم بدێرە، بە ملاك بۆم بنێرە[٦]

٧)- وەجاخزادە بە ئیشارە و ناوەجاخ بە کوتەك[٧]

---

[١] ئەم پەندە لە مەعنای پەندی ( لەم لاتەڕۆم ئاو ئەمبا، لەولا ئەڕۆم گورگ ئەم خوا) دایە.

[٢] بە هەڵەیەك ئەوترێ، کە ئەوەندە زل بێ پینە نەکرێ.

[٣] واتە قسە تا لە بێژنگ و هێلەکی نەدەیت نەیلێت.

[٤] گومەز: لە کوردستانا، بە زۆری پیرێکی تیا نێژراوە، بە یەکێکی بە سەر و سورەت ئەوترێ، کە تۆ ، بە مرۆڤێکی ژیری تێگەیشتووی بە نرخی بزانیت، کەچی وانەبێ.

[٥] ئەگێڕنەوە کە کوڕێك، دوو مەشکە دۆشاو ئەبا بۆ فرۆشتن، لە ڕێگا تووشی کابرایەکی نامەرد ئەبێ، تەمەعی تێ ئەکات، وە وانیشان ئەدا کە گوایە ئەیەوێ دۆشاوەکەی لێ بکڕێ، وە داوا ئەکا کە نیشانی بدا، کوڕەکەش دەمی مەشکەکانی بۆ ئەکاتەوە، کابراش لە دوای تەماشا کردنیان ئەڵێ نامەوێ، وە دەمی هەر دوو مەشکەکە بە کراوەیی ئەداتەوە دەست کوڕەکە، ئەمیش دەمی هەر مەشکەیەی بە دەستێك ئەگرێ، لە پێش ئەوەی کە بیان بەستێتەوە کابرای نامەرد سواری ئەبێ، کوڕە نازانێ چی بکات، دەست لە مەشکەکان بەرئەدا دۆشاوەکە ئەڕژێ، دەستیان لێ بەر نادا کابرا تەنگە تاوی کردووە، ئنجا بەم بۆنەیەوەئەڵێ: (وای لە قوونێ، وای لە دۆشاوێ).

[٦] ملاك: کەوچکی چێشت پێخواردن، واتە تۆ یادم بکە با بە کەوچکێك چێشتیش بێ کە بۆم بنێریت.

[٧] چونکە ئەویان شەرمی بە خۆیەتی، نەك ئەمیان.

٨)-  وەجاخزادە هانینی گرانە و راگرتنی ئاسانە[٨]
٩)-  وەجرتەی خۆت پێ ناکەنیت، وە بڵەی من پێ ئەکەنیت؟[٩]
١٠)-  وەحەی لێکەیت ئەچێتە گاگەل[١٠]
١١)-  وەختی چزوبز، ئەمانکەن بە دز، وەختی کەڵك و کار ئەمانکەن بە یار[١١]
١٢)-  وەختێك بـووك و خەسـو رێـك ئەکەوێ، کـە حوشـتر بـە پەیـژەدا سـەر بکەوێ[١٢]
١٣)-  وەرە ئەم کەرە لەم قوڕە دەربێنە[١٣]
١٤)-  وەستای قسان، کۆڵەواری دەستان[١٤]
١٥)-  وەستای نجار، بنو بێ خەم و خەیاڵ، خوا یەکە و دەرگەی هەزار[١٥]
١٦)-  وەفای مێردی، سێبەری بەردی[١٦]

---

[٨] چونکە خۆی بە هاوسەری هـەموو کەسـێك نازانـێ، بـەڵام دوای ئـەوەی کـە هـات ئـیتر دەنگی لێ دەر ناچێ.
[٩] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی جرتاوایی و کابرایەکی بڵەسەنیی یەکانگیر ئەبن، کابرای یەکەم لە کابرای دووهەم ئەپرسێ، کوێندەریت؟ ئەمیش ئەڵێ بڵەسـەنیم، کـابرای جرتـاوایی بـە (بڵە، بڵە) ئەکەوێتە گاڵتە پێ کردنی، ئەمیش ئـەڵێ (وەجرتـەی خـۆت پـێ ناکـەنیت، وە بڵەی من پێ ئەکەنیت؟) واتە مەردوم ئەبێ خەریکی نەنگی خۆی بێ، نـەك نـەنگی ئـەم و ئەو.
[١٠] واتە زۆر کەرە.
[١١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە وەختی خۆشی و رابواردنا نەیەڵێ بچیت بە لایا، لـە وەخـتی ئیش و بێگاریشا بتخوێنێتەوە.
[١٢] واتە خۆ ئەمیان هەرگیز نابێ، کەواتە ئەویشیان نابێ.
[١٣] بە یەکێك ئەوترێ کە بتەوێ پینەی قسەیەکی بکەیت، کەچی لەو میانەدا هەڵەیەکی تر بکات کە تۆ نەتوانیت بۆی پینە بکەیت.
[١٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە بەگوفتار تەواو بێ، بەڵام بە کردار هیچی لەدەست نەیەت.
[١٥] تەماشای چیرۆکی پەندی (خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە) بکە.
[١٦] واتە زۆر مێرد لەگەڵ ژنی خۆیا بێ وەفایە، وە ژنەکەی وەك لـە بـن سـێبەری بـەردێکا دانیشتبێت وایە کە لە دوای پێنج دەقیقە نەمێنێ.

١٧)- وەك ئاردی بەڕو بە پەینكەی خۆی نابیٚ[١٧]

١٨)- وەك ئاگری بن كا وایە[١٨]

١٩)- وەك ئەسپێی كراسە كۆن وایە[١٩]

٢٠)- وەك بازەكەی فلاّن كەس وایە بە مریشكی ئاوایی فێرە[٢٠]

٢١)- وەك بە بەرزیی دا ئەڕوانیت، بە نزمیشا بڕوانە[٢١]

٢٢)- وەك تڕی بن گۆم ڕۆی[٢٢]

٢٣)- وەك پەشتەماڵی حەمام هەر ساتە بە بەر یەكێكەوەیە[٢٣]

٢٤)- وەك پیازی عەودالاّن، خواردنی هەیە و بردنی نییە[٢٤]

٢٥)- وەك حوشتری ناو پەمو‌و وایە[٢٥]

٢٦)- وەك خەنجەری دەبان لە كالانا ناوەستیٚ[٢٦]

٢٧)- وەك سەگە بە مانگەشەو بوەڕیٚ وایە[٢٧]

٢٨)- وەك سەگی پیٚ سوتاو وایە[٢٨]

٢٩)- وەك سووژن بیٚ كەسە[٢٩]

---

[١٧] بە یەكێك ئەوترێ، كە ئیش و كاری تێكەڵ و پێكەڵ و بیری پەرت بیٚ.

[١٨] بەیەكێك ئەوترێ، كە بەپەنهانی دوو زبانی بكات، وە ئاگری ئاژاوە و ئاكۆكی هەڵ گیرسێنیٚ.

[١٩] بە یەكێك ئەوترێ، كە قسە زۆر برنگێنێتەوە وە لە مەردوم نەبێتەوە.

[٢٠] بە زۆردارێكی ستەمكار ئەوترێ، كە بتوانیٚ زۆر و ستەم هەر لە ئەهلی ئاوایی یەكەی خۆی بكا، وە هەر بەوان بوێرێ.

[٢١] واتە وەك تەماشای خۆت ئەكەیت تەماشای مەردومیش بكە، بە یەكێك ئەوترێ، كە هەر قازانجی خۆی بویٚ.

[٢٢] بە شتێك ئەوترێ، كە بكریٚ و كەس پێی نەزانیٚ، یا لە بیر بچێتەوە.

[٢٣] بە یەكێك ئەوترێ كە هەر ڕۆژەی لەگەڵ یەكێكا بیٚ.

[٢٤] پیازی عەودالاّن لەبەر ناسكی نابرێتە دەرەوە، وە بۆ دوور نابریٚ.

[٢٥] بە یەكێكی درێژ داهۆڵ ئەوترێ، كە لەگەڵ چەند منالێكا یاری بكات.

[٢٦] بە یەكێك ئەوترێ كە جەوهەرێكی ببیٚ و دەری خات.

[٢٧] بە یەكێك ئەوترێ، كە ناوی پیاوێكی گەورە بەخراپ ببا.

[٢٨] بە یەكێك ئەوترێ، كە زۆر خوێڕی و گەڕۆك بیٚ.

٣٠)- وەك چرا شەوقی بۆ ژێر خۆی نییە[٣٠]

٣١)- وەك چراوایە سێبەری بۆ خۆیەتی و تیشکی بۆ بێگانە[٣١]

٣٢)- وەك گای عەلی خۆی ئەلێسێتەوە[٣٢]

٣٣)- وەك گای مارۆ وایە[٣٣]

٣٤)- وەك گەنمە قەندەهاری هەموو شتێکی لێ دێ[٣٤]

٣٥)- وەك گو، وایە تا چیلکەی تێوەژەنی، بۆن ئەداتەوە[٣٥]

٣٦)- وەك گورگ بە دەم خشپەوە ئەچێ[٣٦]

٣٧)- وەك گوریسی گاگێرە وایە[٣٧]

٣٨)- وەك گوریسی ناو هەمانە وایە[٣٨]

٣٩)- وەك گولۆڵە بەفر، هەتا تلەوە بێ گەورەتر ئەبێ[٣٩]

٤٠)- وەك گیسك لە دایکی خۆی هەڵدێ[٤٠]

٤١)- وەك کەپەکی لێ هاتووە، بە پەینکەی خۆی نابێ[٤١]

٤٢)- وەك کەری دەروێش سەر بە هەموو ماڵێکا ئەکا[٤٢]

---

[٢٩]

[٣٠] بە یەکێك ئەوترێ کە قازانجی هەر بۆ بێگانە بێ نەك بۆ کەس و کاری خۆی.

[٣١] بە یەکێك ئەوترێ کە قازانجی هەر بۆ بێگانە بێ نەك بۆ کەس و کاری خۆی.

[٣٢] چیرۆکی ئەم پەندە لە پەندی (بوە بەگای مام عەلی) دا نووسراوە.

[٣٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هەموو لایەکەوە دیار بێ.

[٣٤] بە یەکێکی بە جەوهەر ئەوترێ، کە هەموو شتێکی لێ بێ.

[٣٥] بەمەردومی پیسی ناپاکی قەبەی دەم دڕاو ئەوترێ.

[٣٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هەر لایەکەوە سوسەی شتێکی کرد دوای کەوێ.

[٣٧] بە یەکێك ئەوترێ کە جڵەوی کاری لە دەست دەرچووبێ.

[٣٨] واتە زۆر بە پێچە.

[٣٩] بە کارێك ئەوترێ، تا دەستی بدەیتێ خراپتر ببێ.

[٤٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە فو لە دۆ نەکا.

[٤١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر ئیش و کار زۆری سەری لێ شێوابێ، وە ئیشەکانی لەیەك پچڕابێ.

٤٣)- وەك کەری دێز وایە حەزی بە تۆپینی خۆی و زەرەری ساحێبی ئەکات[٤٣]

٤٤)- وەك کەری ناو جۆگە لە هەر دوو لا ئەخوا[٤٤]

٤٥)- وەك کەڵەشێری ناوەخت وایە[٤٥]

٤٦)- وەك کەو چو[٤٦]

٤٧)- وەك کێشکەی بەچلانە[٤٧]

٤٨)- وەك مۆم وایە روناکی بۆ ژێر خۆی نییە[٤٨]

٤٩)- وەك ماری بێ ئیجازە وایە[٤٩]

٥٠)- وەك ماری پێ لەزگە[٥٠]

٥١)- وەك ماستی مەیو وایە[٥١]

٥٢)- وەك ماسی وایە، جارێ سەر ئاو ئەکەوێ جارێ ژێر ئاو[٥٢]

٥٣)- وەك مامە خەمە وایە[٥٣]

٥٤)- وەك مریشك وایە لە سەر خەرمانی گەنم هەڵیگرە، لە گودا چینە ئەکا[٥٤]

---

[٤٢] بەیەکێك ئەوترێ، کە هاتوچۆی هەموو شوێنێك بکات.

[٤٣] بە مەردومی زۆر حەسود ئەوترێ کە زیان بە مەردوم بگەیەنێ با خۆشی لە پێناوی ئەوەدا تووشی زیان ببێ.

[٤٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە دوو لا بەهرەمەند بێ.

[٤٥] بەیەکێك ئەوترێ، کە هەموو کارێکی لە ناوەختا بێ.

[٤٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە قسەیەك یا بە بینینی یەکێك وابچێ قسەی بۆ نەکرێ.

[٤٧] بە خواردنێکی کەم ئەوترێ، کە لە بەردەمی چەند زەلامێکا دابنرێ، واتە ئەم خواردنە وەك چۆلەکەیەك وایە کە بۆ چل کەس دابنرێ.

[٤٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە خزمەتی بێگانە بکا، وە خزمەتی خزم و خوێشی خۆی نەکا.

[٤٩] بە یەکێك ئەوترێ کە زۆر خراپ بێ و هەرگیز لێی دڵنیا نەبن.

[٥٠] بە یەکێك ئەوترێ کە بیری خۆی هەرگیز دەرنەبڕێ.

[٥١] بە یەکێکی سەر راست ئەوترێ، کە لەهیچ شتێکا سەرپێچی نەبێ.

[٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە هیچ ئەرکێکی بە سەرەوە نەبێ.

[٥٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە هەموو شتێك خەفەت بخوا.

٥٥)- وەك میزی حوشتر هەر بۆ دواوە ئەگەڕێتەوە[٥٥]

٥٦)- وەك مێشە سەگانە وایە، بە هەر شتێکەوە نیشت لێی نابێتەوە[٥٦]

٥٧)- وەك ناجێکەی ئەحمەدی ساغا لە وەختی ڕاوا گوی دێ[٥٧]

٥٨)- وەك نسکێنە هەل ئەچێ[٥٨]

٥٩)- وەك نێرەکەرەکەی عوزمێر پێغەمبەر وایە زەڕینی هەیە و پەڕینی نییە[٥٩]

٦٠)- وەك نیسك وایە بەرووپشتی بۆ نییە[٦٠]

٦١)- وەك هەڵمات وایە، باری بۆ نییە[٦١]

٦٢)- وەك هێلکە و ڕۆنی سەر کلاو ڕۆژنە وایە[٦٢]

٦٣)- وەکا چالەکە وایە، تا لێی دەی قەڵەو ئەبێ[٦٣]

٦٤)- وەلی، وەلی ئەناسێ[٦٤]

---

[٥٤] بە یەکێکی پەست ئەوترێ کە لە پیشەیەکی بەرز بیهێننە خوارەوە بچێ دەست بداتە کارێکی پەست.

[٥٥] بە شتێك ئەوترێ، کە پاشەوپاش بگەڕێتە دواوە.

[٥٦]

[٥٧] ئەگێڕنەوە کە ئەحمەدی ساغا تانجییەکی بووە هەموو جارێك لە وەختی ڕاوا گوی کردووە، تا نێچیرەکەی لە دەست دەرچووە، ئێستا بە هەموو کەسێك ئەوترێ، کە لە کاتی هەلێکا بە شتێکی هیچ و پووچەوە خەریك بێ تا هەلەکەی لە دەست دەرئەچێ.

[٥٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە توورە و تڕۆ بێ.

[٥٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە گوفتاری ببێ و کرداری نەبێ.

[٦٠] بە مەردومی دوو ڕوی دوو زبان ئەوترێ.

[٦١] بە یەکێك ئەوترێ کە هەر ساتەی لەسەر بارێ بێ.

[٦٢] بە ئیشێك ئەوترێ، کە لە شوێنێك بێ، وە تۆ لە شوێنێکی دوور هەوڵی بۆ بدەیت، کە ئەو هەوڵە بێ کەڵك بێ، واتە ئەگەر ئەتەوێ ئەو ئیشە ببێ، بچۆ بۆ شوێنی خۆی لەوێ هەوڵی بۆ بدە.

[٦٣] چالەکە: دەعبایەکی پانکەڵەی چوار پێی قەڵەوە، گۆشتی ئەخورێ.

[٦٤] واتە هەموو کەسێك هاوبیری خۆی ئەناسێ.

٦٥)- وتی ریشت بگرم، دنیات پێ بگێڕم، وتی خۆ تۆشم هەر لەگەڵایت[٦٥]

٦٦)- وتی گاسوور من رق تۆ رق، بزانین کاممان ئاخری ئەیبەینەوە؟![٦٦]

٦٧)- وتی: بێنە مەلا، وتی ئەستغفرالله، وتی هانێ مەلا! وتی بارەك الله[٦٧]

٦٨)- وتی: رۆستەم نێر بوو، یا مێ[٦٨]

٦٩)- وتی: سواربوونی حوشتر زۆر خۆشە، وتی: ئەی خۆت بۆچی سوار نابی[٦٩]

٧٠)- وتی: میمکە ها جەرە کەچەڵە دایکم وتی دیزەیێ دۆمان بۆ بنێرێ، وتی: ئەو زمانە شیرینەی دایکت هەیەتی، شەپێ کەرەشی بۆ ئەنێمە بانی[٧٠]

٧١)- وتی: نێرە، وتی: بیدۆشە[٧١]

٧٢)- وتیان ئێستر: باوکت کێیە؟ وتی خاڵم ئەسپە[٧٢]

٧٣)- وتیان بە بەراز: بۆ بە رۆژ دەرناکەوێ؟ وتی: لەبەر ئیشە باشەکانی شەوم[٧٣]

---

[٦٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ ئابڕوی یەکێکی تر بەرێ، کەچی ئابڕوی خۆشی پێ بچێ.

[٦٦] واتە ئەگەر دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتێك، مان لە یەك بگرن، ئاخری هەر بە زەرەری بێدەسەڵاتەکە تەواو ئەبێ.

[٦٧] جاران مەلا مانگانەیان نەبووە، نە لە لایەن دەوڵەت و نە لە لایەن ئاواییەوە، ماوەتەوە چەند تەنەکەیەك گەنم و جۆ و چەند مەڕ و بزنە لاتێك کە ساڵە و ساڵ بە ناوی زەکاتەوە وەریان گرتووە لەبەر ئەوە زۆر دەست کورت بوون، بێزیشیان نەهاتووە باسی هەژاری خۆیان بکەن، یا داوای شت بکەن یا کارێکی ناشایستە رویان تێ بکا، یا شتێ: وەربگرن بەرانبەر بە وەرامێکی شەرعی.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە تۆ قسەیەکی بۆ بکەیت و ئەو تێی نەگا وە قسەیەکی وا بکا نیشان بدا کە تێ نەگەیشتووە.

[٦٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە هانە هانەی مەردوم بدا بۆ کردنی کارێك، کەچی خۆی نەیکا.

[٧٠] بە یەکێك قسە رەق ئەوترێ، کە داوای شێتکت لێ بکا.

[٧١] بە یەکێك ئەوترێ، کە داوای کارێکت لێ بکا کە لە کردن نەبێ، وە هەر چەندە تۆ پێی بڵێیت ئەو دانەکەوێ.

[٧٢] بە یەکێك ئەوترێ کە لەخێزانێکی بێناونیشان بێ، وە روی نەیەت ناویان ببا، بەڵام یەکێکی تیا هەڵکەوتبێ، هەمیشە خۆی بەوا هەڵواسێ.

[٧٣] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر شەرمەزاری خۆی دەر نەکەوێ.

٧٤)- وتیان بە دۆم قوزت رەشە، وتی: بە میراتم کەوێ هەر ئەوەتە[٧٤]

٧٥)- وتیان بە قەحبە: بۆ منالّت نابێ؟ وتی یەکێ ئەیکا و دوان تێکی ئەدات[٧٥]

٧٦)- وتیان پشیلە گوت بۆ دەرمان ئەشێ، ئەچوو ئەیشاردەوە[٧٦]

٧٧)- وتیان حوشتر بۆ بەرز ئەڕوانی؟ وتی دووربینی ئەکەم[٧٧]

٧٨)- وتیان حوشتر بۆ ملت درێژە؟ وتی دوربینی پێ ئەکەم[٧٨]

٧٩)- وتیان حوشتر برات بووە، وتی: بە من چی، باری من هەر چل مەنە[٧٩]

٨٠)- وتیان حوشتر لە کوێ بووی؟ وتی: لە حەمام، وتیان: بە قاچ و قولی گواویتا دیارە[٨٠]

٨١)- وتیان ڕانە، هەرۆ، بڕۆ، شوانت مری! وتی: خاوەنیشم بمرێ بێ شوان نابم[٨١]

٨٢)- وتیان ڕێوی چەند بەند ئەزانی؟ وتی: نەوەد و نۆ، چاکتریان پێچ کردنەوەیە[٨٢]

٨٣)- وتیان ڕێوی کێ شایەتتە؟ وتی کلکم[٨٣]

---

[٧٤] یەکێك ئەیلێ، کە ئەنگێکی لێ بگیرێ، واتە هەر ئەوە شك ئەبەم وە لەوە زیاتر لە توانام نییە.

[٧٥]

[٧٦] بە مەردومی زۆر سپڵە و پیسکە ئەوترێ کە هەموو شتێکی خۆی لە مەردوم بشارێتەوە.

[٧٧] واتە هەموو کەسێك پێویستە بە دووربینی.

[٧٨] واتە هەموو کەسێك پێویستە بە دووربینی.

[٧٩] واتە برا کە باری من سوك ناکا بە من چی.

[٨٠] بە یەکێك ئەوترێ کە درۆیەکی وا بکا کە پێی وابێ بۆی ئەچێتە سەر کەچی لە هەموو کەسێکیشەوە ئاشکرا بێ.

[٨١] یەکێك ئەیلێ، کە لای چەور بێ وە هەموو کەس چاوی تێوە بێ.

[٨٢] بەڵێ هەمیشە پێچ و پەنا پیشەی فێڵبازانە.

[٨٣] بە دوو کەس ئەوترێ، کە کەسیان پشتی ئەویکەی تریان نەدا لە زەوی، وە هەموو تاوان و کەم و کوڕییەکی بۆ پاساو بدا.

٨٤)- وتیان شەیتان خوا ئیمانت بداتێ؟ وتی درۆیەکی ناموستەجاب[٨٤]

٨٥)- وتیان شێتە بۆ شێتی؟ وتی: بۆم ئەلوێ[٨٥]

٨٦)- وتیان قرژاڵ! بۆ بە دووو سەر ئەڕۆیت؟ وتی بۆ جوانان هیچ عەیب نییە[٨٦]

٨٧)- وتیان کابرا ژنەکەت زۆر ئەگەڕێ، وتی ئەگەر زۆر بگەڕایە، ڕێی ئەکەوتە ماڵی خۆشمان[٨٧]

٨٨)- وتیان لە کوێ زەمی خۆت بیست، وتی: لەو شوێنەی کە هی دراوسێم تیا بیست[٨٨]

٨٩)- وتیان مام ڕێوی، خورما ئەخۆی یا مێوژ، وتی ئەمیش و ئەویش[٨٩]

٩٠)- وتیان مام گورگ ئەمڕۆ نۆرە ئاژەڵتە، وتی خۆ پێشم پەتییە، بەلام ناچارم هەر ئەبێ بچم[٩٠]

٩١)- وتیان مام گورگ بۆ نادیاری؟ وتی لە کاری خۆم شەرمەزارم[٩١]

٩٢)- وتیان مەیمون خوا غەزەبت لێ بگرێ، وتی: بمکا بە ئاسك[٩٢]

٩٣)- وتیان: بەردە بۆ بەردی؟ وتی: بەرد ئەبینم، بۆیە بومەتە بەرد[٩٣]

---

[٨٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ درۆیەك بکا، بەڵام لەبەر ئاشکرایی پێی نەکرێ، وە بە ناچاری دان بە راستەکەدا بنێ.

[٨٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە پشتیوانێکی ببێ پێی بنازێ، وە بەو بۆنەیەوە یاخی ببێ.

[٨٦] بە یەکێکی ناشرین ئەوترێ، کە کارێکی ناشرین بکات.

[٨٧] بە شتێك ئەوترێ کە لە حەد تێپەڕی بێ.

[٨٨] واتە کە لە ماڵە دراوسێکەت ناوی یەکێك برا، ناوی تۆش ئەبرێ.

[٨٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر تەمەعکار بێ، وە بە هیچ پڕ نەبێتەوە.

[٩٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە ئیشێکی پیا بدەیت، بە دڵ پێی خۆش بێ، وەکی تریش وا نیشان بدا کە پێی ناخۆشە.

[٩١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لەبەر شەرمەزاری خۆی دەر نەکەوێ.

[٩٢] واتە لەمە زیاتر چیم لێ بکات.

[٩٣] یەکێك ئەیلێ، کە خراپە لەگەڵ یەکێکا بکا، کە ئەویش خراپەی لەگەڵ ئەما کردبێ، من بۆیە دڵم رەقە لە عاستی ئەو، چونکە ئەویش لە عاستی من دڵی رەقە.

٩٤)- وتیان: بەهار ئەوەندە بۆ تەمەنت کورتە؟ وتی خوا غەزەب لە دراوسێی خراپ بگرێ[٩٤]

٩٥)- ورگ بە ژمارە ناخوا[٩٥]

٩٦)- ورگ دڕاوە[٩٦]

٩٧)- ورگی داوە بە شانیا[٩٧]

٩٨)- وشتر باری خورمایە و وشتر خوار ئەخوا[٩٨]

٩٩)- وشتی بە وشتی، خۆی چ نییە، دەعیەی کوشتی[٩٩]

١٠٠)- وڵات لە هەی هەی، کۆستە لە ئیش خۆی[١٠٠]

١٠١)- وڵاخی هەڵەشە، زوو خۆی ئەپڕوکێنێ[١٠١]

١٠٢)- وێرانە ماڵ! قوڕ بە چ لایەکتەوە بدەم[١٠٢]

---

[٩٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر باش بێ، بەڵام بەهۆی هێندێ شتی دەورووپشتییەوە هیچ چاکەیەکی لە دەست نەیەت .

[٩٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ بە ژمارە خواردنت بداتێ، واتە ورگ ئەیەوێ تێر بخوا، ئنجا ئەمە بە کەم یا بە زۆر.

[٩٦] بە مەردومی زۆرخۆر ئەوترێ.

[٩٧] بە چڵێسێك ئەوترێ، کە دووی خواردن بکەوێ.

[٩٨] بە یەکێك ئەوترێ کە یارای ئەوەی نەبێ بەهرە لە شتێك وەربگرێ.

[٩٩] بە مەردومێکی بە دەعیە و دەمار ئەوترێ کە لەو پێناوەدا زەرەرمەند بووبێ.

[١٠٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆی قسەی لێ بکەن، وە ئەو گوێی نەداتێ وە هەر لەگەڵ ئیشی خۆیا خەریك بێ.

[١٠١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ئیش و کارا هەڵەشەبێ، وە بە جرت و فرت ئیش بکات.

[١٠٢] واتە هەمووی بە قوڕ گیراوە، بە یەکێك ئەوترێ، کە لە هەموو روویەکەوە خراپ و ماڵ وێران بێ.

# پیتی هێ

١)- هات بنو، نەهات بنو[1]

٢)- هاتم شاخ بکەم، گوێم نایە بانی[2]

٣)- هاتینەوە سەر بای بەرە[3]

٤)- هازا گۆ و هازا مەیدان[4]

٥)- هالاوێك، خۆشترە لە پلاوێك[5]

٦)- هاڵە بە ئەنگورا ئەڕوانێ ئاو ئەگرێ[6]

---

[1] ئەم پەندە ئەگەر مەعنای وایە بە تەماڵی دانیشە و هەوڵ مەدە، وە چاو ببڕە سەر نفیشت (قەزا و قەدەر)ی خوا، ئەمە وانییە، وە پێچەوانەی فەرموودەی قورئانە کە ئەفەرموێ ( و ان لیس اللانسان الاماسعی) واتە هەر چی مەردوم بە هەوڵ و تەقەلای خۆی دەستی نەخات دەستی ناکەوێ، وە سەرنفیشت تابعی کۆششی ئادەمییە، وە ئەگەر مەعنای وایە نە بەهات زۆر کەیف خۆش و یاخی بە، وە نە بە نەهاتی زۆر خەمبار و خەفەتبار بە، زۆر جوانەوەرێکی ئایەتی (لا تاسوا علی مافاتکم، ولا تفرحوا بما اتاکم)ە، واتە نە لە سەر چووە خەفەت بخۆ، وە نە لەسەر هات زۆر کەیف خۆش و یاخی ببە.

[2] واتە هاتم خۆم دەرخەم کەچی گوێچکەشم دانا، بە یەکێك ئەوترێ، کە بۆ قازانجێك بچێ، کەچی تووشی زیان ببێ.

[3] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر قسەیەك بکا بیباتە سەر باسێکی تایبەتی.

[4] هازا: هژای عەرەبییە کە بە مەعنا ئەمەیە. بە یەکێك ئەوترێ کە لە شتێکا خۆی هەڵ بکێشێ، واتە فەرموو ئەگەر ئەتوانی بیکە.

[5] لە کاتێکا ئەوترێ، کە زۆر سەرمات بێ، وە هالاوێکی گەرمی ببینیت.

[6] واتە منداڵ چاو لە گەورە ئەکا.

٧)- هاڵە رۆی هەنگور ما، روو رەشی بۆ باخەوان ما[٧]

٨)- هامسای خراو لە گۆڕەوشار خراوترە[٨]

٩)- هاوڕێی بەدخوو، نەشت سووتێنێ رەشت ئەکات[٩]

١٠)- هاوڕێی گان ئەکا، ئەو بن کلکی ژان ئەکا[١٠]

١١)- هاوڕێیەکی باش لە دە برای خراپ باشترە[١١]

١٢)- هاوسێ لە هاوسێ، ئەگرێ سەراسێ[١٢]

١٣)- هاوین بەڕەی فەقیرە[١٣]

١٤)- هاوینان دۆ، زستانان لۆ[١٤]

١٥)- هەباسە، لە دیواخانان چ باسە؟[١٥]

١٦)- هەتا ئاو زۆرترە، ئاش خۆشترە[١٦]

١٧)- هەتا ئەیکەم بە سەر پاڵو، ئەبێتەوە بە ژێر پاڵو[١٧]

١٨)- هەتا تاڵی نەبینیت، خۆشی نابینیت[١٨]

---

[٧] هاڵە: بەرسیلەیە. هەنگور: ترێیە، واتە بەرسیلەی رەزەکان بوون بە ترێ و خۆش بوون، ئیتر باخەوان نایەڵێ کەس نزیکی باخەکەی بکەوێتەوە.

[٨] هامسا: دراوسێیە، گۆڕەوشار: سزای ناوگۆڕە.

[٩] واتە لەبەر چاوی خەڵق.

[١٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە هاوڕێکەی ئیشێکی باشی کردبێ، وە ئەم زۆری پێ ناخۆش بووبێ.

[١١] چونکە لەو بەهرەمەند ئەبێ، بەڵام لەم بەهرەمەند نابێ.

[١٢] سەراسێ: سەریەشەیە، واتە دراوسێ لە هێندێ دراوسێ وە تووشی سەریەشە ئەبێ.

[١٣] چونکە هەژار لە هاوینا هەر لە سەر زەوی دائەنیشێ.

[١٤] لۆ: گیایەکی بەهاریە وەك "کەما" گزرە ئەکرێ و لە زستانا ئەدرێ بە ئاژاڵ، زۆر بە شیرە.

[١٥] بە یەکێك ئەوترێ کە سەر بە دەرەوە بێ وە هاتوچۆی ماڵان بکا بە زۆری.

[١٦] چونکە بەرداش زۆر بە سووکی و خێرایی ئەسووڕێتەوە.

[١٧] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك، کە هەر چەند بەرزی بکاتەوە، ئەو هەر خۆی نزم بکاتەوە.

[١٨] چونکە تا رەنج نەدەیت گەنجت دەست ناکەوێ.

١٩)- هەتا جۆزەردان، سەد پاشا گەردان[١٩]

٢٠)- هەتا جوانی مەستی کە پیر بوویت سستی گەی خوا ئەپەرستی[٢٠]

٢١)- هەتا خۆم بووم بە بانانەوە، بەرتیلیان ئەدا و ئەپاڕانەوە[٢١]

٢٢)- هەتا دەڵێم و دەڵێمەوە، بەخۆ دەچم و دێمەوە[٢٢]

٢٣)- هەتا شەقەی قەڵماسکی نەبیست کێڵ و گەنمی نەکرد[٢٣]

٢٤)- هەتا گندۆر بوو، قەوم و قیلەمان زۆر بوو کە گندۆر بە سەر چوو، قەوم و قیلەش بەسەر چوو[٢٤]

٢٥)- هەتا گندۆر گندۆر بوو، خزمی مەگەلەك زۆر بوو، گندۆر هاتە بڕانێ، خزم هاتنە قڕانێ[٢٥]

٢٦)- هەتا کچەتیم دەبنە خانەدان، گونی کەرێ دەبێتە باینجان[٢٦]

---

[١٩] بە یەکێك ئەوترێ ، کە خەمی لێ هاتبێ وە تۆش دڵخۆشی بدەیتەوە پێی بڵێت: خوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە.

[٢٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە خوا پەرستی نەکات.

[٢١] یەکێك ئەیڵێ کە لێ کەوتبێ.

[٢٢] بە یەکێك ئەوترێ کە لەش قورس بێ، وە ئەو ئیشەی کە پیا ئەدرێ نەیکات.

[٢٣] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی لەك لە کاتی خەرمان و شەن کردنا، بای شەماڵی بۆ نایەت تا گەنمەکەی شەن بکات، لە سەر ئەوە تووڕە ئەبێ لە خوا و لە رقانا ئاسمان ئەداتە بەر قۆچەقانێ، بە رێکەوت دوای ئەوە با هەڵ ئەکا و خەرمانەکەی شەن ئەکات، ئنجا ئەم پەندە ئەڵێ:

گێل کردن: گێژکردنی دەغڵە بۆ گرتنی کا و پووشەکەی، واتە تا شەقەی قۆچەقانێت نەبیست، بات نە نارد بۆ شەن کردنی خەرمانەکە، وە بۆ جیا کردنەوەی کا و دانەکەی لە یەك.

[٢٤] یەکێك ئەیڵێ کە تا بوویێتی خزمان و برادەران هاتوچۆیان کردبێ، کە لەگەڵ نەیما ئەوانیش پێی لێ ببڕن.

[٢٥] بە کەسێك ئەوترێ کە لە کاتی بوونتا هاتوچۆت بکات و لە کاتی نەبوونیتا لێت دوورکەوێتەوە.

[٢٦] چونکە بە منالی بێ لغاو گەورە بووە.

٢٧)- هەتا لە سەر دەستان نەڕۆیت، قەدری پێیان نازانیت[٢٧]

٢٨)- هەتا لە مار نەدەیت، پێتەوە نادات[٢٨]

٢٩)- هەتا ما کراس نەبوو لە بەریا، کە مرد ئالآیان ئەکرد بە سەریا[٢٩]

٣٠)- هەتا ماڵ وێستابێ، مزگەوت حەرامە[٣٠]

٣١)- هەتا ماڵخۆ دزی گرت، دز ماڵخۆی گرت[٣١]

٣٢)- هەتا من وتم بسم الله ئەو وتی الحمدالله[٣٢]

٣٣)- هەتا نەترێ، چوارمەشقی دانانیشێ[٣٣]

٣٤)- هەتا هاتم بوو، هەر هات هاتم بوو، کە نەهاتم بوو، روی زوڵماتم بوو[٣٤]

٣٥)- هەتا هەتە، عالەم براتە[٣٥]

٣٦)- هەتە، درێغ مەکە، نیتە قەرز مەکە[٣٦]

٣٧)- هەتیو ئەگریا ئەی وت: بەشەکەم کەمە، سەگ پڕی پیا کرد و ئەویشی فڕاند[٣٧]

---

[٢٧] واتە نیعمەتی خوا تا هەیە نرخی نازانرێ، کە نەما ئنجا نرخی دەرئەکەوێ.

[٢٨] واتە تا تۆ زیان بە خەڵق نەگەیەنیت، کەسیش زیان بە تۆ ناگەیەنێ.

[٢٩] بە یەکێك ئەوترێ، تا لە ژیانایە هەژار و بێ ناو بێ، کە مرد بەیداخ لەسەر گۆڕەکەی هەڵدەن.

[٣٠] واتە تا لە خۆت و ماڵ و منداڵت نەمێنێتەوە، بەخێر ناشێ.

[٣١] بە یەکێك ئەوترێ، کە گلەیی یەکێکی بە سەرەوە بێ، کەچی لە پێش ئەوەی کە خاوەنی گلە گلەیی خۆی بکا، ئەم گلیەیی لەو بکا.

[٣٢] واتە تا من دەستم پێ کرد ئەو لێ بووەوە.

[٣٣] بە یەکێك ئەوترێ هەڵەیەکی زلی کردبێ و بۆگەنی دابێتەوە ئنجا پەندی وەرگرتبێ.

[٣٤] واتە تا ئەتوانیت مەیەڵە نەهاتی رووت تێ کا.

[٣٥] واتە تا ئەتوانیت مەیەڵە نەهاتی رووت تێ کا.

[٣٦] واتە کە بوت چروکی مەکە، کە نەتبوو دەست بڵاوی مەکە.

[٣٧] بە یەکێکی کەم دەست ئەوترێ، کە شتێکی کەمی ببێ، کەچی ئەویشی لە دەست بسێنن.

٣٨)- هەتیوچە، بە دەنكە جۆیەك ئەزمڕێ[٣٨]

٣٩)- هەتیوم كەو شوومم كە[٣٩]

٤٠)- هەر ئاهێ لە ئاگاهێ[٤٠]

٤١)- هەر ئەوتاس و حەمامەیە[٤١]

٤٢)- هەر بازی بازی، بە ریشی بابا بازی[٤٢]

٤٣)- هەر بەربەكەی كرێوەیە[٤٣]

٤٤)- هەر پەنجەیەك خوێنی خۆی لێ دێ[٤٤]

٤٥)- هەر پیاوێكە هەزار پیاو ئەهێنێ[٤٥]

---

[٣٨] چونكە هیچی بە خۆیەوە نەدیوە.

[٣٩] واتە لە ناو كۆمەڵی دواكەوتودا، هەتیو لە بەر هەژاری و بێكەسی سەرسەری دەر ئەچێ.

[٤٠] واتە هەر عەقڵە لە خەساری.

[٤١] بە یەكێك ئەوترێ، كە زۆر ئامۆژگاری بكەیت و هیچ نەگۆرێ و كاری تێ نەكا.

[٤٢] بە یەكێك ئەوترێ كە بیەوێ فروفێڵێكت لەگەڵ بكات.

[٤٣] ئەگێڕنەوە كە لە ناوچەی ئالان كابرایەك ئەبێ لە دێی (كرێوە) كە كوێرە دێیەكی بێ بەروبوومە هە رچەند كشت و كال ئەكات بە هیچ نابێ. ناچار سەری خۆی هەل ئەگرێ بەرەو گەرمیان، وە لەوێ دەست ئەكات بە كشت و كاڵ، كاتێك كە خەرمان هەڵ ئەگرێ ئەبینێ كشت و كاڵەكەی ئەویشی وەك كرێوە بێ برشتە، ناچار ئەگەڕێتەوە بۆ دێیەكەی خۆی، كە خەڵق و خوا لێی ئەپرسن ئایا دەست كەوتی ئیمساڵت چۆنە؟ ئەڵێ: بە خوا (هەر بەربەكەی كرێوەیە)، واتە هیچم زیاد نەكردووە، ئنجا ئێستا ئەم پەندە یەكێك ئەیڵێ، كە دەست لە كارێك هەڵ بگرێ، وە دەست بداتە كارێكی تر، یا لە شوێنێكەوە بچێ بۆ شوێنێكیتر كە بە باشتری بزانێ. كەچی ئەمیش هەر وەك ئەو وابێ.

[٤٤] یەكێك ئەیڵێ، كەمناڵی زۆری ببێ، وە یەكێكیان بمرێ، وە پێی بڵێن خەفەت مەخۆ، چونكە مناڵی ترت هەیە.

[٤٥] چونكە ئەویان لە هەزاران لاوە قازانجی هەیە بۆ كۆمەڵە و گەل، بەڵام ئەمیان هەرچی كەڵك بێ نییەتی.

٤٦)- هەر جارێ بە زستان ئەڵێن: سارد[٤٦]

٤٧)- هەر جارەلات، هەموو وڵات[٤٧]

٤٨)- هەر جێگەیەك پەری هەیە، دێوێكی لەگەڵ هەیە[٤٨]

٤٩)- هەر چەند ئەكا، نانی بە ئاو ناگا[٤٩]

٥٠)- هەر چەند بارم لارە، بەڵام راوێژم راستە[٥٠]

٥١)- هەر چەند مزگەوت رووخاوە، محرابی ماوە[٥١]

٥٢)- هەر چەندە پیرە، هەر كۆنە بە گیرە[٥٢]

٥٣)- هەرچی ئەخوا بە شەوی تاریك، رەنگی زەرد و قۆڵی باریك[٥٣]

٥٤)- هەرچی بەرز بفرێ، پیا ئەترێ[٥٤]

٥٥)- هەرچی بترسێ، ناخەلەسێ[٥٥]

٥٦)- هەرچی بچێتە شاری كوێران، ئەبێ دەست بە چاوەوە بگرێ[٥٦]

٥٧)- هەرچی بكرێ لە كیسەی خەلیفە دەر ئەچێ[٥٧]

---

[٤٦] بە یەكێك ئەوترێ، كە قسەیەك زۆر بڵێتەوە.

[٤٧] لات: بانەیەكە لە زەوی، كە جووتیار ئەیكێشێ بۆ ئەوەی تۆوی پێوە بكا و بی كێڵێ، واتە ئەگەر هەموو خاوەن زەوییەك هەموو جارێ بانەیەك بكێڵێ هەموو وڵات ئەكێڵرێ، وە پارچەیەك زەوی بە بەیار نامێنێتەوە.

[٤٨] واتە لە هەر شوێنێك پیاوێكی باشی خزمەت گوزار ببێ، ئەبێ ملۆزمێكی بۆ پەیدا بێ.

[٤٩] واتە تا نان پەیدا ئەكا ئاوی نییە، وە تا ئاو پەیدا ئەكا نانی نییە.

[٥٠] یەكێك ئەیلێ، كە هەژار و لێ قەوماو بێ، بەڵام ژیر و بە بیر و قسە زان بێ.

[٥١] بە شتێك ئەوترێ كە خۆی نەمابێ، بەڵام نوونەیەكی وای مابێ كە گەورەیی ئەو شتە نیشان بدات.

[٥٢] بە شتێكی كۆنی نیوداشت ئەوترێ، كە لە شتێكی تازە قایم تر بێ.

[٥٣] واتە بە شەو خواردنی قورس مەخۆ.

[٥٤] واتە لوت بەرزی لوت شكانی لە دوایە.

[٥٥] واتە ترسان رێی پێشكەوتن لە ئادەمی ئەگرێ.

[٥٦] واتە مەردوم ئەبێ بە پێی باوی ئەو شوێنەی كە تیایەتی بجوڵێتەوە.

٥٨)- هەرچی بکێڵیت، هەر ئەوە ئەدرویتەوە[٥٨]

٥٩)- هەرچی بوو بە رەفیقی قەلەندەری، لە ریش سمێڵ بوو بەری[٥٩]

٦٠)- هەرچی پەستەکی سوور بێ کاکە حەمەد نییە[٦٠]

٦١)- هەرچی ترسا، نەخەلەسا[٦١]

٦٢)- هەرچی چووە دێی ژنێ، دەستی بوو بە گونێ[٦٢]

٦٣)- هەرچی دشێکی لە گەڵایە، درەوشێکی لە پێدایە[٦٣]

٦٤)- هەرچی ریشی بێ سۆڤی نییە[٦٤]

٦٥)- هەرچی ریشی سوور بوو هەمزاغایە؟[٦٥]

٦٦)- هەرچی زۆر گەڕا، یا کۆل دێنێتەوە، یا زۆڵ دێنێتەوە[٦٦]

٦٧)- هەرچی فرەگەڕە، بەختی شەڕە[٦٧]

٦٨)- هەرچی کەر بێ ئەو کۆپانە[٦٨]

٦٩)- هەرچی لە دز بمێنیتەوە، رەماڵ ئەیبا[٦٩]

٧٠)- هەرچی لە دێزەدابێ، بە ئەسکوێ دەردێ[٧٠]

---

[٥٧] واتە ماڵ و منالّ هەرچی خەرج بکەن، هەر لە کیسەی خاوەن ماڵ دەر ئەچێ.

[٥٨] واتە چاك بکەیت و چاك و خراپ بکەیت خراپ دێتە رێت.

[٥٩] واتە هەرچی بوو بە هاورێی سەرسەری، نە رێزی ئەمێنێ و نە نرخی.

[٦٠] ئەم پەندە لە مەعنای پەندی شەشەمین دایە لە دوای خۆی.

[٦١] لە مەعنای پەندی هەشتەمایە لە پێش خۆیەوە.

[٦٢] واتە جێی خۆت بە جێ مەهێڵە بۆ ژن.

[٦٣] دش: خوشکی مێردە، واتە دش بۆ براژن وەك درەوشێك وایە کە بکرێ بە پێیا.

[٦٤] هەر وەك هەرچی مێزەری بە سەرەوە بێ مەلای خوێندەوار نییە.

[٦٥] واتە نەخێر.

[٦٦] واتە ئەوانەی زۆر ئەگەڕێن نەخوازەلا ژن یا شتی زۆریان دەست ئەکەوێ، یا ئابڕوویان ئەچێ.

[٦٧] چونکە قسە زۆر ئەبیەت، وە قسەی ئەم و ئەو زۆر ئەبات و ئەهێنێ.

[٦٨] بە یەکێك ئەوترێ، کە کوڕی رۆژگار بێ.

[٦٩] رەماڵ: فاڵ گرەوە و کتێب گرەوەیە، واتە هەر چی لە دز بمێنێتەوە دزێکی تر ئەیبا.

٧١)- هەرچی لە مال نەبێ، ژنی ئەدەن بە شوو[٧١]

٧٢)- هەرچی لە مشك بێ جەواڵ ئەدڕێ[٧٢]

٧٣)- هەرچی مەلا کەرۆ، منیش کەرۆ[٧٣]

٧٤)- هەرچی هاتە پێشم، پیا ئەکێشم[٧٤]

٧٥)- هەر چی بزنێکی ببێ، خەمێکی ئەبێ[٧٥]

٧٦)- هەر چی دەستت بۆ برد تیتکی بوو بیسمیلات لێکرد غەیبی نەبوو، ئیتر ئەوە ژنە[٧٦]

٧٧)- هەر چیایەك دۆڵی خۆی هەیە[٧٧]

٧٨)- هەر چیت دا، دیتەوە، هەر چیت خوارد ڕیتەوە[٧٨]

٧٩)- هەر چیت کردۆتە بەری بێژنگەکە، بیکەرە پشتی بێژنگەکە[٧٩]

---

[٧٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە بییەوێ نەنگی تۆ بلێ، واتە ئەگەر تۆ نەنگی من بلێیت: منیش هەموو نەنگێکی تۆ ئەلێم، وە هەرچی لە دێزەدا بێ، بە ئەسکوێ دەری ئەهێنم.

[٧١] واتە پیاوێك کە کەم بکەوێتە ناو ماڵ و منالی، ژنەکەی خراپ دەرئەچێ.

[٧٢] بە پیاو خراپێك ئەوترێ، کە منالەکەی وەك خۆی بێ، واتە زۆرتر پیاوی خراپ منالی خراپی ئەبێ.

[٧٣] ئەگێڕنەوە کە کابرایەکی هەورامی نوێژنەکەر، لە وەختی نوێژدارێی ئەکەوێتە مزگەوتێك ناچار کابرا دەستنوێژ ئەگرێ و ئەچێتە ریزی نوێژکەرەکانەوە، کە لێ ئەبێتەوە لێی ئەپرسن: چۆنت نوێژەکە کرد، ئەویش ئەلێ: (هەرچی مەلا کەرۆ منیش کەرۆ) واتە هەر چی مەلا کردی منیش کردم.

[٧٤] بە پیاو خراپێك ئەوترێ، کە منالەکەی وەك خۆی بێ، واتە زۆرتر پیاوی خراپ منالی خراپی ئەبێ.

[٧٥] واتە هیچ شتێك بە بێ خەم نابێ.

[٧٦] واتە هەر چی قژی بوو ژن نییە.

[٧٧] واتە هەر دەولەمەندێك هەژاری خۆی هەیە.

[٧٨] واتە هەرچی بکەیت بە خێر دۆزیتەوە، وە هەرچیش بخۆیت بە پیسی دای ئەنێتەوە.

[٧٩] بە یەکێکی ئەلێت کە هیچ خێرێکی بۆت نەبووبێ، واتە ئەو خێر و بێرەی کە تا ئێستا بۆت ناردووم لە ناو بێژنگا، لەمەولا بیکەرە پشتی بێژنگەکە.

٨٠)- هەر چییەکت هەیە مەیخەرە کەشتییەکەوە[٨٠]

٨١)- هەر خوا خوایە، دنیا کاوبایە[٨١]

٨٢)- هەر خوا لە قەرارەکەی دەمێنێ[٨٢]

٨٣)- هەر خواردنێك رینێکی ئەوێ[٨٣]

٨٤)- هەر خوایان یەکە[٨٤]

٨٥)- هەر دۆڵێکیان بە بایەك سپاردووە[٨٥]

٨٦)- هەر دارێك نەرم بێ کرم ئەیخوا[٨٦]

٨٧)- هەر دەرە لنگێکی لە ماڵێك پساوە[٨٧]

٨٨)- هەر دەرکێك بە کلیلی خۆی دەکرێتەوە[٨٨]

٨٩)- هەر دەوەنە ئەبێ بە دار، لە بنیا دائەنیشن فەقیر و هەژار[٨٩]

---

[٨٠] واتە هەموو دەست مایەکەت مەخەرە کسبێکەوە، نە وەك هەمووی بە زەرەر بڕوا لەو کسبەدا، وەك کەسێك کە هەر چێکی هەیە بیخاتە کەشتییەکەوە، وە کەشتییەکە نوقوم ببێ.

[٨١] واتە هەرچی ئەکەیت هەر بۆ رەزای خوای بکە، وە لە چوارچێوەی فەرموە و فەرمانی خوا مەچۆرە دەرەوە، وە هەرگیز بە دنیا هەڵ نەخەڵەتێت چونکە ژیانی دنیا وەك کایەك وایە کە بیدەیت بە دەم باوە، تا چاو ئەکەیتەوە نامێنێ.

[٨٢] واتە ئەو شتەی کە بڕیاری لە سەر داوە ئەبێ هەر ببێ.

[٨٣] واتە چۆن خواردنێکت خوارد ئەبێ لە پاشا بە نقەنق دای بنێیتەوە، کە شتێکیشت لە یەکێك وەرگرت بە هەر ناوێکەوە بێ، ئەبێ لە پاشا خێری بۆ بدەیتەوە.

[٨٤] بە دوو شت ئەوترێ، کە زۆر لە یەك جیابن.

[٨٥] واتە هەر کەسێك چی ئەزانێ ئەبێ هەر لەوە بدوێ.

[٨٦] واتە مەردوم لە جیهانا نابێ ئەوەندە نەرم بێ هەموو کەس تەمەعی تێ بکات.

[٨٧] بە ژنی گەڕۆك ئەوترێ.

[٨٨] واتە هەر گرێیەك لە ژیاندا بەجۆرێکی تایبەتی خۆی ئەکرێتەوە، وە هەر دەردێك بە دەرمانێك تیمار ئەکرێ.

[٨٩] واتە هەر شتی بچوکە گەورە ئەبێ.

٩٠)- هەر دوو تای برنجە[٩٠]

٩١)- هەر رۆژێ کاری خۆی وا لە تەك خۆیا[٩١]

٩٢)- هەر رۆژە با یا بارانە، کەچەل سەر شۆڕانە[٩٢]

٩٣)- هەر رینێك لە خواردنێکە[٩٣]

٩٤)- هەر ڕێیێ لە بۆ جێیێ[٩٤]

٩٥)- هەر سەرێك سەودایەکی هەیە[٩٥]

٩٦)- هەر سیر بخۆ و زوڕنا لێدە[٩٦]

٩٧)- هەر عەقڵە لە خەسارێ[٩٧]

٩٨)- هەر قسەیەك لە دڵ دەرێ لە دڵا جێگە ئەگرێ[٩٨]

٩٩)- هەر قوڕی زستانە پاشەڵ پیس ئەکا[٩٩]

١٠٠)- هەر کەس بانی فرەترە، بەفری زۆرترە[١٠٠]

---

[٩٠] بە یەکێك ئەوترێ بە تەوسەوە کە یەکێکی لە یەکێکی تر پێ باشتر بێ، واتە وانییە وەك تێ گەیشتوویت هەر دووکیان وەك یەکن.

[٩١] واتە ئیشی ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ.

[٩٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە هەر رۆژە نە رۆژێ بە بۆنەی شتێکەوە خۆی بشوا، وەیا خۆی بگۆڕێ.

[٩٣] واتە هەموو ناخۆشییەك سەرەنجامی خۆشییەکە.

[٩٤]

[٩٥] واتە هەر کەسێك جۆرە بیرێکی هەیە.

[٩٦] واتە ئەو شتەی کە بە تەمای بوویت بۆ تۆ نابێ.

[٩٧] واتە تا هەڵە نەکەیت و ئازار و زیان نەبینیت دەرس وەرناگریت.

[٩٨] واتە قسە کە لەدڵ دەرچوو ئەدا لە دڵ، بەڵام کە لە دەم دەرچوو ناگەتە دڵ.

[٩٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە درێژەی ببێ لە سەر کردنی کارێك کە زۆر پەسەند نەبێ، وە پێی بڵێن: دەست لەم کارە هەڵگرە، چونکە جوان نییە ئەویش ئەڵێ: خۆ بێ شەرعی نییە، ئەویش ئەم پەندەی پێ ئەڵێ، واتە قوڕی زستانیش عەفوە تا رادەیەك، بەڵام کە زۆر بوو ئەبێ بەشتێکی ناپەسەند کە پاشەڵ پیس ئەکا.

[١٠٠] واتە تا بەشت لە جیهانا زۆرتر بێ، ئەرکت زیاترە.

١٠١)- هەر کەس بە تەمای خاڵۆ و مامۆ بێ، ئێوارە بێ نان شەو بێ دۆبێ[١٠١]

١٠٢)- هەر کەس بە دەمتەوە پێکەنێ، وە نەبێ رازی بێ[١٠٢]

١٠٣)- هەر کەس بە گژ راستا بڕوا، زەی ئەخوا[١٠٣]

١٠٤)- هەر کەس بە لێفەی خۆی ئەنوێ[١٠٤]

١٠٥)- هەر کەس بە یاری خۆی هەڵدەڵێ[١٠٥]

١٠٦)- هەر کەس بە یاری خۆیدا هەڵدەڵێ[١٠٦]

١٠٧)- هەر کەس بەشی خۆی دەزانێ، بەجێ نەمێنێ لە کاروانێ[١٠٧]

١٠٨)- هەر کەس ببینێ مورغ و ماهی، عەجەب سەری ناگا بە پادشاهی[١٠٨]

١٠٩)- هەر کەس پێڵاوە شرێکی لە دیوانا بێ ترى پێوە لێ ئەدا[١٠٩]

١١٠)- هەر کەس خانەدارۆ، خەبەردارۆ[١١٠]

١١١)- هەر کەس دایکی نانەوا بێ، لە برسانا نامرێ[١١١]

١١٢)- هەر کەس دەست بۆ دەمی خۆی ئەبا[١١٢]

---

[١٠١] ئەم پەندە نزایە لەو کەسانەی کە بە تەمای خزم و خوێشی خۆیان بن، واتە پێویستە لە سەر هەموو کەسێك کە هەر پشت بە خۆی و بە هەوڵ و تەقەلای خۆی ببەستێ، نەك بە خزم و خوێش.

[١٠٢] واتە بە هەموو پێکەنینێك باوەڕ مەکە.

[١٠٣] واتە ئەڕوخێ و ژێر ئەکەوێ.

[١٠٤] واتە هەر کەسە لەسەر حسابی خۆی ئەژی.

[١٠٥] واتە هەر کەسە گۆرانی بە سەر یاری خۆیا هەڵ ئەدا.

[١٠٦] واتە دڵداری خۆی پێ جوانە.

[١٠٧] واتە هەر کەس بە پێی خۆی قازانج و سودی خۆی ئەزانێ.

[١٠٨] واتە هەر کەس لە خوا مورغ و ماسی ببینێ تووشی خێر ئەبێ.

[١٠٩] بە یەکێك ئەوترێ، کە خزمێکی کار بەدەستی ببێ لە لای دەوڵەت یا لای ئاغا.

[١١٠] تەماشای پەندی (ئەگەر خانەدانیت لە خانەڕانان خەبەرداریت) بکە.

[١١١]

[١١٢] واتە هەر کەس قازانجی خۆی ئەوێ.

١١٣)- هەر كەس دشی لە دێدایە، درەوشێكی لە پێدایە[١١٣]

١١٤)- هەر كەس زۆر بخوا، زۆر ناژی[١١٤]

١١٥)- هەر كەس زۆر گەڕا، زۆر ئەبینێ[١١٥]

١١٦)- هەر كەس سەرەن بكا، هێلكەی ئەكەن[١١٦]

١١٧)- هەر كەس سەلا لە چاوی خۆی[١١٧]

١١٨)- هەر كەس كەر بێ ئەو كورتانە[١١٨]

١١٩)- هەر كەس كردی بێگانە بە خوێش، كردی بە سەریا خۆڵ بە دەستی وێش[١١٩]

١٢٠)- هەر كەس كوێر نانە، كوێر ئیمانە[١٢٠]

١٢١)- هەر كەس گوێ ئاگری خۆی رۆشن بێ[١٢١]

١٢٢)- هەر كەس گوێز لە باری خۆی ئەژمێرێ[١٢٢]

١٢٣)- هەر كەس لە ئاشێ ئەكا[١٢٣]

---

[١١٣] دش: خوشكی مێردە، واتە دش هەمیشە بۆ خزمەتی براكەی سەر كۆنەی براژنەكەی ئەكا.

[١١٤] واتە زۆر خواردن باش نییە.

[١١٥] واتە زیرتر ئەبێ.

[١١٦] سەرەن: كەوی شت بێژانەوەیە، واتە هەر كەسی مەردوم لە كەو بدا و نەنگی گەورەی باس بكا، مەردومیش ئەو لە هێلەك ئەدەن، وە نەنگی ورد و درشتی بەرچاو ئەخەن.

[١١٧] واتە هەر كەس خۆی و بیر و باوەڕی خۆی.

[١١٨] بە یەكێك ئەوترێ، كە كوڕی وەخت بێ.

[١١٩] واتە هەرگیز نهێنی خۆت مەدەرە دەست بێگانە.

[١٢٠] كوێرنان: رژدی چروكە.

[١٢١] واتە كەس تا سەر بە كەلكی كەس نایەت.

[١٢٢] واتە هەر كەس بە پێی دڵ و دەروونی خۆی قسە ئەكا.

[١٢٣] بە كوڕێك ئەوترێ، كە كەس گوێ لە كەس نەگرێ، وە هەر كەسە بۆ خۆی قسە بكا.

١٢٤)- هەر کەس لە بەڕەی خۆی پێ زیاتر ڕاکێشێ ئەی بڕنەوە[١٢٤]

١٢٥)- هەر کەس لە خۆی بگرێتەوە، خواش لەوی ئەگرێتەوە[١٢٥]

١٢٦)- هەر کەس لە کراسی خۆیا پیاوە[١٢٦]

١٢٧)- هەر کەس لە ماڵی خۆیا سەری شا ئەبڕێ[١٢٧]

١٢٨)- هەر کەس لە هەرچی بترسێ لێی ناخەلەسێ[١٢٨]

١٢٩)- هەر کەس نانی گاور بخوا، سلاوات لە دیداری گاور ئەدا[١٢٩]

١٣٠)- هەر کەس نانی ناوچەوانی خۆی ئەخوا[١٣٠]

١٣١)- هەر کەس نەفسی بوو، کەسی نەبوو[١٣١]

١٣٢)- هەر کەس نەیکرد بە قسەی گەوران بە قنگەوە کەوتە ناو کەندەلان[١٣٢]

١٣٣)- هەر کەس هات ئەحواڵی دایکی پرسی، یەکێك نەبوو ئەحواڵی باوکی بپرسێ[١٣٣]

١٣٤)- هەر کەس هەرزانی و گرانی لە ماڵی خۆیایەتی[١٣٤]

١٣٥)- هەر کەس هەرچی بچێنێ هەر ئەوە دێتە ڕێی[١٣٥]

---

[١٢٤] واتە نابێ کەس لە سنوری خۆی بچێتە دەرەوە.

[١٢٥] کەواتە تا بت بێ، لە خۆت و ماڵ و منالّت مەگرەرەوە.

[١٢٦] واتە نابێ کەس بە چاوی سووك تەماشای کەس بکا.

[١٢٧] واتە هەموو کەسێك ئەتوانێ قسەی زل زل بکا لە شوێنێکا کە کەس ئاگای لێ نەبێ، ئنجا ئاخۆ ئەمە ئازایەتی پێ بلێین؟ بێگومان نە، ئازایی لەوەدایە کە بتوانێ ڕوو بە ڕوو قسە بکا و بێتە پێشەوە.

[١٢٨] چونکە ترسان سەر لە مەردوم ئەشێوێنێ.

[١٢٩] واتە هەر کەس پیاوەتی دی لە یەکێکەوە، ئەبێ سوپاسی بکا.

[١٣٠] کەواتە خۆت و ناوچەوانی خۆت.

[١٣١] واتە یەکێك کە هەر نەفسی خۆی مەبەس بێ، کەسیش ئەوی مەبەس نییە.

[١٣٢] کەواتە تا ئەتوانی لە قسەی گەورە دەرمەچۆ.

[١٣٣] واتە هەموو منالێك پەیوەیستی لەگەڵ دایکی زۆرترە وەك لەگەڵ باوکی.

[١٣٤] ئارەزوو بکا هەرزانییە و ئارەزوو بکا گرانییە.

[١٣٥] کەواتە هەر چاکە بچێنە.

١٣٦)- هەر کەس هەڵ ئەستا خولەی ئەگا، خولەش بلەی ئەگا[١٣٦]

١٣٧)- هەر کەسێ بە پێی عەقڵی خۆی قسەی لەگەڵ ئەکرێ[١٣٧]

١٣٨)- هەر کەسێ بی کوژێ دەستی سەوز ئەبێ[١٣٨]

١٣٩)- هەر کەسێ پەڕی تاوسی ئەوێ، ئەبێ بڕوا بۆ هێندستان[١٣٩]

١٤٠)- هەر کەسێ پەز بێ، گورگ ئەیخوا[١٤٠]

١٤١)- هەر کەسێ چاڵ بۆ یەکێك هەڵکەنێ خۆی تێی ئەکەوێ[١٤١]

١٤٢)- هەر کەسێ کەسە، حەرفێکی بەسە[١٤٢]

١٤٣)- هەر کەسێ لە خۆی بە شکە، پڕ قنگی مارو مشکە[١٤٣]

١٤٤)- هەر کەسە بە زمانی خۆی لەگەڵی بدوێ[١٤٤]

١٤٥)- هەر کەسە بە کەسێك ئەگیرێ[١٤٥]

١٤٦)- هەر کەسە چاوەڕوانی توێشوی خەڵق بێ لە برسا ئەمرێ[١٤٦]

١٤٧)- هەر کەسێ فرە گەرە، بەختی شەڕە[١٤٧]

١٤٨)- هەر کێو بە کێو ناگا[١٤٨]

---

[١٣٦] بە یەکێك ئەوترێ، کە ببێ بە حیزی حیزان گاو.

[١٣٧] خوێندەوار بە پێی خۆی و نەخوێندەوار بە پێی خۆی خوێندەواریش نزمیان بە پێی خۆی و بەرزیان بە پێی خۆی، ئەگینا لە قسەکەت ناگەن.

[١٣٨] بە یەکێکی زۆر خراپ ئەوترێ، کە سەرتاپێ زەرەر و زیان بێ بۆ کۆمەڵە.

[١٣٩] واتە هەموو شتێك بە پێی خۆی ئەبێ هەوڵی بۆ بدرێ.

[١٤٠] واتە ئەوەندە بەسزمان مەبە تەمەعت تێ بکرێ.

[١٤١] کەوابوو با کەس چاڵ بۆ کەس هەڵ نەکەنێ.

[١٤٢] کەواتە تا ئەتوانی هەر کەس بە.

[١٤٣] واتە هەر کەسێك ناپاك، وە لەخۆی دوودڵ بێ، دەرونی پڕە لە ترس و بیم.

[١٤٤] واتە بە پێی ژیری خۆی بیدوێنە.

[١٤٥] کەواتە پیاو ناس بە.

[١٤٦] کەواتە بە تەمای هیچ مەبە، وە هەر پشت بە هەوڵ و تەقەلای خۆت ببەستە.

[١٤٧] چونکە کە زۆر گەڕا پێویستی بۆ بەجێ نامێنرێ، ئەو حەلە پەکی ئەکەوێ.

[١٤٨] واتە هەموو دوو کەسێك ئەگونجێ بە یەك بگەن.

١٤٩)- هەر گوێرەکەیە ئەبێ بە گا[١٤٩]

١٥٠)- هەر لە بڕ ناکاتەوە[١٥٠]

١٥١)- هەر لە عەرش هەتا قورش، کەس بە دۆی خۆی نالێ ترش[١٥١]

١٥٢)- هەر ملەیەك سەختە بڕۆ بیگرە[١٥٢]

١٥٣)- هەر مویەکی بە سالێك رواوە[١٥٣]

١٥٤)- هەر نەهاتیت هەر نەهاتیت، تا وەك دومەڵ لە جێی ناسك دەرهاتیت[١٥٤]

١٥٥)- هەر هەورازێك نشێوییەکی هەیە[١٥٥]

١٥٦)- هەر هێندە هەڕوەجێیان، شتێکت بخەنە بەر پێیان[١٥٦]

١٥٧)- هەڕەشە نیوەی مێردییە[١٥٧]

١٥٨)- هەردی بە سەر بەردێوە نەماوە[١٥٨]

١٥٩)- هەرزان بەهایی بێ مەلامەت نییە[١٥٩]

١٦٠)- هەرزان کڕی، هەمبان دڕ[١٦٠]

١٦١)- هەرزە چەنەیان خستە ناو ئاگر، ئەیوت دارەکەی تەڕە[١٦١]

---

[١٤٩] واتە هەموو شتێکی منالْ بەرە بەرە گەورە ئەبێ.

[١٥٠] واتە زۆر کەڕەواڵە و هیچ نەزانە.

[١٥١] واتە هیچ کەسێك چاو راو لەشتی خۆی ناکات.

[١٥٢] بە یەکێك ئەوترێ، کەهەڕەشەت لێ بکات، واتە چیت لە دەست دێ درێغ مەکە.

[١٥٣] واتە زۆر وریا و چاو کراوەیە.

[١٥٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە وەختێکی ناوەختا بچێتە لای یەکێك.

[١٥٥] واتە هەموو بەرزبوونەوەیەك نزم بوونەوەیەکی لە دوایە.

[١٥٦] واتە ئەوەندە مەچۆرە شوێنان کە بێڕێز بیت.

[١٥٧] واتە زۆر شت هەر بە هەڕەشە و چاو سوور کردنەوە جێبەجێ ئەبێ.

[١٥٨] بە شتێك ئەڵێن، کە تێك چووبێ، وە هیچی بە سەر هیچەوە نەمابێ.

[١٥٩] واتە شت تا بێکەڵك نەبێ هەرزان نابێ، هەر وەك شت تا زۆر چاك نەبێ داوای گرانی لێ ناکەن.

[١٦٠] بە یەکێك ئەڵێن، کە شتی خراپ و هەرزانی وا بکڕێ کە بنی هەمانە بدڕێنێ.

[١٦١] هەرزەچەنە: چەنەبازە.

١٦٢)- هەرگی نم دراو، ئاوێکی بەسە[١٦٢]

١٦٣)- هەرمێ دارە هەروا دیارە[١٦٣]

١٦٤)- هەرمێ دارە و هەروا دیارە[١٦٤]

١٦٥)- هەزار تەڵەی بە کلك تەقاندوە[١٦٥]

١٦٦)- هەزار دۆست کەمە، دوژمنێك زۆرە[١٦٦]

١٦٧)- هەزار دۆست و دوژمنێك[١٦٧]

١٦٨)- هەزار دۆست، نەك یەك دوژمن[١٦٨]

١٦٩)- هەزار گۆزە دروست ئەکا، یەکێکی دەسوی نییە[١٦٩]

١٧٠)- هەزار گوناح و یەك تەوبە[١٧٠]

١٧١)- هەزار فاتحە بە موچەیەك حەڵوا نابێ[١٧١]

١٧٢)- هەزار فاکم بە فیکێکی[١٧٢]

---

[١٦٢] بەیەکێك ئەوترێ، کە لەوە پێش لە یەکێك تووڕە بووبێ و قسەی پێ وتبێ، وە دووبارە بییەوێ قسەی تری پێ بڵێتەوە، واتە زۆر خەستی مەکە، وە سەری مەکەرەوە سەر، با نەتەقێ.

[١٦٣] بە شتێك ئەوترێ، کە ئاشکرا و نمایان بێ.

[١٦٤]

[١٦٥] واتە وەك ڕێوی فێڵبازە.

[١٦٦] واتە تا دوژمن کەمتر بێ باشترە.

[١٦٧] واتە تا دوژمن کەمتر بێ باشترە.

[١٦٨] واتە تا دوژمن کەمتر بێ باشترە.

[١٦٩] بە یەکێك ئەوترێ، کەهەموو ئیشێکی نیوە و نیوەچڵ بێ.

[١٧٠] یەکێك ئەیڵێ بە یەکێك کە هەڵەیەکی زلی کردبێ دەربارەی، واتە پەشیمانم لە گوناهەکەم.

[١٧١] بە یەکێکی چروك ئەوترێ کە لە جیاتی هەموو خێری گەرمە گۆڕ و شەو جومعانەیەك هەر فاتحە بخوێنێ و بۆ مردوەکانی، واتە خێری هەزار فاتحە بە خێری موچەیەك حەڵوا نابێ کە بدرێ بە هەژارێکی برسی.

[١٧٢] واتە زۆر زۆر زانە، وە هەرگیز دەرەقەتی نایەم.

١٧٣)- هەزار قەزوان بە گوێزێك نابێ[١٧٣]

١٧٤)- هەزار قوڕ و چڵپاوی بە قنگا هەڵپژاوە[١٧٤]

١٧٥)- هەزاری بمرێ لە باوان، کلی نابڕێ لە چاوان[١٧٥]

١٧٦)- هەزرا قەزوان بتەقێنیت بە گوێزێك ئەتگەمێ[١٧٦]

١٧٧)- هەژاری کراسی ئاگرینە[١٧٧]

١٧٨)- هەسان ئەدا لە بنی پێی[١٧٨]

١٧٩)- هەستان و مەستانن، بە زمانی یەکدی دەزانن[١٧٩]

١٨٠)- هەشت بێ و لە مشت بێ نەك نۆ بی و نەبێ[١٨٠]

١٨١)- هەڵە کۆکە پرچنە، چۆرە چۆرەم کەوتە بنە، چیمە لەم ماڵ و ژنە[١٨١]

١٨٢)- هەڵمەتە کاسەیە[١٨٢]

---

[١٧٣] یەکێکی دەست دار ئەیڵا بە یەکێکی دەست کورت، واتە تۆ بە ساڵێك چەند پەیدا ئەکەیت، من بە رۆژێك ئەوەندە پەیدا ئەکەم.

[١٧٤] واتە لە دنیادا زۆر چاك قاڵ بووە.

[١٧٥] بە ژنێك ئەوترێ، کە هەمیشە هەر خەریکی خۆ جوان کردن بێ وە بێ هیچ شتیك دەستی لێ هەڵ نەگرێ.

[١٧٦] یەکێکی دەست دار ئەیڵا بە یەکێکی دەست کورت، واتە تۆ بە ساڵێك چەند پەیدا ئەکەیت، من بە رۆژێك ئەوەندە پەیدا ئەکەم.

[١٧٧] واتە لەبەر هەر کەسێکا بێ ئارامی نابێ.

[١٧٨] واتە بە قسەی خۆش ئەیەوێ ئیخفالی بکات.

[١٧٩] بە دوو کەسی وا ئەوترێ کە لە زمانی یەکتری بگەن.

[١٨٠] واتە کەمی حازر، لە زۆری قەرز باشترە.

[١٨١] ئەگێڕنەوە کە هەڵەکۆك لە سەرەتای بەهارا، کە سەر دەردێنێ لە زەوی، تەماشا ئەکات وا بەفر جیهانی داگرتووە، بە شاخ و داخ و دەشت و دەرەوە، ئەمیش لە ژێرەوە بە بەفرەکە ئەڵێ بم خوازە، ئەویش ئەڵێ: تۆ وا تازە لە دایك بوویت، وە سەرت لە زەوی دەرهێناوە، من چی بخوازم.؟ کە بەهار گەرم ئەبێ و هەڵەکۆك بەرز ئەبێتەوە لە بەفرەکە، ئنجا پێی ئەڵێ بم خوازە ئەویش ئەڵێ: (هەڵەکۆکە پرچنە، چۆڕە چۆڕەم کەوتە بنە چیمە لەم ماڵ و ژنە؟)

[١٨٢] بە یەکێك ئەوترێ، کە بە بێ ورد بوونەوە و بیرکردنەوە دەست بداتە هەموو کارێك.

١٨٣)- هەم ئێشەكە و هەم دۆشەك[١٨٣]

١٨٤)- هەم دیداری دۆست هەم شكاری پۆست[١٨٤]

١٨٥)- هەم زیارەت، هەم تجارەت[١٨٥]

١٨٦)- هەمبو هەمبو پارە ناكا هەیەتم هەیەتم تەواوە[١٨٦]

١٨٧)- هەمەوەندا نەگبەتیت بۆ، ئەحەی رابی تاقیب كەرت بۆ[١٨٧]

١٨٨)- هەمزە لە هەباسی چی ترە لە تەوراسی چی[١٨٨]

١٨٩)- هەموو ئەڵێی پشقلی بزنێكن[١٨٩]

١٩٠)- هەموو جارێ گۆزە بە ساغی ناگەڕێتەوە لە كانی[١٩٠]

١٩١)- هەموو جاشی ماكەرێكن[١٩١]

١٩٢)- هەموو خوڕەیەك ئاو نییە، هەموو چنراوێك جاو نییە[١٩٢]

١٩٣)- هەموو دەردێك دەرمانی هەیە گەوجی نەبێ[١٩٣]

---

[١٨٣] بە شتێك ئەوترێ كە بە هەموو بارێك بە كار بێنرێ.

[١٨٤] ئەم پەندە لە مەعنای ( هەم زیارەت، هەم تجارەت).

[١٨٥] بە زیارەتێك ئەوترێ، كە قازانجێكی تیابێ.

[١٨٦] واتە قسە لە ئێستا بكە نەك لە رابوردوو.

[١٨٧] بە پیاوێكی گەورە یا تیرەیەكی ناودار ئەوترێ، كە كوڵۆڵی رووی تێ كردبێ، وە مەردومی هیچ و پووچ بگەڕێ بۆ زیان پێ گەیاندنی.

[١٨٨] بە یەكێك ئەوترێ، كە قسەیەكی وا بكات كە هیچ پەیوەستی نەبێ لەگەڵ ئەو باسەی كە ئەكرێ.

[١٨٩] بە چەند خوشك و برایەك ئەوترێن، كە هەموو ناشرین بن.

[١٩٠] بە یەكێك ئەوترێ، كە لە كارێكا تێ شكابێ، واتە مەردوم لە هەموو كارێكا هەر قازانج ناكات، بەڵكو هێندێ جاریش زەرەر ئەكات.

[١٩١] بە چەند شتێكی خراپ ئەوترێ، كە هیچیان لە هیچیان چاكتر نەبێ.

[١٩٢] واتە هەموو هیوایەك كە بۆی ئەچیت دەستت ناكەوێ.

[١٩٣] بە یەكێك ئەوترێ، كە قسەیەكی ناشرین یا كردەوەیەكی ناپەسندت لەگەڵ بكات.

١٩٤)- هەموو رۆژێ گا نامرێ گۆشت هەرزان بێ[194]

١٩٥)- هەموو رۆژێ کەر نامرێ سێ کفتە بەدینارێك بێ[195]

١٩٦)- هەموو رەنگێکی تەواوە تەنیا پەمەیی ماوە[196]

١٩٧)- هەموو رێیەك ئەچێتەوە بۆ بانە[197]

١٩٨)- هەموو رێیەك ئەچێتەوە سەر دێیەك[198]

١٩٩)- هەموو زەردێك ئاڵتون نییە[199]

---

[194] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك لە ئێران رێی ئەکەوێتە لۆقەنتەیەك سێ کفتەی بۆ ئەهێنن بە دینارێك ( قرانی ئێرانی – کە شاییە لێی نووسراوە دینار، کەواتە دینار شاییەکە) سبەینێ کابرا ئەچێتەوە بۆ ئەو لۆقەنتەیە وە داوای کفتە ئەکات، تۆزێ ئاو و کفتەیەکی بچوکی بۆ ئەهێنن بە دەقاتیپارەکەی دوێنێ ئەمیش ئەڵێ: بۆچی دوێنێ وا هەرزان و ئەمڕۆ وا گرانە؟ ئەویش ئەڵێ: ( هەموو رۆژێ کەر نامرێ سێ کفتە بە دینارێك بێ) بەمە تێ ئەگات کە کفتەی دوێنێ لە گۆشتی کەری تۆپیو بووە. ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە فەرقێك ببینێ لە شتێکا بە هەرزانی و گرانی، یا بە زۆری و کەمی لەبەر شتێك کە لێی بێ ئاگا بێ.

[195] ئەگێڕنەوە کە کابرایەك لە ئێران رێی ئەکەوێتە لۆقەنتەیەك سێ کفتەی بۆ ئەهێنن بە دینارێك ( قرانی ئێرانی – کە شاییە لێی نووسراوە دینار، کەواتە دینار شاییەکە) سبەینێ کابرا ئەچێتەوە بۆ ئەو لۆقەنتەیە وە داوای کفتە ئەکات، تۆزێ ئاو و کفتەیەکی بچوکی بۆ ئەهێنن بە دەقاتیپارەکەی دوێنێ ئەمیش ئەڵێ: بۆچی دوێنێ وا هەرزان و ئەمڕۆ وا گرانە؟ ئەویش ئەڵێ: ( هەموو رۆژێ کەر نامرێ سێ کفتە بە دینارێك بێ) بەمە تێ ئەگات کە کفتەی دوێنێ لە گۆشتی کەری تۆپیو بووە. ئنجا ئێستا ئەم پەندە بە یەکێك ئەوترێ کە فەرقێك ببینێ لە شتێکا بە هەرزانی و گرانی، یا بە زۆری و کەمی لەبەر شتێك کە لێی بێ ئاگا بێ.

[196] بە تەوسەوە بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی بە دەستەوە بێ هێشتا نیوە و نیوەچڵ بێ ، کەچی وابزانێ تەواوە، تەنیا شتێکی کەمی ماوە.

[197] بە چەند قسەیەك ئەوترێ، کە هەموو بچنەوە سەر یەك.

[198] بە چەند قسەیەك ئەوترێ، کە هەموو بچنەوە سەر یەك.

[199] واتە بە دیمەن دەست خەرۆ مەبە.

٢٠٠)- هەموو سەرەوژوورییەك سەرەوخوارییەكی هەیە[٢٠٠]

٢٠١)- هەموو شت درۆیە، شەرت چاو و برۆیە[٢٠١]

٢٠٢)- هەموو شت لە باریكی ئەپچڕێ، مێرد لە قایمی[٢٠٢]

٢٠٣)- هەموو شت لە بوون ئەكرێ[٢٠٣]

٢٠٤)- هەموو شتێك بە خوێ، خوێش بە مەعنا[٢٠٤]

٢٠٥)- هەموو شتێكم لە كۆڵە، نۆرەی زوڕنا و دەهۆڵە[٢٠٥]

٢٠٦)- هەموو گون رەشێ تووشی گون رەشی خۆی ئەبێ[٢٠٦]

٢٠٧)- هەموو گیانی سست و مستە، جێی خواردنەكەی دروستە[٢٠٧]

٢٠٨)- هەموو گیای مردنین[٢٠٨]

٢٠٩)- هەموو كانی ئاوی تێدایە، بەڵام هەموو ئاوێك ناخورێتەوە[٢٠٩]

٢١٠)- هەموو كەس ئاغای ماڵی خۆیەتی[٢١٠]

---

[٢٠٠] بە یەكێك ئەوترێ ، كە لە رووی زۆر و ستەم و دەست درێژییەوە، دەوڵەمەند و یاخی بووبێ، واتە هەموو بەرز بوونەوەیەكی وا، نزم بوونەوەیەكی لە دواوەیە.

[٢٠١] واتە جوانی چاو و برۆ زۆر شتی تر دائەپۆشێ.

[٢٠٢] واتە هەموو شتێك بە هۆی باریكییەوە ئەپچڕێ تەنیا پیاو نەبێ كە بە هۆی قەبەییەوە ئەپچڕێ.

[٢٠٣] واتە كە نەبوو هیچ ناكرێ.

[٢٠٤] واتە هەموو شتێك ئەندازەیەكی تایبەتی هەیە، كە لەو ئەندازەیە تێپەڕی خراپ ئەبێ.

[٢٠٥] یەكێك ئەیلێ كە سەرەڕای ئیش و كاری خۆی، ئیشی تریشی هاتبێتە سەر.

[٢٠٦] گون رەش: بە یەكێك ئەڵێن كەملۆزمی یەكێكی تر بێ، واتە هەموو ملۆزمێك خوا ملۆزمێكی بۆ ئەنێرێ.

[٢٠٧] بەیەكێك ئەوترێ كە بۆ هەموو شتێك نەخۆش بێ، بەڵام بۆ خواردن ساغ بێ.

[٢٠٨] واتە هەموو ئەمرین.

[٢٠٩]

[٢١٠] وە كەس ژوور دەستی نییە لە ماڵی خۆیا.

٢١١)- هەموو کەس ئەزانێ ئاڵی کەچەڵە[٢١١]

٢١٢)- هەموو کەس بە عەیبی خۆی کوێرە[٢١٢]

٢١٣)- هەموو کەس گەمە بە مشك ئەکا، مشکیش بە ئاشەوان[٢١٣]

٢١٤)- هەموو کەس نانی خۆش ئەوێ، بەلآم وەك شوان نایگرێ بە سەر دڵیەوە[٢١٤]

٢١٥)- هەموو کەسێ گۆشت خۆرە، هەر ناوی گورگ بەدناوە[٢١٥]

٢١٦)- هەموو کون، کون نییە دەستی تێ راکەی[٢١٦]

٢١٧)- هەموو لەشی پێ ئەکەنێ[٢١٧]

٢١٨)- هەموو مەلآ هەنجیر خۆر بوایە هەنجیر بە دارەوە نەئەما[٢١٨]

٢١٩)- هەموو هەورازێ نشێوییەکی هەیە[٢١٩]

٢٢٠)- هەمیشە گۆزە بە ساغی ناگەڕێتەوە لە کانی[٢٢٠]

٢٢١)- هەندێ ژنە و هەندێ ژان، هەندێ هەوێنی نۆ تەبەق نان[٢٢١]

٢٢٢)- هەنگ لە ماکی، کچ لە داکی[٢٢٢]

---

[٢١١] یەکێك ئەیڵێ، کە نەنگێکی ببێ، وە هەمیشە بیدەنەوە بە چاویا، واتە ئەوەندە پێویست بە وتنەوە ناکات.

[٢١٢] واتە یا نایزانێ، یا ئەگەر بیشی زانێ دانی پیا نانێ.

[٢١٣] واتە لە هەموو شوێنێك راوی مشك ئەکرێ بە تەڵە، لە ئاشا نەبێ.

[٢١٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە شتێکی ئێجگار خۆش بوێ.

[٢١٥] واتە هەر کەسێك دەستی ببێ، زۆردار و ستەمکارە.

[٢١٦] واتە هەموو کەسێك کەسپك نییە تێکەڵی بکەیت، پیاوی خۆت بناسە.

[٢١٧] واتە زۆر کەیف خۆشە.

[٢١٨] یەکێکی ئیش زان بە یەکێکی ئیش نەزان ئەڵێ، واتە هەموو کەسێك ئیش زان بووایە ئیش نە ئەمایەوە.

[٢١٩] واتە هەموو بەرزبوونەوەیەك نزم بوونەوەیەکی بە دوادا دێ.

[٢٢٠] واتە قاپ و قاجاخیش وەك ئادەمی ئەشکێ و ئەجەلی دێ.

[٢٢١] هەوێنی نۆ تەبەق نان: واتە فتنە و فەسادی ئەکا و ئاژاوە ئەنێتەوە.

[٢٢٢] واتە ئەچنەوە سەر ئەوان.

٢٢٣)- هەنگوین بە دەمی تاڵە[٢٢٣]

٢٢٤)- هەنگوینە و لە پێستی سەگایە[٢٢٤]

٢٢٥)- هەوێ ببێ بە كراس و كەوێ، نامەوێ[٢٢٥]

٢٢٦)- هەوێ هەوێ جوان ئەكات، هێوەژن هێوەژن خێرا ئەكات[٢٢٦]

٢٢٧)- هەوات مرێ هەوا زەنگی، قەڵتاخ شڕی بێ ئاوزەنگی[٢٢٧]

٢٢٨)- هەواڵ ببەن بۆ میران، كارەكەر كارەكەر مەگیران[٢٢٨]

٢٢٩)- هەواڵ ببەن بۆ میران، وەرزێر وەرزێر مەگیران[٢٢٩]

٢٣٠)- هەوەڵ بەخت، ئەوەڵ تەخت[٢٣٠]

٢٣١)- هەودا توند راكێشیت ئەپچڕێ[٢٣١]

٢٣٢)- هەورامی لەبەر مەرامی كاری، بن كلكی كەری خۆی ماچ ئەكا[٢٣٢]

---

[٢٢٣] واتە زۆر خەفەتبارە.

[٢٢٤] بە شتێكی بە نرخ ئەوترێ، كە بە جۆرێكی بێنرخ پێشكەش بكرێ.

[٢٢٥] بەو دەوڵەمەندانە ئەوترێ، كە دەغڵ و دانیان هەڵگرتبێ بۆ گرانی واتە لەگەڵ هەوری پاییز پەڵەی دا، دەوڵەمەند سەری لێ تێك ئەچێ.

[٢٢٦] هەوێ: ژنی مێردە، هەر وەك هێوەژن: ژنی برای مێردە واتە لە یەكەمدا هەر دوو لا لە رقی یەكتری خۆیان جوان ئەكەن، لە دووهەمیشا هەر دوو لا لە رقی یەكتری باشتر ئیش ئەكەن.

[٢٢٧] بە یەكێكی لوت بەرزی چەكمە رەق ئەوترێ، كەهیچی نەبێ وە هیچی بە دەست نەبێ.

[٢٢٨] واتە كارەكەر بووە ئاغاژن و كارەكەر بۆ خۆی رائەگرێ، هەر وەك وەرزێر بووە بە ئاغا و وەرزێر بۆ خۆی رائەگرێ.

[٢٢٩] واتە كارەكەر بووە ئاغاژن و كارەكەر بۆ خۆی رائەگرێ، هەر وەك وەرزێر بووە بە ئاغا و وەرزێر بۆ خۆی رائەگرێ.

[٢٣٠] واتە نیشانەی خۆشی و ناخۆشی هەر لە سەرەتاوە دەرئەكەوێ.

[٢٣١] واتە لە هەموو شتێكا توندی خراپە.

[٢٣٢] بە یەكێك ئەوترێ، كە مەرایی یەكێكی ناڕەسەن بكات.

٢٣٣)- هەورامی و رمبازیان نەوتوە[٢٣٣]

٢٣٤)- هەوری پاییز خورِی، دەوڵەمەند ریشی خۆی برِی[٢٣٤]

٢٣٥)- هەوری سوور، بارانی دوور[٢٣٥]

٢٣٦)- هەوڵێرە، هەر بەخێرە[٢٣٦]

٢٣٧)- هەویری مێردان، ئاوی زۆر دەوێ[٢٣٧]

٢٣٨)- هەویری هەڵات ، پیشەی وڵات، هەویری فەتیرە، پیشەی فەقیرە[٢٣٨]

٢٣٩)- هەوێنی مێردان، بە حەوت ساڵان دێتە جۆش[٢٣٩]

٢٤٠)- هەوێنی نۆ قازان شیرە[٢٤٠]

٢٤١)- هەیدەر تەریکە، لە هەموویا شەریکە[٢٤١]

٢٤٢)- هورچ دەعبایەکی ناعالە، هێلکەی کرد کردی[٢٤٢]

٢٤٣)- هونەرمەند لە هیچ لایەك پەکی ناکەوێ[٢٤٣]

---

[٢٣٣] چونکە شوێنەکەیان هەموو شاخ و داخە لەبەر ئەوە رمبازی نازانن جگە لەوە ئەگەر بیشی زانن جێگایان نییە رمبازی پتا بکەن، بە یەکێك ئەوترێ، کە لە ئیشێکەوە دوور بێ.

[٢٣٤] بەو دەوڵەمەندانە ئەوترێ، کە دەغڵ و دانیان هەڵگرتبێ بۆ گرانی واتە لەگەڵ هەوری پاییز پەڵەی دا، دەوڵەمەند سەری لێ تێك ئەچێ.

[٢٣٥] واتە هەور کە سوور بوو، بارانی دوورە.

[٢٣٦] واتە هەولێر هەمیشە هەر شوێنی پیت و بەرەکەت بووە.

[٢٣٧] واتە کاری پیاوان زۆر ئەخایەنێ، چونکە بە گۆترە نییە، بەڵکو هەمووی لە رووی پیلانەوەیە.

[٢٣٨] واتە پیشەی وڵات وایە، کە هەویر هەڵبێ ئنجا بکرێ بە نان، یا بە کولێرە، بەڵام هەژار ئەم دەستورە تێك ئەدا، وە هەویر هەیە فەتیری ئەیکا بە نان، چونکە برسییەتی.

[٢٣٩] واتە پیاوی گەورە درەنگ توورە ئەبێ.

[٢٤٠] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر خراپ بێ، وە رێی کەوتە هەر شوێنێك ئاژاوەی تێ بخات.

[٢٤١] یەکێك ئەیلێ، کە گومان بار (متهم) کرابێ بە شتێ، واتە بووم بە هەیدەر، کە ئەویش لە هەموو شتێکا گومان بار ئەکرا.

[٢٤٢] بە هێندێ کەسی چەموشی نالەبار ئەوترێ کە هەموو شتێکیان لێ بوەشێتەوە.

[٢٤٣] چونکە لە هونەرەکەی خۆی بەهرەمەند ئەبێ.

٢٤٤)- هوهای دوای گورگە[٢٤٤]

٢٤٥)- هۆ هۆیە، هەر کەس بۆ خۆیە[٢٤٥]

٢٤٦)- هۆر یا ئەم تای، یا ئەو تای[٢٤٦]

٢٤٧)- هۆرمان خواردوە، هەمانەمان ماوە[٢٤٧]

٢٤٨)- هۆز نەگەی لە تەچن گەی[٢٤٨]

٢٤٩)- هی خۆم بۆ خۆم، هی تۆ ئەخۆم[٢٤٩]

٢٥٠)- هی خۆیان دەجوون، هی مە دەژمێرن[٢٥٠]

٢٥١)- هێشتا بای نەداوە شەقەی دێ[٢٥١]

٢٥٢)- هێشتا خێر و شەڕ بەش نەکراوە هاتۆتە سەرم[٢٥٢]

٢٥٣)- هێشتا زەردویی فڕێ نەداوە[٢٥٣]

٢٥٤)- هێشتا زەردویی وا بە دەمەوە[٢٥٤]

٢٥٥)- هێشتا لە کوێتە، هۆمەرە کوێر نیوەی رێتە[٢٥٥]

---

[٢٤٤] بە یەکێك ئەوترێ، کەماڵی یەکێکی خواردبێ بە رەنگێك کە لێی نەسێنرێتەوە.

[٢٤٥] لە کاتێکا ئەوترێ کە ئاژاوە بێ دنیا بووبێ بە ئاشوفتە و هەر کەس بۆخۆی بێ.

[٢٤٦] بە کارێك ئەوترێ، کەلە هیچ سەرێکەوە جیاوازی نەبێ.

[٢٤٧] واتە زۆرمان خواردووە و کەممان ماوە.

[٢٤٨] لەتەچن: سوال کەرێکە کە لەتە نان بچنێتەوە.

[٢٤٩] بە یەکێکی زۆردار ئەوترێ، کە چاوی بڕیبێتە شتێکی تۆ.

[٢٥٠] بە یەکێك ئەوترێ کە بەشی خۆی بخوا و چاوی لە بەشی ئەم و ئەویشەوە بێ.

[٢٥١] بە یەکێك ئەوترێ، کە لە پێش تەواو بوونی کارێکا خۆی ئامادە بکات هەر وەك تەواو بووبێ.

[٢٥٢] واتە بە تەواوی رۆژ نەبۆتەوە.

[٢٥٣] واتە مناڵە، وە بۆنی شیری خاو لە دەمی دێ.

[٢٥٤] واتە مناڵە، وە بۆنی شیری خاو لە دەمی دێ.

[٢٥٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە کارێکی گرنگی دەست دابێتێ و گەیاندبێتی بە نیوەی، وە وا بزانێ کە لە تەواو بوونایە، تۆش ئەمەی پێ ئەڵێیت بۆ ئەوەی کە تێ بگا هێشتا زۆری ماوە.

٢٥٦)- هێشتا مەلاشوی هەڵ نەدراوەتەوە[٢٥٦]

٢٥٧)- هێشتا نەبووە بە قۆچەقانی قنگەی دێ[٢٥٧]

٢٥٨)- هیچ مشکێ بێ کون و هیچ کونێ بێ مشك نامێنێتەوە[٢٥٨]

٢٥٩)- هیچ نایەوێ ماسی فێری مەلە بکەیت[٢٥٩]

٢٦٠)- هیچت نەبێ و راخەرت ببێ[٢٦٠]

٢٦١)- هیچی نەدیوە، نە چەقچەقەی ئاش، نە گوڵە گەنم[٢٦١]

٢٦٢)- هێلکە بۆ کراس رەشێ، جیقنە بۆ سەر بەهەشێ[٢٦٢]

٢٦٣)- هێلکە بە بن باخەڵ ئەبرژێنێ[٢٦٣]

٢٦٤)- هێلکە بە بن هەنگڵ ئەبرژێنێ[٢٦٤]

٢٦٥)- هێلکە لە بن کەشی ئەکوڵێ[٢٦٥]

٢٦٦)- هێلکە لە مریشکە و مریشك لە هێلکەیە[٢٦٦]

٢٦٧)- هێلکە نەی برژێنیت پیس ئەبێ[٢٦٧]

---

[٢٥٦] واتە زۆر منالە.

[٢٥٧] تەماشای لێکدانەوەی پەندی ( هێشتا بای نەداوە شەقەی دێ) بکە.

[٢٥٨]

[٢٥٩] چونکە خۆی بە سروشت مەلەوانە بەیەکێك ئەوترێ کە ئامۆژگاری یەکێکی وا بکا کە پێویست بە ئامۆژگاری نەبێ.

[٢٦٠] چونکە بە راستی خانووی رووتی بێراخەر، وەك مەردومی بێ کالا و بەرگ وایە.

[٢٦١] بە تەوسەوە بە یەکێك ئەوترێ، کەخۆی هەڵە بکات لە کارێکا وە وا نیشان بدات کە هیچی لێ نازانێ.

[٢٦٢] یەکێك ئەیڵێ کە خێر و بێری ئەو ماڵەی کە تیایەتی بۆ یەکێك بێ و خاك و خۆڵ و تەپوتۆزیشی بۆ ئەو بێ.

[٢٦٣] واتە گەنجێکی گەرم و گوڕ و خوێن گەرمە.

[٢٦٤] واتە گەنجێکی گەرم و گوڕ و خوێن گەرمە.

[٢٦٥] واتە گەنجێکی گەرم و گوڕ و خوێن گەرمە.

[٢٦٦] بە دوو خزمی دوور ئەوترێ، واتە هەموو سەر و قنگی یەکن وە ئەچنەوە سەر یەك.

[٢٦٧] بە کچێك ئەوترێ، کە وەختی شووی هاتبێ، واتە لەمە زیاتر بمێنێتەوە خراپە.

٢٦٨)- هێلکە و ڕۆنی سەر کلاو ڕۆژنەیە[٢٦٨]

٢٦٩)- هێلکەی ئەمڕۆ لە جوجەڵەی سبەینێ باشترە[٢٦٩]

٢٧٠)- هێلکەی بێ زەردێنە ئەفرۆشێ[٢٧٠]

٢٧١)- هێلکەی شکاو پینە ئەکات[٢٧١]

٢٧٢)- هێڵی لار لە ژێر سەری گای پیرایە[٢٧٢]

٢٧٣)- هێواش بڕۆ و هەمیشە بڕۆ[٢٧٣]

---

[٢٦٨] بە کارێك ئەوترێ، کە دوراودوور دەستی بدەیتێ، بە جۆرێکی وا کە هەوڵ و تەقەلاکانی تۆتینێکی وای نەبێ بۆ ئەو کارە.

[٢٦٩] چونکە ئەمڕۆ هێلکەکەت لە ژێر دەستایە، بەلاّم جوجەڵەکەی سبەینێ ئەنگونجێ دەستت نەکەوێ.

[٢٧٠] واتە زۆر ناڕاست و بە فڕ و فێڵە.

[٢٧١] تەماشای لێکدانەوەی پەندی ( نانی دڕاو پینە ئەکات) بکە.

[٢٧٢] بە ژنێك یا پیاوێکی پیرئەوترێ، لە مالاّ کە حەزی لێ نەکەن، وە زۆر شتی بدەنە پاڵ، وە بیانووی پێ بگرن و پلاری تێ بگرن.

[٢٧٣] واتە کە هێواش بڕۆیت بە ڕێدا، ماندوو نابیت، ئەو حەلە درێژەت ئەبێ لە سەر ڕێ ڕۆین.

# پیتی ی

۱)- یا ئەبێ بە خانی خانان یا ئەبێ بە پوشی بانان[١]

۲)- یا پرسە بە، یا دانا بە[٢]

۳)- یا خەر ئەتۆپێ، یا خاوەنی خەر[٣]

٤)- یا زانابە، یا پرسابە[٤]

٥)- یا سەمەن ئەمرێ بۆ نانێ، دوور بە جۆ ئەدا بە (.....)[٥]

٦)- یا شارستان، یا دارستان[٦]

۷)- یا گاڵ دێنێ، یا پەموو[٧]

۸)- یا لەگەڵ دایکی منالان، یا لەگەڵ بووکی گەورە مالان[٨]

۹)- یا مەرد بە، یا لە پەنای مەردا بە[٩]

۱۰)- یاخوا ئەم دەست محتاجی ئەو دەست نەبێ[١٠]

---

[١] بە یەکێك ئەوترێ، کە دەست بداتە کارێکی گەورە، واتە یا تیا سەرئەکەوێ، یا تیا لەناو ئەچێ.

[٢] واتە خۆت دانا بە و شت بزانە، یا ئەگەر شت نازانیت پرسیار بکە. بە یەکێك ئەوترێ کە شت نەزانێ و پرسیاریش نەکات.

[٣] واتە ئەو مەسەلەیە هەر ئەکەوێ بە بارێکا.

[٤] واتە بە پرس هەموو شتێ ئەزانرێ.

[٥] بە یەکێك ئەوترێ، کە زۆر نەدارا و رەجاڵ بێ، کەچی پارەیەکی باش خەرج کا لە ئارەزوویەکی خۆیا.

[٦] چونکە لە هەر دووکیانا ئاوات دێتە دی.

[٧] یەکێك ئەیلێ کە ئیشێکی کردبێ و نەزانێ ئەنجامەکەی چۆن ئەبێ واتە یا باش ئەبێ یا خراپ.

[٨] چونکە یەکەم هەمیشە لە ماڵەوەیە لەبەر منالەکانی، وە دووهەمیش زۆر نەرم و نیان و سەنگین و گرانە.

[٩] چونکە کە لە پەنای مەردا بوویت فێری مەردی ئەبی.

[١٠] واتە خۆت بە خۆت محتاج نەبی چ جای بە بێگانە.

١١)- ياخوا بە دارەکەی قەرەداغ بێ[11]

١٢)- ياخوا بچيتە ئەو شوێنەی کە ئاو ئەڵێ کس[12]

١٣)- ياخوا تونچی نەبێ بە حەمامچی[13]

١٤)- ياخوا پير و خەرۆ بن[14]

١٥)- ياخوا دەستی راست محتاجی دەستی چەپ نەبێ[15]

١٦)- ياخوا کەس قاچی نەچێ بە گوی فلان کەسا[16]

١٧)- يار باقی و سوحبەت باقی[17]

١٨)- ياری نەوسی لێت زيزە[18]

١٩)- يەخە دادرين، پەشيمانی دێنێ[19]

٢٠)- يەز، دوورە، گەز نزيکە[20]

---

[11] بە يەکێك ئەوترێ، کە نزای عومر درێژی بۆ بکەيت.

[12] واتە ئەوەندە دوور بکەوێتەوە کەس جێگا و رێگات نەزانێ.

[13] چونکە لە خۆی ئەگۆرێ، وە زۆر زبر و قەبە دەرئەچێ.

[14] بە ژن و مێردێك ئەوترێ، کە دڵيان پێکەوە بێ.

[15] تەماشای پەندی دووهەم بکە.

[16] مەبەس لە فلان کەس يەکێکە کە هەر کەس کەوتە داوی لێی رزگار نابێ.

[17] واتە هەر دوکمان ماوين و رۆژگاريش زۆری بە دەمەوەيە.

[18] واتە يەکێك کە بۆ خواردن لێسە هاتوچۆت بکات و ببێ بـە ئاشـنات، هەميشـە لێـت زيزە، چونکە هەرگيز ناگونجێ کە تۆ شتێك بە بێ ئەو نەخۆيت.

[19] چونکە ناشکوری ئەگەيەنێ.

[20] يەز: ناوی شارێکە لە ئێران کە خۆيان پێی ئەڵێن: (يەزد) جاران زۆر جۆرە قوماشی بە تۆپ لێ دروست کراوە، وە نێراوە بە هەموو لايەکا، لە سەر تۆپەکان نووسراوە کە ئەمەندە گەزەيە، ئنجا جارێکيان لە شارێکی کوردەواری، دوور لە شاری يەزد، يـەکێك کە ئەيەوێ تۆپێ لەو قوماشە بکرێ، ئەڵێ من باوەڕ ناکەم کە ئەم تۆپە ئەوەندە گـەز بێ، کابرای خاوەنيشی ئەڵێ ( يـەز دوورە گـەز نزيکـە) واتـە هـەر چـەند شـاری يـەزد دوورە، وە دەستمان ناگاتە کارخانەکەی بزانين ئەم ژمارەيەی کە لە سەری نووسراوە راستە يا درۆيە، بەڵام گەز حازرە کە بی پێوين.

٢١)- یەك ڕوو هەمیشە وا لە ئابڕوودا[٢١]

٢٢)- یەك ساڵە دوو ساڵە ئەخەڵەتێنێ[٢٢]

٢٣)- یەك ساڵە دوو ساڵەی خەڵەتان[٢٣]

٢٤)- یەك شەویلەی قنگ قەویلە[٢٤]

٢٥)- یەکێ بە زۆر بینێرن بۆ مازوان، بە دارا هەڵناڕوانێ[٢٥]

٢٦)- یەکێ بە گەورەیی فێری پلاو خواردن بێ، دەست بۆ لووتی ئەبا[٢٦]

٢٧)- یەکێ پۆلا و یەکێك ئاسن بێ[٢٧]

٢٨)- یەکێ خانووی لە شووشە بێ، بەرد ناگرێتە خانووی کەس[٢٨]

٢٩)- یەکێ ڕێی ئاوایی یان نەئەدا، کەچی ئەحواڵی ماڵی کوێخای ئەپرسێ[٢٩]

٣٠)- یەکێ چاڵێك بکەنێ بۆ کەسێك، خۆی تێی ئەکەوێ[٣٠]

٣١)- یەکێ لە شار هاتبۆوە، کەچی ئەچوو خەبەری شاری لە یەکێکی تر ئەپرسی[٣١]

---

[٢١] هەر وەك دوو ڕوو هەمیشە بێ ئابڕووە.

[٢٢] یەکێك ئەیڵێ، کە یەکێکی لە خۆی منداڵتر بی خەڵەتێنێ.

[٢٣] یەکێك ئەیڵێ، کە یەکێکی لە خۆی منداڵتر بی خەڵەتێنێ.

[٢٤] بە منداڵێك ئەوترێ، کە زۆر زۆر قەڵەو و گەورە ببێ، ئەگونجێ لە یەك شەوەی قنگ قەوییەوە وەرگیرابێ.

[٢٥] واتە ئیش بە زۆرە ملێ ناکرێ.

[٢٦] واتە هەر کەسێك بە پیری پایەیەکی دەست کەوێ، باش نازانێ هەڵی سوڕێنێ.

[٢٧] واتە دوو کەس کە پێکەوە بوون، ئەگەر یەکێکیان توند وم تیژ و ڕەق و تەق بوو، ئەبێ ئەویکەی تریان نەرم و شل بێ، ئەگینا هەڵ ناکەن.

[٢٨] چونکە خەڵقیش بەرد ئەگرنە خانۆکەی ئەو، کە شووشەیە، بە یەکێکی نەنگدار ئەوترێ، کە ناوی نەنگدارێك بەرێ.

[٢٩] بە یەکێك ئەوترێ کە ڕێی شوێنێك نەدرێ، یا حەز نەکەن بچێ، ئەحواڵی ئەو شوێنە بپرسێ، وە بییەوێ بۆی بچێ.

[٣٠] تەماشای پەندی (هەر کەسێك چاڵ بۆ یەکێك هەڵ کەنێ، خی تێ ئەکەوێ) بکە.

[٣١] بە یەکێك ئەوترێ کە خۆی ئاگای لە شتێك بێ کەچی ئەو خۆی پرسیار لەو شتە بکات.

٣٢)- یەکێ مرد و یەکێ مردار بوو، یەکێ بە تیری خوا گرفتار بوو[٣٢]

٣٣)- یەکێ نانی نەبوو ئەچوو پیازی ئەکڕی[٣٣]

٣٤)- یەکێ نانی نییە، داوای دۆ ئەکا[٣٤]

٣٥)- یەکپاڵوو بە هیچ لایەکا ناکەوێ[٣٥]

٣٦)- یەکێك دەمرێ، یەکێك داری تێ ئەژەنێ[٣٦]

٣٧)- یەکێك لێی بگۆڕێ، رەشماڵی لە سەر بەفرێ ناناسێ[٣٧]

٣٨)- یەکێکی کرد بەس نەبوو، دوانی کرد کەس نەبوو[٣٨]

---

٣٢

[٣٢] ئەم پەندە وەك قسەکەی کابرای ئێرانی وایە کە هاوڕێکەی پێنج کاڵەکی کڕی بۆ هەر دووکیان کە بیخۆن، کابرای ئێرانیش پێشەکی دوانیان ئەخوا بە بێ خاوەنەکەی، ئەمێنێتەوە سیانی، کە خاوەن کاڵەکەکان دێتەوە، ئەڵێ کوا دوو کاڵەکەکەی تر، وە ئەو سێ کاڵەکە چۆن دابەش بکەین لە ناو خۆمانا؟ کابراش ئەڵێ: (یەکێ دەر ئەزەل نەبود، یەکێ کەردەم زەقنە مووت، یەکێ من یەکێ تۆ، یەکێ من) واتە ئەم پێنج کاڵەکەی کە تۆ ئەحواڵی ئەپرسیت یەکێکیان هەر لە ئەساسا نەبوو، واتە چوار بوون، چوارەکەش یەکێکیانم زەقنە مووت کرد، مایەوە سیانیان، ئەم سیانەش یەکێکیان بۆ من، یەکێکیان بۆ تۆ، یەکێکیان بۆ من، خولاسە لە پێنج کاڵەك یەکێکیانی دا بە خاوەنەکەی، چواریشی بۆ خۆی. ئەم پەندەش ئەوە ئەگەیەنێ، کە یەکێك سێ سەر ئاژاڵ، یا سێ باڵندەی دانابێ بە سپاردە لای یەکێك، ئەویش هەر سێکی خواردبێ، وە دوای لێ پرسینەوەی بەم پەندە وەڵامی دابێتەوە.

[٣٤] بە یەکێك ئەوترێ، کە پێویست بێ بە شتێکی زۆر گرنگ، کەچی بچێ بە شتێکی هیچ و پووچەوە خەریك بێ.

[٣٥] واتە مەردومێك کە لە سەر یەك بار بێ، هەرگیز ناکەوێ.

[٣٦] یەکێك ئەیلێ کە تووشی بەڵایەکی گەورە بووبێ، وە یەکێکی تر لە سەر گاڵتە و کەیفی خۆی مابێ.

[٣٧] یەکێك ئەیلێ کە سەری لێ شێوا بێ و رەش و سپی لە یەك جیا نەکاتەوە.

[٣٨] بە ژنێك ئەوترێ کە شوو لە دوای شوو بکات.

